# دەروونناسیی میدیایی

کەمال فاروق

محەمەد عەبدوڵڵا کەلاری



هەولێر - ٢٠١٣



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **دەروونناسیی میدیایی**

● کەمال فاروق ـ محەمەد عەبدوڵڵا کەلاری

● دیزانی بەرگ و ناوەوە: لوقمان کەریمی

● نرخ: (٤٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم: ٢٠١٣

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٣٠)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## پێشەکی

فەیلەسوفێکی بەناوبانگی چین دەڵێ «وێنەیەک کاریگەری هەزاران وشەی هەیە».
بۆئەوەی ئێمەی نەتەوەی کورد رازو نیازی خۆمان بە دۆستان و نەیارانمان را بگەیەنین، پێویستمان بە میدیایەک هەیە کاریگەری کاراو چڕوپڕ لە بەرامبەر بکات و، درک بەدەوربەرمان بکات کە باوەڕ بێنن بەوەی ئێمەش مرۆڤین و مافی ژیان و ئازادیمان هەیە و، شوێنەواری دەروونی چەوساندنەوەی نەتەوەییمان لەسەرە، ئەوەتا مێژووش شاهێدە، ئەوەی شۆڕشی چەکداری نەیتوانی بیکات، دەبێ میدیای کوردی رۆڵی تەواوکردنی هەبێت و، دەوروبەر رابچڵەکێنێت و ببێتە هێزی نەوت و پیشەسازی و ئاوو دیبلۆماسیەت و، سەرنجراکێش بێت و هانی بڕیاردانی نێودەوڵەتی بدات، بۆ لاکردنەوە لە نەتەوەیەکی مەزن کە رەنج و خەباتی مەزنی کردووەو تەنها شاخ پاڵپشتی بووە.

دەبا ئیستا میدیا بە شێوازە زانستی و ئەکادیمی و ئەزموونی خۆیەوە پاڵپشتی بێت و، بە وشەو وێنە گوازراوەکانی شۆڕشێکی نوێ بەرپا بکات، میدیای نوێی کوردی لە ئاستێکی زانستی ئەوتۆدا بێت، بتوانێ وێنەی دۆخی تاکی کورد لە سەد ساڵی رابردووی شۆڕش و بەرخودان بگەیەنێتە شوێنی مەبەست و، بتوانێ ویژدان و سۆزی جیهان بهەژێنێت هێندەی زوومەکەی رۆژنامەنووس (ئادم شمیدت) کە لە کۆڕەوەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١، وێنەی چەوساندنەوەو ئێش و ئازاری سەدەی نەتەوەیەکی بێ سەدای گەیاندە دڵ و ویژدانی دونیا، کە سەدان هەزار تفەنگ نەیانتوانی ئەو رۆڵە ببینن، بەهۆی بێ میدیایی و پێش نەکەوتنی ئامرازەکانی میدیای ئەو سەردەمەو بارودۆخی سیاسی نالەبار، زوومی کامیری ئەو رۆژنامەنووسە کاریگەری خۆی بەجێ هێشت.

میدیای شۆڕشی کوردیش لەناو شاخەوە شوێن پەنجەی دیارەو بەپێی توانای

خاکەڕای خۆی کەمتەرخەم نەبووە، بەڵام بێ میدیای سەردەمیانەو زانستیانەی ئەم نەتەوەیە، هێشتا سەداو ڕەنگی کێشە ڕەواکەی بە گوێرەی پێویست و لە ڕوانگەی جیهانگیرییەوە، ئەگەر گەیشتبێتە شوێنی خۆیشی وەلی نەیتوانیوە قەناعەت بە ویژدان و دڵ و دەروونی دەوروبەر بێنێت، نەک لەڕووی سۆزی مرۆییەوە بەڵکو لەرووی مافی سیاسییەوە سەیری ئێمە بکەن.

ئێمەی کورد پێویستمان بە میدیا و دروستکردنی میدیاکاران هەیە، لە ڕێگەی میدیای ئەکادیمی و وەرگێڕانی ئەزموونی گەلانی پێشکەوتووو هزری میدیایی، ئەم کتێبە تنۆکێکە لە دەریای میدیا بۆئەوەی بئاخنرێتە نێو کتێبخانەی کوردییەوەو، شان بە شانی خوێندنی بواری میدیا، وشەکانی سەر زارمان لە ئەنفال و هەڵەبجەو شۆڕش بە وێنەوە ڕەوانەی ویژدانی بەویژدانان بکات و بێ ویژدانانیش وریا بکاتەوە، بۆ ئەمەش پێویستمان بە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری میدیایی هەیە، کە چۆن میدیاکاری کورد دەتوانێ لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە کێشەی ڕەوای نەتەوەیەک بە دونیا بناسێنێ و، بە خامەکەی مۆرکی دادوەری بنەخشێنێ.

لەم مەیدانەدا میدیای کوردی هێشتا نەیتوانیوە سەرنجی گەلانی دونیا بۆ کێشەکانی رابکێشێ و، دەسەڵاتی خۆی بەکار بێنێت بۆ تێگەیاندنی گەلانی دونیا سەبارەت بە ڕەوشی مێژوویی ئەم نەتەوەیە و، ڕۆڵی گفتوگۆو دانوستاندنی سیاسی ببینێ لە ناوەندی عەرەبی و هەرێمی و جیهانییدا، کە بەداخەوە تا ئێستا ئاراستەی میدیای کوردی زیاتر بەرەو ناوخۆیە نەک بۆ دەرەوە، کە سەردەمی ئێستا پێویستمان بە شۆڕشی میدیایە کە چێکردنی میدیاکارو بڵاوکردنەوەی هۆشیاری میدیاییە، ئەمە بۆ گەلێکی سڤیل کاریگەرترین خەباتی سەردەمەو جێگرەوەی دیکەی نییەو، بەوپێیەی میدیا مانی شارستانییەتە، پێویستە بۆ ئێمەش زمانێکی کارا بێت لە مەحافلی نێودەوڵەتیداو، کاریگەری سایکۆلۆژیانەی وای هەبێت ڕاستەوخۆ وێنەکانی بێ دەوڵەتی و سەربەخۆیی بەرجەستە بکات و دەوروبەر لێمان تێ بگات.

هەستمان بە کەمیی سەرچاوەی دەروونناسی میدیا لە کوردستان کرد، بۆشمان دەرکەوت زۆر لە کتێبەکان یان ئەوەی گرنگی بە میدیا داوە وەک ڕووداوێک تەنها

باس لە ئامرازەکانی میدیا دەکات، یان ئەوەتا بەشێوەی گشتی لەمیانەی کتێبەکانی کۆمەڵناسی کاری لەسەر دەکات، تەنانەت ئەو کتێبانەش کە باس لە دەروونناسی میدیایی دەکەن، دەرکەوتووە میدیا بە لایەنی دەروونی بەشێوەی گونجاو نابەستێتەوە، لەبەر ئەوە بیرۆکەی ئامادەکردنی ئەم کتێبە هاتە ئاراوە.

ئەم هەوڵە بێ کەموکورتی نییە و ئەرکێکی مەدەنیانەیە بۆ بڵاوکردنەوەو پێشخستنی رەوتی میدیای زانستی و پێگەیاندنی میدیاکاران، کە پەیامبەری وێنەی حاڵی نەتەوەیەکن، بۆ نیشاندانی رووی چەوسانەوەی مێژوویی و سایکۆلۆژی تاکەکانی کە سەدان ساڵە دەنگیان کپ کراوەتەوەو، رۆڵی خۆیان بۆ چێکردنی شارستانی و دیموکراسی نابینن، کارابوونی رۆڵی میدیای کوردی لە هۆشیاری میدیایی تاکەکانیدایە بۆ ئاخاوتن لەگەڵ دەوروبەرو، بڵاوکردنەوەی هۆشیاری میدیایی و گەیاندنی وێنەکانی حاڵی تاکی کورد بە شوێنی مەبەست، کە خۆی لەم نموونەی ئەم کتێبەو دەیان کتێبی دیکەدا دەبینێتەوە.

کتێبی دەروونناسی میدیایی، بۆئەوەیە هێزی میدیای دەروونی بکاتە لقێک بۆ هەموو میدیاکاران و، بۆ هەموو ئەو قوتابیانەی کە دەخوێنن چ لەبارەی پسپۆڕێتی دەروونناسی یان پسپۆڕێتی میدیاییەوە بێ، ئەم کتێبە لە دوانزە بەش پێکهاتووە لە لیستی ناوەڕۆکدا ئاماژەی پێ کراوە، بە شێوازێکی خۆش ساناو داڕێژراوە، دەروازەیەکە بۆ قوتابیانی دەروونناسی کە لەبارەیەوە زانیاری گرنگیان پێ دەبەخشێ، هەروەها سوودی بۆ میدیاکارانیش هەیەو ناتوانن لەمبارەیەوە دەستبەرداری ببن.

ئەگەر میدیا زمانێک بێ بۆ داڕشتنی شارستانیەت، کەواتە با ئێمەش ئەو زمانە بخەینەگەڕ بۆ داڕشتنی ئەو شارستانیەتە، کە پێویستە بۆ تێگەیاندنی دەووربەرمان لە کێشەی نەتەوەیەکی بێ دەوڵەت.

**کەمال و محەمەد**

**هەولێر**

# بەشی یەکەم
# دەروونناسیی و میدیا

دەروونناسی، ئەو زانستەیە لە رەفتارو کردەوە دیارو نادیارەکانی تاک دەکۆڵێتەوە، هەوڵدەدات پەیوەندی نێوان دیاردەکان ئاشکرا بکات و گەشە بە رەفتارەکانی مرۆڤ بدات. دەروونناسیی زانستێکی نوێیە لە چاو زانستەکانی تردا و تەمەنی زیاتر لە چارەکە سەدەیەکە و رۆژ بە رۆژ لە پێشکەوتن و پەرەسەندندایە.

**بوارەکانی دەروونناسیی:**

بوارەکانی دەروونناسی لە فراوانبووندایە، هەر لە بوارە تیۆرییەکانەوە تا بوارە پراکتیکییەکان، کە بەم شێوەیە دابەش دەکرێن:

**ا/ بوارە تیۆرییەکان:**

ئەو بوارانەیە تایبەتن بە دۆزینەوەی ئەو پرەنسیب و یاسایانەی رەفتاری مرۆڤ جڵەو دەکەن، وەک:

- دەروونناسی گشتیی:

لەو بنەماو و یاسایانە دەکۆڵێتەوە کە چالاکییە دەروونییەکانی مرۆڤ شی دەکەنەوە، وەک: بیرکردنەوە، فێربوون، بیرچوونەوە، هەڵچوون.. هتد. ئەم زانستە بناغەی هەموو بوارەکانی دیکەی دەروونناسییە.

- دەروونناسی کۆمەڵایەتی:

گرنگی بە رێگاکانی کارلێککردنی نێوان مرۆڤەکان دەدات، کە کار لە بۆچوون و رەفتاریان دەکات.

- دەروونناسی گەشە:

لەو قۆناغانە دەکۆڵێتەوە کە مرۆڤ لە ژیانیدا پێیاندا تێدەپەڕێت، هەروەها

تایبەتمەندی دەروونی و جەستەیی هەر قۆناغێک دەخاتەڕوو، ئەو بنەماو یاسا گشتییانەش دەخاتەڕوو کە تایبەتن بە گەشەکردنەوە، لقەکانی ئەم زانستەش بریتین لە: دەروونناسی منداڵ، دەروونناسی هەرزەکار، دەروونناسی پێگەیشتووان، دەروونناسی بەساڵاچووان.

- دەروونناسی جیاتاکی:

لە جیاوازی نێوان تاکەکان و جیاوازی کۆمەڵ و ڕەچەڵەکەکان دەکۆڵێتەوە، لەڕووی چالاکی ئەقڵی و کەسێتی و ئامادەباشی و بەهرە تایبەتییەکان، لە هۆکاری ئەو جیاوازیانەش دەکۆڵێتەوە. ئەگەر دەروونناسی گشتی ئەوە نیشان بدات کە خەڵک لە چیدا لێک دەچن، ئەوا دەروونناسی جیاتاکی ئەوە نیشان دەدات ئەو تاکانە چۆن و تا چ ڕادەیەک لە یەکتر جیاوازن.

- دەروونناسی بەراوردکاری:

لە شتە جیاوازو لێکچووەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ، منداڵ و گەورە، مرۆڤی سەرەتایی و شارستانی، کەسی ئاسایی و کەسی نائاسایی دەکۆڵێتەوە، واتە بەراورد لەنێوانیاندا دەکات.

- دەروونناسی فسیۆلۆژی:

لە بناغەی فسیۆلۆژی (جەستەیی) ڕەفتاری مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، بایەخ دەدات بە توێژینەوە لەبارەی کۆئەندامی دەمارو ئەرکە جیاوازەکانی وەک بیرکردنەوەو فێربوون و خەوبینین و هەستەکان .. هتد، بۆنموونە هەوڵدەدات بزانێ هەستەکان چۆن ڕوودەدەن و ڕەوتە دەمارییەکان چۆن لە ناو دەمارەکاندا گوزەر دەکەن و، مێشک چۆن هەست و ڕەفتار جڵەو دەکات. هەروەها لە ئەرکە جیاوازەکانی ڕژێنە بێ دەنگەکان و کاریگەرییان لە سەر ڕەفتار دەکۆڵێتەوە.

- دەروونناسی ئاژەڵ:

لە ڕەفتارە جیاوازەکانی ئاژەڵ و توانای بیرکردنەوەو وەبیرهاتنەوەو فێربوونی دەکۆڵێتەوە، ئەو زانست و زانیارییانەش لە بواری ئاژەڵەوە بەدەست هاتوون، ڕێخۆشکەرن بۆ سەرهەڵدانی زۆر لە بیردۆزو بنەما تایبەتەکانی مرۆڤ.

**ب/بواره كرداربیەكان:**

ئامانجی بەدیهێنانی مەبەسـتە زانسـتییەكان و چارەسـەركردنی گرفتە كرداری و زانسـتییەكان و دۆزینــەوەی رێگەچـارەی كرداری ئەو گرفتانەی لێـی دەكۆڵێتەوە. لە نموونەكانی:

- دەروونناسی پەروەردەیی:

لــە گرفتــە پەروەردەییــەكان دەكۆڵێتــەوە لــە رێگــەی جێبەجێكردنــی بیردۆزەكانی دەروونناسـی، دۆزینــەوەی هـۆكارو رێگەچـارەی گونجـاو بـۆ ئـەو گرفتانـەی دێنـە رێگەی پرۆسـەی پەروەردەو خوێندن، وەك دواكەوتن لە قوتابخانە، دابەزینی ئاسـتی زانستیی، توێژینەوە سەبارەت بە بابەتە پەروەردەییەكانی وەكو فێربوون، پاڵنەرەكانی رەفتار، جیاتاكی، یادگە، زیرەكی، كەسێتی مامۆستاو شێوازی وانەوتنەوەو فێركردنی گەورەكان و، چۆنێتی گونجاندنی پرۆگرامی خوێندن لەگەڵ رەوشی خوێندنی سەردەم.

- دەروونناسی پیشەسازی:

بنەماو یاساكانی دەروونناسی پەیڕەو دەكات لە بواری پیشەگەری و بەرهەمهێناندا، لە ئامانجەكانی:

١- بەرزكردنــەوەی ئاســتی بەرهەمهێنانــی كرێـكارو دەســتەی كارگــەران لــە رێگــەی پەیڕەوكردنــی رێنماییەكانــی دەروونناســی و بیردۆزەكانــی، كــە دەبنــە هۆی چارەسەركردنی ئەو گرفتانەی دێنە رێگەی كرێكاران لە میانەی كارەكانیاندا.

٢- بەدەستهێنانی رەزامەندی كرێكار لە رێگەی خۆشكردنی كەش و هەوای ماددی و كۆمەڵایەتی.

٣- بەدەســتهێنانی زۆرتریـن بـڕی بەرهەمهێنـان و باشـترین جـۆر لــە ماوەیەكی كورت و هەوڵێكی كەمتردا.

٤- شـیكردنەوەی كارو مەشـقی پیشەسـازی و گـەڕان بـەدوای كرێـكارو دەستنیشانكردن و پۆلێنكردنی پیشەیی و نەخشەدانانی كار.

٥- دابینكردنــی ئاسایشــی پیشەســازی و كەمكردنــەوەی رووداوەكانــی كارو

ماندوبوونی کرێکار.

- دەروونناسی ئەندازەیی:

گرنگی بە پەیوەندی نێوان کرێکاران و ئامێرەکان دەدات.

- دەروونناسی کلینیکی (پزیشکیی دەروونی):

لە چۆنێتی دروستبوونی نەخۆشییە دەروونی و ئەقڵییەکان و لاوازی مێشک و تاوان و هۆکارەکانی دەکۆڵێتەوە، هەروەها دانانی بناغەی زانستی بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەی گونجاو بۆ نەخۆشییەکان و، دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی بارگرژی دەروونی سووک، وەک کەموکورتی قسەکردن و گەشەکردن.

- دەروونناسی ئەزموونگەری:

لێکۆڵینەوەیە لەبارەی کاردانەوەی تاکەکان و درککردنیان بەرامبەر ئەو وروژێنەرانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، لەگەڵ لێکۆڵینەوە سەبارەت بە چۆنێتی فێربوون و وەبیرهاتنەوەو کاردانەوەی تاکەکەکان بەرامبەر هەڵچوونەکان، هەروەها چۆنێتی دروستبوونی پاڵنەرەکان.

- دەروونناسی دادوەری:

لەو بارودۆخ و هۆکارانە دەکۆڵێتەوە کە کار لە دادوەر دەکەن، لە رووی خەملاندنی بەڵگەی تاوان و لێکدانەوەی و بڕیارەکەی.

- دەروونناسی بازرگانی:

گرنگی بە پاڵنەری کڕین و پێویستییەکانی بەکاربەرو خەملاندنی بۆچوونە دەروونییەکانیان دەدات بەرامبەر بەروبوومەکان و دەروونناسی فرۆشتن و شێوەی ڕێکلامکردن و سەرنجراکێشان. ئەم زانستە لە بوارە جیاوەزەکانی ژیانی مرۆڤ گرنگی خۆی هەیە، لەوانەش گرنگی لە بواری پەروەردەو فێرکردن و دەروونندروستی و چارەسەری دەروونی و خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و بەرهەمهێنان، هەروەها لە بواری هێزە چەکدارەکان و چەندین بواری دیکە.

- دەروونناسی تاوانکاری:

بایەخ دەدات بە تاوان و تاوانکاری و دۆزینەوەی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی تاوان

و ڕێگە چارەی گونجاو، لە ئامانجەکانی ئەم زانستە: توێژینەوە لەسەر باری دەروونی تاوانبارو کەسی لاسارو، دۆزینەوەی تاوانباران و گەڕانەوەیان بۆ ناو کۆمەڵگاو خۆ گونجاندنیان. دەروونناسی پێیوایە ڕەفتاری تاوانکاری ڕەنگدانەوەی نەگونجاندنی تاکەکانە لەگەڵ خۆیان و ئەو کۆمەڵگایانەی تیایدا دەژین.

- دەروونناسی سەربازی:

لەو گرفتە دەروونیانە دەکۆڵێتەوە کە تایبەتن بە هێزە چەکدارەکان، وەک گرفتی هەڵبژاردن و ڕاهێنان و پاڵنەرەکان و گیانی ورەو جەنگی دەروونی، لە ئامانجەکانی:

١- دەستنیشانکردن و دانانی سەرباز لە شوێنی ئەوتۆ کە لەگەڵ زیرەکی و تواناو کەسێتیان بگونجێ، ئەمیش پشت بە شارەزایانی دەروونی دەبەستێ.

٢- ئاشکراکردنی باری نائاسایی سەربازان و لاوازی ئەقڵییان و کەموکورتیان، بۆئەوەی ئەگەر یەکێک بۆ شوێنێکی دیاریکراو دەست نەدات، لەو شوێنە دوور بخرێتەوە.

٣- چارەسەرکردن و نەهێشتنی نەخۆشی و گرفتە دەروونییەکانی نێو ڕیزەکانی سوپا، بەمەبەستی بەرزکردنەوەو زیادکردنی گیانی ورەی سەربازانە.

- دەروونناسی پێوانەیی:

پێوانەکردنی پرۆسە دەروونییەکان و توانا ئاوەزییەکان و نیشانەکانی کەسێتی، لەڕێگەی تێست و ئامرازەکان.

- دەروونناسی شەرعی:

تایبەتە بە ڕاوێژکاریکردنی پۆلیس و قەزا بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە گرفتی تاوانباران و کەتنکاران و، پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی دەروونی سەبارەت بە شیاوبوونی تاوانبار لەڕووی دەروونییەوە.

- دەروونناسی کۆمپیوتەریی:

بەکارهێنانی زیرەکی دەستکرد لەڕووی دانانی بنچینەی ئامێری کۆمپیوتەر بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی تارادەیەکی زۆر لە پرۆسەی بیرکردنەوەی مرۆڤ دەچێت.

**دەروونناسیی کۆمەڵایەتی:**

دەروونناسی کۆمەڵایەتی کە لقێکە لە لقەکانی دەروونناسی، بریتییە لە لێکۆڵینەوەی زانستی رەفتاری بوونەوەر وەک بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، لەگەڵ هاوتاکانی لەناو کۆمەڵگە ژیان دەگوزەرێنێ، لەگەڵیاندا کارلێک دەکەن، واتە دەکەوێتە ژێر کاریگەری رەفتاریان و دەکەونە ژێر کاریگەری رەفتارییەوە.

دەروونناسی کۆمەڵایەتی وەک لقێکی گرنگی دەروونناسی، گرنگی بە لێکۆڵینەوەی تاک لەچوارچێوەی کۆمەڵ دەدات، چونکە رەفتاری تاک بەردەوام دەکەوێتە بەر کارتێکردنی ئەو فەزا کۆمەڵایەتیەی تێیدایەتی، مرۆڤیش بەپێی سروشتی دروستبوونی کە لەدایک دەبێت، لەبنەڕەتدا تاکێکی کۆمەڵایەتییەو لەژیانیدا پشت بە دەوروبەر دەبەستێت، کاروبارەکانی کەسانی دیکە دەیکەن، لەژیانیدا بەردەوام لە پەیوەندی و هاموشۆدایە لەگەڵ ئەم و ئەودا.

کەسانی دەوروبەری تاک لەجیاتی وروژێنەرن بۆ وەڵامدانەوەی، ئەویش ئامانجی وەڵامدانەوەکان و میحوەریشیانە، شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵیاندا بڕیار لەسەر جۆری رەفتارو کارو کردەوەکانی دەدات و سروشتی هەست و نەست و جۆرەکانیشی دیاری دەکات.

هەر کاتێک تاک و کۆمەڵ لەئارادا بن و کار لەیەکدی بکەن، دەروونناسی کۆمەڵایەتی گرنگی زۆری لە بوارەکانی ژیانیاندا دەبێ، ئەگەر کارەکانیان پەیوەست بێ بە خزمەتگوزاری گشتییەوە یان بە نەشونمای کۆمەڵایەتی لە خێزان و قوتابخانەو لە هەموو بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن، هەروەها لە بواری پەیوەندییە گشتییەکان و خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و، بواری کارو پیشەسازی و هێزی چەکدارو بوارەکانی میدیا و پڕوپاگەندەو ریکلامکردن و ئاراستەو رێنمایی، هەروەسا لە بوارەکانی سەرکردایەتیکردن و شتی دیکە.

**ئامانجەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی:**

ئەم زانستە لەبەرئەوەی دەچێتە ناو ژیانی مرۆڤەوەو لە حاڵەتە کۆمەڵایەتییەکانی

دەکۆڵێتەوە، هەندێ ئامانجی هەیە، لەوانە:

١- لێکۆڵینەوە لە رەفتاری تاک و کۆمەڵ لە هەڵوێستە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکاندا.

٢- لێکۆڵینـەوە لـە شـێوە جیاوازەکانی کارلێککردنی کۆمەڵایەتـی، وکو کاریگەری لەنێـوان تاکـەکان و نێوان کۆمەڵەکان، لەوانەش نێوان باوک و منداڵەکانی، مامۆسـتاو قوتابیـان، کرێـکارو خاوەنـکار، نێـوان کرێـکاران خۆیـان، هەروەها نێوان پزیشـک و نەخۆش .. هتد.

٣- لـە شـێوەکانی دیکـەی کارلێککردنـی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتـەوە وەک هاوکاری، رکابـەری، خۆشەویسـتی و رک و کینـە، گومـان و دڵپیسـی، هانـدان، دەمارگیـری، سرووشدان و، تۆڵەسەندنەوە، هەروەها ئەنجامی کارلێککردنەکانیش.

٤- بایەخ بە دروسـتبوونی بیروڕاو سـۆزو ئەو باوەڕانە دەدات کە کەسـێتی تاک پێک دەهێنێ.

## گرنگی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی:

دەروونناسی کۆمەڵایەتی گرنگی زانستی و کرداری لەزۆر بوارەکانی ژیان لەهەر کات و شـوێنێک کەتـاک و کۆمەڵـەکان کارلێـک بکـەن هەیـە، ئەمیـش گرنگتریـن ئەو بوارانەیە کە دەروونناسی کۆمەڵایەتی خزمەتگوزاری خۆی پێشکەش دەکات:

- لە بواری پەورەدەو فێرکردن:

قوتابیـان لـە قوتابخانـە لـە گرووپەکانـەوە فێـر دەبـن، هـەر کۆمەڵێک مامۆسـتاو سەرپەرشـتیار یان سـەرکردەی هەیە، کە پێویسـتە لە بەڕێوەبردنی دیموکراسیەت و پەیوەندییە مرۆییەکاندا شارەزاو راهێنراو بێ، دەروونناسی کۆمەڵایەتی بەشداری لە پێدانی زانیاری و خزمەتگوزاری بە مامۆستا دەکات، بۆ پاڵپشتی تێگەیشتنی سەبارەت بە بناغەی گەشەکردنی دەروونی کۆمەڵایەتی.

- لە بواری دەروونتدروستی و چارەسەری دەروونی:

دەروونناسـی، زانستی دەروونتدروسـتی و چارەسەری دەروونی لە دەروونناسـی کۆمەڵایەتییـەوە وەردەگـرێ و زۆریشـی پـێ دەبەخشـێ، لێکۆڵینەوە لـە هۆکارەکانی

نەخۆشـییە دەروونییـەکان و ئـەو رۆڵە روون دەکاتەوە کە هـۆکارە کۆمەڵایەتییەکان دەیبینن، لێکۆڵینەوەش لە نیشـانەکانی نەخۆشـییە دەروونییەکان و مەترسـی نیشـانە کۆمەڵایەتییەکان دەردەخات، تەشخیس کردنیشی پشت بە لێکۆڵینەوە لەبارەی لایەنی کۆمەڵایەتـی و رەفتـاری کۆمەڵایەتـی نەخـۆش دەبەسـتێ، چارەسـەری دەروونیـش چارەسەری دەروونی و چارەسەری بەکۆمەڵ دەگرێتەوە.

- لە بواری خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی:

خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی رێگایەکی زانستییە بۆ خزمەتکردنی مرۆڤ، سیستمێکی کۆمەڵایەتیشە بۆ چارسەرکردنی ئاریشەکانی و گەشەپێدانی تواناکانی و، یارمەتیدانی سیستمە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵ، بۆئەوەی رۆڵی خۆیان ببینن.

- لە بواری بەرهەم:

هـەوڵ و کۆششـی نەتەوەیـی بەشـێوەیەکی فـراوان و بەهێـز روو دەکاتـە کاری پیشەسـازی و بەرزکردنـەوەی ئاسـتی بەرهەمهێنـان و کار، ئەمیـش جگـە لـە لایەنی تەکنۆلۆژیا، پێویستیشی بە گرنگیدانە بە لایەنی مرۆیی لەپیشەسازی و کار.

- لە بواری هێزی چەکدار:

هێزە چەکدارەکان رۆڵی گرنگ لەناو کۆمەڵگا دەگێڕێ، کە ئەرکی پاراسـتنی وڵات و بنیاتنانی کۆمەڵگا لەئەستۆ دەگرێ، دەروونناسی کۆمەڵایەتیش بایەخێکی زۆری لە بـواری سـەربازیدا هەیە، لەبەدواداچوونـی لەبارەی بنەماکانی رەفتـارو کارلێککردنی کۆمەڵایەتی نێوان تاک و گرووپەکان و یەکە سەربازییەکان لەکاتی ئاشتی و جەنگدا، هەروەسا لە پرۆسەکانی فێربوونی هەڵویستەکانی مەشق و راهێناندا.

- لە بواری میدیاو پەیوەندییە گشتییەکان:

میدیـاو پەیوەندییـە گشـتییەکان و پڕوپاگەنـدەو توێژینەوەی رای گشـتی، رۆڵێکی گـەورە لـە کارتێکـردن لـە رەفتـاری تـاک و کۆمـەڵ دەگێـڕن، ئەگـەر باشـیش بەکار بهێنرێن ئەوا دەکرێ هۆکاری گرنگ بن لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی. لێرەدا پێویسـتمان بە هۆشـیارکردنەوەی جەماوەرە، بۆئەوەی فەلسـەفەی کاری نیشتمانی لە هەموو بوارەکان بەشـێوەیەکی زانسـتی بگاتە هەموو کارمەندانی نیشتمان، لەبەرئەوە

پێویستە میدیاکاران گرنگی بە روونی هزرێک بدەن کە لەسەر بناغەی زانستی وەستابێ.

دەکرێ ئامرازەکانی میدیا تا ئەوپەڕی گرنگی بە دەروونناسی کۆمەڵایەتی بدەن، لە پاڵپشتیکردنی هۆشیاری هاوڵاتیان سەبارەت بە بەرپرسیاریێتی کۆمەڵایەتی سەرشانیان، هەروەسا بەستنەوەی تاکی مرۆڤ بە کۆششی رۆژانەی بە هەموو بزاڤی کۆمەڵەوە، دروستکردنی بۆچوونی ساغڵەم و راستکردنەوەی ئەوەی پێویستە راست بکرێتەوە لە بۆچوونەکانیان، بە بەکارهێنانی گونجاوترین رێگەی زانستی لە پڕوپاگەندەو گفتوگۆو بڕیارگەلی بەکۆمەڵ.

پسپۆری پەیوەندییە گشتییەکان کە بۆ بەرزکردنەوەی گیانی ورەبەرزی نێوان کارمەندان کار دەکات، هەروەسا بۆ ئەوە کار دەکات هەست بە بەرپرسیارێتی بکەن پێش جەماوەرو زەبوونەکانی، پێویستە تێگەیشتنی لە سروشتی گرووپەکان و بۆچوونەکانیان هەبێت، واتە رای گشتی و ئەو هۆکارانەی بەشداری دەکەن لە دروستکردنی و رێگاکانی پێوانەکردنی و کارتێکردنی.

سەرەرای ئەوەی باسمان کرد، پێشکەشکردنی بابەتی میدیایی پێویستی بە لێکۆڵینەوەی پسپۆریانەو شارەزایی هەمەلایەنە سەبارەت بە چەندین بابەتی گرنگ هەیە، وەکو:

- ئامرازەکانی میدیاو پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بایەخی لە پرۆسەی نەشونماکردنی کۆمەڵایەتی.
- پڕوپاگەندەو بناغەو پرەنسیب و کاریگەرێتی و ئەو ساتە دەروونناسییانەی بۆی گونجاون.
- هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان کە تاک لەچوارچێوەیدا کار دەکات.
- توێژینەوەی جەماوەرو کۆمەڵی رای گشتی.
- توێژینەوەی تاک و کۆمەڵەکان و چۆنێتی کارتێکردنیان.
- ئامرازو شێوازی گونجاو بۆ کارتێکردن لەتاک و کۆمەڵەکان.
- شێوازەکانی راپرسی و رووپێوکردن و توێژینەوەی رای گشتی.

- پروپاگەندەو دەنگۆو شتی دیکەی ئامرازەکانی جەنگی دەروونی.
- پەیوەندی گشتی و رۆڵی زیندووی لە پرۆسەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی (الاتصال الاجتماعی).
- رای گشتی و بنەماو سروشت و هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی و پێکهاتن و پێوانەکردن و پرەنسیبەکانی قەناعەتپێکردنی کۆمەڵایەتی و بیردۆزی دیموکراسی بۆ رای گشتی.

**میدیا:**

وشەی میدیا لە زمانی لاتیندا بە مانای ناوەڕست وەرگیراوە، بەو واتایەی میدیا رۆڵی پردێک لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر دەگێڕیت. ئەم وشەیە لە زمانی کوردیدا بەرامبەر (اعلام)ی عەرەبی و (press)ی ئینگلیزی بەکارهاتووە.

میدیا وا دەناسێنرێت کە "پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری و دووبارە رەوانەکردنەویەتی بۆ جەماوەر». یان "دەربڕینی عەقڵییەتی جەماوەرە». هەروەها "پرۆسەی بەرهەمهێنانی زانین و زانیارییە و پەخشکردنێتی بۆ جەماوەر». پێناسەی تریشی هەیە کە «بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕو هەواڵ لە ناو خەڵکدا لە رێگەی چەند کەناڵێکەوە بۆ لێ حاڵی بوون و قەناعەت پێهێنان و راکێشانی لایەنگری».

(چالز رایت) پێیوایە "میدیا ئەو پرۆسەیەیە بەهۆیەوە مانایەک لە ماناکان لە نێو تاکەکاندا دەگوازێتەوە. زانای ئەڵمانی (ئۆتۆ گرۆس) میدیا وا دەناسێنێ کە "دەربڕینێکی بابەتیانەیە کە عەقلی مرۆڤ بە بەردەنگ دانێ لەکاتێکی دیاریکراودا، بە دانی زانیاری."

لێرەدا چەمکی میدیا دوو پرۆسە دیاری دەکات کە هەردووکیان تەواو کەری یەکترن. لە لایەک پرۆسەی گەیشتن بە زانیاری، لەلایەکیتر گەیاندنی ئەو زانیارییانە بە جەماوەر، ئەم زانیارییانەش ناتوانرێت بگەیەنرێت، تەنیا بە هۆی هۆیەکانی میدیا یاخود کەرەستەکانی میدیا Mass-media ەوە نەبێ، کە ئەوانیش کۆمەڵێک ئامرازن وەک: رۆژنامە، رادیۆ، تەلەفزیۆن...هتد، ئەو زانیارییانە لە ماوەیەکی کورت و خێراییەکی زۆر لە رێگەی ئەم کەناڵانەوە بە جەماوەر دەگەیەنرێن.

چەندین پێناسەی میدیا هەیە بە گوێرەی زۆربوونی ئەزموونی ئەو کەسانەی لەو ناوەندە کار دەکەن، دەکرێ سێ ئاراستە بۆ ئەم پێناسانە دیاری بکرێت:

ئاراستەی یەکەم: ئەو پێناسانەی جەخت لە میکانیزمی نێرەرو وەرگرتنی پەیام دەکات. یاخود ئەوانەی ناوزەند دەکرێن وەک ئاگادارکەرەوەو ولامدانەوە، گرنگترین و دیارترین پێناسە پێناسەکەی فەرهەنگی ئۆکسفۆردە کە دەڵێت "میدیا بریتییە لە گواستنەوەو گەیاندنی زانیاری بۆ بەدەست هێنانی وەلام دانەوە". (دان نیمۆ) میدیا بەم جۆرە پێناسە دەکات «میدیا بریتییە لە گواستنەوەی زانیاری بۆ بەدەست هێنانی وەلامدانەوە». (ویلی و رایس) دەڵێ «بریتییە لە گۆڕینەوەو ئاڵوگۆڕکردنی هێماو واتاکانە لە نێوان ئەندامان».

ئاراستەی دووەم: ئەو پێناسانەی جەخت لەسەر لایەنی کۆمەلایەتی لە میدیا دەکات، چونکە کاریگەری کۆمەلایەتی ئەنجام دەدات، (جۆرج لندبرج) دەڵێ «میدیا بریتیە لەو کاریگەرییەی بە هۆی هێماو نیشانەکان ئەنجام دەدرێ». (ویلبرت شرام) دەڵێ «میدیا بریتیە لە بەشداری کردن لە زانیاری بە رێگای بەکارهێنانی کۆمەڵێک هێمای بارکراو بە زانیاری». (چارلز کولی) پێیوایە «میدیا ئەو میکانیزمە دەگەیێنێت کە بە هۆیەوە بوونی پەیوەندی کۆمەلایەتی مرۆڤانە گەشەو پەرە پێ دەدات». (د. محمد عبدالحمید) دەڵێ «میدیا پرۆسەیەکی کۆمەلایەتییە بە هۆیەوە ئەتوانرێ ئاڵوگۆڕی زانیاری و بیروڕاو بیرۆکە لە ناو کۆدیاردەکان، لەنێوان ئەندامان یان کۆمەڵ لەناو کۆمەلگاو لە نێوان شارستانییەتی جیاواز بۆ گەیشتن بە ئامانجی دیاری کراو».

ئاراستەی سێیەم: ئەو پێناسانەی جەخت لەسەر کاریگەری دەروونناسی لەسەر میدیا دەکات. گوایە میدیا هاوبەشە لە کاریگەری لەسەر ئاراستە و بیرو راو رەوشتی کەسانیتر، (کارل هوفلاند) دەڵێ «میدیا پرۆسەیەکە بەهۆیەوە کەسێک ئاگادارییەک دەنێرێت بۆئەوەی رەوشتی کەسێکیتر راست بکاتەوە».

لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازی نوێ و بەرهەمهێنانی ئەو ئامرازانەی کاریگەریان خێرایە وەکو: رۆژنامەنووسی، رادیۆ، تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت، ناوێکی سەربەخۆو ئەرکێکی تایبەتی وەرگرتووە. میدیا پرۆسەیەکی دوو جەمسەری دوو لایەنەیە،

لــە لایــەک پرۆســەی گەیشــتن بــە زانیــاری، لەلایەکیتر گەیاندنــی ئــەو زانیاریانەیە بە جەمــاوەر. ئــەو زانیاریانەش لە ڕێگەی ئامرازگەلێکــەوە دەلوێن، پێیان دەوترێ (ماس میدیــا) واتــا میدیای جەماوەری. گەیاندنی ئەم زانیاریانە پەیوەســتە بە کات و شــوێن کە بەپێی دەورە مێژووییەکان دەگۆڕدرێ. لە ســەردەمێکدا ســوارچاکەکان پەیامیان لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکیتر دەگواســتەوە، ســەردەمێک کۆترە نامەبەرەکان ئەم ئەرکەیان لە ئەستۆ بوو، ئێستاش شەپۆلەکان پەیامەکان دەگەیەنن.

زاراوەی میدیــا تەنهــا مانــای زمانەوانی نییە، کە تەنهــا هەواڵپێدان و پێ ڕاگەیاندن بێ بەشــێوەیەکی خێرا، بەڵکو ئەوەشــی تێپەڕاندووە بەرەو مانایەک کە لەگەڵ ئەرکە نوێیەکــەی بگونجــێ، ئەویش گوزارشــتکردنە لە مەیل و بۆچــوون و بەهاکانی خەڵک، دەتوانیــن وا پێناســەی بکەیــن، «بڵاوکردنــەوەی زانیاری و هەواڵ و هــزرو بیروڕای نێــوان خەڵکــە، بەو شــێوەیە کە گوزارشــت لــە مەیــل و بۆچــوون و بەهاکانیان بکات بەمەبەستی کارتێکردنیان».

ئەگەر ئەو پێناسەیە تەرکیزی کردبێتە سەر ناوەڕۆک بەبێ ئامرازەکان، لەبەرئەوەی ناوەڕۆکەکە گوزارشت لە کەسێتی میدیا دەکات، ئەوا ئامرازەکانی ڕۆژنامەنووسی و نووســین و ڕادیۆو تەلەفزیۆن و شــتی لەو بابەتە بریتین لە کەناڵگەلێک، کە ناوەڕۆک بــەولاوە هیچــی دیکەی پێدا گوزەر ناکات، ئەگەر بەباشــی بەکارهێنرا ئــەوا ئەنجامی بــاش بەدەســت دێنێــت، ئەگەر خراپیش بەکارهێنــرا ئەوا ئەنجامی خراپــی دەبێت، ئەو کەناڵە هیچ گوناهێکی نییەو ئەنجامیش دەکەوێتە ســەر ئەو کەســەی بەکاری دەهێنێ. بەوپێیەش دەتوانین وا پێناسەی بکەین کە بریتییە لە «ئامرازگەلێکی دەستکرد لەیەک کاتدا یان قۆناغ بەقۆناغ ناوەڕۆک بۆ کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر دەگوازێتەوە».

بریتیشــە لە پرۆســەی بڵاوکردنەوەو پێشکەشــکردنی زانیاری ڕۆژنامەنووســی و ڕاســتیگەلێکی ڕوون و، هەواڵــی ڕاســت و بابەتــی وردو ڕووداوگەلێکــی دیاریکــراوو هزرگەلێکــی لۆژیکــی و، بیروڕایــەک بگەڕێتــەوە بۆخودی جەماوەر لەگــەڵ ناوهێنانی سەرچاوەکەی، بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندی گشتی.

میدیــا ئــاوەزی جەماوەرو ســۆزە باڵاکانی دەدوێنێ و، پشــت بــە گفتوگۆی هزرو

دیالـۆگ و قەناعەتپێکـردن دەبەسـتێ و ڕەچەیەکی دیموکراسـیانە دەگرێتەبەر، بەپێی ئەو بنەمایانە دەبێ پرۆسەی میدیایی بەئەمانەت و بابەتیانە بناسرێتەوە.

میدیـا ئامانجـی گەشـەو رابـوون و گونجاندنـی کلتـووری و شارسـتانییە، بـە ڕووناککردنـەوەو ڕۆشـنبیرکردنی گەشـە بە ڕای گشـتی دەدات. میدیـا لە کۆمەڵگەی نوێـدا گرنگـە چونکە گۆڕانی مەدەنییەت و پێشـکەوتنی زانسـتی و تەکنۆلۆژیای خێرا لەم کۆمەڵگەیە ڕۆڵی میدیاو پێویسـتی ئاگادارکردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ سـەبارەت بـە ڕووداو و پەرەسـەندنەکانی دەوروبـەری دەردەخات، لەگـەڵ زۆربوونی ژمارەی خەڵکیـش پەیوەندیکردنـی ڕاسـتەوخۆ بەسـەرچاوەکانی میدیـاوە کـە ڕۆڵ و ئەرکی خۆی دەبینێ بۆتە کارێکی سانا.

هەروەهـا زۆربوونـی زانیـاری و سـەرچاوەکانی و ئاڵۆزبوونی ژیانی سیاسـی و ئابـووری و کۆمەڵایەتـی و کەمـی کاتـی تاکەکان بۆ بەسـەرکردنەوەو گەڕان بەدوای زانیـاری لـە کۆمەڵگـەی نوێـدا، وایکـردووە ئەرکی تێگەیشـتن لە گرفتـەکان و زانینی ڕاستیەکان و هەواڵ و زانیاری کارێکی قورس بێت، بۆیە ڕۆڵی میدیای ئازادو شەفاف کە یارمەتیدەرە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو قورسییەدا ڕۆژ بەڕۆژ مەزنتر دەبێت.

میدیا ڕۆڵێکی گرنگ لە پرۆسەی نەشونماکردن و ئاساییکردنەوەی کۆمەڵایەتی و گەشەی کۆمەڵایەتی تاک بەشێوەیەکی گشتی دەگێڕێ، ئامرازەکانی میدیا بەشداری لە یەکێتـی ڕۆشـنبیریی و کۆمەڵایەتی و لێـک نزیککردنەوەی نێوان چینەکانی کۆمەڵگەی نوێ دەکات، هەروەها بەشـداری لە گواسـتنەوەی ڕۆشـنبیری نێوان نەوەکان دەکات، ئامـرازە نوێیەکانـی میدیـا ڕۆژهەڵاتـی زەوی و ڕۆژئاواو باکورو باشـوری لێک نزیک کـردەوە، وایکـرد هەر بەشـێکی جیهان هەسـت و ئـاگای لە ڕووداوی بەشـەکەی دی بێـت و کاردانەوەی بەرامبـەری هەبێت، ئەمەش ناکرێ لەرێگەی ئامرازەکانی میدیاوە نەبێت.

ئەگەر سـەدەی بیسـت و یەک بە سـەدەی میدیا ناوزەد کرابێت، نابێ ئەوەمان بیر بچێت کە بۆ ماوەی زیاتر لە سـەدەو نیوێک باری قورسـی ئەم مێژووە لە ئەسـتۆی میدیا بووە. داهێنانی ماشێنی چاپ جیا لەوەی توانی کتێب بخاتە بەر دەستی مرۆڤ،

کارێکی گەورەتری کرد ئەویش بە جیهانی کردنی هەواڵ و زانیاری بوو لە ڕێگەی میدیاکانەوە. سەرەڕای گەیاندنی زانیاری، ئەرکی هەرە گرنگی میدیاکان، دەربڕینی فکرو بۆچونی نوێ و پەرە پێدانی بیرو هزری بزوتنەوە نوێیەکان بووە.

هەروەها ڕوانینی ڕەخنەگرانەی میدیا لە بارەی ڕووداوو بابەت و ئاریشە کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییەکان بە شێوەیەکی گشتی توانیویەتی ئاراستەی ڕووداوەکان بگۆڕێ. بە شێوەیەک نوسەرو ڕەخنەگران میدیایان بە «ویژدانی نەخەوتووی کۆمەڵگا» ناساندووە.

چەندین بەڵگەش سەبارەت بە بوونی زانستی میدیا هەن، کە بریتین لە:

١- میتۆدی تاقیکردنەوە لە توێژینەوەکانی میدیا بەکارهاتووە، ئەمەش خەسڵەتی زانستی پێ دەبەخشێت، سەرەڕای ئەوەی میتۆدی دیکەشی بەکارهێنا، وەک میتۆدی ڕووپێو، میتۆدی شیکاری و میتۆدی بەراوردکاری.

٢- پێکهاتەگەلی میتۆدی بۆ زانستی میدیا هەن، کە خۆی لە نموونە و تیۆرە زانستییەکاندا دەبینێتەوە. بایەخدان بەم زانستەش دوای ئەوە بوو کە تێبینی کاریگەری ئامرازەکانی میدیا لە کۆمەڵگەدا کرا، یەکەمین تیۆرەکانی میدیایش کە پەیدابوو بەناوی تیۆری کاریگەری ڕاستەوخۆ یان تیۆری (فیشەکی جادوویی) لەساڵی ١٩٣٩ بوو، لەدوای ئەوە چەندین تیۆری دیکە پەیدابوون وەک: تیۆری کاریگەری دیاریکراو، تیۆری کاریگەری هاوسەنگ، تیۆری پاسەوانی دەرگا، تیۆری پشتپێ بەستن، تیۆری چاندنی کلتووری، هەروەها تیۆری بەکارهێنان و تێرکردنەکان.

**بوارەکانی میدیا:**

میدیا بە چەندین بواری گرنگەوە بەستراوەتەوە، کە دەبنە لقێک لێی و بەو شێوەیەی ئێستای بەشدارن لە دەرهێنانی، گرنگترینیان ئەمانەن:

**١- پەیوەندییە گشتییەکان:**

میدیا یەکێکە لە ئامرازەکانی بەدیهێنانی بەرنامەی پەیوەندییە گشتییەکان، میدیا لە پەیوەندییە گشتییە دروستەکاندا کە باوەڕی بە بەرپرسیارێتی هەیە، هەر دەبێ گرنگی

به دەرخستنی سیاسەتی قوڵبوونەوەو بنیاتنان و جدیتی و، ئاڵوگۆڕی زانیاری گرنگ و بەسوودو بڵاوکردنەوەی زانیاری دەوڵەمەندو خۆسازینی کۆمەڵایەتی بدات.

میدیای ناوخۆیی لە بواری پەیوەندییە گشتییەکاندا رۆڵێکی کارا لە پێشکەشکردنی هەواڵ و زانیاری بۆ کارمەندان لە دامەزراوەکە، یان بۆ قوتابیانی زانکۆ یان قوتابخانە یان بۆ پزیشکانی نەخۆشخانەو کارمەندانی دەبینێ، بۆ ئەوەش هەموو ئامرازەکانی میدیا بەکاردەهێنرێ. هەروەها میدیای دەرەکی لە بواری پەیوەندییە گشتییەکان هەواڵ و زانیاری وردو راست بۆ جەماوەری دامەزراوی بەکاربەران و بەشداران و هاوردەکاران و دابەشکاران، یان جەماوەری ناوخۆیی یان جەماوەری گشتی لەرێگەی ئامرازە جیاوازەکانی میدیاوە بڵاو دەکاتەوە.

**٢- رێکلام:**

هۆیەکانی رێکلام (الاعلان) ئەو ئامرازەیە کە بەهۆیەوە پەیامی رێکلامەکە دەگەیەنرێ، لەکاتێکدا رێکلام بڵاوکردنەوەی زانیارییە، یان داتای کاڵا یان خزمەتگوزارییەکانە، یاخود هزر لە هۆیەکانی رێکلام جیاوازە بۆ دۆزینەوەی دۆخێک لە رەزامەندی دەروونی بۆ جەماوەر، بەمەبەستی فرۆشتنی یان یارمەتیدانی فرۆشتنی یان پەسندکردنی یان رەواجکردنی، بەرامبەر پێدانی شتێک.

رێکلام لە بواری پەیوەندییە گشتییەکاندا بەتایبەتی پێشکەوتنی بەخۆوە بینی تەنها لە ئامرازێک بۆ زیادکردنی بەرهەم و دابەشکردن بۆ میدیا، سەبارەت بەکاری دامەزراوەیەکی کۆمەڵ و ئەو رۆڵەی لەناو شارستانیەتدا دەیبینێ، ئەویش بەمەبەستی راکێشانی رای گشتی. بەوپێیە رێکلامکردن بۆ فەرمانێکی گرنگ بووە هۆکارێکی پەیوەندییە گشتییەکان، لەپێناو بازارکردن و رەواجکردنی بەروبووم، هەروەها لەپێناو میدیاو شرۆڤەکردنی تێڕوانینی دامەزراوەکە و شیکردنەوەی سیاستەکانی و میدیای، بەو شێوەیەش بووە رێکلامێکی میدیایی.

**٣- پڕوپاگەندە:**

دەروونناسی وا دەڕوانێتە پڕوپاگەندە (الدعایة) کە هەوڵێکە بۆ کارتێکردنە سەر بۆچوونی تاکەکان و بیروڕایان، پاشان رەفتاریان بەو ئاراستەیە کە ئەو کەسە

پڕوپاگەندەی بۆ دەکات، ئەمیش لە ڕێگەی سروش (ایحاء)ەوە ڕوودەدات، زێتر لەوەی لەڕێگەی ڕاستییەکان و لۆژیکەوە ڕووبدات.

پڕوپاگەندە ڕاستیگەلێکی ڕووت پێشکەش دەکات، کە هەندێکیان خۆشن و هەندێکیان ناخۆش، میدیاکار مەبەستێکی دیاریکراوی نییە بۆ جەماوەر بڵاوی بکاتەوە تەنها پڕوپاگەندە نەبێت لەخودی خۆیدا، ئەو هزرانەی میدیاکار دەیگوازێتەوە بابەتیانەیە یان دەبێ بابەتیانە بێت. ئەو کەسەی پڕوپاگەندە دەکات ڕاستییەکی ڕووت بەکاردەهێنێ، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەیقۆزێتەوە بۆ لایەنگیریکردنی تێڕوانینی خۆی و ئەو پرسەی مامەڵەی لەگەڵ دەکات، ئەم کەسە ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە ئەویش ڕەواجکردنی بیرۆکەکەی یان ڕێبازەکەیەتی، لەگەڵ قۆرغکردنی هزری تاک و کۆمەڵەکان و هاندانیان بەرەو ڕەفتارێکی دیاریکراو.

پڕوپاگەندە بە هەموو شێوە جیاوازەکانی لەسەر ئاستی جیهان گرنگییەکی زۆر پێ دەدرێت، بەش و دامەزراوەی زۆر لە بواری پڕوپاگەندە دەکرێنەوە، هەروەها چەندین کۆلێژو پەیمانگای ئەکادیمی بۆ ئەم مەبەستە دامەزراوە، چەندین ناوەندیش هەن بۆ پێگەیاندنی کادر لەم بوارەو بۆ کارکردن ئامادە دەکرێن.

**بایەخی میدیا:**

مرۆڤ بەشێوەیەکی هەرەمەکی لە دێر زەمانەوە ئامرازێکی میدیایی بەکارهێناوە، زمانیش یەکەم ئامرازی میدیا بووە لە هەواڵ و وێناندن و لێکگەیشتن و ڕازیکردن لەڕێگەی وتارو پەخشان و چیرۆک و کتێبەوە، ئەمڕۆش میدیا لە ئامرازە تەکنیکیە پێشکەوتووەکاندا خۆی دەبینێتەوە، کە خێرایی و کاریگەریی لە ڕێگەی تەلەڤزیۆن و کۆمپیوتەرو مانگە دەستکردەکان و ئاژانسەکانی هەوال و، چاپخانەکان و خانەکانی بڵاوکردنەوەو دابەشکردن و ڕێکلامکردن بەشێوەی ڕەش و سپی و ڕەنگاو ڕەنگی قسەکەرو جوڵاوەوە پتر کردووە، بایەخەکانیشی لەم ڕووانەوەیە:

١- ئاراستەکردنی مەیل و هەستەکان و گەشەپێدانی تواناو بەهرەکانی تاک.

٢- ئامادەکردنی گیان و عەقڵ و چێکردنی جەستە بەتایبەتی ئەگەر هەڵسوڕێنەرانی

میدیا شــارەزاو پســپۆر بن لە ئاراستەکردندا سەبارەت بە دەروونناسی و پەروەردەو میدیــاو لێهاتووبن لە بەکارهێنانی ئامرازەکانــی میدیاو جڵەوکردنی پلەی کاریگەرێتی، چونکــە مــرۆڤ لــە تێڕوانینــی میدیاوە بە هــەواڵ دەژی و بە هزر گەشــە دەکات و بە زانیاری ئاسوودە دەبێ، ئەمیش گرنگی میدیا لە پێکهێنانی مرۆڤ و داڕشتنی کەسێتی و ئامادەکردنی لایەنەکانی بەشێوەیەکی دروست دەردەخات.

٣- سیمبولی بەشارستانیبوون و پێشکەوتنە بە پێوەری نەتەوەو کۆمەڵگاکان.

٤- دەرخستنی پرەنسیب و بەهاو دەسکەوتەکانی دەوڵەتە.

٥- ئامرازێکی زیندووی دەوڵەتە بۆ ئاراســتەکردنی گەل لەپێناو گەیشــتن بەئاوات و ئامانجەکانی.

٦- ئامرازێکــی دەوڵەتــە بــۆ بونیاتنانــی شارســتانیەتەکەی و پەروەردەکردنــی نەوەکانی داهاتووی بەو پێیە.

٧- بە جیاوازی ڕیگاو ئامرازەکانیەوە پرۆسەیەکی گرنگ پەیڕەو دەکات لە ژیانی نەتەوەو شارســتانی گەلاندا، هیچ تاک و کۆمەڵ و دەوڵەتێک لە کاریگەرییە ئەرێنی و نەرێنییەکانی رزگاری نابێ.

٨- بــۆ دووپاتکردنــەوەی ناســنامەی نەتەوەیــی و نیشــتمانی، بەدڵنیاییەوە هەموو نەتەوەیــەک پرەنســیب و بەهــاو چەمکــی تایبەتــی خــۆی هەیــە، کــە رووی دەرەوەی کەســێتی دەنوێنــێ، گوزارشــت لــە تێڕوانینــی بــۆ ژیــان دەکات، لە وێناندنــی بۆ ژیان سەرچاوە هەڵدەگرێ، لەبەرئەوە سوور دەبێ لە بەردەوامی و پاراستن و بەرگریکردن لێی لە بەسەرهاتەکانی زەمەن و ململانێی ئایدیاکان.

٩- میدیــا ئاوێنــەی هەر نەتەوەیەکە، ئامرازێکیشــە بۆ بڵاوکردنەوەی پرەنســیب و بەهاو چەمکەکانی و بڵاوکرنەوەی کەلتورو بەهاکانی و، هیچ کەلتورێکیش پاشەکشەی نەکــردووەو پەراویــز نەکراوە بــە لاوازی ئامرازەکانی میدیاو کەمی میدیاکارانی و بێ هیمەتییان نەبێت.

١٠- میدیا ئامرازێکی سەرکەوتووە بۆ گواستنەوەی بەهاو پرەنسیب و چەمکەکان بــۆ کەســانی دی، هەروەهــا داڕشــتنی کۆمــەڵ لەســەری و نەشــونماکردنی منــداڵ و

دووپاتکردنەوەی.

میدیا بە درێژایی مێژوو بە هەردوو لایەنی چاک و خراپ رۆڵی بینیوە، کەم تا زۆرو لێرە و لەوێ و بە ئاست و پلەی جیاوازیش توانیویەتی خزمەت بە دیوی باش و خراپدا بکات. میدیا بەشێوەیەکی سەرەکی بەشدارە لە گەشەپێدانی شێوازەکانی بیرکردنەوەی تاک و کۆمەڵەکان و بەردەوام بونیاتی نوێ دروست دەکات، واتە بەپێی رێکخستن و دینامیکییەتی پێشکەوتوو بەبەردەوام پێشکەوتن دێنێتە کایەوە، بەڵام تەنیا رێکخستن و گوێ پێ نەدراو بە کاروبارە تەریبەکانی توانامەند بە گۆڕانی ئاراستەی پێشکەوتنی گشتی نییە و، بەتایبەتی سیاسەت و ئابووری و ئایدۆلۆژیاو بەهاکان و، ئەوەی نوێنەرانی ئەو زانست و بابەخە جیاوازانە لەسەری کۆکن ئەوەیە، میدیا رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ و هیچ کام لەو زانستانە ناتوانن بە تەنیا رۆڵی میدیا فەرامۆش بکەن، یان لە کاریگەرییە راستەوخۆکەی بۆ وێنەکێشانی رێکخستنی گۆڕان و پێشکەوتنی کەم بکاتەوە.

شۆڕشی تەکنیکی لە میدیادا بۆ حاڵەتێکی نوێی بێ وێنە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دامەزرا، وای کرد پێشبینی کردن لە شێوەی گەشەپێدانی پەیوەندییەکان و کاریگەرییەکانی پرسێکی ئاڵۆزەو ناکرێ قەتیس بکرێ.

چیتر میدیا لە چوارچێوەی هێزی پەخش یان وەرگرتن کورت نابێتەوە، بەڵکو بۆتە پرۆسەیەکی گشتگیر پەیوەندی بەزۆر لە پسپۆرێتییەکانەوە هەیە، بەجۆرێک دەکرێ لەگەڵیدا قسە لەبارەی گۆرانکاریە سۆسیۆ - تەکنیکییەکان بکەین کە لەگەڵیدا رۆڵی دامەزراوە پیشەسازییە گەورەکان بە روونی دەستپێکرد. کاری میدیایی، سروشتی خۆی و شوێنی راپەراندنی و شێوەی بڵاوبوونەوەی خۆی گۆڕیوە. میدیا بۆتە هاوکێشەی بابەتی بۆ بەردەوامێتی بونیاتی شارستانێتی پێشکەوتووی مرۆڤایەتی.

میدیا بۆتە فاکتەری سەرەکی نەک تەنیا لە پێکهێنانی پەیوەندییەکان بەڵکو لە شێوازەکانی رەفتارو سەلیقەشدا، تا وای لێهات لێپرسین لە (فشار) بە هۆکارەکانی میدیا پرسێکە پێویست بە راوەستان لەبارەیەوەو خستنەرووی کاریگەرییەکانی دەکات.

بەهۆی شۆڕشی تەکنەلۆژیاو پێشکەوتنی ئامرازەکانی و داهێنانی زانستی و نەمانی هیچ لەمپەرێک لە بەردەمیدا و گرنگیەکەی وای کردووە ببێتە توخمێک لە بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان لەگەڵ سیستەمەکانی تر کاری خۆی دەکات، ڕۆڵی خۆی دەگێرێ و بۆتە پێوەرێکی ئاستی پێشکەوتن و جیاکردنەوەی کۆمەڵگەی پیشەسازی لە کۆمەڵگەی کشتوکاڵی، ئەویش لەبەرئەوەی لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان میدیا سەرکەوتوبوون لەوەی کە توانی تاکەکانی کۆمەڵگە ئاراستە بکات بەرەو بیرکردنەوەی عەقڵانی بۆ بەرەو پێش بردنی شێوازی ژیانیان، تەنانەت ئەمرۆ لە کۆمەڵگە تازە پێشکەوتووەکانیش بۆتە بەشێکی گرنگ لە ژیانی هەمەلایەنەی کۆمەڵگە، کە ناتوانرێ لێی دابرێت. لە هەر کۆمەڵگەیەکیشدا میدیا کاریگەرە بە پێشکەوتنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسی و ئایدیای کۆمەڵگەوە.

گرنگترین وەرچەرخان لە مێژووی بایەخ و گرنگی و فەلسەفەی میدیاو کەناڵەکانی میدیا لەوێدایە، کە ئیدی ئەوە میدیاو هۆکارو شێوازەکانیەتی، (وەرگر)ەکان و کایەکانی کۆمەڵگا ئاراستە دەکات، نەک پێچەوانەکەی. میدیا هێزێکی کاریگەرو کارتێکراوە، بۆیە گرنگی و کاریگەرییەکەشی لەسەر کۆمەڵگاو ئاراستەکردنی، بە هەردوو دیوی ئەرێنی و نەرێنی هەیە.

گرنگی میدیا لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان وای کردووە ببێتە دەسەڵاتی چوارەم شان بەشانی سێ دەسەڵاتەکەیترو چاودێرێکە بەسەر هەموو دام و دەزگاکانی دەوڵەت ئەو هێزەشی، کە هەیەتی لە راستگۆیی و بڵاوکردنەوەی زانیاری بە شێوەیەکی راست و دروستەوە وەریگرتووە، هەرچەندە لە کۆمەڵگە تازەپێگەیشتووەکان نەیتوانیوە بەتەواوی ببێتە دەسەڵاتی چوارەم لەبەر چەندین هۆکاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی.

لە کۆتایی ئەم سەدەیەشدا، میدیا گرنگییەکەی بە چەند جار زیادی کردووە، ئەمرۆ ئاراستەی کۆمەڵگای پێ دەکرێت، لێرەشەوە هەڵەی ئەو بیردۆزە دەردەکەوێت، کە دەڵێ: (وەرگر ڕێبازی سەرچاوەی میدیا دیاری دەکات و ئاراستەی دەکات)، بەپێچەوانەوە میدیا ئاراستەی وەرگر دەستنیشان دەکات.

**ئەرکەکانی میدیا:**

ئەمڕۆ لەسەر ئاستی جیهاندا میدیا بە کەناڵی هەرە گرنگ دادەنرێ لە فراوانکردنی مەودای فکری تاکەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیرییان، بەتایبەت بینین و بیستن، وەک دوو جۆری میدیا بەبێ پرس خۆیان دەکەن بە سەرجەم ماڵانداو، ناچارمان دەکەن سەیر بکەین و گوێ بگرین، تەنانەت لە زۆر لە گوندەکانیشدا ئەم ئامێرانە تێکەڵ بە ژیانمان بوون و ئێمە بە دەوروبەرو دەرەوەی خۆمان دەبەستنەوەو کاریگەری خۆیان لەسەر زهن و شێوازی بیرکردنەوەمان لە رێگەی بەرنامە تایبەت و گشتییەکانیانەوە جێ هێشتووە، لەم گۆشە نیگایەوە دەکرێ پێداگری لەسەر ئەوە بکەین، کە میدیا بە چەشنە جیاوازەکانییەوە دەتوانێ لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری کۆمەڵایەتیدا رۆڵی کاریگەر بگێڕێ.

میدیا بەوەی چالاکییەکی تاکە کەسی و کۆمەڵ و جەماوەریشە و بەشداریکردن لە بیرو بۆچوون و خستنەڕووی راستی و راگەیاندراوەکان دەگرێتەوە، پسپۆڕو شارەزایانی بواری میدیا، هەریەکە و بە پێی روانینی خۆیان بۆ ئامرازەکانی میدیا، کۆمەڵێک ئەرکیان بۆ دەستنیشان کردووە، وێرای جیاوازی لە روانگەکاندا، دەتوانین خاڵی هاوبەشیش بدۆزینەوە، میدیا کە بە شادەماری هەموو ئامرازەکان یان هۆکارەکانی ژیان دادەنرێ، دەتوانین ئەرکە سەرەکییەکانی بەم جۆرە بخەینە ڕوو:

**١- کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری:**

بریتییە لە کۆکردنەوەو پاشەکەوتکردن و چارەسەرو بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و راگەیاندراوو وێنە و بیروڕاکان، لە پێناو تێگەیشتنی ژینگەی دەوروبەرو هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن تیایدا، بە شێوەیەکی زاستی و کارامەیی و لێهاتوویی.

لە سەردەمی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی ئامرازەکانی میدیا لە کێبرکێدان بۆ گواستنەوەی رووداو بە خێرایی بۆ جەماوەر، بەمەبەستی هاوبەشی کردن لەگەڵ ئامرازەکانی میدیاو دەستەبەرکردنی وەرگرتنی پەیامەکانی، ئەرکەکانی میدیای هەواڵی خۆی لە سێ تەوەردا دەگرێتەوە:

أ. زانیاری کۆکردنەوە: دەزگاکانی میدیا زانیاری لەبارەی رووداوەکان کۆ

دەکەنەوە بەهۆی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن و ریپۆرتاژو راپرسی، دواتر نووسینەوەی هەواڵ و راپۆرت لەبارەیەوە.

ب. چارەسەرکردنی زانیارییەکان: دەزگاکانی میدیا دوای کۆکردنەوەی زانیاری، هەواڵ و راپۆرت و راپرسی و ریپۆرتاژەکان دادەڕێژنەوەو، شیاوترینیان هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی بڵاوی بکەنەوە.

ج. دابەشکردنەوەی زانیارییەکان: بڵاوکردنەوەی زانیارییە بۆ وەرگر کە لە ژینگەیەکی میدیا بەدەست هاتووە، لە رێگەی بڵاوکردنەوەی هونەرەکانی نووسینی رۆژنامەوانی (خۆی لە چەندین بیرو راو زانیاری دەبینێتەوە) لە رۆژنامە و گۆڤارەکان و، بڵاوکردنەوەی هونەرییەکانی ئێستگەو تەلەفزیۆن (خۆی لە چەندین بیرو راو زانیاری دەبینێتەوە) لە ئامرازی بینراو بیستراو دا.

**٢- گەشەکردنی کۆمەڵایەتی:**

ئەم ئەرکە خۆی لە دابینکردنی گەنجینەیەکی هاوبەشی زانست و زانیاری دەبینێتەوە، کە تاکەکان بە هۆیەوە بتوانن ببنە ئەندامی کاریگەرو بونیاتنەرو لە کۆمەڵگاکاندا بژین و بەشداری لە هۆشیاری کۆمەڵایەتی و کاری بە کۆمەڵ و کێشەکانی کۆمەڵگادا بکەن. میدیا یەک لەو میکانیزمە گرنگانەیە دەتوانێت لە رێگەی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری خەڵک بۆ پەسندکردنی بەها نوێیەکان و دروستکردنی هاوسەنگی لەنێوان بەهاکاندا رۆڵی یەکلاکەرەوە بگێڕێت، لە پاراستنی ئاستی تەندروستی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە.

کۆمەڵگەی ئێمە بە قۆناغی وەرچەرخاندا تێدەپەڕێت، ئەم قۆناغە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە دوو جۆر بیرکردنەوەو ئاراستە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە تێیدا حوکم دەکەن، ئاراستەیەک بانگەشەی کرانەوەو هەنگاونان بەرەو قۆناغی مەدەنی دەکات، لە هەمان کاتدا ئاراستەیەکیتر بانگەشەی پابەندبوون و پارێزگاریکردن دەکات، لە کۆی بەها کلتوورییەکان. میدیا بەشداری لە هاندانی جەماوەر دەکات بۆ بڕیاردانی باش و گونجاو کە توانای خزمەتکردنی کۆمەڵگای هەبێت، پاشان بەشداریکردن لە درێژەدان بە پرۆسەی کارلێکی کۆمەڵایەتی لە نێوان تاکەکانیدا.

### ٣- رۆشنبیرکردن:

بریتییە لە بڵاوکردنەوەی زانیاری بە شێوازیک کە ببێتە هۆی نەشونماکردنی رۆشنبیری و پێکهێنانی کەسێتی و بە دەستهێنانی کارامەیی و لێهاتوویی لە سەرجەم قۆناغەکانی ژیاندا. ئامرازەکانی میدیای جەماوەری هەڵدەستن لەناو ئەم کارەدا بەرۆشنبیرکردنی جەماوەر لە رێگەی پێشکەش کردنی ئەو پەیامانەی دەبنە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری جەماوەر، هەریەک لە ئامرازەکان رۆڵی خۆیان دەبینن، بە گوێرەی چوارچێوەی کارەکەی و جیاکەرەوەی چینەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان. میدیا هەوڵی بڵاوکردنەوەی چالاکی و کاری رۆشنبیری و هونەری دەدات، بە مەبەستی پەرەپێدانی رۆشنبیری لە رێگەی فراوانکرنی ئاسۆی هەستی تاکەکان و بزواندنی خەیاڵ و، تێرکردنی پێداویستییە جوانکارییەکان و ئاوەڵاکردنی تواناکانیان لەسەر داهێنان.

### ٤- پێکهێنانی رای گشتی:

رای گشتی ئەو رایە زاڵەیە لە نێوان زۆرینەی گەلێکی هۆشیار لە کاتێکی دیاریکراو پەیدا دەبێت، ئامرازەکانی میدیا هاوبەشن بۆ هاندانی جەماوەر بۆ پێکهێنانی رایەکی یەکگرتوو بەرامبەر کێشە هەنووکەییەکان، لە رێگای پێدانی ئەو زانیاریانەی بەو کێشەیە پەیوەستە و، هاندانیان بۆ بەشداری کردن لە دەربڕینی بیرو راو، هاندانیان بۆ ئەوەی رەفتارێکی دیاریکراو دەربڕاو ئەنجام بدەن، وەک بەشداری کردن لە خۆپیشاندان و هەڵبژاردن و مانگرتن.. هتد. رۆڵی دەزگاکانی میدیا لەمە تێدەپەڕێت بۆ کاریگەری لەسەر جەماوەر بەهۆی بەکارهێنانی ستراتیژییەتی کاریگەری و رازیکردن، وەک دووبارەکردنەوەو پێشکەش کردنی بەڵگەکان و پێشکەش کردنی هەردوو لای سەرنج و ئاراستە لەسەر بابەت، لەگەڵ جەخت کردن لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، و پاڵپشتی لەو رایانەی لە رای سەرکردەکان بەدەست هاتوون.

### ٥- خۆشی و کات بەسەر بردن:

ئامرازەکانی میدیای جەماوەریی ئەرکێکی کات بەسەر بردنە، لە رێگای پێشکەش کردنی ئەو پەیامانەی دەبنە هۆی تێرکردن و خۆش گوزەرانی جەماوەر، رۆڵ و

کاریگـەری هەریـەک لە ئامرازەکان بە گوێرەی چۆنیەتی بەکارخسـتنیان لەم رووەوە دیـار دەکەوێت. ئەمەش لە پێشـکەش کردنی دراماو گۆرانی و فیلم و بڵاوکردنەوەی رۆمـان و چیرۆک و، پێشـکەش کردنـی جۆرەکانـی هونـەر وەکو مۆسـیقاو دەنگ و وێنـە دەبێـت، بـۆ بەسـەربردنی کاتێکـی خـۆش چ وەک تاک یان کۆمـەڵ و جەماوەر، هەروەها رزگارکردنی خەڵکی لەو خەم و ئەندێشـە و ناسـۆرانەی لە ژیانی رۆژانەدا روبەڕوویـان دەبنـەوە. لەوکاتـەی تەلەڤزیـۆن بەرنامـەی خۆشـی پێشـکەش دەکات، رۆژنامـە و گۆڤاریـش لاپـەڕەی تایبەت بۆ کات بەسـەربردن و خۆشـی دەستنیشـان دەکەن.

**٦- روونکردنەوەو لێکدانەوە:**

ئامرازەکانی میدیا کار لەسـەر روونکردنەوەو لێکدانەوەی کێشـەکان بۆ جەماوەر دەکەن، پێشـبینی لەسـەر بوونی کێشـەیەک کە ئاسـتەمە بۆ تێگەیشـتنی گشت خەڵک، بۆیە ئەم دەزگایانە کاریان روونکردنەوەی لایەنەکانی کێشەکەیە بۆ جەماوەر، چونکە کێشـەکانی وەک کێشـەی پزیشکی و زانستی و رۆشنبیری ئاستەمە هەندێ جەماوەر تێـی بگـەن، بە بێ بەشـداری کردنی دەزگاکانـی میدیا لە روونکردنـەوەو لێکدانەوەی کێشەکان بۆیان.

هەروەهـا میدیـا بەشـداری لـە گۆڕینـەوەی بیـرو ڕاو بۆچوونـی نێـوان تاکەکانی کۆمەڵـگا دەکات لـە رێگـەی سـیمینارو گفتوگـۆوە، بـۆ زانینـی زانیـاری و بیـروڕای یەکتـر. ئامرازەکانـی میدیـا کێشـە گشـتییەکان و کەسـایەتییەکان و رێکخـراوو بزاڤە کۆمەڵایەتییـەکان دەخەنـە ڕوو، لە رێگەی ئەو ڕارودۆخـە راوێژکارییەی ئامرازەکانی میدیا دەیانهێننە کایەوە.

**٧- خزمەتگوزاری گشتی:**

ئەم کارە بریتییە لە پێشکەش کردنی رێنمایی خزمەتگوزاری بۆ خەلک، بەشداری دەکات لـە خزمـەت کردنـی کۆمەڵـگا، وەک بڵاوکردنـەوەی کاتەکانـی فڕینی فرۆکە و هەواڵـی نرخـی کەلوپەلـی خۆراکـی و بۆرسـەکانی جیهـان، هەروەهـا فەراهەمکردنی دەرفەت بۆ هەموو کەسـێک، بە جۆرێک دەسـتەبەری گەیشتن بە ئامانجەکانیان بکات

و، زانین و تێگەیشتنی بارودۆخی گوزەرانی خەڵکیترو راو بۆچوون و خواستەکانی ئەوانیش بهێنێتەدی.

### ٨- سڕکردن:

ئەم ئەرکە کۆسپ دروستکەرە، بە کردەوە ئاماژە بە لاسەنگ بوون لە تەرازووی ئەرک بەجێ هێنانی رۆڵی ئامرازەکانی میدیا دەکات، لە ئەنجامی بەرزکردنەوەی ئاستی زانیارییەکان بۆ جەماوەر روودەدات، چونکە لێشاوی زانیاری دەبێ بە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی گەورەی خەڵک، لە ئەنجامی دڵۆپێک زانیاری ئەوتووە کە هۆشیاری خەڵک بکات بە هۆشیارییەکی نەرێنی و، ببێ بە مایەی ئەوەی چالاکییەکانی مرۆڤ نەبن بە بەشدارییەکی کاریگەرانە و بەگوڕ.

### ٩- چاودێری کردنی ژینگە:

ئامرازەکانی میدیا شارەزاییەکی باشیان هەیە لە گەڕان بە رێگای بڵاوکردنەوەی بیرو رای جەماوەر لە بارەی کێشە و ئاراستەی جیاواز، هەروەها بڵاوکردنەوەی بیرو ڕای بەرپرسان بەرامبەر رووداوو کێشە و وڵات و حکومەتەکان، ئەم دەزگایانە بەو واتایە کار دەکەن کە ئەرکی چاودێری کردنی ژینگەیە، لە رێگای گواستنەوەی هەواڵەکانی ژینگە بۆ جەماوەرو بە پێچەوانەوە.

### ١٠- دیکۆمێنت کردنی رووداوە گشتییەکان:

ئامرازەکانی میدیا رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە دیکۆمێنت کردنی رووداوە گشتییەکان لە رێگای ورووژاندن و شیکردنەوەو پێشاندانی بابەتەکان، بۆ ئەوەی بتوانرێ بەکاربهێنرێت و بۆی بگەڕێینەوە دوای چەندین ساڵ و سەدە.

(مەک لۆهان)ی کەنەدی ئامێرەکانی پێوەندیکردن و ئامرازەکانی میدیا، بە سەرچاوەو تەوەری رەوتی بەرەو پێشچوونی مێژووی مرۆڤایەتی دادەنێت. ئەم زانایە رای وایە خودی ئامێرەکانی پەیوەندیکردنیش هەڵگری پەیامی سەردەمێکی نوێیە، بۆیە تەنیا گواستنەوەی پەیامەکە، بە ئەرکی سەرەکی ئەم ئامرازە نازانێت، بەڵکو بنیاتنانی جیهانێکی نوێ و هەوڵ بۆ پێشکەوتنی هەمەلایەنەی ئەم جیهانە، بە

ئەرکە گرنگەکانی ئامێرەکانی پێوەندی گشتی دادەنێت.

میدیای نوێ بۆتە بەشێک لە پرۆسەی گشتگیر بۆ گەل و وڵات و کەلتوورو کیشوەرە جیاوازەکان، جا لەسەر ئاستی پەیوەندیکەر یان بەکاربەر بێت. هەژموونی میدیایی بۆتە واقیعێکی بەرجەستەکراوو تێگەیشتنی کاریگەرییە جیهانییەکەی لەسەر چەمکە سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەروەریتی و کەلتوورییەکان، پرسێکە بە هەموو شارستانییەتەکانەوە پەیوەستە.

**دەروونناسیی میدیایی:**

دەروونناسی میدیایی لقێکە لە لقەکانی دەروونناسی، لە رەفتارو ئەدگارەکانی میدیاکارو وەرگرو شێوازی پەیامی میدیایی و ئەو هۆکارانەی کار لە جەماوەر دەکات دەکۆڵێتەوە، هەروەسا کۆمەڵێ پرسیار دەخاتەڕوو و لە کاروباری جیاوازی میدیایی، هاوکات هەوڵی پراکتیزەکردنی شێوازو رێبازگەلێکی زانستی و پراکتیکی دەدات لەمیانەی توێژینەوەکان و نموونەی گشتی رەفتار کە شیاوی پراکتیزەکردنە، هەروەسا یارمەتی تێگەیشتنی وردی ئەو کارانە دەکات کە میدیاکاران دەیکەن، کە بەشێوەی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەگەڵ نووسەران و شیکەرەوان مامەڵە دەکەن.

دەروونناسی میدیایی هەوڵی کۆکردنەوەی داتای وردو ئەو زانیاریانە دەدات کە بە رێگای زانستی وەکو سەرنجدان، راپرسی، چاوپێکەوتن کۆیان دەکاتەوە، هەروەها دەروونناسی میدیایی هۆکاری پێوانەی هەیە کە بەرێگەی ئامار لایەن و رواڵەتی رەفتار تۆمار دەکات لەمیانەی تێستی دەروونی و راپرسی بیروڕای کارمەندانی بواری میدیا یان رای گشتی.

چەمکی دەروونناسی میدیایی خۆی لەو راستی و واتاو ئەو وێنە هاوبەش و هێما واتادارانە دەدۆزێتەوە کە دەیکێشی، بەشێوەیەک ئەم هێمایانە ئەو ماناو وێنانە بگەیەنێ کە گوزارشتی لێ دەکات، دەروونناسی میدیایی لێکۆڵینەوەیە لە هۆش و رەفتاری مرۆیی لە چوارچێوەی کارلێککردنی مرۆیی لەگەڵ پرۆسەی پەیوەندیکردن.

خوێندنی دەروونناسی میدیایی ئەم سوودانەی هەیە:

١- هاوكاريكردنـى ميدياكار بـۆ نيشـاندانى رادەى پشتبەسـتنى جەمـاوەر بـە ئامرازەكانى ميديا.

٢- ئـەوە دەردەخـات كـە جەمـاوەر چ جـۆرە ئامرازێک و چۆن بـەكارى دێنى، بۆ تێركردنى پێويستييە دەروونى و كۆمەڵايەتى و مەعريفيەكانى.

٣- دەرخسـتنى رۆڵـى هـۆكارە دەروونييەكان لە ئاراسـتەكردنى پاڵنەرەكانى تاک بـۆ پەيوەنديكردن، پاشـان پێشـبينيكردنى رادەى پێشـوازيكردنى جەمـاوەر لە چەمكە جياوازەكانى بوارەكانى ژيان.

٤- دەرخستنى شێوازى تێگەيشتن و درككردن و وەرگرتن و گەڕانەوەى ميدياكار بۆ زانيارييەكان و، چۆنێتى كارتێكردن لە جەماوەر.

٥- خوێندنـى لايەنـى دەروونـى ئامرازەكانـى ميديـا ئـەوە فێر دەكات، لـە چى بير دەكەيتەوەو جەماوەر لە چى بير دەكاتەوە، نەک چۆن بير دەكەنەوە؟

### دەروونناسيى ميديايى و پەيوەندى بە دەروونناسيى گشتييەوە:

دەروونناسى گشتى لە رەفتارى تاک دەكۆڵێتەوە، لە ميانەى پرۆسـەى كارلێككردنى لەگەڵ وروژێنەرە سروشتييەكان، هەروەها ئامانجى دۆزينەوەى ئەو ياساو پرەنسيپە گشتيانەيە كە رەفتارى تاكى مرۆيى شى دەكاتەوە چ رەفتارى دروست بێ يان ناوازە. دەروونناسـى ميدياييـش پشـت بەم ياسـاو پرەنسـيپانە دەبەسـتێ بۆ شـيكردنەوەى رەفتـارى ميديايـى، لەميانـەى لێكدانـەوە شـيكردنەوەى بۆچوونەكانى ئـەو رەفتارەو پێشـبينيكردنى. بـەم شـێوەيە دەتوانيـن پێناسـەكە لـە چەنـد بۆچوونێكى جيـاواز كو بكەينەوە:

١- لقێكە لە لقەكانى دەروونناسـى گرنگى بە پرۆسـەى بەدواداچوون و دەرهێنانى زانيارى و بەدەستهێنانى دەدات، پاشان پەخشكردنى ئەم زانياريانە بۆ كەسانى دى.

٢- زانسـتێكى رەفتارناسـييە گرنگـى بـە كارلێككردنى نێوان تـاک و كۆمەڵ لەگەڵ ئامرازەكانـى ميديـا دەدات، بـۆ زانينـى ئـەو هۆكارانـەى دەبنـە هـۆى پێكهێنانـى ئەو ميكانيزمە سايكۆلۆژيانەى ئەو كارلێككردنانە شرۆڤە دەكات.

٣- توێژینەوەیەکی زانستییە کە دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی ئەو ئاریشە دەروونییانە کە لەمەیدانی میدیاییدا دەردەکەون، بۆ بەرزکردنەوەی توانای زانستی کارمەندانی ئەم مەیدانە.

**دەروونناسیی میدیایی و پەیوەندی بە لقەکانی دیکەی دەروونناسییەوە**

**یەکەم: پەیوەندی دەروونناسی میدیایی بە دەروونناسی کۆمەڵایەتی:**

بابەتی دەروونناسی کۆمەڵایەتی لێکۆڵینەوەی زانستییە لە رەفتاری تاک لە چوارچێوەی کاریگەری وروژێنەرە دەروونی و کۆمەڵایەتی و شارستانییەکاندا، دەروونناسی میدیاییش رۆڵی بنەڕەتی و کارای لە خرۆشاندنی ئەو سێ وروژێنەرە هەیە، کە وێنەی کەسێتی تاکەکان لە چوارچێوەی ژینگەکەی دەکێشێ.

**دووەم: پەیوەندی دەروونناسی میدیا بە دەروونناسی کارگێڕیی:**

دەروونناسی کارگێڕی، ئەو زانستەیە کە رەفتاری کارگێڕی کارمەندان لێک دەداتەوە، هەروەها کاریگەری لەسەر رەفتارە جیاوازەکانی لەمیانەی راپەڕاندنی کارەکانیان و، لەگەڵ دەروونناسی میدیاییش پەیوەندییەکی پتەویان هەیە لەڕووی دیاریکردنی ئەو تواناو ئامادەباشییانەی میدیاکار پێویستی پێیەتی لە راپەراندنی ئەرکەکانی و بەرەو پێشبردنی تواناو بەهرەکانی، کارگێڕی میدیاش سوود لە چەمکەکانی دەروونناسی کارگێڕی وەردەگرێ، لە بەڕێوەبردنی داخوازی میدیاو جەماوەرو باشترکردنی بەپێی گۆڕانکارییەکانی سەردەم.

**سێیەم: پەیوەندی دەروونناسی میدیایی بە دەروونناسی پیشەسازی:**

دەروونناسی پیشەسازی، ئەو زانستەیە کە رێبازە زانستییەکانی دەروونناسی لە بواری کاردا بەکاردێنێ، بۆ شیکردنەوەی کارو دانانی کرێکاری شیاو لە شوێنی خۆی و، چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی بواری کارو بەدەستهێنانی رەزامەندی کرێکارو، چۆنێتی مەشقی پیشەیی و گونجاندنی بارودۆخی فیزیایی و دەروونی بۆ کرێکار،

ئەمیش هەمان ئامانجی دەروونناسی میدیایە لەلێکۆڵینەوەی بۆ سووتانی دەروونی میدیاکارو کاری میدیاو، دروستکردنی مەیل و بۆچوونی ئیجابی بۆ کارمەندی میدیا و سەقامگیری دەروونی.

### چوارەم: پەیوەندی دەروونناسی میدیایی بە دەروونناسی بازرگانی:

دەروونناسی بازرگانی لە پاڵنەری بەکاربەران و پێویستییەکانیان دەکۆڵێتەوە، لەمیانەی توێژینەوەی لە باری دەروونی فرۆشیار (نێرەر) و کڕیار (وەرگر) و، توێژینەوەی ریکلامکردن کە ئامرازێکی جەماوەرییە بۆ پەیوەندیکردنی داتاو زانیاری، بۆ قەناعەتپێکردنی کڕیاران بۆ ئەو کاڵا بازرگانییە کە ریکلامی بۆ دەکات، بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئەوپەڕی قازانج هەروەها بایەخدان بە تەرویجکردن کە بڵاوکردنەوەی زانیارییە بە رێگەی جیاواز بەمەبەستی سەرنجڕاکێشانی جەماوەر، یەکێک لە ئامانجەکانی دەروونناسی میدیاییش سەرنجڕاکێشانی جەماوەرە بۆ کارو خزمەتگوزاریە میدیاییەکان.

### پێنجەم: پەیوەندی دەروونناسیی میدیایی بە دەروونناسی کەسێتی:

دەروونناسی کەسێتی یان جیاتاکی جیاوازی نێوان تاک و کۆمەڵەکان و رەچەڵەکەکان دەخوێنێ لەڕووی جیاوازی زیرەکی یان رەوشت و کەسێتی و ئامادەباشییەکان و بەهرەکانیان، ئەوەمان پیشان دەدات کە چۆن جیاوازن و تا چ رادەیەک جیاوازن، پاشان کەسی میدیاکار لە کارەکەیدا مامەڵە لەگەڵ کەسە جیاوازەکاندا دەکات، بۆیە پێویستە لەسەر میدیاکار شارەزایی سەبارەت بەبونیاتی کەسێتی مرۆڤ و ئەرک و ئایندەی هەبێ.

### شەشەم: پەیوەندی دەروونناسی میدیایی بە دەروونناسی بەکاربەر:

کاتێک وەک پیشەسازییەک سەیری میدیا دەکرێ، پێویست دەکات ئەم پیشەسازییە بە بازاڕکردن ببەستینەوە، بازاڕکردنیش پرۆسەی تێرکردنی ئارەزووەکانی

جەماوەری بەکاربەرە بەباشترین شێوە، چونکە کارمەندانی کەرتی میدیا بۆ تێرکردن ء ئـارەزووی خوێنـەران کار دەکـەن و، هـەوڵ دەدەن پێویسـتی و ئـارەزووی نـوێ بدۆزنـەوە یـان ئارەزووی پێویسـتی بەکاربەران بوروژێنن. ئـەم وروژاندنە مانای چالاکـی بازاڕکردنـە، بازاڕکـردن لـە تێڕوانینـی بەکاربـەر بریتییـە لـە تێرکردنی ئەو پێویسـتی و ئارەزووانـەی بـۆ کڕین پاڵی پێـوە دەنێت، بەڵام لە دامـەزراوەی میدیایی و میدیـاکاران سـەیری سـەرکەوتنی پرۆژەکانی خۆیان و فراوانکردنـی و بەدیهێنانی قازانـج دەکـەن، لەمیانەی سەرنجڕاکێشـانی میدیایی بۆ بازاڕی ئـەو بابەتە میدیاییەی پێشکەشی دەکەن.

بـەڵام کۆمـەڵ لە میانـەی ئارەزووی بـۆ زیادبوونـی داهاتی نەتەوەیی کـە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەران سەیری میدیا دەکات، بەکاربەریش ئارەزوو و پاڵنـەری خـۆی هەیە هەوڵی تێرکردنی دەدات، لە کڕینی خزمەتگوزاری میدیایی وەکو کتێب و گۆڤار، هاوکات لەلاوازی توانای کڕینی دەناڵێنێ.

**ئامانجەکانی دەروونناسیی میدیایی:**

دەروونناسـی میدیایی هەوڵدەدات چەمک و پرەنسـیپ و تیۆرەکانی دەروونناسـی گشـتی بەسـەر کاری میدیاییدا جێبەجێ بکات، بۆ گەیشـتن بەو ئامانجانەی کە دەبێتە هۆی سەرنجڕاکێشانی میدیایی. دەزگای میدیایی خزمەتگوزاری پێشکەشبە بەکاربەری میدیایـی دەکات و هەوڵـدەدات زانیـاری تـازە بەو بەکاربەرە بەئاسـانی پێ بگەیەنێت. ئامانجەکانیش دوو جۆرن:

**- ئامانجی گشتی:**

باسـکردن و کۆنترۆڵکردنی بزاڤی دیاردەی میدیاییـە، کە بە سروشـتی دینامیکی گۆڕاوو هەڵقولاندنی بە لێشـاو دەناسـرێتەوە، چونکە بەپێی سیستمی کۆمەڵایەتی کار دەکات و دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە، هەروەها بەوە دەناسرێتەوە کە پێشبینی بزاڤی دیاردەی میدیایی دەکات، لەم ئامانجانەش: وەسـفکردن، کۆنترۆڵکردن، پێشـبینیکردن، کـە ئامانجـی دەروونناسـین و لقەکانی تری زانسـتەکان لەگەڵیدا بەشـدارن، لەوانەش

دەروونناسی میدیایی.

**- ئامانجی تایبەتی:**

ئامانجی تایبەتی دەروونناسی میدیا دانانی ئەو بنەماو پرەنسیبە گشتیانەیە، کە لە رەفتاری وەرگر دەکۆڵێتەوە، ئەگەر جەماوەر بێ یان تاک لەکاتی روودانی دیاردە میدیاییەکان و رووداوە لەپڕەکان و پرۆسەی کارلێککردنیان و هەماهەنگییان.

میدیای ئەمڕۆ کە لەمیانەی دامەزراوە میدیاییە پسپۆریەکانەوە بەڕێوەدەچێ، سەرکەوتنی ئەم دامەزراوانە بە وەدیهێنانی ئامانجەکانی دەروونناسی میدیا بەستراوە، کە ئەمانەن:

١- بایەخدان بە کاریگەری کەسێتی لەسەر رەفتاری میدیاکارو پرۆسەی بڕیاردان.

٢- جۆشدان و ئاراستەکردنی پاڵنەرێتی رەفتار بەئاراستەیەکی دیاریکراو (ئامانجێکی دیاریکراو).

٣- بەدیهێنانی خۆگونجاندن و کارلێککردنی کۆمەڵایەتی لە رەفتاری تاک (میدیاکار)، بەرامبەر هاوکارانی لە دامەزراوەکە یان بەرامبەر جەماوەر.

٤- دۆزینەوەی جیاتاکی چ دەروونی بێت یان جەستەیی یان عەقڵی یان هەڵچوون و، کاریگەری ئەوەش لەسەر رەفتاری میدیایی.

٥- پێشکەشکردنی یارمەتی لە پرۆسەی رێنمایی پیشەیی (گەشەپێدان، هەڵبژاردن و تاقیکردنەوە بەپێی بنەمای زانستی و بابەتی) بۆ تاکی میدیاکار.

٦- مەشقی میدیایی (دروستکردنی بارێکی هاوسەنگی دەروونی) کاتێک تاکی میدیاکار خاوەنی بەهرەو توانایەو، ئەوەی ئەرکەکەی پێویستی پێیەتی لە کارو چالاکی بەشێوەیەکی کارا.

٧- زانینی گرنگی هەڵبژاردن (الاختيار) و دامەزراندن و هەڵسەنگاندنی هەڵسوڕاندنی کاری میدیایی.

٨- بەرزکردنەوەی ئاستی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری میدیایی لەمیانەی بەدەستهێنانی رەزامەندی کار بۆ میدیاکار کە بە هۆکارێکی بنەڕەتی دادەنرێ، لە رەزامەندی دەروونی بۆی کە هانی دەدات بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری باشتر.

٩- دەستنیشـانكردنی فشـارە دەروونییـەكان (رەفتارییـەكان)ی كار، كـە كار لـە رەفتاری میدیاكار دەكات.

١٠- جەختكردن لەسەر بایەخی تەندروستی دەروونی لە كاری میدیاییدا.

## بەشی دووەم
## دەروونناسیی ئامرازەکانی میدیا

میدیا لەم سەردەمەی ئێستاماندا شادەماری ژیان و بزوێنەری بنەڕەتیتی لە سەرجەم بوارەکاندا، تەکنۆلۆژیای تازەش بەشداری لە رەخساندنی هەل لەبەردەم ئامرازەکانی میدیا کردووە، بۆ پەڕینەوەی سنوورو بڕینی کیشوەرەکان و بەو شێوەیە کۆت و بەندە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بەزاند، کە بەسەر ئامرازە ئاساییەکانی میدیادا سەپێنراون.

**ئامرازەکانی میدیا:**

بەهۆی جۆری ئامرازەکانی میدیاوە بیر یان بۆچوونێک دەگاتە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی وەرگر کە لە شوێنە دوورو جیاوازەکاندا بڵاو بوونەتەوە، ئەم جۆرانەش بریتین لە:

١. ئامرازی میدیای بیستن: ئەو ئامرازانەن پشت بە بیستن دەبەستن، وەک: رادیۆ، کاسێتی ریکۆردەر.

٢. ئامرازی میدیای بیستن و بینین: ئەوانەن پشت بە هەردوو هەستی بیستن و بینین دەبەستن، وەک: تەلەفزیۆن، سینەماو رادیۆ.

٣. ئامرازی میدیای خوێندراو: ئەو ئامرازانەن پشت بە رستە و قسە دەبەستن، وەک: رۆژنامە، کتێب، گۆڤارو بڵاوکراوە.

٤. ئامرازی چەسپاو: ئامرازی میدیان خەڵکی روویان تێ دەکات بۆ سوود لێ وەرگرتنی، وەک: پیشانگاو شانۆو مۆزەخانە.

هەریەک لەم جۆرانە شێوە بەکارهێنانێکی تایبەتی خۆی هەیە، هەریەکەیان خەسڵەتی تایبەت بە خۆیان هەیە و ئەو هۆکارەش لە یەکتریان جیا دەکاتەوە، هۆیەکی تری جیاواز لەڕووی پەیوەندیانەوە بە جەماوەر و وەرگرەوە لە جۆری ئەو پەیامەش

که هەڵیدەگرن، یان لەڕووی ئەو کاریگەریەی لەسەر وەرگر دروستی دەکەن.

**یەکەم: ئامرازە خوێندراوەکان:**

**١- ڕۆژنامە:**

ڕۆژنامە ئامرازێکی خوێندراوی زیندووی تاکەکانە بەهۆی ئاسان دەسکەوتنی و گواستنەوەی بە خێرایی و ئەرشیفکردنی، توێژەرانی بواری میدیا وا پێناسەیان کردووە، کە بریتییە لەو پەنجەرەیە کە تاک جیهانی لێوە دەبینێ. ڕۆژنامە ئامرازێکی گرنگە بۆ خۆ ڕۆشنبیرکردنی زانستی و کارامەیی لە میانەی فێربوونی هونەری کاری میدیایی: هەواڵ، ریپۆرتاژ، دیالۆگی ڕۆژنامەنووسی.

لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد وشەی (Press) بە مانای ڕۆژنامە و ڕۆژنامەوانی بەکارهێنراوە، بە مانای ئەوەی پەیوەندی بە چاپ و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیارییەکان هەیە، هەر لەو فەرهەنگەدا وشەی (Journal)یش بەکارهاتووە کە مەبەست لێی ڕۆژنامەیە. هەروەها لە زمانی عەرەبیداو لە فەرهەنگی (المعجم الوسیط) وشەی (صحافة) بە مانای بڵاوکراوەیەکی دەورییە لە ژمارەیەک لاپەڕە پێکهاتووەو هەواڵ و زانیاری تێدا بڵاو دەکرێتەوە.

ئینسکلۆپیدیای ئەنکارتا بەم جۆرە پێناسەی ڕۆژنامە دەکات، ڕۆژنامە بە مانا پیشەییەکەی «بریتییە لە کۆکردنەوەو هەڵسەنگاندن و بەدواداچوون زانیاری و ڕاستییەکان، لەبارەی ڕووداوە نزیکەکان و خستنەڕووی بۆ خوێنەران». هەر لەو ڕووەوە ویکیپیدیا دەڵێ «ڕۆژنامە کار لەسەر کۆکردنەوەی زانیاری و هەواڵ دەکات و لێکدانەوەو بەدواداچوونیان لەبارەوە دەکات، لە وردی و دروست زانیارییەکان دەکۆڵێتەوەو پێشکەشی جەماوەری دەکات، بە جۆرێک هەواڵ و زانیارییەکان هەنووکەیی و ڕووداوە تازەکانی بوارە جیاجیاکانی ژیانن».

ئەگەر ڕۆژنامە لە ڕووی پیشەییەوە ئەو ئەرکانەی هەبێ، ئەوا لە ڕووی پیشەسازییەوەش پێناسە و پرۆسەی تایبەت بە خۆی هەیە، بۆ چۆنیەتی دەرچوون و قۆناغەکانی دەرچوونی ڕۆژنامە، لەوانە "بریتییە لە پرۆسەی بڵاوکردنەوەی

زانیاری لە ڕێگای چاپکردن لەسەر پەڕدا، هەروەها نەخشەسازی و هونەری دانان و داڕشتن بۆ چۆنیەتی بەخشینی زانیارییەکان دەگیرێتەبەر، بەشێوەی خولی و لە کاتی دیارکراوە دەوەشێنرێ، ناوەرۆکی لە کۆمەڵی پێکهاتە لە خۆ دەگرێ و ڕەنگاو ڕەنگ و جۆراوجۆر لە خستنەرووی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان لە سەرجەم بوارەکاندا».

(د.فاروق ئەبو زێد) دەڵێ «ڕۆژنامە کۆمەڵە پەڕێکی چاپکراوەو لە چاپخانەدا چاپ دەکرێ و دەوەشێنرێ، ناوەڕۆکەکەی بە بابەتی ڕۆژنامەوانی جۆراوجۆر لە سەرجەم بوارەکان پڕ دەکرێتەوە، ڕووداو و زانیارییە تازەو هەنوکەییەکان دەخاتە ڕوو".

هەروەها (د. جلال خەلیفە) دەڵێ «ئامرازێکی میدیایە لە لقی ئامرازە چاپکراوەکانە زانستی میدیایە، لە ڕێگای چاپکردن لەسەر پەڕەکان پەیامی خۆی بەشێوەیەکی خولی و لە کاتی دیاریکراو بە جەماوەر دەگەیەنێت». (د. ئەدیب خەزور)یش دەڵێ «چاپکراوێکی خولییە، بە زۆری ڕۆژانەن، پێکهاتە و ناوەڕۆکەکانیان بە زۆر پەیوەستە بە ڕووداوە گۆڕانکارییە گرنگەکانی ژیان بە سەرجەم بوارەکانییەوە وەک سیاسەت و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و وەرزشی...هتد».

ڕۆژنامەو گۆڤارە گشتییەکان (بازرگانییەکان) دەچنە چوارچێوەی ئەو بڵاوکراوانەی، کە ئەڵقەیەکی گرنگی پەیوەندییە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵ بە هەموو چینەکانییەوە، بە جدێتی و ئاسان دەسکەوتن دەناسرێ.

هەروەها پێناسە دەکرێ کە «بریتییە لە پیشەسازی ڕۆژنامەکان، ڕۆژنامەکانیش کۆی ڕۆژنامەیە، ئەویش بریتییە لە پەڕەی نووسراو، لە گرنگترین ئامرازەکانی گەیشتنە بە جەماوەر، ئەگەر ئەو جەماوەرە کۆمەڵەکان بێت یان گەلان، هەر کەسێ پەیامێکی پێ بێت بۆ پەیوەندیکردن، ئەوە میدیاکارە یان کەسێکە کە ڕۆژنامەنووسی کردبێتە پیشە».

ڕۆژنامە یەکێکە لەو ئامرازانەی کاریگەری گەورەی لەسەر مرۆڤایەتی و توانای دروستکردنی ڕای گشتیشی هەیە، هەلێکی باش بۆ گواستنەوەی بیروراو گفتوگۆکردن لەنێوان تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگە دەرەخسێنێت، ڕۆژانەش بە نوێترین زانیاری دەبێتە میوانی خوێنەران، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا پێویستە ئەو زانیاریانەی دەخرێنەروو

راست بن و دووربن لە زانیاری دروستکراو، هەروەک زمانی دەربڕینەکەی لە هەموو رووییەکەوە شایستە و شیاو بێت و خوێنەران لێی تێ بگەن و بە زمانی ئەوان بێت، لەگەڵ ئەمانەشدا پێویستە لە خستنەڕووی رووداوو بابەتەکاندا نەبێتە هۆی بەهێزکردنی رۆحی دوژمنایەتیکردنی ئایدۆلۆژیاو مەزهەبی و رەگەزی، یاخود چەوساندنەوەی هیچ کەسێک بە هۆی ئینتیماو تێروانینەوە، نابێ دەستدرێژی بکرێتە سەر کەسایەتی هیچ مرۆڤێک و دەبێت کەسایەتی مرۆڤەکە لە پلە و کارەکەی جیا بکرێتەوە، هەروەک نابێت ئەو وێنانە بڵاو بکاتەوە کە سوکایەتی کردنن بە کەرامەتی مرۆڤ و نابێ پێداویستییە سەرەتاییەکانی مرۆڤ بۆ مسۆگەرکردنی دەستکەوتی تایبەتی بوروژێنرێن.

**٢- گۆڤار:**

ئینسایکلۆپیدیای رۆشنبیری دەڵێت (گۆڤار چاپکراوێکی خولی وێنەیی یە کەچەندین بابەتی هەمەرەنگ لەخۆوەدەگرێت). گواستنەوەی زۆر هزرو زانیاری و هەڵوێست بۆ گەلان لە رێگەی گۆڤارەوەیە، هەزاران گۆڤار ئەو کاریگەرییەیان هەیە، هەمەجۆری بوارەکانیش لەسەر کاغەزی لووس و بە چوار رەنگ مانگانە دەردەچێت و بە ملیۆنان دانە بڵاو دەکرێنەوە، تا دەگاتە ئەو گۆڤارە تایبەتیانەی سێ مانگ جارێک دەردەچن لەلایەن جەماوەرەوە نەناسراون، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە کاریگەری بەهێزی لەسەر خوێنەران لە بوارە جیاجیاکاندا هەبێ.

گۆڤار پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی شان بەشانی رۆژنامە بەهۆی پێشکەوتنی چاپخانەکان پەیدابوونی جۆری نوێ لە کاغەز، بەڵام گۆڤار جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەل رۆژنامە لەلایەنی شێوەو ناوەڕۆک، ئاراستەی گۆڤار بەرەو تایبەتمەندبوونێکی هۆشیاری چوو، جگە لەوەی بە لاپەرەی رەنگاو رەنگ و سەرنج راکێش و بابەتی زیندوو لەخۆ دەگرێت، لەلایەکیترەوە گۆڤار هەفتانە یان پانزە رۆژ جارێک یان مانگانە یاخود وەرزی دەردەچێت.

گۆڤار زانیاری دەگوازێتەوەو تام و چێژ بە خوێنەران دەبەخشێت و لە رووی نووسینەوە کاریان تێ دەکات، پەیامگەلێکی رێکلامی بۆ هەلی نەتەوەیی و هەرێمایەتی

لە بەردەمیان دادەنێ، گۆڤارێک نییە کە هەفتانە زیاتر لە جارێک دەربچێت، لەبەرئەوە نووسەرانی کاتی تەواویان دەبێت بۆ گەڕان بە دوای زۆر پرس و هەڵوێست سەبارەت بەو ڕووداوانەی لە ڕۆژنامەکاندا دەردەکەون، پاشان دەرفەتی باشتری بۆ هەڵدەکەوێ بۆ دەرخستنی ئەو ڕووداوانەو تیشک خستنەسەری و شیکردنەوەی واتاکانی.

گۆڤار بە بڕگە جوان و لاپەڕە ڕێکخراوەکانی بەوە دەناسرێتەوە کە ماوەیەکی زۆر لای خوێنەر دەمێنێتەوە، ئەمیش ئەو جیاکەرەوەیەیە کە ڕۆژنامەکان نیانە، هەندێ گۆڤاریش ڕەنگە بۆ چەند ساڵێک لە ماڵاندا بمێنێتەوە یان لای خوێنەرێک بۆ یەکێکی دیکە دەساودەست بکات.

**٣- کتێب:**

سەرەڕای ئەو ڕۆڵەی ئامرازەکانی دیکە لە هوشیارکردنەوەی تاکەکان دەیبینن، لە ڕووی پەروەردەییەوە کتێب سەرچاوەیەکە ناتوانرێ دەستبەرداری بن بەهۆی ئەو زانست و زانینەی لە دوو توێی دایەتی و، بەئاسانی بۆ خوێنەران بە هەموو تەمەنە جیاوازەکانەوە دەگوازرێنەوە. هەروەسا کتێب میدیایەکی تەواوکارە، کە لە ڕووی ڕۆشنبیری و ئاراستەکردن و پەروەردەیی و خۆشگوزەری (ترفیهی)ەوە ئەرکەکانی میدیا دەبینێ، کە دەکرێ خوێنەر بیکاتە سەرچاوەو بە باوکی ئامرازەکانی میدیا دادەنرێت.

سەرەڕای بڵاوبوونەوەی ئامرازەکانی میدیا بە هەموو شێوەو پەرەسەندنیەوە، بەڵام کتێب بۆ پاراستن و گواستنەوەی زانیاری و زانین و زانست و چەمک و بەهاکان زیاد لە هەموو ئامرازەکانی دیکە بەکاردەهێنرێت. دەکرێ کتێب وەک سەرچاوەیەک بۆ پێکهێنانی بناغەیەکی زانیاری وەبەربهێنرێ کە لەسەرەتاوە بۆ کاری میدیایی بەکاردەهێنرێ، ناشکرێ ڕۆڵی کتێبخانە گشتییەکان بە هەند وەرنەگیرێ، ئەگەر بمانەوێ بیکەینە هاندەر بۆ سەردانیکردن بە پڕکردنەوەی بە کتێبی نوێ، کە لەگەڵ هەموو تەمەنێکدا بگونجێ، سەرەڕای ئەنجامدانی هەڵمەتی ڕێکلامکردن کە هانی سەردانی کتێبخانە دەدات و سوودی لێ وەربگیرێ.

کتێب ئامرازێکی میدیاییە بە قوڵی کار لە ژیانی تاکەکان دەکات، زۆر لە کلتووری

رابردوو لەخۆ دەگرێ و یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە خودو لەو جیهانەی تاک تێیدا دەژی و وای لێ دەکات پلان بۆ ئایندەی دابڕێژێ، کتێب دەزگایەکی کارایە لە پرۆسەی فێرکردن و، چێژ بەخشین بە تاکەکان بە هەموو تەمەنەکانەوە.

**کتێب ئەم کاریگەرییە دەروونیانەی لەسەر خوێنەر هەیە:**

١- بەشداری لە پێکهێنانی زمانێکی هاوبەشی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ دەکات و، هانیان دەدات بۆ کارلێککردن و یەکتر ناسین.

٢- بۆ گەشەکردنی خێرای عەقڵ و فراوانکردنی چەمک و بۆچوونەکانی ژیان.

٣- وەک ئامرازێکی خۆشگوزەری و سووککردنی فشاری دەروونی بەکاردەهێنرێ، چونکە هەندێ کتێب لایەنی بزەو پێکەنین لەخۆدەگرێ، کە یارمەتیدەری تاکە بۆ ئارامبەخشی دەروونی، هاوڕێیەکی بێدەنگی مرۆڤیشە.

٤- بە شێوەیەک بوار بۆ فراوانکردنی ئاسۆی تاک دەرەخسێنێ کە پێشبینی ناکات، وای لێ دەکات بچێتە جیهانی کتێبەوەو خەیاڵی ئەوە بکات کە نووسیویێتی و بە ئەزموونەکانی خۆی بژی.

٥- گواستنەوەی هزرو کلتوری گەلان و هزرمەندانی جیهان و ئاڵوگۆڕکردنیان.

٦- پێشخستنی ئاسۆی رووناکبیری تاکەکانی کۆمەڵ سەبارەت بە هاونیشتمانێتی و ژینگەپارێزی و، دوورکەوتنەوە لە نەخۆشییە دەرونییەکان.

٧- بۆ زاڵبوون بەسەر کاتی ڤالایی و سەقامگیری.

پێش سەردەمی ئەلیکترۆنی گەلانی دونیا زۆر پەنایان بۆ خوێندنەوە دەبرد بەهۆی زۆریی ماوەو کاتی ڤالاییانەوە، هەندێ لێکۆڵینەوەش پێیانوایە دەرکەوتنی تەکنۆلۆژیای ئەلیکترۆنی کار لە خوێندنەوەی کتێب ناکات، هەندێکی دیکەش دەڵێن کاریگەری تەلەڤزیۆن لەسەر خوێندنەوە زیانبەخش نییە.

دوای چەند دەیەیەک لە خۆ گونجاندن لەگەڵ ئامرازە نوێیەکانی میدیا، ئەمریکاییەکان ئێستا دەگەڕێنەوە بۆ شێوازی پێشتری خوێندنەوەیان.

لە رووپێوێکدا دەرکەوتووە ئەمریکاییەکان لە پێشتر زیاتر دەخوێننەوە، رووپێوەکە هەموو جۆرە خوێندنەوەیەک لەخۆ دەگرێ لە رێنمایی تایبەت بە ئامێرە نوێیەکان

تـا دەگاتـە هێماکانی شـەقام. لە رووپێوێکی دیکـەدا ژمارەی دابەشـکردنی رۆژنامەو گۆڤـارەکان و ئامارەکانـی فرۆشـتنی کتێب باس کراوە، ئامـاژە بەوە دراوە ژمارەکان بە بەراورد لەگەڵ رابردوودا زیاتر بووە. لەکاتێکدا ئەمریکاییەکان لەوانەیە زۆر کتێب بکـڕن، زۆریـش لە گۆڤـارەکان دەخوێننــەوەو رۆژانــەش زۆر سـەیری چاپکراوەکان دەکـەن، کەچـی بەهـۆی ئـەو گۆڕانکارییـە زۆرانـەی لەبـارەی پیشەسـازی کتێبـەوە روویداوە، بە تێڕوانینێکی نوێ سـەیری ئەنجامی ئامارەکان دەکرێ، لەوانەشـە شێوە نوێیەکانی پەیوەندیکردن کار لە قەبارەی ئێستای خوێندنەوە لای خەڵک نەکات، بەڵام جۆری خوێندنەوەو شێوازی خوێندنەوە دەگۆڕێت.

ئەو گۆڕانەی لە چۆنێتی خوێندنەوە رووی داوە، لە میانەی جیاوازی و هەمەچەشنی کتێـب و گۆڤارەکانـدا دەردەکـەوێ، کە رۆژانـە بڵاودەبنەوەو دەفرۆشـرێن. کتێبەکان بەپێـی ئامـارەکان پڕفرۆش بوونە، بەڵام زیاتر ئەو کتێبانەی پسـپۆڕێتیان پێوە دیارە: کتێبەکانی کۆمپیوتەر، کەمکردنەوەی کێش و جوانکردنن.

گۆڤارگەلێکی سـەرکەوتووی پسـپۆڕێتی دەرکەوتن وەک: گۆڤارەکانی کۆمپیوتەر، ئامێری بیسـتن، پلانی دارایی، راکردن، تێنس و شـتی هاوشـێوە، ئەوە نیشـان دەدات کـە خوێندنـەوە هێشـتا رۆژانـە ماوەیەکـی زۆری تاکـی ئەمریکایـی داگیـر دەکات، نیشـانەکانیش بەڵگەی کەمبوونەوەی خوێندنەوەن لە ماوەی ڤالاییدا، لە خوێندنەوەی کات بەسـەربردن و چێژوەرگرتـن ء، فراوانکردنـی زانیـاری ء تێگەیشـتنی زیاتـر لـە کاروباری دەرەکی و پەیوەندی مرۆڤایەتیدا.

کەواتە مەسەلەکە چییە؟ ئەگەر خەڵکی لە جیاتی خوێندنەوەی رۆژنامەو کتێب پەنا بـۆ تەلەڤزیـۆن و ئینتەرنێت ببەن بۆ کات بەسـەربردن، ئەگەر بەدوای هەڵەدا بگەڕێن بـۆ ئاگاداربـوون لە رووداوەکان، هەروەها ئەگەر لە جیاتـی خوێندنەوەی رۆمان یان ژیاننامـە¬ سـەیری درامای تەلەڤزیۆن بکەن، ئایـا دەکرێ ئەوە بە جۆرێک لە گۆڕانی نا پەسند دابنرێ؟

ئەوانـەی باوەڕیـان وایـە پرۆسـەی خوێندنـەوە پەیوەندییەکـی بەتینی بـە توانای بیرکردنـەوەو پەیوەنـدی بـە شـێوازی شـیکردنەوە هەیـە، متمانـە بـەوە دەکـەن کـە

شێوازە نوێیەکانی خوێندنەوە موژدەی گەشبینی نییە بۆ دوارۆژی نەتەوەیەکی دیموکراسی، وەک (تاوسند هۆبز) لەبارەی دوورکەوتنەوە لە خوێندنەوە دەڵێ: «ئەو دوورکەوتنەوەیە ئارەزوونەکردنی خوێندنەوەیە لە نێوان ئەوانەی توانایان بەسەردا دەشکێ، چونکە بیرکردنەوەی روون بە تەواوی پشت دەبەستێ بە توانای بەکارهێنانی ئامرازە تاقیکراوەکانی وشە وردەکان و مانای چەسپاوی رستەیەکی یەکگرتوو».

خوێندنەوە پێویستی بە مومارەسەی عەقڵی ئاڵۆز هەیە، چونکە خوێنەر زیاتر لە بینەر پێویستی بە تەرکیزکردن هەیە، یەکێک لە پسپۆرانی بیستن سەرنجی داوە ئەوەی گرنگ بێت سەبارەت بە ئامرازە ئەلیکترۆنییەکان (کرانەوە)یە، کرانەوە رێگە بۆ وروووژێنەرەکانی بیستن و بینین خۆش دەکات راستەوخۆ بگەنە مێشک، ئەو کەسەی فێری تەرکیزکردن بووە سەرناکەوێ لە درک پێکردنی زۆر لەو زانیاریانەی وروووژێنەرە ئەلیکترۆنییەکان پێی دەگەیەنن. سەیرکردنی تەلەڤزیۆن و ئینتەرنێت و ئامرازە تەکنۆلۆژییەکانی دیکە کاری لە دەرکەوتنی هەر کارامەیەکی زارەکی کردووە کە فێرخواز پێویستی پێیەتی.

**٣- پۆستەر:**

پۆستەر یەکێکە لە ئامرازە گرنگە کاراکانی میدیا، لە گرنگترین مەرجی سەرکەوتنی پۆستەر:

ا. روونی ئامانج و سادەیی ناوەڕۆک.

ب. هاوسەنگی: واتە گونجاندنی بابەتەکانی ناوەڕۆکی پۆستەرەکە.

ج. تەرکیزکردن لەسەر بیرۆکەیەک.

د. کورتکردنەوەی وشە نووسراوەکان و تەرکیزکردن لەسەر وێنە گوزارشتکارەکە.

ە. بەکارهێنانی رەنگی سەرنجراکێش.

ئەمیش لە چوارچێوەی ئەو وێنانەیە کە دەبنە هۆی گواستنەوەی بیرۆکەیەک بەشێوەیەکی وێنەگیراو، بە زۆریش بۆ مەبەستی هۆشیارکردنەوەی گشتی بەکاردەهێنرێ، هەروەها لە قوتابخانەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجە پەروەردەییەکان بەکاردەهێنرێ، بۆ زۆر شتی دیکەش بەکاردەهێنرێ وەک: پڕوپاگەندە.

ئـەوەی پێویسـتە رەچـاو بکـرێ لـە کاتـی دانانـی پۆسـتەر، دەبـێ دوای کۆتایـی مەبەستەکە بەئاسانی لاببرێ، بۆئەوەی پۆستەرەکە ئامانج بپێکێ، نابێت بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە، هەرچەندە بەهێزیش بێت بۆئەوەی کارایەتی و کاریگەرێتی لەدەسـت نەدات.

**٤- لافیتە:**

پشـت بـە رسـتەیەکی گوزارشـتکارو روون دەبەسـتێ، زۆرجـار لـە پرۆسـەی بڵاوکردنـەوەی زانیـاری جیـاوازو کـورت و گرنـگ لـە یـەک کاتـدا بـەکار دەهێنرێ، کـە لافیتەکـە ئامـاژە بە شـوێنی بۆنەیەک بـدات، لەوانەش ئـەو لافیتانەی لـە دەرگای مزگەوتەکانـدا هەڵدەواسـرێن و گرنگـی مانگی رەمـەزان روون دەکەنـەوە. یەکێک لە لایەنە باشەکانی لافیتە ئاسانی گواستنەوەیەتی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بەپێی پێویست.

**٥- دروشم:**

سـیمبولێکە بۆ ئامانجێک هەوڵی بەدیهێنانی دەدەین، پێویسـتە لە کاتی بیرکردنەوە لـە هەڵکردنـی دروشـمێک، یان لـە کاتی پلاندانان بـۆ پرۆژەیەک، رسـتەی زمانەوانی پێویست هەڵبژێرین کە هەمەلایەن و دوور لە هەڵە بێت، سەرباری توانای بەدیهێنانی برگەکانی ئەو دروشـمە، ئەوەی گونجاویشـە لە کاتی نەخشەکێشان بۆ جێبەجێکردنی هەڵمەتێکـی میدیایـی ئەوەیە، دروشـمێکی دیاریکـراوی بۆ دابنێین کە نیشـانە بێت بۆ ئـەو بۆنەیـە، هەمـوو ئامرازەکانی پەیوەندی بخەینە کار بۆ پاڵپشـتیکردنی ئەو ئەرکە، لەوانەش: بڵاوکراوەکان، لوولپێچەکان، شانۆ، ئێستگە، کۆڕ، سمینار.

**نموونە بۆ دروشم:**

١- چی بچێنی ئەوە دەدوورییەوە.

٢- جوتیاران و رەنجدەران بەردی بناغەن بۆ گەشەسەندنی ئابووری وڵات.

٣- ژینگەپارێزی بەڵگەی وشیارییە.

٤- گێرانەوەی خەمەکانت باری دەروونیت سوک دەکات.

٥- ئەوەندە بخۆ بۆئەوەی بژی، مەژی بۆئەوەی بخۆی.

٦- هەموو دونیا پڕ بێ لە رک و کینە جێگەی خۆشەویستی هەر دەمێنێ.

٧- بەرز بفڕی نزم دەنیشیتەوە.

٨- رۆژێک هەست بکە هەموو خەڵک تۆیان خۆش دەوێ.

٩- بیرکردنەوەی باش رەفتاری باش بەرهەم دێنێ.

دروشم کاردانەوەی دەروونی لەسەر کۆمەڵ بەشێوەیەکی گشتی هەیە، کە ئەم لایەنە باشیانەی هەیە:

- بەهۆیەوە دەتوانین تاکەکانی کۆمەڵ کۆ بکەینەوە بۆ یەک ئامانجی گشتی، کە لە رێگەیەوە دەتوانین ئەوەی دەمانەوێ بەشێوەیەکی ئاسان بیگەیەنین.

- لە میانەی دروشمەوە تاک دەتوانێت پابەندی رەوشتی بنەڕەتی بێت، کە لە کاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسانی دیکەدا رەچاوی دەکات، بۆ نموونە بڵێین: پاک و خاوێنی لەباوەڕەویە.

- دروشم گیانی ورەی هێزی چەکدارو هەر کەسێک بۆ سەرخستنی نیشتمان خەبات دەکات، بەهێزی دەکات، کە لە رێگەی دروشمەوە لەگەڵ کەسانی دی رێک دەکەوێت.

- بەهۆیەوە تاک ئامانجی باڵای وەبیر دێتەوە کە دروشمێکی بۆ دادەنێت، کاریش بۆ ئاراستەکردنی رەفتاری تاک و بەرزکردنەوەی پاڵنەرێتی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە بانگەشە بۆکراوەکانی دەکات.

**٦- لوولپێچ:**

لایەنە باشەکانی لوولپێچ (المطوية) ئاسانی هەڵگرتن و دابەشکردنێتی، سەرەڕای توانای چاپکردنی ژمارەیەکی زۆر بە هەرزانترین نرخ، هەمیشە تەرکیز تەنها لەسەر یەک بابەت دەکات و شرۆڤەو شی دەکاتەوە بە شێوازێکی سووک و ئاسان بۆ ئەو توێژەی مەبەستە، لە بۆنە گشتییەکاندا لوولپێچ بە باشترین ئامرازی میدیا دادەنرێت.

**دووەم: ئامرازی بیستراوو بیستراوبینراو:**

**١- ئێستگە:**

ئێستگە، ئەو ئامرازەی میدیای بیستراوە کە شەپۆلەکانی بە شێوەی کارۆموگناتیسی لە هەوادا بڵاو دەکاتەوە، پەیامە دەنگییەکانی بە بیسەر دەگەیەنێت و لە ڕێگەی ئامێری وەرگرتنەوە گوێبیستی دەبین.

بڵاوبوونـەوەی ڕێکخراوانـەی ئاراسـتە کـراوە بەهـۆی ئامێـری رادیـۆوە، بـۆ بابەتەکانی هەواڵ و ڕۆشـنبیری و فێرخوازی. بایەخی ئێسـتگە لە چەند ئەدگارێکەوە سەرچاوە دەگرێ، لەوانە: خێرایی بڵاوبوونەوە، توانای سەرنجڕاکێشان، توانای بڕینی مەبەسـتەکانی گوێگر سـەرەڕای بڕینی سـنووری جوگرافی و سیاسـی. بەو ئامرازە ڕۆشـنبیریانەش دادەنـرێ کـە پتر لە هەموویـان بڵاوەو دەنگی هەیـەو دەگاتە هەموو شوێنێک، ئەوەی یارمەتی بڵاوبوونەوەشی داوە ئاسانی بەدەستهێنان و هەمەچەشنی بەرنامەکانێتی، هەوڵی ڕازیکردنی هەموو زەوقێکیش دەدات.

ئـەم ژانـرەی ڕاگەیانـدن بـە هۆکارێکـی زۆر گرنـگ دادەنرێـت کـە زانیارییـەکان لـە ڕێگای هەسـتی بیسـتنەوە زۆرترین خەڵک سـوودی لـێ وەردەگرن و سـنووری کاریگـەری فراوانـە و دەگاتـە زۆر گۆشـەو کەنـاری ئـەم جیهانـە و موخاتەبەی ڕای گشـتی جیهانـی دەکات. بەم شـێوەیە پەخشـی ڕادیۆیـی بۆ هەموو چیـن وتوێژەکانی کۆمەڵگایـە بـە خوێنـەوارو نەخوێنەوارەوە. بۆیـە توانی بکەوێتـە ململانێ و ڕکابەری جەنگێکـی ڕاگەیاندنـی بەهێـزەوە و زۆرێـک لـە هـەواڵ و زانیـاری پـێ بـگات و بڵاو بکاتـەوە، بە واتا سـادەکەی ژمـارەی گوێگرەکان زۆر زیاترن لـە ژمارەی خوێنەران، بۆیە ڕۆڵی ئێسـتگەش زیاتر دەبێت چونکە گوێگرتن پێویسـتی بە فێربوون و زانسـت نییە وەک فێربوونی خوێندنەوە، تەنانەت خوێنەریش زیاتر حەز لە گوێگرتن دەکات تا خوێندنەوە چونکە وزەیەکی کەمتری پێویستە.

**تایبەتمەندییەکانی ئێستگە:**

ئێستگە بە یەکێک لە ئامرازە گرنگەکانی میدیای جەماوەری دادەنرێ، بەهۆی ئەو تایبەتمەندیانـەی هەیەتـی و گونجاوی لەگەڵ زۆربەی چینەکانی ناو کۆمەڵگە، ئەمەش وای کردووە رۆڵێکی باش بگێڕێ لە رۆشنبیرکردن و گواستنەوەو گەیاندنی زانیاری خزمەتگوزارییەکان، گرنگترین تایبەتمەندییەکانیشی بریتین لەمانە:

١- ئاسـانی بەدەسـتهێنان، بـە قەبـارەو شـێوازو توانـای جۆراوجـۆرو بـە نرخی هەرزان و گونجاو، لەگەڵ پێویست نەبوونی بە وزەی کارەبا بۆ کارپێکردنی.

٢- لای زۆربەی خەڵکی وشەو چەمکە بیستراوەکان گرنگییەکی زیاتریان هەیە و، تێگەیشتنیان لە نووسراوەکان ئاسانترە.

٣- شـەپۆلەکانی دەتوانـن بـە خێرایی بـە هەموو جیهاندا بڵاو ببنەوە، هیچ شـتێک نابێتە بەربەسـت لە بڵاوبوونەوەیان، وەک سـنووری جوگرافی، بەربەستی سیاسی و سروشتی.

٤- دەتوانێت سەرنجی گوێگر بۆ خۆی رابکێشێت، بەهۆی بەکارهێنانی کاریگەری دەنـگ و مۆسـیقاو گفتوگـۆ کـە بـەکاری دەهێنێـت، بۆئەوەی تـام و چێژ بـە بابەتەکە ببەخشێت.

٥- بێـژەر خەیاڵدانـی گوێگر دەوروژێنێت، بەمەش گوێگر بەشـداری لە گوێگرتنی پەیامەکەدا دەکات.

٦- ئاسانی بەکارهێنانی، پێویستی بە شارەزابوون نییە بۆ ئیشپێکردنی و تێچونی کەمە.

٧- کادری میدیـا دەتوانێـت ناسـنامەی خۆی ئاشـکرا نـەکات و بیپارێزێت، چونکە وێنەی دەرناکەوێت.

٨- ئاسانی گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر بە هۆی بچووکی قەبارەیەوە.

٩- پێویسـت نـاکات گوێگـر دەسـت لـە کارەکـەی هەڵبگرێت، بۆ ئـەوەی گوێی لێ بگرێت، لە کاتی کارکردن و قسەکردنیشدا دەتوانێت سوودی لێوەربگرێت.

١٠- لـە هەمـان کاتـدا سـێ جـۆر پرۆسـەی میدیـا ئەنجـام ئـەدات وەک میدیـای

جەماوەری و جیهانی، ناوچەیی و هەرێمی، لۆکاڵی.

١١- وەک یەک بۆ خەڵکی خوێندەوارو نەخوێندەوار بە کەڵکە، بەلام خەڵکانی نەخوێندەوار زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەری رادیۆوە.

١٢- دەتوانێت تەواوکەری پەیامی کەناڵەکانی تر بێت.

١٣- تەنها کار لەسەر هەستی بیستن دەکات، ئەمە یارمەتی وەرگر دەدات بۆ زیاتر خەیاڵکردن و ئەمدیوو ئەودیوکردنی بیر بە هەموو لایەکدا، دواتریش بەبێ تێکچون و لەرینەوە لە مێشکیدا بیرێکی جێگیری دەست دەکەوێت.

**ئەرکەکانی ئێستگە:**

- هەواڵی جیاوازی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بە خەڵک دەگەیەنێ.
- پشت ئەستوورکردنی کۆمەڵ بە رۆشنبیری و مافەکانی مرۆڤ.
- فەراهەمکردنی خۆشگوزەری کات بەسەربردن و خۆشگوزەری دراماو گۆرانی و هونەر.
- ئاراستەکردنی تاک و کۆمەڵ بەرەو هەر لایەنێکی ئەرێنی و چاکسازی و رێنماییکردن و تەرکیزکردن لەسەر بەرنامەکانی منداڵ و ئافرەت.
- روونکردنەوەی گرفتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکان و قەناعەتکردن بە خەڵک.
- گەشەپێدانی کۆمەڵ لە گۆرانی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری.
- رێکلام کردن، بە مەرجێک مۆرکی مرۆڤایەتی و بەرژەوەندییەکانی تاک و کۆمەڵ رەچاو بکات.

**ئەدگاری میدیای دەروونی ئێستگە:**

١- بلاوکردنەوەی دەسبەجێی رووداوو هەواڵەکان کە لەپڕ روو دەدەن، وەک هەواڵی کارەسات و تیرۆر.

٢- توانای گوێ لێ گرتنی لە کاتی ئەنجامدانی هەر کارێکی دیکەدا.

٣- ئامرازێکی بیستراوە، دەنگ و ئامرازەکانی دەنگ بەکاردەهێنێ لەبەرئەوە هەلی

زیاتر بۆ گوێگر دەڕەخسێنێ، خەیاڵ بکات و لەگەڵ ڕووداوەکانی نواندن یان دراماو موزیک و گۆرانی بگوزەرێنێ.

٤- لە توانایدایە بۆ نەخوێندەواران بدوێ.

٥- قەبارەی بچووکەو هەڵگرتنی ئاسانە، بە سانایی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگوازرێتەوە.

٦- ئامرازێکی گرنگە بۆ شوفێران لەڕووی خۆشگوزەری و بەسەربردنی کاتێکی خۆش.

ئێستگە پتر بە تواناو بە بەرهەمترەو بڕی تێچوونیشی کەمترە، گرنگترین ئامرازی میدیای جەماوەرییە، بەهۆی توانای خێرا پەیوەندیکردنی، بەشداریش لە پێکهێنانی ڕای گشتی و ڕێزلێگرتنی دەکات، لێک نزیکبوونەوەی زەینی نێوان جەماوەرو دەسەڵات بە دەست دێنێ، پرۆسەی گوێگرتنیش بەهێز دەکات، چونکە پشت بە گوێ دەبەستێ و خەیاڵکردنی ڕاستەوخۆش دروست دەکات.

لە کوردستان جەماوەر گوێگرخوازە بەهۆی زۆری ڕێژەی نەخوێندەواری لە نێویدا، بەڵام هێشتا بارودۆخی باشترکردنی گوێگرتن و باشترکردنی زمان لە خوار ئاستی پێویستەوەیە، ئەمیش پێویستی بە پێشخستنی دەزگا تەکنۆلۆژییەکان هەیەو، وزەو توانا داهێنەرەکان بەرهەم بهێنرێن و بەشگەلێک بۆ توێژینەوەو، لێژنەش بۆ ڕاوێژکاری لە دەرەوەی دامەزراوەکانی میدیا پێک بهێنرێ.

### ٢- تەلەڤزیۆن:

تەلەڤزیۆن وەک ژانرێکی ڕاگەیاندن، کاریگەرییەکی وای لەو بوارەدا بەدی هێنا کە لەگەڵ هەموو داهێنانەکانی پێشتری ئەو بوارە بەراورد نەدەکرا، چونکە توانی وشە لەگەڵ وێنەدا پێکەوە گرێ بدات و دیمەن و ڕستەکان ئاوێتەی یەکتر بکات، ئەم سەندوقە جادووییە توانی دیمەن و ڕووداوەکان لە ڕێگەی وێنەی گوازراوەوە لە هزری بینەردا بەرجەستە بکات و لە ڕاستی ڕووداوەکە نزیکی بکاتەوە.

کاتێک تەلەڤزیۆن هاتە نێو ژیانی تاک و کۆمەڵەوە گۆڕانکاری پیشەیی دروست کردو ئاستێکی فیکری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی تایبەتی پێ بەخشین، بەو شێوەیە

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای تەلەڤزیۆن و گرنگیدانی دەوڵەتان بە تەلەڤزیۆن وایکرد سنووری ناوچەیی ببڕێت و، وردە وردە بەرەو ئاستێکی جیهانی گەشە بکات گۆڕانی تەلەڤزیۆن لە ناوچەییەوە بۆ جیهانی.

**ئەدگارە میدیاییەکانی تەلەڤزیۆن:**

- یەکخستنی دەنگ و وێنە کە پشت بە گرنگترین دوو هەستەوەر دەبەستێ، ئەوانیش بیستن و بینینە.
- کارپێکردنی تەلەڤزیۆن پێویستی بە کارامەیی نییە.
- فەراهەمبوونی توخمی تاموچێژ بۆ بینەر.
- زیاد لە هەر سەرچاوەیەکی دیکەی میدیا جەماوەر باوەڕ بە هەواڵەکانی دەکات، بەڵام رۆژنامە سەرچاوەیەکە کەمتر باوەڕی پێ دەکرێ.
- تەلەڤزیۆن پێویستی بە برێک تەرکیز هەیە، بەپێچەوانەی رادیۆ کە دەکرێ بێ دیقەتگرتن گوێی لێ رابگیرێ.
- زیاد لە هەر ئامرازێکی دیکە گوزارشت لە واقیع دەکات، بەهۆی وێنەی رەنگاورەنگی بابەتەکانی و دەنگی راستەقینەوە.
- توانای هەمەلایەنی لە: گفتوگۆ، دیالۆگ، نواندن، سەرنجی زانستی.
- بەزاندنی هەردوو رەهەندی کات و شوێن، کە توانای ئەوەی هەیە چەند گرتەیەکت لە چیرۆکێکی کەلتوری بۆ دروست بکات و وێنەی زیندووی پرۆسەی فێربوونت، بۆ نموونە لە ژاپۆنەوە بۆ بگوازێتەوە.
- کۆنترۆڵکردنی کاتی پەخشکردن.

**لایەنە ئەرێنییەکانی تەلەڤزیۆن:**

- کۆکردنەوەی هەردوو هەستەری بینین و بیستن.
- کۆبوونەوەی خاسیەتەکانی شانۆو رۆژنامەوانی و رادیۆ تیایدا جگە لە جووڵەو راکێشان و زیندوێتی و رەنگەکان.
- بەزاندنی سنووری ناوخۆیی بەرەو جیهانی.
- بە سەرنجراکێشانی بێژەرەکەی و ئەکتەری شانۆیی جیا دەکرێتەوە.

- بەوە جیا دەکرێتەوە کە ڕووداوەکان بە زیندوویی و بەرجەستەیی دەگوازێتەوە لەشوێنی ڕووداوەکەوە.

- خێزان کۆ دەکاتەوە.

**لایەنە نەرێنییەکانی:**

- پێویستی بە خۆتەرخانکردن هەیە بۆ بەدواداچوونی.

- لە خوێندنەوەی لاوان و منداڵان کەم دەکاتەوە.

- خێزانی بەجۆرێک بەخۆوە بەستووە کە بێ دەنگی کردوون.

- لاساییکردنەوەی شەرانگێزی و لایەنە خراپەکانی لەلایەن منداڵانەوە.

- ئاڵوودەبوونی هەندێ خەڵک بەتایبەتی منداڵان بە تەلەڤزیۆن.

**ماوەی سەیرکردنی تەلەڤزیۆن:**

لە وتارێکدا کە لەبارەی تەلەڤزیۆنی منداڵ لە ڕۆژنامەی The New Republc بڵاوکراوەتەوە، نووسەر لۆمە دەخاتە سەر ناوەڕۆکی بابەتی بەرنامەکان لە جیاتی ئەوەی بیخاتە سەر ئەزموونی تەلەڤزیۆن، کە دەڵێ: «منداڵ لە چینە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوڕێیانی لەماڵەوە ژیان بە سەر دەبات، بێ ئەوەی هیچ کارێک بکات. تەنها چەند خێزانێک چ لە گەڕەکە هەژارنشینەکان بێت، یان لە ئاپارتمانە گەورەکاندا بێ، یان لە شوێنەکانی دەوروبەری شاردا ڕاهێنانی پێویست بۆ گەشەی عەقڵی و جەستەیی بۆ منداڵ دابین دەکەن، بەرەنجامی ئەم ڕاهێنانەش هەر ئەوەیە کە لە بازاڕەکاندا دەیبینی، چۆن منداڵێکی بچووکی زوو هەڵچوو، ماندوو، بێزار بەهۆی سستی و تەمبەڵییەوە دایکی بێزار دەکات. بەرنامەی گونجاوی تەلەڤزیۆن پێویستە یارمەتی ئەم جۆرە منداڵ و دایکانە بدات، چونکە مەگەر خوا بزانێت منداڵ بە چ شێوەیەکی بەردەوام سەیری تەلەڤزیۆن دەکات».

خاوەن وتارەکە بیری لەوە نەکردۆتەوە کە لەوانەیە ئەو منداڵە کە زوو هەڵدەچێ، ماندوو دەبێ، بێزار دەبێ بەهۆی خاوبوونەوەوە بێ نەک بەرنامەی تەلەڤزیۆن، چونکە سەیرکردنیان بۆ تەلەڤزیۆن بەردەوام و نەپچڕاوە، بیریشی لەوە نەکردۆتەوە، کە منداڵ لە دەرفەتی ڕاهێنانی بەدەنی، یان زەینی، بێ بەشە نەک شتی دیکە. ڕابواردنی

مندالان لەگەڵ تەلەڤزیۆن بۆ باوک و دایکیش ئاسانترە لەوەی لەگەڵ خۆیان بیانبەن بۆ یاریگاو یارییان لەگەڵدا بکەن، یان مامەڵەی راستەوخۆیان لەگەڵدا بکەن.

نووسەر داوا دەکات بەرنامەی چاکتر بۆ منداڵ دابنرێ، کە دەڵێت: منداڵی تەمەنی پێش چوونە قوتابخانە ماوەی ٥٤ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا سەیری تەلەڤزیۆن دەکات، ئەمەش بە شێوەیەکی نا ئاسایی دووچاری زمانێکی ئینگلیزی وشکی دەکات، کە گەورەکان قسەی پێ دەکەن و هەلیشی دەداتێ سەیری شتی زۆرتر بکات، بەڵام منداڵی ئەمریکایی بە شێوەیەکی نایاب مامەڵە لەگەڵ تەلەڤزیۆن ناکات، ئەوان شان بە شانی هاوسەنگی ئەزموونەکانی تری ژیانیان پێویستیان بە شانۆی چاک و ئەفسانەو موزیک و فیلم و چیرۆک هەیە.

منداڵی تەمەنی پێش چوونە قوتابخانە لە ماوەی ٥٤ کاتژمێر کە سەیری تەلەڤزیۆن دەکات لە هەفتەیەکەدا بە خەبەرە! ئەم ماوە زۆرە لە سەیرکردنی تەلەڤزیۆن کاتی تەواوی بۆ خواردن و خۆشتن بەدەستەوە ناهێڵێ، لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر بەرەنگاری گفتوگۆیەکی ئارام نابێتەوە، یان گوزارشت لە رای خۆی بکات، با بڵێین ئەگەر بە دیقەت بووایە دەیزانی لەوە کەمتری وتووە، کە موژدەی شتێکی چاکی دابێت. هۆکاری نیگەرانییەکەی لەوەدا دەخواتەوە کە ئەو ٥٤ کاتژمێرە پڕە لە بەرنامەی خراپ، ئەو دەیەوێ هەموو ئەو ماوە درێژە بە ئەزموونی چاک پڕ بێتەوە، کە منداڵ لە توانایدا بێ لەگەڵ ئەزموونە تایبەتییەکانی خۆی پڕی بکاتەوە.

بەڵام کامانەن ئەزموونی تایبەت کە دەکرێ منداڵ زۆربەی کاتی بەدیار تەلەڤزیۆنەوە بەسەر ببات؟ کەواتە پێویستە شاشەکە بە وێنەی منداڵ پڕ بکرێتەوە کە سەیری تەلەڤزیۆن دەکات. بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیای ئەمریکاییش مندالانی بچووک (١-٣) ساڵ تووشی کەمی ئاگایی دەبنەوە لەهەر کاتژمێرێک کە سەیری تەلەڤزیۆن دەکەن.

(د. دیمتری کریستاکیس) لێکۆڵەر لە نەخۆشخانەی مندالان و ناوەندی پزیشکی هەرێمی لە ئەمریکا دەڵێ: تەلەڤزیۆن پەیوەندی بە قەڵەوی و شەڕانگێزی منداڵەوە هەیە. کاتێک مندالانی ئەمڕۆ دەگەنە تەمەنی ٧٠ سالان، ئەوا ٧ تا ١٠ ساڵی ژیانیان

لەبـەردەم شاشـەی تەلەڤزیۆن بـە ڕێ کردووە، ئەم زانیاریانـە بەپێی توێژینەوەیەکی ئەمریکایـی بووە لەسـەر ئـەو بنەمایەیە، کە تێکڕای سـەیرکردنی هەفتانـەی منداڵ بە تێکڕای ٢٣ کاژێرە، بەپێی توێژینەوەیەکی عەرەبیش هەفتانە منداڵان ٢٨ کاژێر سەیری تەلەڤزیۆن دەکەن. لەجیاتی ٣٥ خولەک لە سەیرکردنی ڕۆژانەی تەلەڤزیۆن کە زانایانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و پزیشکان دیاریان کردووە، منداڵان ڕۆژانە ٣ تا ٤ کاژێر بە سەیرکردنی تەلەڤزیۆنەوە بەسەر دەبەن، لە ڕۆژانی پشووی هاوینیشدا بەشێوەیەکی بەرچاو ئەو ڕێژەیە زیاد دەکات.

بەپێی ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی یونسێف لەساڵی ٢٠٠٠دا، دەرکەوت ڕێژەی ٩٧٪ لە تازە پێگەیشـتووان سـەیری تەلەڤزیۆن دەکەن، ڕێژەی خوێندنەوەش لەناویاندا ١٥٪، ڕێژەی زیاتر لە ٧٪ بەرنامەکانیش ئاراستەی منداڵان نەکراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ڕێژەیەکی زۆری بەرنامەی توندوتیژی دەبینن.

ئـەو ئەنجامانـەی توێژینەوەکانـی پێشـوو پێـی گەیشـتوون بەرپرسـیارێتی تونـد دەخەنە ئەسـتۆی دەزگاکانی میدیا لە کارتێکردنیان لە تازە پێگەیشـتووانی نەوە دوای نـەوە، هەروەسـا زەنگـی مەترسـیش بـۆ دایـکان و باوکان لـێ دەدەن، کـە ئاگاداربن لەوەی منداڵەکانیان سەیری دەکەن و داوایان لێ دەکەن وریا بن لە ئاکامە خراپەکانی تەلەڤزیۆن لەسەر منداڵ و کۆمەڵگەش.

لـە هۆڵەندا منداڵی ئاسـایی ڕۆژانە ماوەی دوو کاژێـر تەلەڤزیۆن دەبینێ، بەڵام لە وڵاتە پیشەسازییەکانی دیکە ئەو ژمارەیە دەگاتە ٣ یان ٤ کاژێر، دیمەنەکانی تەلەڤزیۆن سـەبارەت بـە منداڵ هەروەک گـەورەکان ماوەیەکی زۆرتر لە هـەر چالاکییەکی دیکە داگیـر دەکات، جگـە لە نووسـتن و ماوەی خوێندنی قوتابخانـە. بەپێی توێژینەوەیەکی پزیشـکیش سـەیرکردنی تەلەڤزیـۆن زیانێکی تەندروسـتی تایبەت بـە منداڵی بچووک دەگەیەنێ.

سـەبارەت بە سـەیرکردنی دایک و باوک لەگەڵ منداڵەکانیان، (دانییل ئەندرسـون) دەڵێ: بێگومان ئەمە کارێکی باشـە، بەڵام سەیرکردنی دایک و باوک لەگەڵ منداڵەکانیان تەنهـا تێگەیشـتنی منداڵـەکان نییـە، بەڵکـو تێڕوانینێکـی ڕەخنەگرانـە لـە تەلەڤزیۆن و

ڕێکلامەکان بە منداڵ دەبەخشێ، لەبەر ئەوە باوەڕم وایە دایک و باوک لە سەیرکردنیان لەگەڵ منداڵەکانیان دەگەنە زۆر شت.

تەلەڤزیۆن هاندەری نەرێیە، چونکە سەیرکردن پێویستی بە هیچ هەوڵێک نییە، هەروەها هزرو بیری ئامادەکراو پێشکەش دەکات، لەوانەیە لەسەر ئەوە رابێ و فێری تەمبەڵی ببێ تەنانەت سەبارەت بە بیرکردنەوەی تەنها یان رەخنەگرتن یان پشکنین لەوەی دەیبینێ و دەیبیستێ، سەرباری ئەوەش لە دۆخی تایبەتی تەلەڤزیۆندا شتگەلێکی سەپێنراو دەبینێ کە خۆی دەستی لە دیزاینکردنی بەرنامەکانی یان دانانیدا نییە.

## مەترسییە تەندروستییەکانی تەلەڤزیۆن:

(ئەریک سیگمان) پێیوایە ژمارەی ئەو کاژێرانەی منداڵ سەیری تەلەڤزیۆن دەکات بەو کێشانەوە بەستراوە، کە لەمەودوا دەردەکەون، چ لەڕووی کاریگەری لەسەر ئاگا یان روبەڕوبوونەوەی ئاریشەکانی پەیوەندی و گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی دی، لای ئەو منداڵانەی ئامادەباشی بۆماوەییان تێدایە بۆ توشبوون بە نەخۆشییەکانی ئاخاوتن، هەروەها چەندین گرفتی تەندروستی دیکە کە پەیوەندە بە ژمارەی ئەو کاژێرانەی منداڵ لە سەیرکردنی تەلەڤزیۆن بەسەری دەبات، هەروەها ئەو تەمەنەش کە منداڵ تێیدا سەیرکردنی تەلەڤزیۆنی دەست پێدەکات.

توێژینەوەکان دەریانخستووە سەیرکردنی تەلەڤزیۆن دەبێتە هۆی تێکچوونی هەمیشەیی چاوی منداڵان و سەرهەڵدانی نەخۆشی ئۆتیزم بۆ قۆناغی زووی منداڵی. سەرباری ئەوەش، خولەکانی نووستنی منداڵی شیرەخۆرو ئەوانەی بزاڤیان نوێیە دەهەژێنێ و ئەگەری توشبوون بە نەخۆشی شەکرە پتر دەکات. توێژینەوەکان سەلماندوویانە کە سەیرکردنی یەک کاژێری زیادەی رۆژانە بۆ کەسانی تەمەن ٢٠-٦٠ ساڵان دووچاری مەترسی نەخۆشی زهایمەریان دەکات. بەپێ راپۆرتێکی گۆڤاری زانستی بیولوژیست، منداڵی بەریتانی کە تەمەنی شەش ساڵانە ساڵێکی تەواو لە سەیرکردنی تەلەڤزیۆن بەسەر دەبات و، زۆربەی منداڵانیش کە تەمەنیان دەگاتە سێ ساڵ ئامێری تەلەڤزیۆنیان لە ژووری نووستن هەیە.

توێژینەوەیەک ئاشـکرای کردووە کە سـەیرکردنی تەلەڤزیۆن مەترسی پتر لەوەی زانـراوە لەسـەر منـدالآن هەیە، چونکە ئەگـەری گەڕانەوە لە توشـبوون بە قەڵەوی و ئۆتیـزم یـان باڵقبوونی پێشـوەخت زیاتـر دەکات، ئاماژەشـی بەوە داوە کە پێویسـتە گرنگـی بـە کەمکردنەوەی ماوەی سـەیرکردنی مندالآن بـدرێ. هەروەها توێژینەوەکە ئاشـکرای کرد، کەوا تەلەڤزیۆن سـنوور بۆ رادەی بەرهەمهێنانی هۆرمۆنی میلاتۆنین کە رێکخەری سوڕی بایۆلۆژییە دادەنێ، هەروەسا تەلەڤزیۆن زیان بەماوەی نووستن و کۆئەندامی بەرگری و قۆناغی باڵقبوون دەگەیەنێ.

توێژینەوەیەکی زانای دەروونی «ئەریک سـیگمان» دەریخسـت، دابەزینی رێژەی میلاتۆنیـن لەوانەیـە هـۆکاری سـەرەکی باڵقبوونـی پێشـوەختی کچانـی ئەمـڕۆ بـێ، بەبـەراورد لەگـەڵ ماوەی پەنجاکان، ئاماژەشـی بەوەدا کە ئەمە مەترسـی توشـبوون بە نەخۆشـی شـێرپەنجەش پتر بکات. هەروەسـا تەلەڤزیۆن دەبێتە هۆی خەوزڕاندنی کوڕان و بەشداری لە مەترسی توشبوون بە نەخۆشی شەکرە دەکات.

توێژینەوەیەکی دیکەی ئەمریکی دەڵێ سـەیرکردنی تەلەڤزیون بەرسـڤی منداڵ بۆ خۆراک لەکار دەخات، کە لەکاتی دانیشـتون زیاتر دەخۆن ئەگەر هەسـت بە برسـێتی بکەن یان نەیکەن. تیمبل و هاوڕێکانی کاریگەری تەلەڤزیۆنیان لەسـەر راهاتن لەسـەر وریاکـەرەوە خۆراکییـەکان روونکردۆتـەوە، ئەمیـش دیاردەیەکـە کاتێـک روودەدات، کـە جۆرێـک خۆراک پێشـکەش کەسێک دەکرێ بەشـێوەیەکی بەردەوام لـە کۆتاییدا گرنگـی پـێ نـادات و تەنهـا بە هەسـتکردنی بەتێربوون دەسـتی لـێ هەڵدەگرێ، بەڵام پێشکەشـکردنی جۆرێکی نوێ لە خواردن کە پێی ئاشـنا نییە لەوانەیە ئەو پرۆسـەیە پەک بخات و کەسـەکە جارێکی دی دەسـت بە خواردن بکاتەوە ئەگەر برسـیش نەبێ. لەوانەیـە وریاکـەرەوە خۆراکییـەکان هەروەهـا راهاتـن لـەکار بخات ئەگەر کەسـەکە زەینی لەوێ نەبوو.

بەرپرسـیارێتی پاراسـتنی منداڵیـش لـە مەترسـی تەلەڤزیـۆن هەروەکـو «کاسـی شـبینربیرگ» دەڵێ: باوک و دایک و مامۆسـتایان بەرپرسـیارن لەوەی منداڵ سـەیری دەکات، پێشیوایە دەکرێ ئامێری کۆنترۆڵکردن بەکاربهێنرێ و تەلەڤزیۆنەکە دابخرێ،

ئەگەر باوک و دایک و مامۆستایان زانیان ئەوە بەسە.

**تەلەڤزیۆن و زیندەخەون:**

دەتوانین تەلەڤزیۆن وا لەقەڵەم بدەین جۆرێکە لە زیندەخەون، کە خەونگەلێکە هی خۆمان نییە، بەڵکو هی کەسێکی دیکەیە لە شوێنێکی دوورتر، هەرچەندیشە لەسەر شاشەی ناو ئاوەزمان نمایش دەکرێ، چاوەکانیش جێگیرن و خراونەتە سەر شاشەیەکی بچووک، کە خەریکە دەبێ بە تاکە هەستەوەر لەنێو هەستەوەرەکانمان کە کار دەکات و ئەو وێنانەش کە دەچنە ناو نەستمانەوە لە ئاوەز فەرامۆش دەکات، سەدان توێژینەوەش پەیوەندی راستەوخۆی نێوان جوڵەی چاو و بیرکردنەوەی دەرخستووە، پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری بەسەیرکردن پێویستی بەوە هەیە بینەر وریاو چالاک بێ، نەک تەنها هەر شتێ کە بەشێوەیەکی نەرێنی بە بەردەمیدا دەڕوات پەسندی بکات.

توێژینەوەگەلێکیش ئەوە دەسەلمێنن کاتێک هەردوو چاو ئارامن یان بەشێوەیەکی ترسناک خراونەتە گەڕ، ئەوا بیرکردنەوە بەتەواوی بوونی نییە، هەروەک (گیری ماندەر) دەڵێ لەوانەیە لەسەردەمێکدا بین کە زانیاری راستەوخۆ لای هەموان بئاخنرێتە ئاوەزی شاراوە (العقل الباطن)مانەوە، زۆربەی بینەرانیش هەست بەم جۆرە خەونانە دەکەن کە دیارە خەیاڵ دەسەلاتی بەسەر ورووژاندنیەوە هەیە، لەبەرئەوە وێنە پێکهاتووەکان بەهۆی بینینە یەک لەدوای یەکەکانەوە کە یەک بابەتن یان لێک نزیکن دابەش دەبن، لە توانای ئەو خەیاڵەشدایە وێنە ناکۆکەکان لێکەوە نزیک بکاتەوەو شتێکی نوییان لێ دروست بکات، بیکات بە مادەیەکی بە کەڵک بۆ ئازادکردنی زیندەخەونەکان لەسەر پشتی خەیاڵ، دوور لە واقیع و راکردن لە بەرپرسیارێتی.

**کاریگەری تەلەڤزیۆن لەسەر کۆئەندامی دەماریی:**

هەندێ کەس لەو باوەڕەدان سەیرکردنی تەلەڤزیۆن لە بناغەدا ئەزموونێکی نازارەکی و بینینە بۆ منداڵ، ئەم حاڵەتە کە بۆ هەندێ منداڵ وەکو بێ هۆشیی وایە، ئەوە نیشان دەدات کە لە حاڵەتی تێرامانەوە نزیکە، یان هەر حاڵەتێکی هاوشێوە. بەکارهێنانی تەلەڤزیۆن بۆ نیوەگۆی راستی مێشک وەک ئامرازێکی ئارامکەرەوەو

چارەسـەرێک بۆ سـووککردنەوەی زیاد وورووژاندنی منداڵ و هێورکردنەوەی منداڵی بێزارکەر، ناوەڕۆکی نازارەکی تەلەڤزیۆن دووپات دەکاتەوە. بەڵگەیەکی دیکەش هەیە بـۆ دەرخسـتنی کاریگـەری نازارەکـی تەلەڤزیۆن لەسـەر ئەزموونەکانـی تەلەڤزیۆن، ئەویـش ئەوەیـە کە ناتوانـرێ وەک جێگرەوەیەکی تـەواو بەکاربهێنرێ بـۆ فێربوونی زمان.

بەڕێوەبەری سـەنتەری هارلمبۆی منداڵانی بێ سەرپەرشـت پێش تەمەنی چوونە قوتابخانـە، لەمبارەیـەوە دەڵێ: ئەو منداڵانەی دێنە قوتابخانەکەم یەک لەدوای یەک بە کردەوە لاڵن، ناتوانن یەک رسـتەی پێویسـت بڵێن هەرچەندە بەپێی پشکنینی پزیشکی هیـچ کـەم و کورتییەکی جەسـتەیی یا عەقڵییان پێوە نییـە، ئەگەر ئەو هەموو هەزاران کاتژمێـرە کە منداڵانی بچووک بەدیار تەلەڤزیۆنەوە بەسـەری دەبەن، سـەرچاوەیەک بووایە بۆ وریاکردنەوەی زارەکی ء یارمەتیدەری گەشەپێدانی ناوەندەکانی قسەکردن لەناو مێشـکدا، هەروەها ئەگەر ئەو هەموو وشـەو گوزارشـتە جوانە پێگەییوانە، کە لە تەلەڤزیۆنەوە دەردەچن بەشـێوەیەکی کارا کاریان بکردایە وەکو کاریگەری گفتوگۆی واقیعی و گوێگرتن، بە دڵنیاییەوە نەوەیەکی بەتوانا پەروەردە دەبوو، کە زۆر بەمتمانەو راشکاوانە گوزارشتی لە خۆی دەکرد، بەڵام دیارە ئەوە رووی نەداوە.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی پەیوەندی نێوان سـەیرکردنی تەلەڤزیۆن و، توانای زمانەوانـی منداڵانـی پێـش چوونـە قوتابخانە ئەنجـام دراوە، دەرکەوتـووە پەیوەندی پێچەوانـە لـە نێـوان مـاوەی سـەیرکردن و ئەدای ئـەو منداڵانـە لـە تاقیکردنەوەکانی گەشەی زماندا هەبووە، لێکۆڵینەوەکە دەریخست ئەو منداڵانەی لەماڵەوە زۆر سەیری تەلەڤزیۆن دەکەن ئاستی زمانەوانییان نزم بووە، هەروەها کەم و کورتییەکی ترسناک لە توانای زمانەوانی ئەو منداڵانەدا هەیە کە لەگەڵ تەلەڤزیۆن گەورە بوون و ماوەیەکی زۆریش سەیر دەکەن.

دەبێ جیاوازییەکی یەکلاکەرەوە هەبێ لەنێوان ئەزموونی زمانەوانی کە پێویسـتی بـە بەشـداریکردنی ئاڵوگۆڕ نییە وەکـو تەلەڤزیۆن و، ئەزموونێکی دیکە کە پێویسـتی بەوە هەیە منداڵ بە چوسـت و چالاکییەوە تیایدا بەشـدار بێت وەک قسـەکردن لەگەڵ

یەکێکی دیکە. ئەگەر سەیرکردنی تەلەڤزیۆنیش بە راستی جۆرە چالاکییەکی عەقلّی غەیری ئەزموونە واقیعییەکانی ژیانی بگرتایەتەوە، ئەوەی نیشان دەدا کە ئەم چالاکییە بەشەکەی دیکەی مێشک کە لەگەشەکردندایە بەئاگا دەهێنایەوە.

ئایا مێشکی منداڵێکی تەمەن ١٢ ساڵ، کە ماوەی ١٠ هەزار کاتژمێر لە ژوورێکی تاریکدا بە دیار سەیرکردنی کارتۆنەکانی تەلەڤزیۆنەوە بەسەر بردبێ، جیاوازی نابێ لەمێشکی منداڵێک کە کەم سەیری کردبێ، یا هەر سەیری نەکردبێ؟ وەکو جیاوازی نێوان سێیەکانی کەسێکی جگەرەکێش لەگەڵ کەسێکی دیکە، کە نەیکێشابێ؟ ئایا منداڵێک، کە لەگەڵ تەلەڤزیۆن گەورە بووبێ لەوانە نییە بەهرەکانی نیوەگۆی چەپی مێشکی گەشەی کەمتر بێ، لەبەهرەکانی نیوەگۆی راستی مێشک؟

لێرەدا دوو پرسیار سەرهەڵدەدات: ئایا هەر جۆرە ئەزموونێک کە لەسەر منداڵ ئەنجام دەدرێ کار لەگەشەی مێشک دەکات؟ ئەگەر وابێ، ئایا ئەزموونی پێشوەخت کار لە گەشەی قۆناغەکانی دواتر دەکات؟

پرسیاری تایبەت سەبارەت بە ئەگەری توانای ئەزموونێک بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری راستەقینە لەناو مێشکدا، کە ببێتە بابەتێک بۆ لێکدانەوەو بیرکردنەوە تا ئەم سەردەمەش هەر لەئارادایە، هاوکات هەندێ لە زانایان باوەڕیان وایە بەکارهێنانی خانە دەبێتە هۆی پەرەسەندنی خانەکە، دوایی وەکو پێویست دەبێ ورووژێنەرەکانی ژینگەکار لە گەشەی مێشکی منداڵ بکات، هەندێ کەسی دیکە وا هەست دەکەن وزەی مێشک و گەشەسەندنی لەڕووی بۆماوەوە پێشتر مەزەندە کراوەو ناکەوێتە ژێرکاریگەری رووداوو ئەزموونەکانی ژیانەوە.

لە ئەنجامی ئەو ئەزموونانەی لەم دوو دەیەی دواییدا کراون، دەرکەوتووە زۆر لایەنی توێکاری و کیمیای مێشک بە ورووژاندن و ورپاکردنەوە، دەگۆڕێن. لەلایەکی دیکە شارەزایانی کۆمپانیای جەنەڕاڵ ئەلیکتریک پێیانوایە: دوای نیو خولەک لە سەیرکردنی تەلەڤزیۆن مێشک وا دەردەکەوێ کە نوستووە، ئەمەش رووی مەترسی تەلەڤزیۆنە، ئەگەر بینەر لەسەر ئەوە راهات کە خۆی رادەستی بینین بکات ئەوا هەر بەو خۆبەدەستەوەدانە دەمێنێتەوە، لێرەدا مەترسی خۆی حەشارداوە، چونکە مێشک

نیمچە نوسـتووەو لەتوانایـدا نییـە دەروون لـەوە بپارێزێ کە ئاراسـتەی دەکرێ، بێ دەسەڵاتیش دەبێ لە بەرگریکردن، کە زانیارییەکان بەشێوەی باران بەسەریدا دەبارێ کە کاریگەری لاوەکی لە دەروون و عەقڵدا دەردەکەوێ.

**کاریگەری تەلەڤزیۆن لەسەر منداڵ پێش چوونە قوتابخانە:**

سـەیرکردنی تەلەڤزیـۆن لەلایـەن منداڵـی پێـش تەمەنـی قوتابخانـە، نابێتـە هـۆی بەدیهێنانی دەسـکەوتی بنەڕەتی فێربوون، ئەم پرسـیارە سەر هەڵدەدات: تا چ ئاستێک منداڵانی تەمەن سێ، یا چوار ساڵ بە کردەوە سوود لە تەلەڤزیۆن دەبینن؟ ژمارەیەک لە لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە تێگەیشتنی منداڵ لە بابەتی تەلەڤزیۆن پێیانوایە ئەو کاتە منـداڵ بەڕاسـتی چێـژ لـە بەرنامەکانـی تەلەڤزیۆن وەردەگـرێ، کە بـۆ تەمەنی ئەوان داڕێژرا بێت، لەوانەشـە لە کاتی سـەیرکردنی تەلەڤزیۆن ئەوپەڕی بە ئاگابن، بەڵام لە رووداوەکانی واقیعی رۆژانە زۆر کەمتر تێدەگەن.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی تێگەیشتنی منداڵی تەمەن پێش چوونە قوتابخانە لە بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆن بە رێگای هەڵسەنگاندنی بژارکراو، دەرکەوت زۆربەی منداڵان نیـوە کەمتـری زانیارییەکانی بابەتی تاقیکردنەوەکە تێ دەگـەن، ئەو منداڵانەی لەکاتی بەرنامەکـەدا هەندێ لە پرسـیارەکانیان ئاراسـتە کـرا، دەرکەوت توانـای وەرگرتنیان باشـترە لەو منداڵانەی لەکۆتایی بەرنامەکەدا هەموو پرسـیارەکانیان ئاراسـتە کراوە، بەدووریش زانراوە کە لەوانەیە زاکیرە فاکتەری یەکلاکەرەوە بێ نەک تێگەیشتن.

لـە لێکۆڵینەوەیەکـی دیکـەدا بۆمـاوەی بیسـت خولـەک هەقایەتێکـی خەیاڵـی لـەو شـێوانەی، کـە بەشـێوەیەکی گشـتی لـە تەلەڤزیـۆن پیشـانی منداڵانـی چوار سـاڵ و حـەوت سـاڵ و دە سـاڵ دەدرێ نمایـش کـرا، دوای بینینـی فیلمەکـە تاقیکردنـەوەی تێگەیشتنی منداڵ دەریخست، تەنها ٢٠٪یان کە چوار ساڵانن لە ناوەڕۆکی هەقایەتەکە تێگەیشـتوون، بـەڵام ئـەو منداڵانەی گەورەترن تێگەیشـتنیان زۆر زیاتـر بووە. بەپێی تاقیکردنەوەکە، منداڵانی تەمەنی پێش چوونە قوتابخانە نەیانتوانی ئەو شتانە بڵێنەوە، کە لە دیمەنەکاندا بینیویانن، یان نەیانتوانی شیکردنەوەی راست سەبارەت بە رەفتاری ئەکتەرەکانی ئەو فیلمە بەدەستەوە بدەن، کە چییان کردووە.

لە لێکۆڵینەوەی سێیەمدا فیلمێکی تایبەت بە پیاوێک، کە چەند کارێک دەکات وەکو دروستکردنی تاوەرو دانانی بووکە شووشە لە لوتکەی تاوەرەکە بۆ منداڵانی تەمەن چوار ساڵ نمایش کرا، فیلمەکە بیست کاری وەک یەکیشی لەخۆگرتبوو، داوا لە منداڵەکان کرا پێش ئەوەی سەیر بکەن هەمان ئەو کارانە بکەن، کە پیاوەکە لە فیلمەکە دەیکات، کەچی منداڵەکان بە سەیرکردن شتەکان فێر نەبوون، کە لە نێو بیست کاردا توانیان تەنها شەش ئەنجام بدەن.

لەلایەکی دیکە، کۆمەڵەی دووەمی منداڵانی تەمەن چوار ساڵ فیلمەکەیان بەسەرپەرشتی سەرپەرشتیارێکی تاقیکردنەوەکە بینی، ئەو سەرپەرشتیارە بە شێوەیەکی زارەکی باسی کارەکانی ناو فیلمەکەی بۆ منداڵەکان دەکرد، دەرکەوت ئەم کۆمەڵەیە تێگەیشتنی زۆر زیاتریان هەیە، یان بەلای کەمەوە توانای وەبیرهاتنەوەی بابەتی فیلمەکەیان هەیەو، ڕێژەی ٥٠٪ی تواناشیان زیاتر کردووە لە دووبارەکردنەوەی بابەتی فیلمەکە بەشێوەیەکی ڕاستتر.

لێکۆڵەرەوان بۆیان دەرکەوت کە تێگەیشتنی منداڵان و وەبیرهاتنەوەیان بۆ ئەو بابەتانەی، لە تەلەڤزیۆن سەیری دەکەن بە زیادبوونی تەمەن زیاد دەکات، ئەنجامە نوێیەکان پیشانیان داوە منداڵ تا تەمەنی هەشت ساڵ زۆر لەو بابەتانەی سەیری دەکات و دەیبیستێ وەبیری نایەتەوە، باوک و دایک بەڵگەی تایبەتیان هەیە کە کەم و کورتی لە تێگەیشتنی منداڵەکانیان هەیە: دەبینن منداڵەکانیان ماندوون بەرامبەر ئەو بەرنامانەی بە هیچ شێوەیەک تێیان ناگەن.

**تەلەڤزیۆن و قوتابخانە:**

بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکانی ماری وین بەڵگەی بوونی پەیوەندی نێوان سەیرکردنی تەلەڤزیۆن و ئەنجامی خوێندن لەسەر یەک کەڵەکەبوون، ڕادەی سەیرکردنی تەلەڤزیۆن چەند پتر بوایە لەلایەن منداڵەوە ئاستی خوێندن ئەمەندە دادەبەزی، زۆر لە توێژینەوەکانی پەیمانگەی نەتەوەیی بۆ تەندروستی عەقڵیی کە ساڵی ١٩٨٢ ئەنجامی داوە لەبارەی تەلەڤزیۆن، جگە لەیەک لێکۆڵینەوە نەبێ هەموویان ئەوە نیشان دەدەن، کە پەیوەندی خراپ لەنێوان سەیرکردن و ئاستی خوێندندا هەیە، بەبێ ئەوەی هۆکاری

دیکەی هاوکات هەبێ بۆ ئەو دابەزینە.

دیارترین بەڵگە سەبارەت بە بوونی پەیوەندی خراپ لەنێوان سەیرکردنی تەلەڤزیۆن و دابەزینی ئاستی خوێندن لە لێکۆڵینەوەیەکی کەنەدیدا دەرکەوت، کە بەراوردی کرد لەنێوان نمرەی قوتابیانی شاری (نوتل) کە بێ تەلەڤزیۆنە و، قوتابیانی دوو شاری دیکە بەناوی (یونیتیل)، کە یەک کەناڵی تەلەڤزیۆنی هەیە و ئەوی دیکە بەناوی (ملتیتل) کە چەند کەناڵێکی تەلەڤزیۆنی هەیە. منداڵانی شاری نوتل دوای پشت راستکردنی نمرەکانیان، ئاستی بەرزتریان بەدەست هێنا لە قوتابیانی هەموو شارەکانی دیکە، سەرباری ئەوەش، منداڵانی (یونیتل) نمرەی بەرزتریان بەدەست هێنا لە منداڵانی شاری (ملتیتل).

کاتێک بوونی پەیوەندی زۆر خراپ لەنێوان سەیرکردنی تەلەڤزیۆن و ئەنجامی خوێندن جێگیر بوو، بەڵام ئەوە جێگیر نەبوو کەوا غیابی تەلەڤزیۆن بەرپرسیارە لە ئەنجامی خوێندنی منداڵانی (نوتل)، کە بێ تەلەڤزیۆنە و نمرەی بەرزتریان هێناوە، یان ئەوەش جێگیر نەبوو کە سەیرکردنی کەمتر وای لە منداڵانی (یونیتل) کردبێ ئەنجامی باشتر بەدەست بێنن، بەبەراورد لەگەڵ هاوڕێیانیان لە (ملتیتل). لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە هۆکاری دیکە کاریگەری لەسەر ئەوە هەبێ، بۆ نموونە لەوانەیە مامۆستایان لە (نوتل) باشتر بووبن، لەوانەشە لە کاتی شیکردنەوەی ئەنجامەکان رەچاوی فاکتەری کۆمەڵایەتی و ئابووری نەکرابێ.

پاشان تەلەڤزیۆن گەیشتە (نوتل)، ئەگەر هۆکارێکی دیکە هەبێ لە پشت بەرزیی نمرەی قوتابیانی نوتل، ئەوا دوای گەیشتنی تەلەڤزیۆن بۆ هەر ماڵێک نمرەکانی خوێندن تیایدا بە بەرزی دەمێنێتەوە، بەبەراورد لەگەڵ هاوڕێکانیان لە (یونیتل) یان (ملتیتل)، بەڵام مەسەلەکە بەم جۆرە نەبوو، چونکە کاتێ تاقیکردنەوەی منداڵەکان کرایەوە لە (نوتل) دوای دووساڵ لەگەیشتنی تەلەڤزیۆن بۆ شارەکەیان، نمرەکانیان نزم بۆوە بۆ ئاستی هەردوو شارەکەی دیکە.

کۆمەڵناسان پێشبینیان نەکردووە کە تەلەڤزیۆن وەک ئامرازێکی نوێ پەیوەندی هەبێ بە ئەنجامی خوێندنەوە، هەروەها ئامادەباشی پێویستیان نەکردووە بۆ

ئەنجامدانــی لێکۆڵینەوەکانــی پێشــترو دواتــر لــە کۆمەڵــگا جۆراوجۆرەکانــدا، ئەگــەر ئەنجامەکان هاوشــێوەی ئەو ئەنجامانە بوون، کە لە لێکۆڵینەوەیەکی پێشــتر بەدەستی هێنابــێ، ئــەوا پەیوەنــدی نێوان ســەیرکردنی تەلەڤزیــۆن و دابەزینی ئاســتی خوێندن دووپــات دەبــۆوە، بــەڵام توێژینــەوە کەنەدییەکە بــە تەنهایەو، لە کەنەدا یــان ویلایــەتە یەکگرتــوەکان یــان لــە زۆربەی وڵاتانــی رۆژاوا دووبــارە نابێتــەوە، لەبەرئەوەی ئەو کۆمەڵگایانە کە تەلەڤزیۆنی تێدا نییە لێکۆڵینەوەی پێشترو دواتر بوونیان نابێ.

چــوار لێکۆڵینــەوەی دیکە، کە تازە بڵاوکراونەتەوە، جەخت لەســەر پەیوەندی زۆر خراپ لەنێوان سەیرکردن و ئەنجام دەکەنەوە، بەپێی ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە پەیمانگەی نەتەوەیی تەندروستی عەقڵی NIMH ئەنجامی داوە:

لێکۆڵینەوەی یەکەم، لەنێوان قوتابیانی پۆلی شەشەم بووە، کە بەردەوام لەماڵەوە تەلەڤزیۆنیــان هەیــە و هاورێکانیــان کە کەمتر تەلەڤزیۆن دەکەنــەوە، کاتێک نمرەکانی خوێندنــی ئــەو دوو کۆمەڵەیە بەراورد کران، جیاوازی ئەوتــۆ لەئارادا بوو، دەرکەوت نمرەکانــی ســێیەکی ئــەو قوتابیانەی لە ماڵێکدان بــەردەوام تەلەڤزیۆنیــان هەیە بەلای کەمــەوە مــاوەی ســاڵێک لە خــوار ئاســتی پۆلەکەیانــەوە بــوون، لەکاتێکــدا نمرەکانی سێیەکی ئەو کۆمەڵەیەی بە نابەردەوامی سەیری تەلەڤزیۆنیان کردووە لەسەر ئاستی پۆلەکەدا بوون، یان لەئاستی بەرزتردا بوون.

لەلێکۆڵینــەوەی دووەمــدا دەرکــەوت، ئــەو منداڵانــەی رێگەیــان پــێ دراوە رۆژانــە ماوەیەکــی زۆر ســەیری تەلەڤزیــۆن بکەن، لەماوەی ســاڵانی پێش چوونــە قوتابخانە، لــە بابەتەکانــی خوێندنەوەو بیرکاری و زمان لە کۆتایی پۆلی یەکەم نمرەی کەمتریان هێناوە، لەو منداڵانەی کەمتر سەیری تەلەڤزیۆنیان کردووە لەماوەی چوونە قوتابخانە.

بــەڵام هــۆکاری دیکــە بەتایبەتی جیاوازی نمرەی زیرەکــی، لەوانەیە بچێتە ناو ئەم پەیوەندییــە روونــەی نێــوان ســەیرکردنی تەلەڤزیــۆن و ئەنجامــی خوێندنــەوە، بەڵام ئامــادەکاری راپۆرتی NIMH بەردەوامە لە دوورخســتنەوەی ئەم ئەگەرە، نموونەش بۆ ئەمە ئەو لێکۆڵینەوەیە بوو، کە ٦٢٥ قوتابی لەخۆ گرتبوو، هەر لە پۆلی شەشەمەوە تا پۆلی نۆیەم لە یەکێک لە قوتابخانەکانی حکومەت لە گوندەکان.

ئـەو قوتابیانـەی نمـرەی زیرەکییان بەرزەو زۆر سـەیری تەلەڤزیۆن یان کردووە بـەراورد کـراون، لەگـەڵ ئەو قوتابیانـەی هەمان نمـرەی زیرەکییان هەبـووەو کەمتر سـەیری تەلەڤزیۆنیـان کردووە، دەرکەوت ئەو قوتابیانەی کەمتر سـەیری تەلەڤزیۆن دەکەن بەشێوەیەکی بەرچاو نمرەی بەرزتریان هێناوە لەتاقیکردنەوەی خوێندنەوەدا.

بەڵگـەی چوارەمیـش رووپێوێکی فراوان لە کالیفۆرنیا دوای پشـکنینی نەریتەکانی تەلەڤزیۆن و پۆلەکانی خوێندن بۆ زیاتر لە ٣٠٠ هەزار قوتابی هەردوو پۆلی شەشەم و دوازدەیەمی قوتابخانە حکومییەکان پێشکەش کرد، ئەنجامەکان ئەوەیان سەلماند کە پەیوەندی بەهێز لەنێوان سەیرکردنی تەلەڤزیۆن و خوێندندا هەیە. چاودێری فێرکردن لـە کالیفۆرنیـا سـەرنجیدا، کـە فاکتەرەکانی وەکـو زیرەکی و داهاتـی دایک و باوک و ماوەی ئەرکی قوتابخانە لەماڵەوە، پەیوەندی خراپی نێوان سـەیرکردنی تەلەڤزیۆن و ئەنجامـی خوێنـدن ناگـۆڕێ، ئەمەش بووە بەڵگەیەک کە بڵـێ: تەلەڤزیۆن بەهای نییەو باشتر وایە دابخرێ.

لەوانەیـە سـەلماندنی بوونـی پەیوەنـدی خـراپ لەنێـوان سـەیرکردنی تەلەڤزیۆن و ئەنجامـی خوێنـدن گرنگـی زیاتـر بـێ، لە هەوڵـی تێگەیشـتنی هۆکارەکە لـە بوونی ئـەو پەیوەندییـە. بیرکردنـەوەش لـەو هـۆکارەی لـە سـەیرکردنی تەلەڤزیـۆن بـکات، ئەنجامی خراپی هەبێ لەسـەر خوێندنی قوتابیان نابێ فەرامۆش بکرێ. ئەگەرەکانیش لەمبارەیـەوە رۆڵـی خۆیان هەیە، بۆ نموونە ئەگەری گۆڕانی سـایکۆلۆژی لە چۆنێتی بیرکردنـەوە، کـە بـە هۆی روبەروبوونـەوەی منداڵ لەگەڵ تەلەڤزیۆن دروسـت دەبێ کاتـێ کیمیای مێشـک دووچاری گۆڕانـی ژینگەیی دەبێ، هەروەهـا ئەگەری دابەزینی فراوانی ئاستی خوێندن وەک چالاکییەکی ئازاد، پاشان پشتگوێخستنی ئەو ئەرکانەی، گرنگن بۆ گەشـەکردنی بەهرەی زارەکی کە پێویسـتە بۆ قوتابخانە، ئەمانە هەموویان رۆڵیان هەیە لەئاستی خوێندندا.

بەڵام ئەو دیاردەیەی کاریگەری کەمتر نییە و لەوانەیە ئەوە بسەلمێنێ تەلەڤزیۆن کاریگـەری لەسـەر خوێندنی منداڵ هەیە، ئەوەیە کـە بوونی تەلەڤزیۆن لەماڵەوە وا لە منداڵان دەکات تا درەنگی شەو نەخەون بەپێچەوانەی سەردەمی پێش تەلەڤزیۆن، ئەم

راستییەش لە ئامارەکانی راپۆرتی کارگێری تەندروستی گشتی لەسەر (تەلەڤزیۆن و رەفتاری کۆمەلایەتی) دووپات کراوەتەوە.

ئـەو کـەم و کورتییـە کەمە کـە لەنووسـتنی منداڵدا هەیە، سـەرەڕای گرنگی خۆی لەوانەشە وا لە منداڵ بکات لە قوتابخانە ئاگای لە وانەکان نەبێ، مامۆستایەکی یەکێک لە قوتابخانەکانی سـەرەتایی لە فرەنسـا لەوبارەیەوە دەڵێ: دەتوانم ئەو قوتابیانە جیا بکەمەوە، کە لە ماڵەوە تەلەڤزیۆنیان هەیەو ئەوانەی نیانە، چونکە ئەوانەی نیانە توانای هەرسکردنی زانیاری و هزریان لەبەیانیاندا هەیە.

سـەرەڕای بوونـی بەڵگـەی بەهێز لـە کاریگەری سـەیرکردنی تەلەڤزیۆن لەسـەر ئەنجامی قوتابخانە، بەڵام هەرگیز ناکرێ بڕیاری کۆتایی بدرێ کە تەلەڤزیۆن هۆکاری راستەقینەیە. هەمیشە ئەگەرێک هەیە هەرچەندە لاوازیش بێت، کە هۆکارێکیتر هەیە وا لەو منداڵە بکات زۆر سەیری تەلەڤزیۆن دەکات، خراپتر بێ لەو منداڵەی کەمتر سەیر دەکات، یان ئەوانەی هەر سەیر ناکەن. لە کۆتاییدا باوک و دایک بە سەلیقەی خۆیان دەتوانن باشترین بڕیار بدەن بۆ بەرژەوندی منداڵەکانیان.

هەر سەلیقەی دروستیشە کە بەسەر بڕیاری باوک و دایک زاڵە، نەک باوەڕبوون بە دروستی بەڵگەی زانستی، ئەمەش تێڕوانینی مامۆستای پەیوەندییەکان بوو لە زانکۆی بەنسلفانیا، کە بەشداری کۆنگرەی کاریگەری تەلەڤزیۆن لەسەر فێربوونی منداڵ کرد، بـە زمانێکـی وتارخوێندنـەوە پرسـیاری کرد: ئایا دەکـرێ بڵێین ئەگـەر تەلەڤزیۆنمان دوور خستەوە منداڵان زیاتر فێر دەبن؟ ئێمە نازانین، بەڵام هەر خۆیشی دواتر وتی: هەرچەنـدە مـن ئەوەم وت، دەبێ ئەوەش بڵێم، کە دوو منداڵم هەیە ٩ سـاڵ و ١١سـاڵ نایەڵم یەک کاتژمێر زیاتر سەیری تەلەڤزیۆن بکەن.

**تەلەڤزیۆن و توندوتیژی:**

بابەتـی توندوتیـژی لەسـەر شاشـەی تەلەڤزیـۆن و ئەگـەری کاریگـەری لەسـەر منـداڵ تـا ماوەیەکی زۆر مایەی ناکۆکی بوو، لەمبارەیەوە لەسـەر داوای کۆنگریسـی ئەمریـکا لەسـالانی ١٩٥٤و ١٩٦١و ١٩٧٠و ١٩٧٧، چەندیـن توێژینـەوە ئەنجـام درا. کاتێک کارگێری تەندروسـتی گشـتی راپۆرتێکی سـەبارەت بە (تەلەڤزیۆن و رەفتاری

کۆمەڵایەتی) بڵاوکردەوە، لە کۆی پێنج بەرگ چوار بەرگی تەرخان کردبوو بۆ لێکۆڵینەوە سەبارەت بە شوێنەواری سەیرکردنی بەرنامەی توندوتیژی تەلەڤزیۆن.

زۆربەی ئەو سمینارو وتارو لێکۆڵینەوانە کە سەبارەت بە کاریگەری تەلەڤزیۆن لەسەر منداڵ ئەنجام دەدرێن، هەموویان بابەتەکانیان تەنها لەسەر ئەم پرسە دەبێ. ئەم زۆر بایەخدانەش بە کاریگەری توندوتیژی شاشە لەسەر منداڵ پاساوی خۆی هەیە: ژمارەی ئەو مێردمنداڵانەی دەسگیر کراون بەهۆی ئەنجامدانی تاوانی توندوتیژی ترسناک لەنێوان سالانی ١٩٥٢و ١٩٧٢ گەیشتە ١٦٪، بەپێی راپۆرتی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی FBIو بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی بەهێز کە لە سەنتەری لێکۆڵینەوەکانی تاوانناسی و یاسای تاوانکاری لە زانکۆی بنسلفانیا ئەنجام درا، بەراورد لەنێوان دوو کۆمەڵەی گەورەی لاوان لە شارەکاندا کرا، کۆمەڵێکیان لەساڵی شەستەکان کامل (الرشد) بوون، ئەوی دیکەش لە هەفتاکان گەیشتبوونە ئەو تەمەنە، دەرکەوت کە تێکڕای کوشتن و توندوتیژی لەناو کۆمەڵەی هەفتاکان سێ ئەمەندە زیاترە لە کۆمەڵەی شەستەکانی هاوتای، لەبەرئەوەی ماوەی نێوان ١٩٥٢ و١٩٧٢ ماوەی راستەقینەی تەواو دەرکەوتنی تەلەڤزیۆن بوو لە ژیانی منداڵی ئەمریکادا، چونکە ئەو منداڵانەی گەیشتنە تەمەنی کامڵبوون (الرشد) لەساڵی ١٩٦٠ لەناوەڕۆکدا بە نەوەی پێش تەلەڤزیۆن ناو دەبردرێن، لەگەڵ زۆری ئەو بەرنامە توندوتیژانە کە منداڵ سەیری دەکەن بۆیە پێویستە بگەڕێین بەدوای پەیوەندی نێوان هەردوو پرسەکە.

بەڵام ئەم پرسە تائێستا مشتومڕی نێوان کۆمەڵناسان و لێکۆڵەرەوانە سەرەڕای هەوڵی زۆریان بۆ سەلماندنی، توندوتیژی لەڕاستیدا مایەی رکوکینەو رەفتاری سادیزم و سەرنجڕاکێشە بە هەموو جۆرەکانییەوە، کە لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆن دەردەکەوێ و هەر دەبێ لە رەفتاری منداڵ رەنگ بداتەوە، بەڵام ئەوەی روونە وایان لێ ناکات بەشێوەیەکی ترسناک دژی کۆمەڵ رەفتار بکەن، بەهەر حاڵ زۆربەی منداڵانی ئەمریکا دووچاری ئەو بەرنامە توندوتیژانە دەبنەوە، کە پێشنیار کراوە بۆ لێکۆڵینەوەکردن وەک هۆکارێک بۆ زیاتر نانەوەی توندوتیژی لای مێردمنداڵ، پاشان

ئـەو منداڵانــەی ئاماری لێکۆڵینەوەکانی فیدراڵی دەیانگرێتەوە ڕێژەیەکی زۆر کەمن لە جەماوەری بینەردا.

لەکاتێکـدا ئەو تازەکرنەوەیەی حکومەتی فیدراڵی سـاڵی ١٩٨٢ کردوویێتی لەسـەر ڕاپۆرتی کارگێڕی تەندروستی گشتی کە ساڵی ١٩٧٢ ئەنجام دراوە، دەرکەوت بەڵگە هەیە کە توندوتیژی زیاد لەسەر شاشە دەبێتە هۆی ڕەفتاری شەڕانگێزی ڕاستەوخۆو تونـد لەنێـوان منـداڵان و هەرزەکارانـدا، ڕوون و ئاشـکرایە ئـەو ڕەفتـارە وەک لـە تاقیگەکانی لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە، تەنها دەسـتدرێژی سێکسـی و کوشتن ناگرێتەوە کـە تاوانـی ترسـناکن وەک لە ڕاپۆرتـی فیدراڵیدا هاتووە، بەڵکو ئەو دەسـتدرێژییەش دەگرێتەوە کە لەنێو منداڵاندا باوە وەکو پاڵنان و دەستوەشاندن و لێدان ء شتی دیکە.

توندوتیـژی لەسـەر شاشـە وا لـە منداڵانـی ئاسـایی دەکات تـاوان ئەنجـام بدەن، بیرۆکەیەکـە هێشـتا بەتـەواوی درکـی پـێ نەکـراوەو یـەکلا نەبۆتەوە. دایـک و باوک بـە هەسـتی دڵنیایـی خۆیانەوە پێیانوایـە سـەیرکردنی بەرنامەی توندوتیـژی لەلایەن منداڵەکانیـان مانـای دەسـت درێژی و کوشـتن ناگەیەنـێ، بەڵکو ڕێگەیـان دەداتێ کە نەرمی بنوێنن بەرامبەر نغرۆبونیان لە بەرنامەی کاریگەرو توندوتیژ، سـەرەڕای ئەو ئامۆژگاریانەی دەروونناسان و پەروەردەکاران لەوبارەیەوە پێشکەشی دەکەن.

زەحمەتـە بـۆ دایـک و باوک ئـەو بیرۆکەیە پەسـند بکەن کە تەلەڤزیـۆن هاندەری ڕەفتـاری شـەڕانگێزی بـێ، بەتایبەتـی لەماڵـەوە کە تەلەڤزیـۆن ئەرکی دیکـە دەبینێ، تەلەڤزیـۆن وا لـە منـداڵ دەکات ئـارام و سـلبی بـێ و لـە تونـدی یاریکـردن و هەراو هوریای کەم بکاتەوە، ڕێگە لە بەردەم تەقینەوەو هەڵچوونی نێوان خوشـک و براکان بگـرێ، هەنـدێ کردەوەی تێکدەرانەی منداڵیش لەماڵەوە ناهێڵێ کە دووچاری دەبنەوە ئەگەر بەرنامەکانی تەلەڤزیۆن و وەک The Dukes Of Hazzard یان وەک The Incredible سەرقاڵیان نەکات.

لێکۆڵـەرەوە (گەشـتکار سـیلما فربیـرگ) هۆکارێکـی بەهێـزی پێشـکەش کـرد بـۆ ڕەتکردنـەوەی بوونی پەیوەندی ڕاسـتەوخۆ لەنێوان سـەیرکردنی تەلەڤزیۆن لەلایەن منداڵانی ئاسـایی و بەرنامەکانی توندوتیژی و نێوان بڵاوبوونەوەی پەتاکە، کە دەڵێ:

مـن مەبەسـتم نییە کە رۆمانە خەیاڵی و بازارییەکانـی تەلەڤزیۆن بتوانن منداڵەکانمان بکاتە تاوانبار، کاریگەری ئەم رۆمانانە لە بۆچوون و رەفتاری منداڵ لەواقیعدا دوورە، ئێمـە پێویسـتیمان بەوەیـە ئەوەمان وەبیر بێتەوە کە دایـک و باوک نەوەی ویژدانن و ئـەو منداڵـەش کە پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ دایـک و باوکیدا هەیە رێنماییەکانی ئەوان بەئاسانی پشتگوێ ناخات ئەگەر لێیان دوور بکەوێتەوە، باوەڕیش ناکەم هیچ کەسێک لە ئێمە پێویست بکات لەو جۆرە گەندەڵییە ترسی هەبێ.

تێنەگەیشـتنێکیتر سـەبارەت بە توندوتیژبوونی رەفتاری منداڵ بەهۆی توندوتیژی تەلەڤزیۆن لەئارادایە، یەکێک لە رەخنەگرانی تەلەڤزیۆن پێیوایە ئەگەر ئەوە راست بێت، ئەوا کاریگەری دیکەی لەئەنجامی لایەنی ئەخلاقی حەتمی و خێرخوازی بۆ خودی ئەو بەرنامە توندانە دێتە ئاراوە، بۆ نموونە: ئەگەر کەڵەکەبوونی لەسـەریەکی سـەیرکردن هەمووبـان وردە وردە بکاتـە بوونـەوەری گەنـدەڵ، ئەوا کەڵەکەبوونی سـەیرکردنی شـتی بـاش دەبـێ وردە وردە بمانکاتە بوونەوەری پیرۆز، کەواتـە تۆ ناتوانی ئەمیان بـێ ئەویان بەدەسـت بێنـی، مەگەر خوا نەگینا ئەگەر تۆ ئامادەیی ئەوە بسـەلمێنی کە شـەڕخوازیی شـتێکە لە کۆلیسـترۆڵ دەچێ- شتێکە بەهێواشـی کۆدەبێتەوەو جوڵەی لـەش پـەک دەخـات، لەکاتێکـدا خێر وەکو سـپێناخ وایـە کە زوو هـەرس دەبێ وخێرا دەردەدرێ.

بەڵام ئەگەر ناوەڕۆکی توندی بەرنامەکان نەبێ کە دەبێتە هۆی رەفتاری توندوتیژ، ئایـا تەنهـا رێکـەوت بوو کـە هاتنی تەلەڤزیون بـۆ ناو ماڵی ئەمریـکا خراپترین پەتای توندوتیـژی هەرزەکارانـی لەگـەڵ خـۆی هێنابێ؟ مامۆسـتایەکی یاسـاو کۆمەڵناسـی سەبارەت بەو هەستەی کە تەلەڤزیۆن فاکتەرێکی هاوبەشە لە دروستبوونی توندوتیژی مێردمنداڵان و هەرزەکارن دەڵێ: من پێشـنیاری بوونی پەیوەندی راسـتەوخۆ لەگەڵ تەلەڤزیۆن ناکەم، بەڵام ئەوەی تەسەور ناکرێ نەبوونی هیچ کاریگەرییەکە.

لەڕاستیدا هۆکار هەیە باوەڕمان پێ دێنێ کە تەلەڤزیۆن تارادەیەکی زۆر بەشداری بەرزکردنەوەی نوێی لەپڕی دیاردەی دەستدرێژی مێردمنداڵانی کردووە، بەتایبەتیش لـە گەشـەکردنی نەوەیەکـی نوێـی ترسـاو لـە مێردمنداڵانـی خراپـەکار. بـەڵام ئـەو

لێکۆڵینەوانە سەبارەت بە پەیوەندی راستەوخۆ لەنێوان بەرنامەی توندوتیژو کاری توندتیژی سنوورێک دادەنێن، لەوانەیە خودی ئەزموونی تەلەڤزیۆن بە چاوپۆشین لە ناوەڕۆکەکەی و، کاریگەری لە ئیدراکی منداڵ بۆ واقیع سوودی زیاتر بێت لەچوارچێوەی لێکۆڵینەوە.

یەکێک لەو میکانیزمانەی منداڵ بەهۆیەوە فێری رەفتار دەبێ بریتییە لە لاساییکردنەوەی دەوروبەری، جا ئەو رەفتارە نەرمی نواندن بێ یان رەفتاری توندوتیژ یان رەفتاری وەکو جگەرەکێشان و یاری ئەتاری بێ، یان جنێوو یان هەر رەفتارێکی باش و خراپ بێ، لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە دەروونناسان لەسەر دوو کۆمەڵە منداڵ ئەنجامیان داوە، کۆمەڵەی یەکەم بۆ ماوەی یەک کاتژمێر سەیری دیمەنە توندوتیژەکانی تەلەڤزیۆنی کردووەو، کۆمەڵەی دووەم سەیری دیمەنەکەیان نەکردووە، دوای تەواوبونی فیلمەکە دەرکەوتووە ئەو کۆمەڵەیەی سەیری دیمەنە توندوتیژەکەیان کردووە بەئاشکرا رەفتاری شەڕانگێزیان پێوە دیار بووە بەرامبەر منداڵانی تر بەپێچەوانەی کۆمەڵەکەی ترەوە.

تەلەڤزیۆن کە بەردەوام لەماڵەکانماندایە کاریگەری نێگەتیڤی خۆی هەر دەبێ، فیلمی (بکوژانی خۆڕسک)ی ئۆلیڤەر ستون رەوشی زیادەڕۆیی ئەم نەوەیە دەنوێنێ، فیلمەکە کامێرای تەلەڤزیۆن بەرپرسیار دەکات لە پاڵنانی هەرزەکاران بۆ توندوتیژی و کەتن و تاوان، مەسەلەکە لەمەش تێپەڕی کردووە، کە فیلمی مایکل مور (بولینگ لە کولومباین) دەبینێ کە خەڵاتی ئۆسکاری وەرگرتووە، توێژینەوەیەکی دیکە کە لە کۆتایی نەوەدەکاندا ئەنجام دراوە ئاماژە بەوە دەدات لەنێوان ناوەڕۆکی بەرنامەکانی تەلەڤزیۆن دیمەنی توندوتیژی و دەستدرێژی پلەی یەکەم داگیر دەکات، توێژینەوەکە دەریخستووە، رێژەی ٧٩٪ی فیلمە کارتۆنییەکان کە لە دەرەوە هاتووە بڕێکی زۆر لە دیمەن و هزری توندوتیژی لەخۆ دەگرێ.

بەپێی توێژینەوەیەکی نوێ لە بەریتانیا سەیرکردنی دیمەنە توندوتیژییەکانی تەلەڤزیۆن لەوانەش فیلمی کارتۆن، وا لە منداڵ دەکەن پتر رەفتاری شەڕانگێزی بنوێنن کاتێ گەورە دەبن، توێژینەوەکە کە ماوەی ١٥ ساڵی خایاندووە ئاشکرای

کـردووه، بەرنامەکانـی تەلەڤزیۆن کار لە رەفتـاری منداڵ دەکات، ئەگەر بگاتە تەمەنی گەنجێتی و ژینگەی خێزانیشی بەهەر شێوەیەک بێ.

توێژینەوەیەکـی دیکـەی نوێـی بەریتانیـا روونیکردۆتـەوە کـە ژمـارەی دیمـەن و دیـاردەی توندوتیـژی لەمـاوەی دوو سـاڵدا دوو هێنـدە زیـادی کـردووە، بەهـۆی سەیرکردنی دیمەنی مردن یان کوشتنی نزیکەی ٣٣٥ کەس لە ماوەی تەنها ١٤رۆژدا. نوێتریـن توێژینـەوەش لـە شـیکاگۆ بـەدوای ٣٢٩ حاڵەتـدا چـووە، دوای ١٥ سـاڵ لە بەشداربوونیان لە لێکۆڵینەوەی پێشوو کاتێ منداڵ بوون لەنێوان تەمەنی ٦-١٠ ساڵ.

تیمێـک بـە سەرپەرشـتی (د. رۆل هوسـمان) لـە زانکـۆی مەشـیگان سـەرلەنوێ توێژینـەوەی حاڵەتـی بۆ ئەو کورو کچانەی کە نموونەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکە بوون و گەیشـتبوونە تەمەنـی سـەرەتای سـییەکان ئەنجامـدا، کە پرسـیاری ئاراسـتەکردن لەبارەی ئەو بەرنامانەی تەلەڤزیۆن کە ئەوان وەک کەسانی کامل بە باشتری دەزانن، هەروەها لەبارەی رەفتاری شەڕانگێزیش.

هەروەها هاوسـەرو هاوڕێکانیشـیان رادەی شـەڕانگێزیانیان پۆلێن کرد، تۆماری تـاوان و سـەرپێچیەکانی بـواری هاتوچۆشـیان بەدواداچوونـی بـۆ کـرا، لەئەنجامـدا دەرکەوت ئەو پیاوانەی بە منداڵی رێژەیەکی زۆری بەرنامەی توندوتیژی تەلەڤزیۆنیان بینیـوە، بـە رادەی سـێ هێنـدە زیاتـر مامەڵـەی خراپیان لەگـەڵ ژنەکانیانـدا کردووە، کاردانەوەشـیان بەرامبـەر هەر مامەڵەیەکی خراپی بەرامبەریـان هەر توندوتیژ بووە، هەندێکیشیان بەوە تۆمەتبار کران کە سەرپێچی کەتنکاریی هاتوچۆیان هەبووە، بەڵام ئـەو ژنانـەی بە منداڵـی زۆر بەرنامەی توندوتیـژی تەلەڤزیۆنیان بینیوە پتر تووشـی ئەوە بوونە هەر شتێک بە رووی هاوسەری ژیانیان فڕێ بدەن بە رادەی چوار هێندە ئەمەنـدە، هەروەهـا ئامـادەش بوونـە لە هەر کەسـێک بدەن کە لێیان تـوڕە دەبێ، یان ئامادەن بۆ سەرپێچی کەتنکاری یان هاتوچۆ.

**٢- کۆمپیوتەر:**

لـە کاتێکـدا بابەتی کاریگەری تەکنیکی سـەردەم بایەخێکی جیهانی پێ دراوە، ئەوا کاریگـەری دەرکەوتنـی کۆمپیوتـەر رەهەندگەلێکـی نوێـی و بایەخێکی پتـری پێ درا،

بەهـۆی ئـەو گۆڕانکارییـە بنەڕەتیانـە کـە لە شـێوازەکانی ژیانـەوە دێنێتە ئـاراوە، لە کۆتایـی چلەکانی سـەدەی ڕابردووەوە لە مـاوەی دوای جەنگی دووەمی گیتی گرنگی بە کۆمپیوتەر دراوە.

هەروەسا لە ئەنجامی شۆڕشی زانیاری و گەشەی پیشەسازی کۆمپیوتەر، کۆمەڵگە ڕووبەڕووی هەڕەشـەی هەنووکەیی و ئاییندە دەبێتەوە، کە هەسـتێکی گشـتی هەیە لە زۆربـەی وڵاتانـی دونیـادا کـە باوەڕ بـەوە بکەن کۆمەڵگـە بـەرەو بەکۆمپیوتەربوون (الحوسـبە) دەچـێ، مەبەسـتیش لەوە پشتبەسـتنێکی زۆرە بە کۆمپیوتـەر، کە ئەمیش بووە هۆی لەدایکبوونی هەستێکی قووڵتر بە هەستکردن بە بەرپرسیاریتی کۆمەڵایەتی، دەکرێ بەم ڕێگایانە سوود لە کۆمپیوتەر وەربگیرێ:

ا. هاندانی خەڵک سەبارەت بەفێربوونی چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمپیوتەردا.

ب. فێربـوون لەڕێگـەی کۆمپیوتـەرەوە: یەکێکـە لەو ڕۆڵانەی کۆمپیوتـەر کەزیاتر پەیوەنـدی بـە فێربوونـەوە هەیە لـەڕووی ناوەڕۆکی زانسـتی کە تێیـدا بەرنامەکاری گێڕانەوەو یاری بەکاردەهێنین، بەکارهێنانی کۆمپیوتەر ئامرازێکیشە بۆ کۆکردنەوەی داتاو شیکردنەوەو ڕێکخستنی.

ج. فێربوون لە کۆمپیوتەرەوە: زیاد لە هەموو جۆرێکی دی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بەکاردەهێنرێ، بە سوودوەرگرتن لە بەرنامە فێرکارییە جۆراوجۆرەکانی.

### کارتێکردنی کۆمپیوتەر لە تاک و کۆمەڵ:

١- لەمیانـەی کۆمپیوتـەرەوە تاک دەتوانێـت زۆرترین ڕێژەی زانیاری کۆ بکاتەوە کە لە کاتی پێویستدا دەتوانێ بیگەڕێنێتەوە بەپێی ئەوەی لە مێشکدا جێی دەبێتەوە، بێ ئەوەی هەوڵبدات چ لەڕووی کۆکردنەوەی چ لەڕووی گەڕانەوەی، پاشان ئەوە دەبێتە شتێکی ئاسانکار بۆ یادو، یارمەتیدەرێکە بۆ ڕاپەڕاندنی کارە گرنگەکانی.

٢- لەمیانەیـدا تـاک ئـەو کارامایانە فێر دەبێ کـە خەڵکی دی دەیانزانێ، کە دەکرێ هەندێ پیشەو پیشەسازی و تەنانەت یاریکردن فێرببێ لە کاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر.

٣- پشوودانێکە بۆ تاکەکان لەمیانەیدا دەتوانن هەندێ کاتی خۆیان لە پەیڕەوکردنی ئارەزووەکانیـان وەکـو نیگارو نووسـین و پەیڕەوکردنی یاری جیاواز بەسـەر ببەن،

پاشان ئاسانكارييەكە بۆ كەسێتی بە هەموو مانای وشەكە.

٤- بە هۆیەوە بەشێوەی بەرنامەكراو قوتابی فێر دەكرێ، ئەمەش یەكێكە لە پراكتیزەكردنی بیردۆزی رەفتاریی.

٥- ئامرازێكە ناتوانرێ هەنووكە وازی لێ بهێنرێ، لە چارەسەركردن بەشێوەیەكی گشتی و چارەسەری دەروونی بەشێوەیەكی تایبەتی، كە دەشێ هەندێ بەرنامە كۆ بكەیتەوە كە چارەسەری هەندێ پرسی دەروونی دەكات بێ ئەوەی پەنا بۆ پسپۆران ببردرێ.

### ئامێری كۆمپیوتەر لە ژووری خوێندن:

لەبەرئەوەی زۆربەی ئامێرەكانی كۆمپیوتەر، كە لە بەرنامە پەروەردەییەكاندا بەكار دەهێنرێن، خاوەن شاشەی نمیچە تەلەڤزیۆنین بۆ نمایشكردنی بابەتەكان، كەواتە بەكارهێنانی كۆمپیوتەر لەگەڵ سەیركردنی تەلەڤزیۆن بەشێوەیەكی یەكسان زیاتر هان دەدرێ، بەڵام دەبێ جیاوازییەكی گرنگ روون بكرێتەوە.

بەرنامەكانی تەلەڤزیۆن چ لەماڵەوە یان لە قوتابخانە بابەتی بینینی بە جوڵە و دەنگ بڵاو دەكەنەوەو ئەزموونێك پێشكەش دەكەن، كە تیایدا رەگەزی بینین زاڵە بەسەر رەگەزی زارەكی، بەڵام ئەو بابەتانەی لەسەر شاشەی كۆمپیوتەر نمایش دەكرێن یا بینینە وەكو یاری ڤیدیۆ، یان لەبنەڕەتدا زارەكییە بۆ نموونە: ئەوەی تایبەتە بە وشە، وشە بەرهەم دێنێ نەك وێنە لەسەر شاشەی بینراو.

كۆمپیوتەر كە كۆگایەكی زانیارییە هەیە، خاوەنەكەی دەتوانێ لەرێگەی ئەو وشانەی لەسەر شاشە بینراوەكە دەردەكەون، زۆر لەو زانیاریانە ئاشكرا بكات. هەندێ گومانیش لەوە دەكرێ، كە ئامێرەكانی كۆمپیوتەر سەرچاوەی گرنگ بن بۆ قوتابیانی پێشكەوتوو، ئەوانەی سەرقاڵی لێكۆڵینەوەن وەكو رۆژنامەنووسان و زانایان و كەسانی دیكە، كە پێویستیان بەوەیە زوو بگەنە برێك بابەتی پۆلێنكراو، بەڵام سەبارەت بەو قوتابیانەی لە پلەی نزمتری پەروەردەیین بوونی ئامێری كۆمپیوتەر لە ژووری خوێندن سوودی كەمترە وەك لەوەی خەڵك بۆی دەچێت.

لەوانەیە هەندێجار ئامێری كۆمپیوتەر ببێتە هۆی ئاڵۆزبوون و تێكدانی هەندێ

شـتی سـاده، دەکرێ نموونەیەک لەوبارەیەوە لە ژمارەیەک لەبەرنامەکانی کۆمپیوتەر ببینـن کـە پێشـنیاری یارمەتیدانـی بەکارهێنەرانـی کۆمپیوتەر دەکات بۆ باشـترکرنی ئاسـتی حنجەکردنیـان، ئەمیش بەدڵنیاییـەوە ژمارەیەکی زۆری قوتابیانی سـەرەتایی پێویسـتیان پێـی دەبـێ، بەڵام پرۆسـەی پاراسـتنی بەرنامـەی حنجەکردنـی بابەتێکی نووسـراو، وەک یەکێک لە رەخنەگران ئاماژەی پێداوە پێویسـتی بە ماوەیەکی زۆرتر هەیە، وەک ئەوەی بەکارهێنانی فەرهەنگێکی ئاسایی دەیەوێ.

ژمارەیەکـی زۆر بەرنامـەی کۆمپیوتـەر بۆ خزمەتـی قوتابخانـەکان خراوەتەگەڕ، کـە کارێکـی پەروەردەیـی بەپێـزی تێدایە لـەڕووی کارامەیـی جۆراوجـۆری زارەکی و بەکارهێنانـی لەلایـەن منداڵانـەوە، بەڵام سـەرەڕای لایەنی پرشـنگداری کۆمپیتەری رۆژگاری بۆشاییگەری لە ژووری خوێندن، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ لەگەڵ ئامرازێکی فێـرکاری زیاتـر ئاسـان بـەراورد بکرێ کە تـا ماوەیەکـی زۆریش پاڵپشـتی بنەڕەتی مامۆستا بوو لە ژووری خوێندنی سەرەتایی ئەویش کتێبی کارە، لە هەموو حاڵەتێکدا بابەتـی بژارکـراو هەیـە بۆ پڕکردنەوەی کاتی قوتابی بەو شـێوەیەی سـوودی هەبێ، بەبێ بوونی مامۆسـتاش کە خۆی بۆ کارکردن لەگەڵ یەکێک لە قوتابییەکان تەرخان دەکات، یان لەگەڵ ژمارەیەکی کەمیان.

مامۆستا کە بەتەنها لەگەڵ یەکێک لە قوتابیەکان کار دەکات، مامۆستای بەتوانا کە دەتوانێ درک بە پێویستیە تایبەتییەکانی منداڵ بکات و شرۆڤە و گفتوگۆ بکات و شی بکاتەوەو ئیلهام ببەخشێ، هەمیشە ئەزموونێکی پەروەردەیی زیاتر بەسوود لە کتێبی کار، یـان بەرنامـەی کۆمپیوتـەر فەراهەم دەکات، مادام مامۆسـتایانی بەتوانا بوونەتە کاڵایەکی دەگمەن، کەواتە هەمیشـە پێویسـتیمان بە ئامرازی فێرکاری سـەرنجراکێش هەیە بۆ پڕکردنەوەی کات، بەڵام بەراوردکردنی نێوان بەرنامەی فێرکردنی کۆمپیوتەرو کتێبی کار لەوانەیە بۆ یاداشتنامەی پڕ ئومێدی جەماوەر سوودی هەبێ.

لەکاتێکیشدا لەوانەیە ئەم ئامرازە میکانیکیانە بە کەڵک بن بۆ بەهێزکردنی کارامەیی چۆنایەتـی دیاریکـراو، ئـەوا ئامانجی گرنگی پەروەردەیی توانای هەرسـکردنی هزری ئاڵـۆزە بەروونـی و توانـای تێگەیشـتن لـە هـزرو رازی کەسـانیتر، هەروەهـا توانای

هەڵسەنگاندنی راست وشتی لەو بابەتە، وەکو ئەم ئامانجانە ئەگەری ئەوە نییە بەبێ رابەری پەروەردەیی بەدەست بێت: مامۆستایەک بتوانێ سەرچاوەی نایاب پێشکەش بکات، کە پێشبینی ناکرێ (سەرچاوەی ئاسان، بەپێز) بۆئامێری کۆمپیوتەری شەخسی سەرسورهێنەر تایبەت بە کچ یان کوڕ (مێشکی مرۆیی).

لە پێناو ئەوەی دایک و باوک لەژیان بەردەوام بن پێویستیان بە هەندێ کات هەبوو بۆ خۆیان دوور لە داواکارییە بەردەوامەکانی منداڵ، بۆیە لەسەریان پێویست بوو پەرە بەو شێوازانە بدەن کە دژی بۆچوونە کۆنەکانە، چونکە شێوازی کۆن تەرکیزی دەکردە سەر باوک و دایک زیاتر لە منداڵ، بەڵام ئەم شێوازانە سەلماندیان کە گرنگی بۆ خودی منداڵان هەیە، چونکە هەندێ لەو زیادەڕۆییانەی پەروەردە کە تەرکیز دەکاتە سەر منداڵ، هاوسەنگیی وەرگرت.

کاتێ تەلەڤزیۆن خۆی وەک ئەلتەرناتیڤێکی ئاسانتر هێنایە ئاراوە، دایک و باوک دەستبەرداری زۆر لە یاساکانی رێککردنی رەفتار بوونەوە، لە هەڵسەنگاندنی مانای تەلەڤزیۆن لە ژیانی ئەمڕۆی منداڵاندا گرنگ ئەوەیە لەو چالاکی و رەفتارانەی دایکوباوک وردبینەوە کە لە سییەکان و چلەکان و پەنجاکان بە کردەوە دەیانکرد کاتێ کە پێویست بوو لەسەریان بەئاسانی برێک دوور بکەونەوە لە منداڵەکانیان. لە رێگەی توێژینەوە لە شێوازەکانی ئەو رەفتارانە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو شێوازانە چیان پێشکەش منداڵ کردووەو، چییان پێشکەشی دایک و باوک کردووە لە ئاسوودەیی پشوودان.

**٣- ئینتەرنێت:**

ئینتەرنێت گرنگترین ئامرازی میدیاییە بەشێوەیەکی رەها، بەهۆی بەجیهانیبوونی و ئاسانی بەکارهێنانی و جگە لە زۆری زانیارییەکانی و هەمەچەشنی سەرچاوەکانی، لەسەر بنەمایەک سەیری ئینتەرنێت دەکرێ کە گرنگترین ئامرازەو لە پرۆسەی کارلێککردن و پەیوەندی ناوخۆیی و جیهانی زۆر کارایە.

زاراوای ئینتەرنێت لە وشەی ئینگلیزی (Net)ەوە وەرگیراوە کە واتای (تۆڕ) دەگەیەنێ، دواتر لە واتا فەرهەنگییە ئاساییەکەوە گۆڕدرا بۆ واتایەکیتر لە بواری

تەکنەلۆژیـاو زانیاریـدا، کـە تۆڕی زانیـاری یان تۆڕی ناردنـی تەلەڤزیۆنی و رادیۆیی دەگەیەنـێ، واتـای تۆڕی جیهانی (Intrnational Net work) ناگەیەنێ، بەڵکو واتای پەیوەنـدی نێوانیـی (ناوخۆیـی) تـۆڕەکان (Intrnational Net work) دەگەیەنێ. بە چەند ناوێکی تریش هاتووە، لەوانە (the net)، تۆڕی جاڵجاڵۆکە (the web)، رێگەی ئەلیکترۆنـی خێـرای زانیارییـەکان (electronic sapir highway). بەپێـی زاراوە، زانیارییەکان گوزارشتە لە کۆمەڵێک کەرەستە و بابەتی زانیاری ئامێزی گرێدراو، جا ئەگەر تۆڕەکان لۆکاڵی بێ یاخود فراوان.

ئینتەرنێت دەرەنجامـی پـرۆژەی ئەربانـت بـوو کەسـاڵی ١٩٦٩ هاتـە ئـاراوە کـە پرۆژەیەکـی وەزارەتـی بەرگـری ویلایەتـە یەکگرتووەکانـی ئەمریـکا بـوو لـە پێنـاو یارمەتیدانـی سـوپای ئەمریـکا لەرێگـەی تۆڕەکانـی کۆمپیوتـەرەوەو بەسـتنەوەی بەتۆڕەکانی زانکۆو دامەزراوەکانی لێکۆڵینەوەو سـوودوەرگرتن لەتوانای ئەو ئامێرە کۆمپیوتەرانەی کە هەیە.

لـە سـەرەتای ١٩٨٣ وەزارەتـی بەرگـری ئەمریـکا پرۆتۆکۆڵـی ناسـراو بـە ncp گۆڕی بە کۆمەڵی پرۆتۆکۆڵی دیکە کە بووە هۆی بەسـتنەوەی دامەزراوی نیشـتمانی زانیارییەکان زانکۆکانی ئەمریکا کە بووە هۆی ئاسانکردنی پەیوەندی نێوان قوتابیانی زانکـۆکان و گۆڕینـەوەی پۆسـتی ئەلیکترۆنـی و زانیـاری، بەگەیشـتنی زانکـۆکان بە تۆڕەکانـەوە، تـۆڕەکان فراوانتـر بـوون و پێشـکەوتن و، قوتابیـان بەشـداریيان کـرد لـە زانیـاری و راگۆڕینـەوەو، بەهۆیـەوە چەندیـن لاپـەڕەی ئەلیکترۆنی دروسـت کرا لەوانەش (موزاییک و جوفر و ئارشی)، کۆمپانیای گەورەی (نتسکیب) کە لەبنەڕەتدا بە هەوڵی قوتابیان دروسـت بوو پێش ئەوەی عەقڵیەتی بازرگانی گەلالەی بکات، پاشـان ئەندازیارنی ئینتەرنێت گەیاندیانە ئەمڕۆ کە بووە یەکێک لە هۆکارەکانی سـەرکەوتنی تۆڕەکە، لە نەوەدەکانیشـەوە بەکارهێنانی ئینتەرنێت سـالانە ١٠٠٪ زیادی کردو رۆژ بەرۆژ خزمەتگوزارییەکانی لەزیادبوندایە.

هەرچەندە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەستی بە تۆڕی ئینتەرنێت کردووە، بەلام ئێسـتا موڵکـی کـەس نییەو کـەس ناتوانێـت کۆنترۆڵی بـکات. بەگوێرەی پێناسـەکەی

ئینتەرنێت کـە تـۆڕی تۆڕەکانـە، ئەوا هەموو کەسـێک تـۆڕی خۆی هەیـەو بەڕێوەی دەبـات و کۆنترۆڵـی دەکات بێ ئەوەی دەسـەڵاتی هەبێ بـۆ کۆنترۆڵکردنی تۆڕەکانی دی. ئەمـە لەگـەڵ تواناکـەی ناکۆک نییە کە هەندێ وڵات هەندێ ڕێسـاو یاسـا دابنێن بـۆ بەکارهێنەرانـی ئینتەرنێت، بـەڵام وڵاتێـک ناتوانـێ کـۆت و بەنـد لەسـەر هەموو بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت دابنێت.

**بوارەکانی ئینتەرنێت:**

لەمـاوەی ئـەم چەند سـاڵەی دواییدا بەشـداربوانی تـۆڕی ئینتەرنێت بەرێژەیەکی زۆر زیـادی کـردووە، کـە دەتوانـن ئینتەرنێت بـۆ پۆسـتی ئەلیکترۆنـی و بەرنامەی پەیوەندیکـردن بـە کۆمپیوتـەری دیکەوەو بەرنامەی ئاڵوگۆڕی فایل و دۆسـییەکان و وێستگەی گفتوگۆکردن و گرێدەری تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی جیهانی (W.W.W) بەکار بێنن.

ئینتەرنێـت چەندیـن خزمەتگوزاری جیاواز پێشـکەش دەکات کە بوارەکانی میدیاو بازرگانـی و ئەکادیمـی و سیاسـی و پزیشـکی و.. هتـد دەگرێتـەوە، سـەرجەم ئـەو خزمەتگوزاریانە کە ئینتەرنێت پێشکەشـی دەکات خزمەتگوزاری میدیاییە کە خزمەتی تاکەکان و دامەزراوو ڕێکخراوە ڕەسمی و مەدەنییەکان دەکات، ئەم خزمەتگوزاریانەش لە زیادبوونی بەردەوامدان، هەورەها خزمەتگوزارییە کۆنەکانیش پێش خراون. نموونە بۆ بەکارهێنانی میدیایی ئینتەرنێت:

١- گـەڕان و لێکۆڵینـەوە: بەرنامەگەلێکی تایبەتمەندە بەسـەر تۆڕی پەیوەندیکردن بەکارهێنەر سوودی لێ دەبینێ و کارئاسانی بۆ دەکات، کە وشەیەکی لێکۆڵینەوەکەی دادەنێ و بۆی دەگەڕێ، ئەویش بەسـتراوە بە سـەرجەم لەماڵپەرو سـایدەکانی ترەوە بۆئەوەی داتاو زانیاریەکانی بۆ بێنێتە بەردەست، لەوانەش پێگەی گەورەی گووگڵ.

٢- پۆسـتی ئەلیکترۆنی (e-mail): بەهێزترین هۆکارو خزمەتگوزاری ڕەخسـاوە لەرێگەی تۆڕەکانەوە، هەروەها بەناوبانگترین و بڵاوترین خزمەتگوزارییە، کە لەلایەن دەیان ملیۆن کەسـەوە بەکاردەهێنرێ، ئەم خزمەتگوزارییە لەبەرئەوەی خێراو ئاسان و هـەرزان و فەراهـەم کـراوە بـۆ سـەرجەم بەکارهێنەرانی ڕەواجی هەیـە، هەروەها ڕێگایەکـی نموونەییـە بـۆ پەیوەندیکردن بـە هاوڕێیان و هـاوکاران لەجیهاندا، بەهۆی

هەرزانی و دوانەکەوتنی، بەپێچەوانەی پۆستی ئاسایی یان پەلەپۆست.

ئەم خزمەتگوزارییە پێویستی بە وەڵامدانەوەی دەستبەجێ نییە وەکو تەلەڤزیۆن، بەڵکو دەکرێ هەر کاتێک وەڵام بدرێتەوە، بێگومان بەکارهێنەری پۆستی ئەلیکترۆنی دەتوانێ لەیەک پۆستدا ژمارەیەکی زۆر زانیاری پۆست بکات، هەروەها دەشتوانێ نامەکە بنووسێ و بژاری بکات پێش ئەوەی رەوانەی بکات.

لە بەناوبانگترین خزمەتگوزاری دەساودەستکراوو بەناوبانگترینیانە، کە رێژەی ٩٠٪ی کۆمپانیا بازرگانییەکان و بزنسمانانی ولاتانی جیهانی پیشەسازی لە کاری رۆژانەیاندا پشتی پێ دەبەستن، کۆمپانیا گەورەکانیش ئەم خزمەتگوزاریانەیان تەنها نێودەوڵەتیانە پێشکەشیان کردووە، بەتایبەتیش بۆ خزمەتگوزاری کۆمپانیاو دامەزراوە بازرگانییەکان و بزنسمانان و بەگشتیش بۆ ئەوانەی دەیانەوێ سوودی لێ وەربگرن، ئەوەی وایکردووە ئەم خزمەتگوزاریانە بڵاو بێتەوە.

٣- تۆرە کۆمەڵایەتییەکان: لەوانەش فەیسبوک و تویتەرو یوتیوب .. هتد، کە تیایدا تاکەکانی کۆمەڵگە پێکەوە پەیوەندی دەکەن و هەواڵی کۆمەڵایەتی و روناکبیری و هەمەجۆر دەگۆڕنەوەو یەکتر دەناسن، بەرنامەگەلێکە داتاو زانیاری دەرەخسێنێ کە لەبنەڕەتدا ژمارەن، بەڵام تەرجەمە دەکرێ بۆ وشەو دەکەوێتە سەر شاشە.

٤- کۆبوونەوەو کۆنگرە: بەکارهێنەری تۆڕی ئینتەرنێت دەتوانی کۆبوونەوەو کۆنگرەکان ببینێ لەرێگەی بەرنامەکانی گواستنەوەی وێنەو دەنگ بەئاسانی.

**خەسڵەتە تایبەتییەکانی ئینتەرنێت:**

ئینتەرنێت سیستەم و ئامرازێکی خێراو زیندووی پەیوەندیکردنی خزمەتگوزارییە بە سەرجەم تاکەکانی مرۆڤایەتی، بێ رەچاوکردنی سنوورەکان لە رێگەی بەستنەوەی ملیۆنەها تۆڕی جیاوازی تایبەتی و گشتی پێکەوەو، سەرجەم ولاتانی جیهان و دامەزراوە ئەکادیمی و حکومی بە ناوخۆیی و دەرەکییەوە گرێ داوە، ئینتەرنێت رۆژانە زۆرترین خزمەتگوزاری و داتاو زانیاری لە سەرجەم بوارەکانی ژیانی سیاسی و ئابووری و بازرگانی و فێرکردن و پەیوندی کۆمەڵایەتی و میدیا بەدەنگ و رەنگ و راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ پێشکەش دەکات، سەبارەت بە میدیایش ئینتەرنێت

بە قەڵەمبازێکی گەورەی مێژوویی دەژمێردرێ کە کاری ملیۆنەها ئامرازو دەزگای میدیایی ئەنجام دەدات لەرێگەی پێشکەشکردنی راستەوخۆی زانیاری داتاکانەوە، هەروەها توانی چەمکە جیاوازەکانی کۆمەلایەتی و رووناکبیری و بازرگانی و کارو پەروەردەو فێرکردن بگۆڕێت. لە خەسڵەتە تایبەتییەکانیشی:

**١- رەوایی و راستگۆیی:**

سەرجەم کۆت و پێوەندەکان لەسەر بەکارهێنانی خزمەتگوزاری وێب لەبواری ئەکادیمی پەیوەستن بە درککردنی رەوایی و راستگۆیی و بەڵگەنامە ژمارەییەکان، واتە وەرگرتنی بەڵگە دەستەبەربووەکان لەشێوەی ئەلیکترۆنیدا تەنیا بە بەشێک لە تۆماری ئەکادیمی فەراهەمبوو بۆ توێژینەوەی زانستی پەیوەستەو، گرفتی یەکەم کە پەیوەستە بە رەوایی، پەیوەستە بە نهێنی ئەدەبی، ئاسانی کۆپیکردنی دەقە ئەلیکترۆنییەکان هەلی ناهاوسەنگ دەرەخسێنێ بۆ قسە هەڵبەستن و دزینی ئەدەبی. بەلام گرفتی دووەم پەیوەستە بە سەختی لە دەستنیشانکردنی بەڵگەنامە ئەلیکترۆنییەکان. گرفتی سێیەم پەیوەستە بە خێرایی و بەردەوام لەناوچوون و، وایلێهاتووە هەندێجار بە تێڕوانینێکی نێگەتیڤ سەیری تۆڕی ئینتەرنێت و خزمەتگوزاری وێب دەکرێ، سەرەڕای ئەوەی پێشکەشی کردووە لە چوارچێوەی پاڵپشتی گەیاندنی جیهانی و پەلەکردن لێی و پشتگیری لە بلاوکردنەوەی لۆکاڵییانەی بۆ زانیارییە ئەلیکترۆنییەکان و ئاسانکاری بە ئەنجامدانی پرۆسەکانی وانەوتنەوە بەهاوکاری کۆمپیوتەرەو پاڵپشتی ستراتیژیەتەکانی فێرکردن لە دوورەوە، هەروەها وێب دەتوانێ لە زیادبوونی داهاتی دەزگا بازرگانییەکان بەکاربهێنرێ لەمیانەی رێکلام و پاراستنی پەیوەندییە بازرگانییەکان و ئەنجامدانی پرۆسە جۆراوجۆرەکانی هەرمێنکردن، بەجۆرێک پاڵپشت بێ بۆ جیهانگیریی و رووبەرووی دیاریکردنی رکابەری بازرگانی ببێتەوە.

**٢- رزگاربوون لە وەهم و مشتومڕ:**

لەم سالانەی دوایی هەندێ بەڵگە ئاشکرا بوون بەوەی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لەوانەیە تاڕادەیەک لەسەرخۆو بێ ئومێدانە بێ و، تۆڕی ئینتەرنێت مشتومڕو ناکۆکییەکی زۆری دروستکرد لەنێوان ئەو بەکارهێنەرانەی کە لە بنەمادا لە زانایان و شارەزایانی

کۆمپیوتەرو سیستەمەکانی زانیاری بوون کە بانگەشەی ئازادی زانیارییەکانیان دەکرد، بەڵام بە گەشەی ئینتەرنێت و تەواوبوونی لەگەڵ پێداویستیەکانی کۆمەڵگەو پەیڕەوکردنە بازرگانی و گرێبەستییەکەی بەسیفەتێکی گشتی، زۆر لە حکومەتەکان هەوڵیاندا هەندێ یاسا دابڕێژن کە کۆنترۆڵی ماددە پێشکەوتوو و فەراهەمبووەکانی سەر ئینتەرنێت بکەن کە لەو بەکارهێنانە ناگونجاوانە بیپارێزن کە لەگەڵ بەهاو دابونەریتی کۆمەڵگە یەکناگرێتەوە، لەئەنجامی ئەمەدا ململانێ و مشتومڕ لەبارەی پرەنسیپی ئازادی لە بڵاوکردنەوەو ئاگاداری دەرکەوتن.

**٣- کەمیی تێچوون:**

سەرەڕای پێشکەوتنی خەسڵەتی بازرگانی ئینتەرنێت بە خێراییەکی زۆر، بەڵام زۆر لە دەزگاو رێکخراوو زانکۆو پەیمانگە توێژینەوەییەکان زانیاری و سەرچاوەکانیان بەبێ بەرابەر بۆ بەشداربوان دەستەبەر دەکات، وەک پشتگیرییەک بۆ ئەرکەکانی توێژینەوە کە کات و ماندوبوونێکی کەمی دەوێ، ئەکتیڤی تێچوونی تەکنەلۆژیا پەیوەستە بە رێنماییکردنی کاتی دیاریکراو بۆ بەکارهێنەران و وردیی بودجە دەستەبەربووەکان لە خزمەتگوزارییە جیاوازەکان.

**٤- ئاسانی بەکارهێنان:**

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پێشکەوتو و پەرەپێدانی پرۆگرامکارییە نوێیەکان بەتایبەتی ئاستگەلی نوێ و زۆر پێشکەوتوو بۆ کارلێکە دینامیکییەکان دەبێتە هۆی بەکارهێنانی ئینتەرنێت بەئاسانی.

**٥- نوێگەری و دەستبەجێیی:**

تۆڕی وێبی جیهانی هەموو نوێیەکی تۆمارکراو لەسەری پێشکەش بە بەکارهێنەرانی دەکات، بەمەش وێب وەک ئامرازێکە بۆ کەمکردنەوەی مەوداکان و کۆتاییهێنان بە سنووری دەستکرد لەنێوان بوارەکانی فێربوونی پێکەوە بەستراو.

چەند ساڵێکە ئینتەرنێت بە چەشنێکی خێرا خۆی خستۆتە ناو پێکهاتەی جیهانی مرۆڤەکانەوە، ئەم دۆخە نوێیە وای لە زۆربەی زانایانی ئینفۆرماتیک و دەروونناسان کردووە، بگەنە ئەو بڕوایەی ئینتەرنێت وەکو بەرهەمێکی کۆمەڵگەی زانیاری و

تەکنەلۆژیای پەیوەندی داهاتووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە بناغەوە دەگۆڕێ.

ئینتەرنێت بایەخێکی جیاوازی لە هەموو بوارەکانی سیاسی و هزری و سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی بۆخۆی پەیدا کردووەو، تەنها ناوەندێکی نوێ نییە بەڵکو شتێکە وا دەکات کە کاری کۆمەڵێک لە هۆکاری پەیوەندی پێکەوە بکرێ، بەهەمان ئەو ڕێگایانەی کە تەلەفۆن و تەلەڤزیۆن کاری پێدەکەن، مرۆڤ سەری سوور دەمێنێ لەبارەی ئەو هەموو خزمەتەی ئەم تۆڕە لەسەر هەموو ئاستەکان پێشکەشی دەکات.

**خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت:**

مەودایەکی فراوان هەیە لە خزمەتگوزاری دەستەبەربوو لەرێگەی تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە، بەجۆرێک ئینتەرنێت ئامرازێکی گەیاندن و سەرچاوەیەکی فێربوونی بازرگانی و ئامرازێکی خۆش رابواردن و، هەرمێن خستن و برەوپێدانی پێشکەوتووە بۆ ئەوپەڕی سنوور. لە دیارترین خزمەتگوزارییەکانی:

**١- ئامرازێکی گەیاندن:**

لەو کاتەی ئینتەرنێت برەوی پێدراوە وەک ئامرازێک بۆ هەموو شێوەکانی گەیاندن بەکاردێ، بەتایبەتی گەیاندنی دوو قوڵی کارلێککراو، کە گفتوگۆ بە دەنگ و وێنە دەبێ و زانینی گرنگترین رووداوە جیهانی و ناوخۆییەکان لە خێراترین کات و بە کەمترین تێچوون. هەروەها خزمەتگوزاری پۆستی ئەلیکترۆنی بۆ ئاڵوگۆڕی نامەی ئەلیکترۆنی لەنێوان هاوبەشەکان لە هەر کوێیەکی جیهاندا بێ و لە چەند ساتێکی کەمدا. هاوکات بەکارهێنانی ئینتەرنێت وەک سەرچاوەیەکی سەرەکی هەواڵ پشتی پێدەبەسترێ، پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لەبواری کۆمپیوتەر گەیشتۆتە بوارەکانی هەواڵی تەلەڤزیۆنی، بەجۆرێک دەکرێ تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی لەلایەن پەیامنێرانەوە بەکار بهێنرێ بۆ ناردنی بەرهەمە هەواڵیەکانیان بۆ کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکانیان لە سەرانسەری جیهاندا.

**٢- سەرچاوەیەکی فێربوون و رۆشنبیری:**

ئینتەرنێت تا ئەوپەڕی سنوور فێربوون و رۆشنبیریی پێشکەش دەکات، بەکارهێنەرانی دەتوانن بگەنە بنەمای داتاو دەقی وتاری گۆڤارەکان و بڵاوکردنەوەی

توێژینـەوەو، سـەرچاوە جیاوازەکانـی ئینسـکلۆپیدیاو بەڵگەنامـە و چاپەمەنییـە جۆراوجۆرەکان لە سەرانسەری جیهاندا، هەروەها یارمەتی توێژەرو قوتابیان دەدات لە پەیوەندی راسـتەوخۆیان بەیەکتر بـۆ ئاڵوگۆڕی راوبۆچوون لەبارەی تاقیکردنەوە توێژینەوەیـی و زانینـە هاوشـێوەکان. هەروەهـا ئینتەرنێت توانای نـوێ بۆ فێربوونی کـراوەو فێرکـردن لـە دوورەوە دەڕەخسـێنێ بۆ ئـەو قوتابیانەی کـە لەناوچە دوورە دەستەکاندا دەژین و، ئاسانکاری پێویستی فێرکارییان بۆ فەراهەم دەکات بۆ توانادار کردنیان لە فێربوون بەدرێژایی ژیانیان. هەروەها بەخشـینی توانای بەشـداریکردنە لە گردبوونەوە نێودەوڵەتییەکان و ژوورەکانی چاتدا.

### ٣- سەرچاوەیەکی بازرگانی:

لەم ساڵانەی دواییەدا بواری کارکردن وردە وردە بایەخی زۆری پێدەدرێ لەسەر ئینتەرنێت، بەڵام هێشتا زۆر پرسی هونەری هەن پەیوەستن بە قەبارەی چوارچێوەو مەودای بەرسڤەوە کە هێشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە بۆئەوەی بگەینە راستگۆیی و بڕواپێکـراوی مامەڵـە بازرگانییـەکان لەسـەر ئەم تۆڕە (web)، کـە تۆڕێکی تەواوە لە بازاڕە بازرگانییەکان کە کاڵاو هاوردە یان فرۆشـیارو بەکاربردنە لە سەرانسـەری جیهان خۆیان تیا دەنوێنن.

### ٤- ئامرازێکی ئاسوودەکردن و هەڕمێن کردن:

ئینتەرنێـت توانایەکـی بـێ کۆتایـی هەیـە بۆئـەوەی ببێتـە سـەرچاوەو ئامرازێکی ئاسوودەو هەڕمێنکردن بۆ بەکارهێنەران بە سەرجەم تەمەن و ئاست و بایەخەکانیان، ئێسـتاش ژمارەیەکی یەکجار گەورە لە يارييەکانی کۆمپیوتەرو بوارو خەسـڵەتەکانی ڤیدیـۆو دەنگییـەکان وێنـەی تەلەڤزیۆنـی راسـتەوخۆ دەگرێتـەوە، ئەمـە جگـە لـە خزمەتگوزاریـە بیسـتن و بینینییـەکان وەک ناردنـی نامـەی دەنگیـان بۆ کەسـێ یان هەندێ کەس و پەخشکردنی زانیارییە بیستن و بینینییەکان، بواردان بە تەماشاکردنی دیوکۆمێنتـە جۆراوجـۆرەکان. هەروەهـا ئینتەرنیـت رۆڵێکـی گـەورەی بینیـوە بـۆ بـە زانسـتیکردنی کۆمەڵگـەکان و نزیککردنـەوەی سـنوورەکان لـە یەکتـر، هەروەهـا دروسـتکردنی گۆڕانکاری جۆراوجۆر لەناو کۆمەڵا و کۆمەڵگەکاندا چ بە لایەنی باش

بێ یان خراپ.

چاوەڕوان دەکرێ لەسالانی داهاتوو ئینتەرنێت ببێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی لە بەرهەمە هەرمێن کردنەکان کە لەسەر رادیۆو تەلەفزیۆن و ڤیدیۆو (CDRom) دەستەبەر بووە، بەم شێوەیە ئینتەرنێت بووە ئەو ئامرازە کاریگەرانە لە دەسکەوتنی بەرهەمەکانی هەرمێن کردن.

**گرنگترین سوودەکانی ئینتەرنێت لەسەر باری دەروونی تاک:**

١- بەهۆیەوە تاک دەتوانێ پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکات کە لێکچوونێکی لەگەڵیاندا هەیە، پاشان بەوپێیە دەتوانێ چارەسەری دەروونی خۆی بکات یان لە پەشێوی کەم بکاتەوە.

٢- بەهۆیەوە تاک دەتوانێ کارێک بدۆزێتەوەو لەسەر باری دەروونی رەنگ بداتەوەو بەرەو سەقامگیری ئابووری ببات.

٣- بەشداری لە تۆڕی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی تاک لەناو کۆمەڵگەکەی دەکات بێ ئەوەی سەردانیان بکات، تەنانەت ئەو ماوە دوورەی نێوانیشیان کورت دەکاتەوە، ئینتەرنێت جیهانی کردۆتە گوندێکی بچووک و هیچ شتێک نییە لە تاکەوە دوور بێت.

٤- بەهۆیەوە تاک دەتوانێت ئەو زانیاریە بەدەست بێنێت کە دێتە خەیاڵی، تەنانەت لە ئەنجامی ئەوەشدا وای لە تاک کردووە واز لە گۆڤارو رۆژنامەو کتێب و تەلەڤزیۆن و رادیۆ بێنێ و بەتەواوی پشت بە ئینتەرنێت ببەستێت، هەندێ کەسیش لەو باوەڕەدایە لەمەودواش ئامرازێکی دیکەی میدیا نییە وەکو ئینتەرنێت و شان لە شانی گرنگییەکەی بدات.

٥- لەرێگەی شوێنی ئەلیکترۆنی تایبەت بە چارەسەرکردن یارمەتی چارەسەرکردنی گرفتی هەندێ کەس دەدات.

٦- یارمەتی خۆشگوزەری دەدات و هەنووکەش باشترین ئامرازە بۆ کات بەسەربردن لەو کۆمەڵگایانەی کە خەڵک کاتی خۆیان پتر لە ماڵەوە بەسەر دەبەن، کە تاک دەتوانێ لەڕێگەیەوە گۆرانی و سروودو بەرنامەگەلێکی جیاوازو ئەو یاریانیانەش بدۆزێتەوە، کە بەشداری چێکردنی ماریفی دەکات و کار بۆ سووککردنەوەی فشارە

دەروونیەکانی دەکات، کە کۆمەڵگە بەهۆی ئاڵۆزییەکانیەوە بۆی هێناوەتە ئاراوە.

**ئاڵوودەبوون بە ئینتەرنێت:**

دیاردەی ئاڵوودەبـوون بـە ئینتەرنێت بـۆ چەنـد هۆکارێـک دەگەڕێتـەوە، لەوانە بێزاربـوون، ڤالایـی، تەنهایـی، سەرنجراکێشـییەکانی ئینتەرنێـت و شـتی دیکـە بەپێی ئارەزوەکانـی تاک. یەکەم کەسـیش کـە زاراوەی ئاڵوودەبوونـی ئینتەرنێتی بەکارهێنا خانمە دەروونناسی ئەمریکی (کیمبرلی یۆنگ) بوو کە یەکەم پزیشکی دەروونناسییە، کە لەساڵی ١٩٩٤ەوە لەئەمریکا خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەم بوارەیە. یۆنگ وا پێناسەی ئاڵودەبوونـی ئینتەرنێـت دەکات کـە بریتییە لە بەکارهێنانی تـۆڕی ئینتەرنێت زیاتر لە ٣٨ کاژێر لە هەفتەیەکدا.

لـە نیشـانەکانی: ئاڵوودەبـوو هەسـت بـەوە دەکات لـە دۆخێکـی دڵەراوکـێ و بارگرژیدایـە کاتێـک کۆمپیوتـەر لـە ئینتەرنێـتەکە جـودا دەکرێتـەوە، لەهەمـان کاتدا هەسـت بـە بەختەوەرییەکی فرە دەکات کاتێک دەگەڕێتـەوە بۆ بەکارهێنانی، هەروەها لـە دۆخێکـی هەمیشـە چاودێریکردنی ئەو ماوەیـەی داهاتوودایە، کـە ئینتەرنێتی تێدا بەکاردەهێنێ، ئاڵودەبوو کاتێک لەسەر ئینتەرنێتدایە هەست بە تێپەڕبوونی کات ناکات، ئەو ئاڵوودەبونەشی دەبێتە هۆی گرفتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کرداری.

بەکارهێنـەری ئینتەرنێـت پێویسـتی بـە مـاوەی درێژتـر هەیـە لـە بەکارهێنانـی ئینتەرنێت بۆئەوەی ئارەزووەکەی تێر بکات، هەروەها هەموو هەوڵەکانی بۆ وازهێنان لـە ئاڵوودەبوونەکەی شکسـت دێنێ، زۆرجاریش ئاڵوودەبـوو ئەم هۆکارە بەکاردێنێ بۆئەوەی لە ئاریشە تایبەتەکانی هەڵبێ.

«جون گرهول» مامۆستای دەروونناسـی ئەمریکایی سەرنجی داوە ئاڵوودەبوونی ئینتەرنێـت پرۆسـەیەکی کاتییـە، کـە دەبینیـن بەکارهێنەرانـی نـوێ پتـر ئینتەرنێت بەکاردەهێنن بەهۆی سەرسامبوونیان بەو ئامرازە، پاشان دوای ماوەیەک بەکارهێنەر تووشـی بـێ ئومێـدی دەبـێ لـە ئینتەرنێـت، بۆیـە تاڕادەیەکـی زۆر بەکارهێنانی کەم دەکاتەوە، پاش ئەوەش پرۆسـەی هاوسـەنگبوونی کەسەکە لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت دێتە ئاراوە.

بـەڵام هەنـدێ کـەس قۆناغـی ئاڵوودەبوونەکەیان درێژە دەکێشـێ و زۆر بەکاری دەهێنن و ناتوانن دەستبەرداری ببن، هەندێ کەس پێیوایە یان بەپێی هەندێ لێکۆڵینەوە کـە لـەم هەمبـەرەدا کراوە ئەو خەڵکانەی کە پتر تووشـی ئاڵوودەبوون دەبن ئەوانەن کـە کەسـانی خەمـۆک و کەسـێتی دڵەراوکێیان هەیە، هەروەسـا ئەوانەشـی تووشـی بێزاربوون بوونە وەکو ژنی ماڵەوە، هەندێ کەسی دیکەش پێیوایە ئەو خەڵکەی توانای بیرکردنـەوەی رووتیان هەیـە ئەوانەش دووچاری ئاڵوودەبوون دەبنەوە بەهۆی زۆر راکێشـانیان بەرەو ورووژاندنی ئاوەزییان، کە بەهۆی ئەو برە زۆرەی زانیاریەوە لە ئینتەرنێت دێتە ئاراوە، ئاڵوودەبوو هەست بە کات ناکات و ئاڵودەبوونەکەی دووچاری گرفتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کرداری دەکات.

تـۆڕی ئینتەرنێـت (تـۆڕی زانیـاری) تازەترین تەکنیکی ئێسـتایە، کە بەسـتراوە بە تەکنیکـی پەیوەنـدی و زانیـاری و کۆمپیوتـەرەوە کە لـە کۆتایی سـەدەی رابردووەوە زۆر پێشـکەوتنی بەخـۆوە بینیـوە، ئێستاشـی لەگەڵدا بـێ بەخێرایی و بـە بەردەوامی لەگۆڕاندایە. لە زۆر ناوەندی جیاوازدا ئەوە بڵاوە کە ئینتەرنێت بۆ کات بەسـەربردن و بێزارکـردن و گـەڕان بـەدوای شـتە قەدەغراوەکاندا بەکار دەهێنـرێ، هەرگیز ئەمە راسـت نییە، چونکە بەکارهێنانی جدی و بەسـوود هەیە لە مەیدانە جیاوازەکانی ژیان و رۆشنبیری و زانستی و کۆمەڵایەتی و شتی دیکەش، ئارستەکردن و رێنمایی لێرەدا رۆڵی گرنگی خۆی دەبینێ بۆ سوودوەرگرتن لەم تەکنیکە پێشکەوتووەو بەسوودە.

ئاڵوودەبوون بە ئینتەرنێتـەوە بە واتای کات بەسـەربردنێکی دوورو درێژ لەگەڵ تۆڕەکـەو فەرامۆشـکردنی کاری بەرپرسـیاریێتی کـە پێویسـتە ئەنجام بـدرێ کارێکی واقیعیانەیـە، ئەمـەش چەندیـن شـیکردنەوەی بـۆ کـراوە لەوانـە: تاموچێژی کەسـیی (شخصي) کە ئەم تەکنیکە پێشکەشی دەکات کە تەکنیکێکی سەرنجراکێشەو پێویستی بە کات هەیە، لەمیانەی ئەم تەکنیکەدا تاک دەتوانێ هەست بە بەدیهێنانی خودی خۆی بـکات، هەروەهـا هەڵاتن لە گرفتە کـرداری و کۆمەڵایەتییەکانیش بە هۆکارێکی گرنگ دادەنرێ بۆ رووکردنە ئەم تەکنیکە.

مرۆڤ بەشـێوەیەکی خۆڕسـکانە لـە ئازار دوور دەکەوێتەوەو لـە تاموچێژیش بە

هەموو جۆرەکانییەوە نزیک دەبێتەوە، کە پێویستی چارەسەرکردنی گرفتەکان و بەرەنگاربوونەوەی دەخاتەڕوو لەجیاتی ئەوەی لێی را بکات، هەروەها لەوانەیە کەسی کەمتەرخەم بۆ داپۆشینی کەم و کورتی و کەمتەرخەمییەکانی و فەرامۆشکردنی ئەرکە جۆراوجۆرەکانی بەپاساوی ئەوەی کارێکی دیکەی بەسوود ئەنجام دەدات، روو دەکاتە ئینتەرنێت. هەروەها لە هۆکارە گشتییەکان گەڕان بەدوای بەدیهێنانی کەسێتی و سەلماندنیتی، ئینتەرنێت بوارێکی گونجاو لەڕووی رادەربڕین و دیالۆگ فەراهەم دەکات، سەرباری کۆنترۆلکردنی تەکنیکات و داهێنان بەشێوەیەکی نیمچە ئاسان، کە بەکارهێنەر گورجوگۆڵ دەکات و وای لێ دەکات هەست بە بەهاو گرنگی خۆی بکات، بەتایبەت لەکاتێکدا کە دەوروبەری هەست بەو شتانە نەکەن.

هەروەها ئاڵودەبووی ئینتەرنێت دووچاری دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و زیادەڕۆیی لە خواردن و هەستکردن بە ئاسایش و کشانەوە دەکات، وای لێ دەکات لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە توانای بەرەنگاربوونەوەی نەمێنێ، ئەمیش رەنگدانەوەی کەموکورتییە لە بونیاتنان و پێگەیشتنی دەروونی، کە کارامەیی پەیوەندیکردنی کەم دەبێتەوەو، ناتوانێ پەیوەندی بەتین لەگەڵ کەسانی دی دروست بکات، هەروەسا ناتوانێ بەئاسانی گوزراشت لە خۆی بکات و توانای بڕیاردانی کەم دەبێتەوە.

**٤- سینەما:**

سینەما لەڕووی کردارییەوە بریتییە لە دەزگایەک یان ئامێرێکی وێنەگرتن لەسەر فیلم (شریت)ێک و دەزگایەکی دیکە بۆ نمایشکردنی ئەو فیلمە، دوای ئەوە دەزگاو ئامرازگەلێکی دیکەی پاڵپشتی دێنە ئاراوە بۆ دروستکردنی سینەما وەکو دەزگاکانی ششتنەوە واتە دەرخستن و جێگیرکردنی فیلمەکەو چاپکردنی، هەروەسا دەزگاکانی مۆنتاژ واتە پێکهێنان و شوێنی نمایشکردن و دەزگاکانی دەنگ.

**ئەدگارە میدیاییە دەروونییەکانی سینەما:**

١- توانای خەیاڵکردن و فراوانی ئاسۆی بینەرو بەستنەوەی فیلمەکە بە واقیعەوە.

٢- سینەما توانای ئەوەی هەیە یاساکانی کات و شوێن بگۆڕێ و وا پیشانی بینەر بدات کە راستین.

٣- سینەما توانای ئەوەی هەیە جیهانێکی نوێ بۆ بینەر دروست بکات و بە تێڕوانینێکی خودییانەی پەتییەوە سەیری بابەتەکە بکات.

٤- لە ڕێگەی ئامێرەکانییەوە جەماوەرێکی باش بۆ فیلمە سینەماییەکانی رادەکێشێ، ڕێژەی ئەو جەماوەرش بە گرنگی فیلمەکەو بابەتەکەی و نواندن و نمایشکردنی بەستراوەتەوە.

٥- خوێندەوارو نەخوێندەوار سەیری فیلمەکە دەکات.

٦- کاریگەری لەسەر تازەپێگەیشتووان بەهێزە، کە دەکرێ بەهۆیەوە تازەپێگەیشتووان بەشێوەیەکی نیشتمانیانەی خێرخوازانە ئاراستە بکرێن.

٧- نمایشکردنەوەی بەشێوەیەکی ئاسان و تێچوونێکی کەم بەپێچەوانەی شانۆوە.

٨- دروستکاری سینەما دەتوانێ بەشێوەیەک یاری بەدیالۆگی وتراوو کاریگەری دەنگ و موزیک بکات، کە بینەر بخاتە بازنەیەکی دەنگگەلێکی سەرنجراکێش و دروستکردنی کەشێکی دیاریکراوەوە بۆ ئەو فیلمەی نیازی نمایشکردنی هەیە.

**جیاکەرەوەکانی فیلمی سەرکەوتووی میدیایی:**

١- بیرۆکەکە بەشێوەیەک بێ بگاتە هەستی بینەران و توانای وروژاندنی هەست و نەستیانی هەبێ و مایەی گرنگیدانیان بێ.

٢- شێوازی خۆش و سەرنجراکێش بێ و چاو ماندوو نەکات و دەمارەکان قورس نەکات.

٣- ڕووداوەکانی ماقوڵ و گونجاو بێ لەگەڵ کۆمەڵگە.

٤- ئاراستەکردنی بەشێوەیەکی شایستەو بە وریاییەوە بێ ئەگینا دەبێتە پڕوپاگەندەو لەوانەشە ببێتە مایەی نارەزایی.

٥- پێویستە ئاماژە بێ بۆ ئامانجێک یان مەبەستێکی ڕێزدارو پایەی لە دڵ و دەروونیدا هەبێ.

٦- هۆکاری کات و شوێن و ئەو دۆخەی تێیدا نمایش دەکرێ لەبەرچاو بگیرێ.

٧- ڕەچاوی لایەنی بەهاو ئاکاری کۆمەڵگا بکات.

**٥- شانۆ:**

شانۆ بریتییە لە چیرۆکی نواندن، بابەتێک یان هەڵوێستێک لەمیانەی دیالۆگێک کە لە نێوان کاراکتەرانی چیرۆکەکە دەخولێتەوە نمایش دەکات، رووداوەکانیشی لەرێگەی ململانێی نێوان هەڵوێست و بۆچوونی کاراکتەرەکان دەخولێتەوە، هەڵوێستەکە پێش دەکەوێ تادەگاتە ئەوپەڕی، پاشان مەسەلەکە بە کرانەوەی هەڵوێستەکەو گەیشتن بە چارەسەرێکی پەسند کۆتایی دێ، شانۆش دەکرێتە چەند بەشێکەوە، لەوانەشە بەشێک بەس بێت بۆی.

شانۆ کۆنترین هونەری میدیایە کە لەدێرزەمانەوە بەکاردەهێنرا بۆ پەیوەندیکردنی پەیامگەلێکی میدیای جیاواز، هەروەها دڵخۆشکردنی گەلان لە چوارچێوەی ئەو واقیعەی تێیدا دەژیان، مرۆڤ وردو درشتی رووداوەکانی ژیانی رۆژانەی لە راوو شکارو شوانکاری و کشتوکاڵ بۆ هاوڕێیان و ئەندامانی خێزانەکەی و دۆست و ناسیاوی خۆی دەگێڕایەوە، زۆرجاریش بە جموجوڵی جەستەی و هێماکانی دەستی و ئاوازی دەنگی و گوزارشتەکانی دەموچاوی ئەو رووداوانەی دەنواند یان باس دەکرد، لەوانەش بە بەکارهێنانی هەندێ ئامرازی سەرەتایی سادە کەلەو سەردەمەدا هەبووە وەکو دارو پەت و بەرد.

شانۆ وەک هونەرو دیاردە بە پێشکەوتنی مرۆڤ ئەویش پێشکەوتووە، لە قۆناغی راوو شکارەوە بۆ شوانکارەو وەرچەرخان بەرەو قۆناغی کشتوکاڵ و سەقامگیری پاشان قۆناغەکانی شارستانیەتی نوێ، سەما یەکەم رواڵەتی ئاینی بووە مرۆڤ بەهۆیەوە خۆی لە پەرستراوەکەی نزیک کردۆتەوە، نواندنی کلاسیکی بێدەنگیش پێش گوتاربێژی و نواندنی بە دەنگ کەوتووە، بەوپێیەش شانۆ یان نواندن لە ژیانی مرۆڤ پێش هەر هونەرێکی دیکەو هەر ئامرازێکی پەیوەندیکردنی میدیای ناسراو دەرکەوتووە.

**شانۆ لە سێ بەش پێکهاتووە کە ئەمانەن:**

- نمایشکردن: هەمیشە دەکەوێتە بەشی یەکەمەوە، کە بابەتی شانۆکەو کارەکتەرەکانی ئاشکرا دەکات.

- ئالۆزبـوون: ئـەو ڕێگایەیە کە ڕووداوەکان بەهۆیـەوە لە زنجیرەیەکی لۆژیکیانە یەک لەدوای یەک ڕیز دەکات.

- چارەسەر: ئەمیش کۆتاییە کە ڕێگە دەدۆزێتەوەو دواتر دەگاتە چارەسەرکردن.

شانۆش بناغەی گرنگی خۆی هەیە، کە ئەمانەن:

- بیرۆکە: مەبەستی ناوەڕۆکی چیرۆکەکەیە.

- هەقایەت: لە بری جەستەی بیرۆکەکەیە.

- دابەشکردنی ڕۆڵ.

- کاراکتەر: پاڵەوانانی شانۆکەن.

- ململانێ: کرۆکی گرفتەکەو ئالۆزکاوییەکانێتی.

- دیالۆگ: مەبەسـت لێی بەشـەکانی وتارو ڕووداوەکانی شـانۆکەیە، کە بەندە بە گفتوگۆو دیالۆگەوە.

- گفتوگۆو هەڵسوکەوت.

**لەو شێوانەی شانۆ بەشێوەی گشتی ناسراوە:**

١- گێڕانــەوەو لاســاییکردنەوەی شـێوەزارو ڕەفتـاری گەلانــی دیکەو ئـاژەڵان لە کوڕبەندو کۆبوونەوە گشتییەکاندا.

٢- ئاهەنگ و بۆنە فەرمی و نافەرمییەکان.

٣- هونەری خەیاڵی سێبەر یان شانۆی خەیاڵی سێبەر.

٤- ئەراگیز یان کەسایەتی کەیفخۆش (الفکاهیة).

٥- کۆبوونەوەکانی گوێ ئاگردان و گێڕانەوەی ژیاننامەی میللی.

شـانۆ بـەزۆر لـە ئەدگارەکانـی ڕادیـۆو سـینەماو تەلەڤزیـۆن جیـا دەکرێتـەوە، دەسـتەواژەی وردتری ئەم ڕسـتەیەش ئەوەیە بڵێین: ئەم ئامرازانەیە کە ئەدگارەکانی شـانۆی هەیـە، ئەویـش لەبەرئـەوەی شـانۆ پێـش ئەوانـە کەوتـووە، کە بە ئـەدگاری کارلێککردنی ڕاستەوخۆی نێوان نێرەرو وەرگر لەگەیاندن جودا دەکرێتەوە.

**٦- مۆبایل:**

مۆبایـل بۆ هەمووان لە پێویسـتییە گرنگەکانە، کە بەبـێ ئەوە ناتوانی لەماڵ بچێتە

دەرەوە، هەروەک کاژێر یان سویچی ئۆتۆمبێل. مۆبایل بەشێوەیەک بڵاو بۆتەوە، کە خەریکـە تەلەفۆنـی نۆرماڵ فەرامۆش دەکات، زۆری ژمـارەی بەکاربەرانی مۆبایلیش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێ هۆکار کە هەندێکیان بەم شێوەیە دەخەینەڕوو:

- گرانـی بەدەسـتهێنانی هێڵـی تەلەفۆنی نۆرمـاڵ لە دامـەزراوی پەیوەندیکردن لە سـەرەتای پێشکەشـکردنی داواکاری، کـە ژمـارەی هێڵـە نۆرماڵـەکان دیاریکـراون و پێویسـتی پـڕ ناکاتـەوە، هاوڵاتـی چەند سـاڵێک چـاوەڕێ دەکات تا هێڵێکـی نورماڵی بەدەسـت دێنـێ، هەروەسـا ئـەو هێڵانـە دەدران بە هەنـدێ کەس و بە کەسـانی دیکە نەدەدران، هەندێجاریش بە نرخی خەیاڵی دەفرۆشران.

- ئاسانی بەدەستهێنانی مۆبایل.

- دابەزینی نرخی مۆبایل.

- رکابەری نێوان کۆمپانیاکان و دەستپێشـخەری نمایشـکردنی نوێ دەبێتە هۆی ئەوەی هێڵ و ئامێرەکان بە نرخێکی سەرنجڕاکێش پێشکەش بکەن.

- پێشکەشـکردنی نمایشـگەلێکی دیاریکـراوی پەیوەندیکـردن کـە دابەزینی نرخی قسـەکردن بەشـەو لەخـۆ دەگـرێ، یـان پەیوەنـدی بـە ژمارەگەلێک کە بەشـداربوو هەڵیاندەبژێرێ، یان پێشکەشکردنی چەند خولەکێکی قسەکردن بێ بەرامبەر.

- ئاراستەی بەرهەمهێنەران بەرەو وەبەرهێنان لەم بوارەدا لەمیانەی دامەزراندنی کۆمپانیاگەلێک بۆ فرۆشتنی مۆبایل و هێڵەکانی.

- رەهەندی کۆمەڵایەتی کە وا دەکات هەڵگرتنی مۆبایل شێوەیەک بێ لە شێوەکانی خۆنیشاندان و شانازی پێوەکردن.

- بـەرزی نرخـی قسـەکردنی مۆبایـل لەگـەڵ تەلەفۆنـی نۆرمـاڵ بەپێچەوانـەی پەیوەندیکردنـی مۆبایـل لەگـەڵ مۆبایـل کە هەرزانتـرە، ئەمیش هاندەرێکـە بۆ کڕینی مۆبایل.

**کاریگەری دەروونی مۆبایل لەم لایەنانەوە دەردەکەوێ:**

- سـۆزو خۆشەویسـتی لەنێـوان تاکـەکان پتـر دەکات کـە تاک لـە پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەوانەی خۆشی دەوێن بەردەوام دەبێت، سەرەڕای کارو دووری ئەو ماوەیەی

لەنێوانیاندایە.

- بەشداری سەقامگیری دەروونی دایک وباوک و ئەندامانی کۆمەڵ بەشێوەیەکی گشتی دەکات، بەهۆی توانای پەیوەندیکردنیان بە رۆڵەو خۆشەویستانیان و دڵنیابوون لێیان بە بەردەوامی.

- بەشداری دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکات، کە ئامرازێکی ئاسان پەیدا بووە بۆ پەیوەندیکردن پێیان، تەنانەت پۆزش هێنانەوە لە ئامادە نەبوونیان لەکاتی پێویست.

- هەروەسا ئامرازێکە یارمەتی تاک دەدات بۆ ئاسانی پەیوەندیکردن بە کەسانی دیکەو چیتر ئەو کەسە بە ئاڵۆزی نامێنێتەوە وەک پێشتر، کە پەیوەندیکردن نەک تەنها لە ژینگەی ئەو تاکەو، نە لەسەر شێوازی پێشترو جۆری کەسێتی ئاسانە، بەڵکو لەجیهانیش کارێکی ئاسانە.

- مۆبایل بۆتە بەشێک لەکەسێتی ناکرێ فەرامۆش بکرێ کە لە کارو خوێندنیش کەڵکی هەیە، پاشان لەسەر پشوودان و بەختەوەری تاکەکان بەئەرێنی رەنگیداوەتەوە.

**٧- پێشانگا:**

بریتییە لە شوێنێکی تایبەت، لەمیانەیدا بەرهەمی جۆراوجۆری پەیوەست بە پیشانگاکەو ئامانج و شێوەکانی بەرێگایەکی رێکخراوو هاوسەنگ نمایش دەکرێ، پوختەی ئامانجەکانی کردنەوەی پێشانگاش ئەمانەن:

ا. بڵاوکردنەوەو ئاڵوگۆڕی زانیاری.

ب. ناساندنی بەرهەمهێنەر ئەگەر بۆ بازاڕکردن بێ یان ناساندن یان دروستکردنی تێڕوانینێک لەلایەن جەماوەر بەرامبەر بەرهەمەکانی.

ج. بڵاوکردنەوەی گیانی رکابەری شەرەفمەندانە.

د. دۆزینەوەی بەهرەو تواناو گەشەپێدانی.

**لە کاتی رێکخستنی پێشانگا پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێ:**

ا. هەڵبژاردنی شوێنێکی گونجاو کە گەیشتن پێی ئاسان بێ.

ب. شوێنەکە رووناک و تەندروست و فراوان بێ.

ج. دیاریکردنی ئامانجی پیشانگاکە و ئەنجامەکانی.

د. بەشداریکردنی سەرجەم ئەوانەی گرنگی بە پیشانگا دەدەن لە ڕێکخستنی پێشانگا.

ە. دابەشکردنی پێشانگا بۆ چەند بەش و لایەک بەپێی ئامانجی ڕێکخستنی.

و. دیاریکردنی بڕی تێچوون و پێویستی گشتی بە کادیرو دابەشکردنی کار لەنێوانیان، لێرەدا پێویستە کەرتی تایبەت لە پارەدانی پیشانگاکە بەشدار بکرێ.

ز. دیاریکردنی کاتی کردنەوەی پیشانگاکەو ئەو کەسایەتییەی کە دەیکاتەوە، هەروەها ڕۆژو کاتی سەردانیکردنی خەڵک، هەروەها ئامادەکردنی پۆستەرێک بۆ گوزارشتکردن لە بۆنەکە، تێیدا گشت زانیاریەک لەبارەی پێشانگاکەو ناوەڕۆک و کاتی سەردانیکردن لەخۆ بگرێ.

لە جۆرەکانی پێشانگا: پێشانگای زانستی، پێشانگای وێژەیی و ڕۆشنبیری، هەروەها پێشانگای پێناسین.

**٨- گەشت:**

هەمیشە بە گیانی سەرکێشی و بەرەنگاربوونەوە وەسف دەکرێ، پتر لە هەر ئامرازێکی دیکەی پەیوەندی گیانی هاریکاری و ئاشنابوون و خۆشەویستی لە بەشداربووان گەشە پێ دەدات، لەوانەیە لە بەرنامەو چالاکییەکانی کۆمەڵ ئەم لایەنە بسەلمێنێ و پاڵپشتی دیدو بۆچوونی ئەم ئامرازە پەیوەندییە گرنگە بکات.

**٩- پێشبڕکێ:**

جۆرێکە لە چالاکی لەسەر ڕکابەرییەکی ساغڵەمی نێوان تاکەکان وەستاوە، لەوانەیە پێشبڕکێیەکی زانستی یان وەرزشی یان وێژەیی بێ، لە پێشبڕکێیەکە پێویستە خەڵاتی واتایی یان مادی بۆ براوەکان دیاری بکرێ، کە تەوەری ڕکابەری ڕکابەران بێ، دەکرێ پێشبڕکێیەکان بۆ پاڵپشتی بەهای پەروەردەیی لە گیانی تاکەکان یان بەرەنگاربوونەوەی داب و پەیڕەوکراوی هەڵە لەناو کۆمەڵ وەبەربهێنرێ، وەکو ئاراستەکردنی پرسیاری زانستی یان ئەنجامدانی توێژینەوەی پەروەردەیی، بە ئاراستەی دیاردەی دەمارگیری وەرزشی، لە سوودەکانی پێشبڕکێی بەرچاو:

راهێنانی تاکەکان لەسەر توێژینەوە، گێڕانەوە، ئاڵوگۆڕی زانیاری، پاشان زیادکردنی زەخیرەی زانستی.

**١٠- ڕێکلام:**

ڕێکلام چالاکییەکی کارگێڕیی سیستماتیکە، شێوازی داهێنەرانە بۆ پەیوەندیکردن بە کۆمەڵەوە بەکاردێنێ بە بەکارهێنانی ئامرازگەلی پەیوەندی جەماوەری بەمەبەستی: کارتێکردنی هۆشیارانەی دیراسەکراو، چ بۆ بڵاوکردنەوەی بەهای نیشتمانی یان ناساندنی بەرهەمێکی بەکاربەری دیاریکراو بێ، کە قازانجی مادی لێ بکەوێتەوە بەشداری بکات لە خزمەتگوزاری باشتری بە کۆمەڵ، یان بۆ بەدیهێنانی هەردوو مەبەست پێکەوە.

ئەگەر ڕێکلامە بازرگانییەکان ئامرازێکی بازاڕکاری خزمەتگوزاری و کاڵا بن کە شان لە شانی نەدرێ، ئەوا بەکارهێنانی بەشێوەیەکی دیراسەکراو بۆ پاڵپشتیکردنی بەهاکان کارێکی چاک و پێویستە، چونکە ڕێکلام ڕۆڵێکی بنەڕەتی لە بڵاوکردنەوەی زانیاری و فراوانکردنی چوارچێوەی بەهاکان دەبینێ، ئەرکی ڕێکلامیش لە تەنها پەیوەندیکردنی ئەو زانیارییە کۆتایی نایە، بەڵکو گرنگتر دروستکردنی کاریگەرییەکی دیاریکراوی ئەوتۆیە، کە شێوەی واتاو چەمکگەلێک وەردەگرێ تاکەکان ڕازی دەکات و دەبێتە ڕەفتارێک لە ژیانیان.

**شێوەکانی ڕێکلام:**

١. ڕێکلام بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی زانیاری و بەهاکانی کۆمەڵگە بێ، نموونەش بۆ ئەوە: ڕیکلام لە ئامرازەکانی میدیا سەبارەت بە ڕێکخستنی وانەیەک لە هەر بابەتێک و لە کات و شوێنی دیاریکراو.

٢. ڕیکلام بە ئامانجی فەراهەمکردنی داهاتی دارایی دیاریکراو بۆ پارەدارکردنی پرۆژەیەکی خێرخوازی یان کەسیی (شخصي) لەگەڵ مەرجی ڕەچاوکردنی ڕێنماییە گشتییەکانی ڕێکلام، لەوانەش بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ڕوون و ئاشکرا لەو لایەنەی کە دەیەوێ ڕێکلامەکە پەخش بکرێ.

نموونەش بۆ ئەوە: ڕێککەوتن لەگەڵ فرۆشگایەکی بازرگانی بۆ دانانی دروشمی

فرۆشـگاکەو ناونیشـانی یان دیزاینی ڕێکلامێکی دیاریکراو بۆ ناسـاندنی فرۆشگاکەو چالاکییەکانـی، یـان فەراهەمکردنـی ئامـرازە پێویسـتییەکانی کارێکـی شـانۆیی بـە بەکارهێنانی نوێترین سیستمی هونەری.

ڕێـکلام کار لـە دەروونـی تـاک دەکات لەمیانـەی: سروشـدان (الایحـاء) و دووبارەکردنـەوە، چونکە دووبارەکردنەوە بەشـداری لـە ڕازیکردنی لۆژیکیانەی تاک دەکات، کە دیزاینەری ڕێکلامەکە دەیەوێن، لە دیزاینکردنی ڕێکلامدا دەشـێ پشـت بە یەکێـک لـە بیردۆزەکانی دەروونناسـی ببەسـترێ، بـۆ نموونە لەوانەیە تاک پشـت بە بیردۆزی ڕەفتارخوازی (النظرية السـلوكية) ببەسـتێ، کە گرنگی بە بنەمای پاڵپشتیکار دەدات لـە میانـەی نوێکردنەوەو هەمەچەشـنێتی، واتە پشـت نەبەسـتن بەیەک ڕێگا لە نمایشکردنی ڕێکلام، یان لە میانەی چێژپێدان و پێکهێنان بۆ دروستکردنی تێڕوانینێک لای تاک سەبارەت بەو کاڵایە، کە نیاز وایە بخرێتە بازاڕەوە، یان لەمیانەی دەرخستنی وروژێنەر بەشێوەیەکی دووبارەکردنەوەو بەرێگەیەکی سەرنجڕاکێش.

لەوانەشە پشت بە بیردۆزی فێربوونی کۆمەڵایەتی ببەسترێ، کە بەندە بە لاسایی کردنەوەو ئاڵوگۆڕی پەیوەندی کە دەشێ کاڵاکە لە ڕێگەی کەسێکی ڕووخۆش، ئەگەر گۆرانیبێـژ بـێ یان ئەکتـەری نواندن یان پاڵەوانێکی سیاسـی نمایش بکرێ، کە پاڵ بە تاکەوە دەنێ لاسایی ئەم کەسایەتییە بکاتەوەو، ئەوە بکڕێ کە لە ڕێگەی ئەو کەسەوە نمایش دەکرێ.

هەنـدێ کەسـیش بیـردۆزی شـیکردنەوەی دەروونـی (فرۆید) پەیـڕەو دەکات، کە بەرهەمەکـە دەبەسـتێتەوە بە کچێکی جوان و سـەرنجڕاکێش یان کچـە گۆرانیبێژێکی ناسـراو یـان ئەکتەرێکـی بەناوبانگ کە سـەرنجی تاکەکان بۆ لای کاڵاکە ڕادەکێشـێ، بۆنموونە لە کاتی ڕێکلامکردن بۆ هەویری ڕیش تاشین کە ئاراستەی پیاوان دەکرێ، بـەڵام کچێکـی سـەرنجڕاکێش لە ڕێکلامەکـە بەکاردەهێنرێ کە سەرسـامی خۆی بەو پیاوانە نیشـان دەدات کە ئەو هەویری ڕیش تاشـینە بەکاردێنێ، هەر بەو شـێوەیە ژن لە شـیکردنەوەی دەروونی وەک ئامرازێکی بازاڕکاری ڕێکلام بەکاردەهێنرێ بەهۆی مەیلی بەهێزی پیاوان بۆی.

هەروەسا دەروونناسی ریکلام یاری بەو ورووژینەرانە دەکات کە پیشکەشی تاک دەکریّ، کە دەشیّ لە سەرەتاوە باسی بابەتیک بکریّ پەیوەندی بە ریکلامەکەوە نەبیّ، پاشـان دەرهینەری ریکلامەکە پتر تەرکیز دەکاتە سـەر گرنگی ئەو مادەیەی دەیەویّ بکەویتـە بازارەوە، لەگـەڵ دوپاتکردنەوەی کە ئەوە هەرزانتریـن و نایابترین مادەیەو زیاد لە مادەکانی دیکە توانای بەدیهینانی پیویستی تاکی هەیە، هەر کەسیّ بیکریّ ئەوە پتر بەرجەستە دەبیّ، ئەگەر قسەکردن لەبارەی هەویری ددانەوە بیّ بۆنموونە، تیبینی دەکەی کە دەرهینەر پزیشکیکی ددان دینیتە سەر شاشە بۆ پاڵپشتیکردنی بیرۆکەکەی لەبـارەی ئـەو هەویـری ددانە، پاشـان لەوانەیە بۆچوونـی ئەو کەسـانە وەربگریّ کە هەویرەکەیان بەکارهیناوەو سەرسامی خۆیان لەبارەیەوە نیشان داوە.

# بەشی سێیەم
# دروستکردنی پەیامی میدیایی

**پەیامی میدیایی:**

گرنگیدان بە دروست کردن و واتا لە پەیامی میدیایی و ئەو هۆکارانەی کار لە دارشتنی بیرۆکەو پێشوازی کردن لە واتا لە میانەی چەند نموونەیەک کە (چارلز ئسگود) و (ویلبور شرام) و کەسانی دیکەی شارەزا دایانرشت، دەردەکەوێ کە لە دارشتنی بیرۆکەکانیان پشتیان بە نموونەی وەرزشی بەستووە، کە جەخت لەسەر چەمکی پەیام دەکاتەوە لە روانگەی نێرەر یان ئەوەی کاری پەیوەندیکردن ئەنجام دەدات، هزرەکانی زمانناسی و دەروونناسی زمانەوانی لە دروستکردنی پەیام و پێشوازیکردنی بناغەی تێگەیشتن و رێکخستنی پەیامی میدیاییان پێکهێناوە.

**ئەو فاکتەرانەی کار لە پەیامی میدیایی دەکەن:**

**١- نێرەر: دەبێ ئەم مەرجانەی تێدا بێت:**

- شارەزایی و توانا: واتە هەرچەندە خاوەن پەیامەکە پسپۆرو شارەزا بێت لەو بابەتەی کە نمایشی دەکات ئەوا کاریگەری لەسەر وەرگر زیاتر دەبێ.

- راستگۆیی نێرەر: لەوانەیە خاوەنی پەیامەکە شارەزا بێت بەڵام بە لای خەڵک بە درۆزن یان زیادەرۆ ناسراوە، یان بەوە ناسراوە سەرچاوەی زانیارییەکانی لاوازن، پاشان هەر کاتێک سەرچاوەکە بە راستگۆیی ناسرا، ئەوا پەیامی دوای ئەوە لای وەرگر پەسند دەکرێ، بۆنموونە رادیۆیەک یان هەر کەناڵێک کە ناسراوە خەڵک زیاتر بڕوای پێ دەکات و بەدوای هەواڵ و راپۆرتەکانیدا دەڕوات.

- قۆرخکردنی ئامرازی میدیا: کاتێک ئازادی میدیایی لەئارادا نییە ئەوا لایەنی تایبەت زاڵ دەبێ بەسەر کەناڵەکان و ئاراستەی کەناڵەکان بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی دەکات، بۆنموونە لایەنێکی توندڕەو کە دەسەڵاتی بەدەستەوەیە هێرش دەکاتە

سـەر هەموو شـتێک کە لەگەڵ بیروباوەڕیدا نەگونجێ، وەک ئازادی ئافرەت یان مافی منداڵ .. هتد.

**٢- ناوەڕۆکی پەیامە میدیایەکە:**

- شێوازی خستنەڕووی پەیامەکە (لایەنی هونەری):

سەبارەت بە میدیای بینراو کاریگەرییەکانی بینین و بیستن و فریودانی سینەمایی و هونەری کۆمپیوتەر وای لە بینەر کردووە فریو بخوات لەوەی دەیبینێ و رادەست و ملکەچی دەبێ، ئەوە هەر مەپرسە کاتێک دەروونناسێک یان کۆمەڵناسێک هێنرانە ناو بابەتەکەو خەیاڵ و راستی تێکەڵ بوو، بینەر لێرەدا واقی وڕ دەمێنێ لەوەی دەیبینێ کە ناتوانی هیچ شتێک رەت بکاتەوە بەهۆی تەکنیک و داهێنانەوە.

- شێوازی دارشتنی پەیامی میدیایی:

جگە لە کارتێکەرەکانی بیسـتن و بینین شـێوازی بابەتە پێشکەشـکراوەکە، ئەگەر شـێوازی راپۆرتـە هــەواڵ بـێ وەک (ئەنفـال، قەسـابخانەی ئەرمەنــەکان) و فیلمێکـی سینەمایی (مردووخۆرەکانی لینینگراد) و، هونەر چیرۆکە تەمسیلییەک کە گاڵتەجاری بێ ئەمە وا لە بینەری ئەو پەیامە دەکات باوەڕی پێ بێنێ، لە پەیامی میدیاییش مەرج نییـە پەیامەکـە راشـکاوانە بـێ بەڵکو هەندێجار بەشـێوەی سـروش پێدان بەشـێوەی ناڕاستەوخۆ دەبێ.

- دووبارە نمایشکردنەوەی پەیامەکە:

دووبـارە نمایشـکردنەوەی پەیامەکـە ئـاگای بینــەر رادەکێشـێ و پاشـان لەگـەڵ دووبارەبوونـەوە ئـەو پەیامــە دەبێتـە زانیارییەک دواتر لەگەڵیـدا کارلێک دەکات چ بە ئەرێنـی یـان نەرێنـی بێـت. دووبارەبوونەوە زۆرجـار بە رێگەی جیـاوازو ناوەڕۆکی جـودا دەبـێ و هەندێجاریـش بە ئامـرازی جیاواز کە هەمویان هەمـان ئامانج دەپێکن. لەمبارەیەوە لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە کە سەیرکردنی منداڵ بۆ زنجیرە چیرۆکێکی کەتن و تاوانکاری و زەبرو زەنگ منداڵ تووشی رەفتاری شەڕانگێزی دەکات، پاشان لای پراکتیزە دەبێ و دەبێتە واقیع. لەمیانەی ئەو دووبارەکردنەوەیە زۆر لە میدیاکانی دونیا توانییان کاریگەری خۆیان بنەخشـێنن لە گۆڕینی زۆر بەهاو دابونەریت لەوانە

پرسـی منداڵ و ئافرەت و ئازادی و خۆشەویسـتی و تەڵاقدان و یەکژنیی و فرە ژنیی و.. هتد.

- بەستنەوەی ناوەڕۆکی پەیامەکە بە بەرژەوەندی و پرسە گشتییەکانی جەماوەر:

کاتێـک کۆمەڵگا یان گرووپێک پرسـی گشـتیی هەیە و بۆتـە گفتوگۆی خەڵک، ئەوا گرنگیدانـی پەیامـی میدیایـی پێـی و بەدواداچوونی بە دوورو درێـژی بۆنموونە وەک جەنگـی کەنـداو جیابوونـەوەی کەسـێکی گـەورەی سیاسـی لـە حزبێک، ئـەوا خەڵک بەتەوسەوە چاوەڕێی پەیامی میدیایی لەوبارەیەوە دەکەن.

### ٣- وەرگری پەیامی میدیایی و ژینگەکەی (جۆری جەماوەر):

- کاریگەری پەیامی میدیایی بەپێ سروشتی خەڵک دەگۆڕێ:

منـداڵ زیـاد لە هەر کەسـێکیتر دەکەوێتە ژێـر کاریگەری پەیامی میدیایی، پاشـان هـەرزەکاران و بەگشـتی ئافرەتـان ئەوجـا پیـاوان، بۆیە دەبێ پەیام ئـاگای لە جۆری جەماوەرکەی بێ کاتی بابەتێک پێشکەش دەکات لەڕووی ژینگە یان بابەتێکی تایبەت بە ئافرەت.

- ئاستی کۆمەڵایەتی تاک:

پێگەی تاک لەناو کۆمەڵ (هەژار، دەوڵەمەند، خوێندەوارو نەخوێندەوار کاربەدەست و فەرمانبەرو بازرگان و کرێکار) هەمووی کاریگەری هەیە لەسەر ئاستی وەرگرتنی پەیامەکـە لەلایـەن تاکەکەوە، بۆنموونە هەژار بەلایەوە گرنگ نیە کە باس لە ئابووری جیهانـی و نرخـی نـەوت دەکرێ، بازرگانیـش بەلایەوە گرنگ نیە باس لـە دانانی نرخ دەکرێ لەسەر شتومەکی خواردن، تاک بەشێوەی واقیعیانە مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕۆڵانە دەکات کە لە ڕوانگەی خۆیەوە پێگە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکەی تەماشای دەکات، کە ئامرازی میدیا بۆ ئەو دامەزراوەی کۆمەڵایەتییە ئەو ڕۆڵە دیاری دەکات کە پێویسـتە ببیبینێ.

- ئاستی ڕۆشنبیری و باکگراوندی کۆمەڵایەتی تاک:

پەسـندکردنی یان ڕەتکردنەوەی پەیامی میدیایی لای تاک و تێگەیشـتن لای تەنها ناگەڕێتەوە بۆ ئاسـتی کۆمەڵایەتی، بەڵکو ئەو پەروەردەیەی لەسـەری گەورە بووەو،

ئـەو ڕێنماییـە کۆمەڵایەتییـەی تیایـدا ژیـاوەو گەشـەی کـردووە دەبنـە بناغەیـەک بۆ پەسەندکردن و وەرگرتنی پەیامە میدیاییەکە. بۆنموونە گەنجێک لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات لەنـاو ژینگەیەکـی باوپارێـزدا ژیـاوەو بیروبۆچوونی سـەبارەت بە ئافـرەت روون و دیـارە، کـە گەشـت دەکات بۆ وڵاتێکی ئەوروپایی و رەوشـی ئـەوێ دەبینێ کاری لێ دەکات لە سفوربوونی ئافرەت و تێکەڵبوونی ئافرەت و پیاو، هەروەها کەسێتی مرۆڤ کار لـە پەسـەندکردن و رەتکردنـەوەی پەیامـی میدیایـی دەکات، بۆنموونە کەسـێکی ئاشـتیخوازو نـەرم و نیـان توندوتیژی رەت دەکاتـەوە، هەروەها بیرو باوەڕی تاک و حەزو ئارەزووەکانی زۆرجار کاریگەری خۆی هەیە و پەیوەندی نییە بە باکگراوندی کۆمەڵایەتییەوە، بۆنموونە کەسێک ڕیکلامی جگەرە پەسەند کات هەرچەندە دەشزانێ زیانی جگەرە چەندە، چونکە خۆی جگەرە دەکێشێ.

- بیرو باوەڕی جەماوەر:

خەڵـک بـە زۆری ئـەو پەیامانـە پەسـند دەکات کـە ئاراسـتەیان کـراوەو لـە بیروباوەڕیانـەوە نزیکـە و لەگەڵیانـدا دەگونجـێ و کاریگـەری پەیامـی میدیایی لاواز دەبـێ، ئەگەر لـەو بیرو باوەڕیانەوە نزیک نەبێ و زۆرجاریش رەتی دەکەنەوە ئەگەر پێچەوانەی بیروباوەڕیان بێ.

- واقیعی کۆمەڵ:

واقیعی سیاسـی و ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵ کار لە پەیامی میدیایی دەکات، پەیامێکـی میدیایـی سـەبارەت بە ئازادی سیاسـی و ئازادی بیروڕاو دیموکراسـییەت لای ئـەو کۆمەڵگایانـە پەسـند کـراوە کـە لەژێـر دەسـەڵاتی دیکتاتۆردایـەو، ئاسـتی پەسەنکردنیشـی بەسـتراوە بـە ئاسـتی بـێ بەشـبونیان لە ئـازادی و دیموکراسـیەت بەتایبەتیش کاتێک خۆیان بەراورد دەکەن لەگەڵ کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان.

- بوونی کەسانی خاوەن بیروباوەڕو ڕۆڵیان لەناو کۆمەڵگادا:

ئامرازەکانـی میدیـا بەپێی بیردۆزی کاریگەری لە دوو قۆناغدا کار لەخەڵک دەکات بەشـێوەیەکی فـراوان کاتێک کەسـانی دیارو خاوەن کەسـایەتی نـاو کۆمەڵەکەیان بە قسـەو کردەوە بەشـداری دەکەن ئەمە وای لە کۆمپانیاکانی ڕیکلام کرد بیانقۆزنەوە،

بۆنموونــە پشــت دەبەســتن بــە کەســانی نــاودار لــە بــواری وەرزش یــان هونــەر بۆ ڕەواجکردنی کاڵای بازرگانی.

### بنەما سەرەکییەکانی دروست کردنی پەیامی میدیایی بەپێی دارشتنی (لاسویل):

**١- نێرەر:**

بەشــی یەکەمــی داڕشــتنەکە ئامــاژە بە نێرەر یان ســەرچاوەی هــەواڵ دەکات، کە ئــەو لایەنەیــە زانیارییــەکان دەنێــرێ، دەستنیشــانکردنی ئــەو ســەرچاوەیە پێویســتە بــۆ بەرجەســتەکردنی راســتگۆیی و پەســەندبوونی، دواتــر لەلایــەن وەرگرانی پەیامە میدیاییەکە لەمیانەی مامەڵەیان لەگەڵ ناوەڕۆکی پەیامەکە.

**٢- ناوەڕۆکی پەیام:**

ئەرکــی ئــەم خاڵە دیراســەکردنی ناوەڕۆکــی پەیامەکەیــە و دیاریکردنــی ناواخنی پەیامەکــە، کە پێویســتە تەرکیزی لەســەر بکــرێ و لێی دوور نەکەوینەوەو تەشــویش نەخرێتەســەری و، ئــاگای وەرگر پــەرش و بڵاو نەبێتەوە بەهــۆی بوونی دووفاقی لە ناوەڕۆکەکەدا، پەیامەکە لەوانەیە کەسی بێ یان پەیامی میدیایی بێ، سەرباری ئەوەش زۆر گرنگە لەم خاڵەدا زانینی شــێوازی پێشکەشــکردنی ناوەڕۆکەکەیە (بەشــێوەیەکی جدی، بابەتی، هاندەرانە، هێرشبەر، پێکەنیناوی، گاڵتەجاری.. هتد).

**٣- لە چ کەناڵێکەوە:**

ئەم خاڵە ئەو ئامرازە میدیاییە دیاری دەکات کە لێوەی زانیارییەکە یان ناوەڕۆکەکە دەگەیەنێ (ئامرازی راســتەوخۆ، ناڕاســتەوخۆ، تەلەڤزیۆن، رادیۆ، رۆژنامەوانی، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، لاپەڕەکانی ئینتەرنێت، هەڵمەتەکانی هۆشیارکردنەوە لە شەقامەکان.. هتد). دیراسەکردنی ئەم خاڵە زۆر پێویستە بەهۆی جیاوازی هەمەچەشنی وەرگرەکانی ئەم پەیامەو جیاوازی باشــخوازییان بۆ ئامرازەکانی میدیا، چونکە هەندێجار ئامرازی میدیا گرنگترین رۆڵ دەبینێ لە دیاریکردنی ئاســتی وەرگر بۆ پەیامەکەو تێگەیشــتنی لە ناوەڕۆکەکەی.

**٤- بۆ کێ؟**

ئـەم خاڵـە یـان ئـەم بنەمایـە کار دەکات بـۆ دیراسـەکردنی وەرگـران و ناسـینی سروشـت و تایبەتمەندیی دیموگرافییان (تەمەن، رەگەز، باری خێزان) و، تایبەتمەندی جوگرافییان (شوێنی نیشتەجێ) و، تایبەتمەندی کۆمەڵایەتیان و ئابوورییان (قەوارەی خێزان، داهات، خوێندەواری، پیشە، ئاین و دابونەریتیان) و، تایبەتمەندی فیزوگرافییان (مەیـل، ئارەزووەکانیـان، شـێوەی ژیـان، بیـرو باوەڕیـان، خـەوو ئاواتیـان)، جگە لە تایبەتمەندی رەفتارییان (بەکارهێنانی ئامرازی میدیا، رەفتاری بەکاربەرییان).

**٥- ئامانجی پەیام و ئەو کاریگەرییەی نیازوایە بەجێی بهێڵێ:**

زۆر پێویسـتە دیراسـەی ئەو کاریگەرییە بکرێ کە لەسـەر وەرگر بەجێ دەمێنێ، دوای وەرگرتنـی پەیامەکـە و هەورەسـا ناسـینی بە دواهاتووەکانی و ئەو سـۆزانەی لێـی پەیـدا بووە پاشـان زانینی ئەو راو هەوڵسـوکەوت و رەفتارەی لێـی کەوتۆتەوە، پەیامی دیراسـەکردنی پێشـوەختی ئەم کاریگەرییە سـوودی هەیە بۆ دوورکەوتنەوە لەو هەلانەی لەوانەیە بێتە دی لە کاتی دیزانکردنی پەیامەکە، کە لەوانەیە ببێتـە هۆی گەیشتن بەو کاریگەریەی کە دەمانەوێ لەو گرووپە روویدات بۆ هاندانیان لە گۆڕینی بیروڕایان، پاشان رەفتاریان بەو شێوەیەی کە دەمانەوێ.

**هۆکارەکانی سەرکەوتنی پەیامی میدیایی:**

**پوختەی گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی پەیامی میدیایی:**

١- هەماهەنگـی یـان هاوشـێوەیی و بەشـداریکردن لـە ئەزمـوون و وێنـەکان بـۆ هەریەکـە لـە نێرەر (میدیاکار) و وەرگر (جەماوەر)، بەشـێوەیەک زامنی تێگەیشـتن لە سیمبولەکان و ناسینەوەیان و بەرسڤیان بکات.

٢- وروووژاندنی ئاگای وەرگرو بەکارهێنانی سیمبولگەلێکی روون.

٣- بەسـتنەوەی پەیامی میدیایی بە پێویسـتییەکانی وەرگر لەگەڵ پێشـنیارکردنی رێگەچـارەی تێر بۆی، بەمەرجێک لەگەڵ دابونەریت و بەهاو پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان ناکۆک نەبێ.

٤- رەچاوکردنی دۆخی دەروونی وەرگرو وردبینی لە هەڵبژاردنی کات و شوێنی

گونجاوو ئامرازی بەسوود بەپێی جۆرو توانای وەرگر.

٥- گرنگیدان بە بەکارهێنانی بێژە (الالفاظ) و پێشکەشکردنی ئەو وێنانەی وەرگر دەتوانێ تێیان بگات و بەرسڤیان بداتەوە، بەپێی چوارچێوەی فیدباکی خۆی و پاشینەی کۆمەلایەتی و ئابووری.

٦- رزگاربوون لە هۆکارەکانی تەشویش، کە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم لێکحالیبوونی نێوان نێرەرو وەرگر، نموونەش بۆ ئەمە گرانی تێگەیشتن لە پەیامی میدیایی یان خێرا پێشکەشکردنی یان نەبوونی ئامرازی گواستنەوەی.

**لە دروستکردنی پەیامی میدیاییدا دەبێ ئەم خالانە رەچاو بکرێ:**

**١- روونی ئامانجەکان و یەکگرتنەوەی لەگەل ناوەرۆکی پەیامەکە:**

توێژینەوەگەلێکی زۆر بۆ تاقیکردنەوەی توانای تاک بۆ پێوانەی لۆژیکی ئەنجام دراوە، توێژینەوەکان دەریانخستووە ئەو تاکەی لۆژیکیانە حوکم دەدات، باشتر وایە ئەنجامەکان بەشێوەیەکی روون و دیاریکراو نمایش بکرێ.

**٢- خستنەرووی بەلگەو راستییەکان:**

پەیامی لۆژیکی بە پلەی یەکەم پشت بە بوونی بەلگەو گەواهیدەرو جێگرەوەو داتاگەلێک دەبەستێ، کە لە بابەتی پەیامەکە پالپشتی هزرو بۆچوونەکان دەکات، بەکارهێنانی بەلگەش ئامانجەکەی لەوەدا چڕ دەبێتەوە کە ئەوە شەرعیەتێک بە پەیامەکەو توانای قەناعەت پێکردنی پێدەبەخشێ. ئەو بەلگانەی لەسەر راستیگەلێکی دیاریکراو بەندە، کاریگەرترە لەو بەلگانەی لەسەر راستیگەلێکی نادیاریکراو بەندە.

**٣- خستنەرووی یەک لایەنی بابەتەکە لەجیاتی خستنەرووی دوو لایەن (لایەنگرو** بەرهەلستکار):

مەبەست لە یەک لایەن، لایەنی لایەنگیرییە، نمایشکردنی دوو لایەنیش واتای پێشکەشکردنی هەردوولایەنی لایەنگیرو بەرهەلستکار دەگەیەنێ. پێشکەشکردنی یەک لایەن کاریگەری پتر دەبێ، ئەگەر ئامانجەکە بە تەنها گۆڕینی کاتیی بێ لە راو بۆچوون، جەماوەریش لایەنە ئەرێنییەکان و بیروڕا دژەکان بەجێ نەهێلێ و لێشیان

تی نەگات، هەروەها نمایشـکردنی یەک لایەن پاڵپشـتی بۆچوونە لایەنگرەکان دەکات کە جەماوەر پابەندبوونی خۆی پێ راگەیاندووە.

**٤- رێکخستنی بیانووی قەناعەت پێکردن لەناو پەیامەکە:**

هەمیشـە پرسـیارێک لەئارادایە سـەبارەت بە دروسـتکردنی پەیام، کە میدیاکار بە چی دەسـت پێ دەکات، یان بە چی کۆتایی پێ دێنێ؟ بەڵام پرەنسـیبەکانی تیۆرەکانی دەروونناسـی فێرخوازی ئاماژە بەوە دەدەن، پێشکەشـکردنی لایەنەکان یان هەنجەتە زیاتـر بەهێـزەکان لـە سـەرەتاوە یارمەتـی ورووژاندنـی سـەرنجی وەرگـر لەبارەی بابەتەکە دەدەن، بەتایبەتیش ئەگەر وەرگر لەسەرەتاوە گرنگی بە بابەتەکە نەدابێ.

**٥- رەچاوکردنی بۆچوون و پێویستییەکانی جەماوەر:**

کۆمەڵناسـان پێیانوایـە جەمـاوەر زیاتـر ئامادەباشـی هەیـە بـۆ پاڵپشـتیکردنی پێویسـتییەکانی لەرێگـەی پەرەپێدانی پێویسـتە زۆر نوێیەکانی، واتـە پەیامەکە کاراتر دەبێ کاتێک دەبینێ ئەو را یان رەفتارەی دەخرێتەڕوو لای جەماوەر وا دەردەکەوێ، ئامرازێکە بۆ بەدیهێنانی راستەقینەی پێویستییەکانی.

**قەناعەتپێکردن لە میدیا:**

میدیـا رۆڵێکـی گرنگی لە گۆڕینی رەفتـاری مرۆیی هەیە، ئەویش بە گۆڕینی زانین و بەهـاکان لە رێگەی گفتوگۆو قەناعەتپێکردن، پێویستیشـە بۆنموونە لە بەرنامەکانی میدیادا زانین ببێتە هۆی گۆڕینی هەڵوێستەکان، ئەویش ببێتە هۆی گۆڕانکاری رەفتار، لەگـەڵ ئەوەشـدا پێویسـتە رەچـاوی ئـەوە بکەین کە زانیـن هەموو کاتـێ نابێتە هۆی گۆڕانـکاری هەڵوێسـتەکان، هەروەهـا مەرجیـش نییە هەر گۆڕانێک لـە رەفتار گۆڕان لەهەڵوێستدا بەدوایدا بێ.

ئەمیش سـوودی میدیا رەت ناکاتەوە سـەبارەت بەوەی پەیوەندە بە خۆپاراسـتن لـە بەکارهێنانـی مـادە هۆشـبەرەکان و واقیـع، ئەمـە پێویسـتی بـە چاودێریکـردن و هەڵسـەنگاندنی ئـەم بەرنامانـە لەلایـەن جەماوەری جیـاوازەوە دەردەخـات. ئامانجی یەکەمی رێوشـوێنە میدیاییەکان دروستکردنی بەشداریکردنی تاکەکان و گروپەکان و

کۆمەڵگایە، لە بەرنامەکانی خۆپاراستن و سەرلەنوێ شیاندنەوەی کۆمەڵایەتی.

**(ا) ڕێوشوێنە میدیاییەکان:**

پێشکەوتنی زانیارییەکان لەبارەی بەکارهێنانی نایاسایی هۆشبەرەکان، بەتایبەتیش لەبارەی مەترسییەکانی وەکو ئەو بەکارهێنانە شێوازێکی زیاتر باوە لە بەرنامەی خۆپاراستن، هەمیشەش بە دوو ڕێباز جیا دەکرێتەوە: ڕێبازی تۆقاندن یان ترساندن، ڕێبازی واقیعی.

**١. ڕێبازی تۆقاندن یان ترساندن:**

فەلسەفەکەی: دوپاتکردنەوەو ترساندن سەبارەت بە شوێنەواری زیانمەندی هۆشبەرەکان و ئاکامی بەکارهێنانی دەبێتە هۆی بڕیاردان لە تاقینەکردنەوەی. بەڵام ئەوانەی مادە هۆشبەرەکان بەکاردێنن، ئەم زانیاریانە بۆ ئەوان سووربوونیان لەسەر بەکارهێنان یان تاقیکردنەوەی دواتری هۆشبەرەکانی دیکە کە زیاتر مەترسیدارە، کەم دەکاتەوە.

ئامانجەکان:

- زیادبوونی ماریفەت سەبارەت بە مەترسییەکانی بەکارهێنانی هۆشبەرەکان.
- هاندانی هەڵویستە ڕەتکەرەوەکانی بەکارهێنانی هۆشبەرەکان بە ئامانجی کەمکردنەوەی ئەگەری بەکارهێنانی هۆشبەرەکان بەگشتی.
- دوورکەوتنەوە لە تاقیکردنەوەی هۆشبەرەکان.

**٢. ڕێبازی واقیعی:**

فەلسەفەکەی: بوونی زانیاری وردو تەریب سەبارەت بە شوێنەوارو عاقیبەتی کۆمەڵایەتی و کەسیی بەکارهێنانی هۆشبەرەکان دەبێتە هۆی بڕیاردانی بەکارنەهێنانی هۆشبەرەکان یان ڕەتکردنەوەی جۆری زۆر خراپتر. هەروەسا تێگەیشتنی باشتر لە سروشتی بەکارهێنانی نایاسایی هۆشبەرەکان دەبێتە هۆی کاردانەوەی زیاتر عەقڵانەتر سەبارەت بە گرفتەکە.

ئامانجەکان:

- زیادبوونی کاردانەوەی ڕەتکردنەوەی بەکارهێنانی هۆشبەرەکان.

- زیادبوونی زانین و گرنگیدان بە سروشت و رادەی گرفتە پەیوەستەکان، بەبەکارهێنانی نایاسایی هۆشبەرەکان.
- پەرەپێدانی هەڵوێستی گونجاو (نەرێنی بەڵام بێ زیادەڕۆیی) بەرامبەر بەکارهێنانی هۆشبەرە نایاساییەکان.
- راستکردنەوەی چەمکە هەڵەکان لەبارەی بەکارهێنانی هۆشبەرەکان و پەنابردنی.

**جەماوەری بەئامانجکراو:**

جەماوەری بە ئامانجکراو لەوانەیە هەر گروپێک لە کۆمەڵگا بگرێتەوە، لەوانەشە ئەمانە بگرێتەوە:
- قوتابیانی قوتابخانەکان.
- باوکان و دایکان و کەسانی دیکە کە ئەگەری ئەوەیان لێ دەکرێ کار لە رەفتاری ئەو کۆمەڵانە بکەن کە ئەگەری توشبوونیان بە مەترسی هەیە (کەسانی فشەڵ).
- ئەو کەسانەی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو جۆرە گرفتانە دەکەن، کە پەیوەندن پێوەی وەک پۆلیس و پسپۆرانی کۆمەڵایەتی.
- کەسانی بەرپرسیار لە رەوشی سیاسی.

**داڕشتنی بەرنامە:**

ناوەڕۆکی بەرنامە میدیاییەکان خاسیەتی جەماوەری بەئامانجکراو گرفتی کۆمەڵ دیاری دەکات. بۆ نموونە لەوانەیە میدیا ئەمانە بگرێتەوە:
- رەوشی یاسایی هۆشبەرگەلێکی دیاریکراو.
- شوێنەواری هۆشبەرگەلێکی دیاریکراو.
- سروشت و رادەی بەکارهێنانی نایاسایی هۆشبەرەکان.
- خاسیەتی کۆمەڵایەتی و دەروونی ئەو تاکانەی هۆشبەرەکان بەکار دەبەن.
- پەیوەندی نێوان بەکارهێنانی هۆشبەرەکان و گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە.
- گرفتە جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی بەکارهێنانی

نایاسایی هۆشبەرەکان، کە تاک لێی بەرپرسیارە.

- میکانیزمی هەڵسەنگاندنی ئەو کەسەی کە هۆشبەرە نایاساییەکان بەکاردێنێ.

- شێوازی داواکردنی یارمەتی بۆ بەکاربەرانی هۆشبەرەکان.

- ئەو دەستپێشخەریانەی دەکرێ ببێتەهۆی کەمکردنەوەی کەمترین رادەی شوێنەواری زیانبەخشی بەکارهێنانی نایاسایی هۆشبەرەکان.

**جێبەجێکردنی بەرنامە میدیاییەکان بۆ قەناعەتپێکردنی بەکاربەرانی هۆشبەرەکان بەمەبەستی دوورکەوتنەوەیان لێی:**

جێبەجێکردنی بەرنامە میدیاییەکان بەم شێوەیە دیاری دەکرێت:

- ئەدگارەکانی جەماوەری بەئامانجکراو.

- داهاتی دارایی.

- ئەو ئاستەی کە دەکرێ بگەینە جەماوەری بەئامانجکراو و کارتێکردنی.

- ناوەرۆکەکانی بەرنامەی میدیایی.

**دەکرێ بەرنامەکانی میدیا بە بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە جێبەجێ بکرێ:**

١. پەیوەندیکردنی کەسی کە شێوەی گفتوگۆ یان کاری گروپگەلێک لەو کەسانەی پەیوەندیان بە بەکاربەرانی هۆشبەرەکانەوە هەیە، پێویستە جەخت لەسەر بەشداریکردنی کۆمەڵگە و بەکارهێنانی دامەزراوەکانی ناو کۆمەڵگە، وەکو یانەکانی لاوان و قوتابخانەکان بکرێتەوە.

٢. بابەتە چاپکراوەکان کە دەکرێ بەسەر جەماوەری بەئامانجکراو دابەش بکرێ، کە تەرکیز دەکاتە سەر راستییە بنەرەتیەکان سەبارەت بە بەکارهێنانی هۆشبەرەکان و ئەو ئامرازانەی بەهۆیەوە سوود لە خزمەتگوزاریەکان وەردەگیرێ.

٣. ئێستگەو تەلەڤزیۆن و ئەو رۆژنامانەی رۆڵی واقیعی و بەرپرسیار دەبینن، یان بە رەواندنەوەی ترسگەلێک کە بنەمای نییە، یان بە ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵگە سەبارەت بە گرفتەکە.

٤. فیلم و وتارە چاپکراوەکان و هەڵمەتەکانی پۆستەر، دەکرێ پەیامەگەلێکی میدیایی سادەو کورت بڵاو بکاتەوە.

**ئـەو ڕێوشـوێنانەی پێویسـتە لە کاتـی گفتوگۆکـردن لەبارەی گرفتـی ئاڵودەبوون ڕەچاو بکرێن:**

- پێویسـتە جورعـە میدیاییـەکان سـووک بکرێتـەوە، بۆئـەوەی بگاتـە شـێوەی مامناوەندی پێویست.

- پێویستیشە سیاسەتی میدیایی بەخێرایەکی سیستماتیک و شێنەییانە هەنگاو بنێ، کە بە سیاسـەتی هەناسـە درێژ ناسـراوە، ناشبێ وا وێنا بکەین کە گرفتی ئاڵودەبوون گرفتـی ئـەم سـەردەمەیە لـە مێـژووی هاوچەرخمان، بەڵکـو گرفتی سـەردەمەکانە و بەردەوام نەوە دوای نەوە هەیەو دەبێ، ئەو شێوازو جۆرانەش کە ئاڵودەبوو مامەڵەی پـێ دەکات بەپێی پێداویسـتی گشـت سـەردەمەکان، بـەڵام ناوازەیـی و ترازانی لاوان شـتێکە لە هەموو وڵاتان و کۆمەڵگاکان بوونی هەیە، ئەمەش خسـتنەڕووی مێژووی هەر گەلێک لە گەلان لەم بوارە تایبەتەدا یان لە بواری ترازانی لاوان بەشێوەی گشتی دووپات دەبێتەوە.

- نابێ هەڵمەتی میدیایی لە ماوەیەکی دیاریکراودا چڕ بێت پاشان شوێنەوارەکانی دەسڕێتەوەو بەتەواوی نامێنێ، چونکە لەوانەیە ئەوە گومان لە جدێتی و نرخی بکرێ، لەوانەشە ببێتە مایەی گەڕانەوە بۆ ئاڵودەبوون بەشێوەیەکی زیاترو قووڵتر.

- دەبێ بژارکراو بێ و پشتی بە شێوازی زانستی درووست بەستبێ.

- مادە میدیاییەکە پێویسـتە بە باشـی بەهۆی پسـپۆڕانەوە لێی بکۆڵدرێتەوە، پێش ئەوەی بگاتە جەماوەرو ڕێگەش لە ناپسپۆڕان بگیرێ دەست لەکاری میدیا وەرنەدات، کە لەوانەیە زیان بگەیەنێ زیاتر لەوەی سوود بگەیەنێ.

- دەبـێ شـێوەی خسـتنەڕووی میدیایـی بەشـێوەی واقیعـی بەڵگەداربـێ زیاتـر لـەوەی بـە شـێوەی ئامـۆژگاری و وانەی تیـۆری بخرێتەڕوو، ئەویـش واتای ئەوەیە بابەتەکان لەسـەر شـێوەی دراما بخرێتەڕوو کە پەیوەندی بە واقیعەوە هەبێ یان بە پێشکەشکردنی نموونەگەلێک بەشێوەی ناڕاستەوخۆ.

- دەبـێ ئامرازەکانـی میدیـا بەپێـی ئـەو توێژانـەی ئاراسـتەیان دەکـرێ پۆلێـن بکـرێ، چونکـە جیاوازی هەیـە لەنێوان میدیای ئاراسـتەکراوی ئەوانەی مامەڵە لەگەڵ

هۆشـبەرەکان دەکەن و میدیای ئاراسـتەکراوی بازرگانانی مادەی هۆشـبەرو میدیای ئاراسـتەکراوی میانگیـران، یـان ئـەوەی ئاراسـتەی ئـەو لاوانە دەکرێ کە دەترسـین توشی ترازان ببن.

- دەبێ میدیا تەرکیز بکات لەسـەر ئەوەی پێویسـتە لاوان بیکەن لە ئەرێنیەکان و بوارەکانـی کارو کردنـی چالاکی و، خولیاکانـی بەرەنگاربونەوەی ڤالآیی و گرفتەکانی کە دەبنە هۆی نامۆبوون و ترازان.

- دەبێ متمانەی تەواو لەنێوان میدیاکاران و نێوان کەرتەکانی لاوان فەراهەم بکات و راشکاوو راستگۆ بێ، شێوازی راستەوخۆ ئامانجی سەرەکی میدیا بێت.

- دەبێ بوارە میدیاییەکان لەبەردەم لاوان والآ بکەین بۆ بەشداریکردن و رادەربڕین و دیالۆگ، هەروەسا دەبێ لە چوارچێوەی تیمی کاری میدیا کۆمەڵی لە لاوان هەبێت.

- دەبێ سـەرجەم ئامرازەکانی میدیا لە بینراوو بیسـتراو و خوێندراو لە شـێوازی پلان و ئامانج یەک بگرن، بەشێوەیەک درز نەکەوێتە نێوانیان کە ورووژاندنی هزری ونەمانی متمانە تێیدا زیاتر بکات.

**پەیامی میدیایی قەناعەت پێکردن:**

**یەکەم: دووبارەکردنەوە:**

توێژینەوەکانـی پەیوەندیکـردن کـە بـە پەیامەکانـی میدیـاوە پەیوەسـتن، ئامانجی قەناعەتپێکردنـی وەرگـرە لەرێگەی پشتبەسـتن بە بۆچوونی جیـاواز، یان ئەنجامدانی ئـەو رەفتـارەی کـە پرۆسـەی پەیوەندیکردنـی قەناعەتپێکـردن ئـارەزووی دەکات، روونیکردۆتـەوە کـە دووبارەکردنـەوەی ناوەڕۆکـی پەیامی میدیایـی قەناعەتپێکردن زۆرجار هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆ گۆڕینی رەفتار.

لەوانەیە بەکارهێنانی دووبارەکردنەوەی رێکلامە بازرگانییەکان بەزۆری لەبارەی پەیامەکانـی قەناعـەت پێهێنان بێت، کە تووشـی هەمووومان دەبێ، هەڵمەتەکانی رێکلام کـە داوا لـە بەکاربـەران دەکات جۆرێک لە خاوێنکەرەوە بکڕن، یان سـەیری فیلمێکی سـینەمایی بکەن بەدوای وەرگردا دەچێ، بۆ پەیوەندیکردنی پەیامی قەناعەت پێهێنان،

هەروەها دەشبینێ و گوێ و چاوی بڕیوەتە سەر ئامرازی پەیوەندیکردنی جەماوەری وەک رادیـۆو تەلەڤزیـۆن، یـان تەنانـەت لە بەکارهێنانـی ئینتەرنێتیـش، لەهەر جارێک یەکێـک لـەم ئامرازانـە بەکاردێنێ بـۆ بەدەسـتهێنانی زانیاری یان بیسـتنی بڵاونامەی هەواڵ یان تەنانەت لە سەیرکردنی زنجیرەیەکی درامیش.

توێژینەوەکانی پەیوەندیکردن پێشـنیاری ئەوە بۆ هەڵسـوڕێنەری پەیامی قەناعەت پێهێنان دەکەن، هەموو جارێک کە پەیامەکەی بۆ وەرگر دووبارە دەکاتەوە باشتراویە پەیامەکە جۆراوجۆر بکات، بڕێک لە شـێوەی پێشکەشکردنەکەشـی بگۆڕێ و تەنانەت بڕێک لە ناوەڕۆکەکەشی، لە یەکێک لە وڵاتە عەرەبیەکان کە دانیشتوانێکی چڕی هەیە، هەڵمەتەکانـی رێکخسـتنی خێـزان سـەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدی هێنـا، دوای ئەوەی دەزگای فێرکردن و پەیوەندیکردنی سەر بە دەستەی پرسگەی ئەو وڵاتە دەیان کورتە فیلمـی رێکلامکردنـی بەرهـەم هێنا، کـە وەرگران هـان دەدات پەیـڕەوی ئامرازەکانی رێکخسـتنی خێـزان بکەن، ئەوەی ئەم فیلمانـەی پتر کارا کرد جۆراوجۆرێتی روون و ئاشکرای فیلمەکان بوو، هەروەسا جۆراوجۆرێتی ئەکتەرەکان کە ئەم پەیامە قەناعەت پێهێنانەو میدیاکاران رۆڵیان تێدا بینی، هەروەها ناوەڕۆکی هەر پەیامێک کە لەکۆتاییدا هانـی بەدیهێنانـی یـەک ئامانجی قەناعـەت پێهێنـان دەدات، ئەویش سـنووردارکردنی منداڵبوون بوو.

سـەبارەت بـە دووبارەکردنـەوەی پەیامـی قەناعـەت پێهێنـان لـە پرۆسـەی پەیوەندیکردن، توێژینەوەکانی پەیوەندیکردن روونیان کردەوە، نمایشکردنی زیاتر لە پاسـاوێک یـان ئەنجامێک لە پەیڕەوکردنی ئەو رەفتـارەی پەیامی قەناعەت پێهێنانەکە پێشنیاری دەکات، هەروەها دابەشکردنی ئەو پاساوو ئەنجامانە لە چوارچێوەی پەیامە دووبارەکردنەوەکانـی قەناعەتپێکـردن و پەیوەندیکردنـەکان، هەموویان لە کاریگەری پەیوەندیکردنـی قەناعـەت پێهێنـان زیاتـر دەکات، بۆنموونە هەڵمەتەکانی رێکخسـتنی خێـزان کـە ئاراسـتەی وەرگـران دەکـرێ بـە زیاتر لە یەک پاسـاو، بـۆ پەیڕەوکردنی ئامرازەکانـی دیاریکردنی منداڵبوون یان رێکخسـتنی بەپێـی ماوە کاریگەر بووە هۆی بەکارهێنانـی زیاتـر لە یەک پاسـاو لە دووبارەکردنەوەی بۆ هەمـان پەیامی قەناعەت

پێهێنان.

بۆنموونـە ڕێکخسـتنی خێـزان بەپێـی پەیامەکانـی پەیوەندیکـردن کـە جەماوەری لەخۆگرتـووە دەبێتـە هۆی پەیوەندی سـۆزێتی زیاتر لەنێـوان ژن و مێرددا، هەروەها ڕەخسـاندنی فەزایەکـی گونجاو بـۆ ژیانی خێزانیی بەختەوەر، لەمیانەی دروشـم یان دەستەواژەی ئیقناعکردنی وەکو (خێزانی بچووک، ژیانی باشترو.. هتد) جەخت لەسەر ئەو واتایە دەکرایەوە، لە زۆر بۆنەی جیاوازدا هەڵسوڕێنەری پەیوەندیکردنی قەناعەت پێکـردن دروشـمێکی یان دەسـتەواژەیەکی دیکـەی قەناعەتپێکردن پێشـکەش دەکرد، سـەبارەت بە پاسـاوی نوێی ڕێکخسـتنی خێزان لەمیانەی جەختکردنی لەسـەر لایەنە خراپەکانـی قەرەباڵغی و کاریگەری نەرێنی لەسـەر دەمـارەکان، تەنانەت بەکارهێنانی ورووژاندنگەلێکـی پەیوەند بە ئینتمای نیشـتمانی بـۆ قەناعەتپێکردنی وەرگر، لەبۆنەی دیکـەدا فیلمگەلێـک بـۆ پڕوپاگەنـدە پەخـش دەکـرا، ئـەوەی ڕوون دەکـردەوە کـە تەندروسـتی دایـک هـەرەس دێنێ، ئەگـەر پەیـڕەوی ئامرازەکانی ڕێکخسـتنی خێزان نەکات، بەڵکو لە دۆخی دیکەدا پێ لەسـەر ئەوە دادەگیرا کە بودجەی سـەرۆک خێزان بەرەو هەرەسـبوون دەڕوات ئەگەر قەناعەت بە هاوسـەرەکەی نەکات سـەبارەت بە ئامرازەکانی ڕێکخستنی خێزان.

**دووەم: جۆراوجۆرێتی:**

بەکارهێنانی تەکنیکی دووبارەکردنەوە بۆ بەرجەستەکردنی ڕەفتاری قەناعەتکردنی پەیامەکـە زیاتـر کارا دەبـێ، ئەگەر ئـەو قەناعەتکردنە لەمیانـەی دووبارەکردنەوە بێ بـە جۆراوجۆرکردنـی پەیامـی پەیوەندیکردنەکە لە هەردوو ڕووی شـێوەو ناوەڕۆک پێکـەوە، تەنهـا دووبارەکردنـەوەی هەمان پەیامیش بۆ سـوودوەرگرتن لە کاریگەری ئیجابی ئەم تەکنیکە بەس نییە، بەڵکو جۆراوجۆرێتی لە هۆکارو پاسـاوەکان، تەنانەت شـێوەی پێشکەشکردنی پەیامەکە بۆ بەدیهێنانی کاریگەری دووبارەکردنەوە پێویستە لەگەڵ خۆدوورگرتن لە بێزاربوونی وەرگرو داهێزرانی لەهەمان پەیام کە پێی دەگات، ئەمـەش لـە هەڵمەتەکانـی ڕێکلامی بازرگانی کە بۆ هەمان پەیـام بەکارهێنراون بەدی دەکرێ، بەڵام تەنانەت گۆڕین و هەموارکردنەوە لە دابەشـکردنی ئاوازە موزیکەکانی

هەمان ریکلام بۆ هەمان کالاّ، یان پەخشکردنی بەشێک لەهەمان ریکلام، کاریگەرتر بووە سەبارەت بە بەکارهێنانی هەمان تەکنیکی دووبارەکردنەوە لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی پەیامی ئیقناعکردنەکە.

**سێیەم: بەرسڤی هەرەشە یان ترساندن:**

لە دەروازە جیاوازەکانی قەناعەتپێکردن هەوڵدانی گۆڕانە لە بونیادی دەروونی تاک بە وروژاندنی پێویستییەکانی یان پاڵنەرەکانی یان بۆچوونەکانی، لەنێو جۆرە باوەکانی ئەم بوارە وروژاندنی پێشبینییەکانی وەرگرە، کەوا رەفتارکردنێکی دیاریکراو لە مەترسییەک لە مەترسییەکان یان بێبەشبوونێک دووری دەخاتەوە، یان دەبێتە هۆی لەدەستدانی پەسندبوونی کۆمەلاّیەتی.

بەرسڤەکانی هەرەشەکردن و ترساندن لە بەرسڤە باوەکانە لە پلاندانانی پەیامی ئیقناعکردن لە بواری میدیادا، کە ناوەڕۆکەکە لەم حاڵەتەدا پشت بەو مەترسیانە یان ئەنجامە ناپەسندانە دەبەستێ، ئەگەر وەرگر گوێڕایەڵی راسپاردەکانی پەیامی ئیقناعی نەبێ، بەکارهێنانی بەرسڤەکانی هەرەشەکردن یان ترساندن لەسەر ئەم گریمانانە دروست دەبن:

- بەکارهێنانی ئەم بەرسڤانە وا دەکات تاک هەست بە پەشێوی بکات.
- هەستکردن بەپەشێوی لەم دۆخەدا دەبێتە هاندەری تاک بۆ دوورکەوتنەوە لە مەترسی یان ئەنجامی ناپەسند.
- تاک بەهۆی ئەو هاندانەوە بەرسڤی ئەو راسپاردانە دەداتەوە کە لەو مەترسی و ئەنجامە ناپەسندانە دووری دەخاتەوە، لەمیانەی تاقیکردنەوەی ئەم بەرسڤانەو بەهێزکردنی دوای ئەوە دەبێتە رەفتارو خوو، کە لەگەڵ ئامانجەکانی پەیوەندیکردنکار یەک دەگرێتەوە، پاشان پەیامەکە لە ئەنجامی بەرسڤدانەوەی تاک بۆ هەرەشەو ترساندن کار بۆ وروژاندنی پەشێوی سۆزی دەکات، لەهەمان کاتدا پێویستە پەیامەکە ئەو راسپاردانەش لەخۆبگرێ، کە بەهۆیەوە تاک لەسەرچاوەی ئەو هەرەشەکردنانە دوور دەکەوێتەوە.

هەرەشەکردنی مامناوەندی ئەنجامی باشتر بەدەست دێنێ لە هەرەشەکردنی

بەهێز، لەبەر ئەم هۆیانە:

- هەڕەشـەی بەهێـز دەبێتـە هـۆی ورووژاندنـی بەرەنگاربوونـەوە، لەجیاتـی وەڵامدانەوە یان ملکەچکردن بۆ راسپاردەکان.

- لەوانەیە تاک دوور بکەوێتەوە لەو پەیامەی هەڕەشەی بەهێز لەخۆدەگرێ.

- بەکارهێنانـی چڕوپـڕی و درێژەپێـدان و زێدەبـار لـە ناوەڕۆکی ئـەو پەیامانەی هەڕەشەو بەکارهێنانی دوورو درێژی ورد لەخۆ دەگرێ، دەبێتە هۆی سوککردنەوەی پەشێوی و نەمانی هاندەری بەرسڤی راسپاردەکان.

**چوارەم: ورووژاندنی پێشبینیە کۆمەڵایەتییەکان:**

ئەگەر ترساندن یان هەڕەشەکردن پێویستی تاک بۆ ئاسایش، یان دوورکەوتنەوە لـە بێبەشـبوون لە هەر پێویسـتییەکی دیکـە بورووژێنێ، ئەوا ئـەم دەروازەیە تەرکیز لەسـەر پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان و پاڵنەرێتـی ئینتیمابـوون و، سـووربوونی تـاک لەسـەر بەدەسـتهێنانی رێـزی کۆمـەڵ دەکات، بەشـێوەیەک کـە دوور بکەوێتەوە لەو رەفتارەی کۆمەڵ پێی قایل نییە، بەرسڤی ئەو رەفتارانەش دەداتەوە کە لەگەڵ پێوەرە کۆمەڵایەتییـەکان یـەک دەگرێتـەوە، لەو بەهـاو نەریت و عورفانە خـۆی دەنوێنێ، کە پێوەرەکانی رەفتار لای کۆمەڵ دیاری دەکات.

تاک وەڵامی هەر شـتێک دەداتەوە کە نەبێتە هۆی فشـاری دەرەکی لەسـەری یان وای لی بکات هەست بە پەشێوی بکات لەئەنجامی ئەو فشارە دەرەکییەوە، کە تاک لە گۆشەگیری یان پەسند نەبوونی لەلایەن کۆمەڵەوە بەهۆی دەرچوونی لە پێوەرەکانی دەترسـێ، پاشـان کۆمەڵیش لەهەمان کاتدا دەسـەڵاتی سزاو پاداشتی هەیەو فشارێک لەسەر ئەو وەرگرە دروست دەکات، بۆئەوەی وەڵامی پەیامە میدیاییەکە بداتەوە.

دەروازەی ورووژاندنـی پێشـبینییە کۆمەڵایەتییـەکان لـە هەڵمەتەکانـی رێکلامـی تایبـەت بـە گۆڕینـی کۆمەڵایەتی بـەکار دەهێنرێ و، لەم شـێوازەش ئەنجامی بەرچاو بەدی هاتووە، لەکاتێکدا شکست لە هەندێ لە هەڵمەتەکانی دەگەڕێتەوە بۆ بێ توانایی میدیـاکار لـە دۆزینەوەی دەروازە کۆمەڵایەتییەکان، کە دەبێتە هۆی پەسـندکردن یان رەتکردنەوە.

**پێنجەم: دووبارە بنیاتنانەوەی زانین:**

دانانـی چوارچێوەیەکـی زانینـی هەمەلایـەن سـەبارەت بـە هەڵوێسـتەکانی پەیوەندیکردنـی بابەتی پەیامەکە، پاشـان پێویسـتە لەسـەر ئامرازەکانـی میدیا کار بۆ دانانی سیمبولگەلی جیاواز بکەن، کە تێیدا سەرلەنوێ وێنەی واقیعی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیەی رێگەخۆش بکات بۆ پەسندکردنی هزری نوێ بکێشێ.

بـۆ نموونـە: بیرۆکـەی بەهێزکردنی کەسـێتی بەسـتراوە بە لایەنـی روناکبیری و خوێندنەوەی کتێب یان بەدەسـتهێنانی بڕوانامە و هەر پرۆژەیەکی رووناکبیری، نەک بەسـترابێ بـە پـارەو سـامانەوە بـۆ ئەوەی بایەخـی خوێنـدن و گرنگیدان بـە لایەنی رۆشـنبیری ببێتە کلتوورێک لەناو کۆمەڵگاو، کەش و هەوای خوێندن بڕەخسـێنرێ و، چەمکـە جیاوازەکانـی ژیـان لای تاک بەرامبـەر ئافرەت و منداڵ و نیشـتمانپەروەری، بەرەو ئەو ئاقارە بێت کە تاک هەست بە ئینتما بۆ نەتەوەو نیشتمانەکەی بکات.

## بەشی چوارەم
## جەنگی دەروونی و ئامرازەکانی میدیا

لـە وەتـەی مرۆڤایەتـی ئاشـنای جەنـگ بووە، لـە هەمـوو ململانێیەکانـدا ئامانجی ئەوە بووە گیانی ورەو ویسـتی شـەڕو کوشـتار لە دوژمن دابماڵێت، کە بە کورتترین ڕێـگا دەژمێـردرێ بـۆ رووخانـدی دوژمـن و سـەپاندنی ویسـت بەسـەریدا، ئەمیـش لـەم سـەردەمەدا پێـی دەووتـرێ جەنگـی دەروونی، کە لـە هەردوو جەنگـی جیهانیدا کاریگەرییەکـەی بەڕادەیـەک گەورە بووە، چارەنووسـی هەندێ لە شـەڕەکانی دیاری کردووە.

ئەمـڕۆ جەنگـی دەروونـی بـە کۆڵەگـەی بنەڕەتی کاری سیاسـی و سـەربازی لە وڵاتانی پێشـکەوتوو دادەنرێت، فراوانی بڵاوبوونەوەشـی لە راسـتیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی زانستە دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بەدەستیان هێنـاوە، لـە زانینـی ئەو هۆکارانـەی کار لە رەفتاری مرۆیـی دەکات، چ مرۆڤ بەتەنها بـێ یـان لـە چوارچێـوەی گرووپێکـدا بێـت. جەنگـی دەروونـی ئامرازەکانـی میدیـاو پێشکەوتنەکانی و بوونی کەناڵە ئاسمانییەکان و بڵاوبوونەوەی وەک باوەشێکی گەرم و ژینگەیەکـی گونجـاو بۆ خـۆی وەرگرتووە، بۆ بەردەوامی قەوارەی هێرشـەکانی و لەقکردنی رەوشی دەروونی کۆمەڵگە.

### جەنگی دەروونی:

جەنگی دەروونی زۆر پێناسـەی هەیە، لەوانە: «بریتیە لە بەکارهێنانی پڕوپاگەندەو ئامرازەکانی دیکە، بۆ کارتێکردنە سەر ویست و هەست و سۆزو بیروباوەڕو رەفتارو هەڵسوکەوتی گرووپێکی دیاریکراو، کە لەوانەیە گرووپێکی خاوەن ئایدۆلۆژیا یان بێ لایەن یان دۆست بن، بەشێوەیەک جەنگەکە ئامانج و سیاسـەتی دەوڵەت بەدی بێنێ».

زانای ئەمریکایی (شـفارتز) وا پێناسـەی جەنگی دەروونی دەکات کە «بریتییە لە

بەکارهێنانی پۆلێنە جیاوازەکان بۆ هەنجەتە راست و ساختەکان و، ئەوانەی ئامانجیان لاوازکردنی گیانی ورەی نەیاران و تێکدانی ناوبانگی سەرکردەکانی و نەهێشتنی باوەڕیان بە تواناو لێهاتووییان، ئەمەش لەکۆتاییدا فشارو کارتێکردن دەگەیەنێ بۆ سەر رای گشتی کۆمەڵایەتی و رای خەڵکی سەربەخۆ بەتایبەتی بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە یان ئامانجی دیکە».

هەروەها جەنگی دەروونی پێناسە دەکرێ بەوەی «بریتییە لە بەکارهێنانی نەخشەبۆکراوی پڕوپاگەندەو شێوازە دەروونییە جیاوازەکان، بەمەبەستی کارتێکردن لە راو هەست و نەست و هەڵسوکەوتی دوژمن بەوشێوەیە کە بەدیهێنانی ئامانجەکان ئاسان بکات، هەروەسا بەکارهێنانی ئامرازەکانی وتارو ئاخاوتن بەمەبەستی گەیشتن بە جەماوەری بەئامانجکراو، بۆئەوەی قەناعەت بە بیرو باوەڕێکی دیاریکراو بێنێت».

یەکەم کەس کە جەنگی دەروونی پێناسە کردبێ لینبارگر (Linebarger)ە، پێیوایە جەنگی دەروونی زامنترین چەکە لە جەنگەکاندا بەکارهاتبێ، بۆ بەدیهێنانی ئەو بەرژەوەندییەی لەپێناویدا ململانێی لەسەر دەکرێ.

جەنگی دەروونی لە سیاسەتەکانیدا پشتی بە بەکارهێنانی ئەو ئامرازانە بەستووە، کە درزی گەورە دەخاتە خەسڵەتی کەسێتی و رواڵەتەکانی رەفتارو، سروشتی ئەداو بیروڕاو باوەڕو بەها واتایی و گیيانیەکانی تاک، لەوانەش:

* بەکارهێنانی شێوازی نابەجێی نایاسایی بۆ هەڕەشکردن لە ئاسایش و ساغڵەمی وڵاتان و هاندانی هێزە چەکدارەکان بۆ خۆبەدەستەوەدان.

* لێدانی داهاتی سەرەکی و گەرمکردنی قەیرانی سیاسی و ئابووری بۆ کارتێکردنە سەر رای گشتی.

* چڕکردنەوەی هەستی گشتی بە نەمانی دادپەورەی و گومانکردن لە ساغڵەمی سیستمی ناوخۆ، هەروەسا دروستکردنی دۆخێک لە چاودێریکردن و نارەزایی و یاخیبون لە واقیع و رەوشی باو.

* وروووژاندنی ململانێی تایفەگەری بۆئەوەی رک و کینە لەنێوان رۆڵەکانی یەک گەلدا بڵاوبێتەوەو، تاکەکان لەوپەڕی ناخۆشی رەوشی پڕ ژاوەژاوو دڵەڕاوکێ

بگوزەرێنن، ئەمیش خەندەقێکی قووڵ لەنێوان گەلی دابەشکراو دەکاتەوە، ولاتیش دەکەوێتە تەڵەزگەیەکی هەستیارەوە، ئەم توندی ململانێیە بێگومان خزمەتی دوژمن دەکات.

* بڵاوکردنەوەی دەنگۆ بە ئامانجی ورکردنی سەربازان لە داکۆکیکردن و، راوەستان بە یەک ریز بۆ بەرگریکردن لە کێشەو ئامانجەکانیان.

* پەنابردن بۆ شێوازەکانی پڕوپاگەندە، کە دەروونناسی پێیوایە لەگەڵ دەنگۆ دووانەن هەمان مەترسی هەیە، وەک سەرچاوەیەکی کاریگەر لەسەر رای گشتی بەهۆی فراوانی بڵاوبوونەوەی بەڕادەیەک، کە هیچ نەخۆشییەک شان لەشانی نادات.

پراکتیزەکردنی دەروونناسی میدیا بۆ پاڵپشتیکردنی هەوڵەکانی پرۆسەی سیاسی و ئابووری و سەربازی، ئەمیش هەروەسا جەنگی گۆڕینی رەفتارو هەڵسوکەوتە و، بەکارهێنانی پلانێکی داڕێژراوە لەلایەن دەوڵەتێکەوە یان چەند دەوڵەتێک لەکاتی ئاشتی یان شەڕ، بۆ بەکارهێنانی رێوشوێنی میدیایی بەمەبەستی کارتێکردنە سەر بیروڕاو سۆزو هەڵوێست و رەفتاری گرووپە بیانییە نەیارەکان، یان بێ لایەنەکان یان دۆستەکان، بەشێوەیەک یارمەتی بەدیهێنانی سیاسەت و ئامانجەکانی دەوڵەتەکە یان ئەو دەوڵەتانەی پەیڕەوی جەنگەکە دەکات.

### ئامانجەکانی جەنگی دەروونی:

(دفیسون) یەکێکە لە شارەزایانی جەنگی دەروونی دەڵێ: «جەنگی دەروونی ئامانجی کارتێکردنە لە سۆزی جەماوەری دوژمن و، ژەهراویکردنی هزری و هەژاندنی هەڵوێستەکانی تا دەگاتە گۆڕینی رەفتارو هەڵسوکەوتی، بەو شێوەیەی یارمەتیدەرە بۆ بەدیهێنانی ئامانج و بەژەوەندی لە ئاستی جیهاندا». ئامانجەکانی جەنگی دەروونیش بەپێی رای شارەزایان دەکرێتە دوو بەشەوە:

**یەکەم: ئامانجە ستراتیژییەکان:**

بریتییە لە ئامانجە سەرەکی و گەورەو دوور مەودا، بەئامانجی بەدیهێنانی مەبەستگەلێکی نەخشە بۆ داڕێژراو، بەدیهێنانیشی ماوەیەکی درێژخایەنی دەوێت،

ڕەنگە بگاتە دەیان ساڵ. جەنگی دەروونی بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلێکی گشتی و هەمەلایەن و دوور مەودا دادەڕێژرێت و، لەگەڵ پلانە ستراتیژییە گشتییەکانی جەنگ ڕێک دەخرێ، بە هەمەلایەنی و درێژبوونەوە لە ڕووی کات و شوێنەوە جیا دەکرێتەوە، لەوانەشە ماوەیەکی زۆر بۆنموونە دەیان تەنانەت سەدان ساڵیش بخایەنێت.

ڕەهەندی ناوچەیی جەنگی دەروونی لەوانەیە ناوچەکانی دەوروبەری ئامانجەکەو هەندێ جاریش گشت کیشوەرەکەو تەنانەت گۆی زەویش بگرێتەوە، بۆئەوەی ئامانجەکە بپێکێت، دوای سەرکەوتنیش بەردەوام دەبێ بۆئەوەی کۆڵەگەکانی بچەسپێنێ. زەحمەتە ئەنجامی پرۆسەکانی ئەم جەنگە بخەملێنرێت، چونکە ماوە درێژە، لەوانەشە ئەنجامەکان بەهۆی فەراهەم نەبوونی زانیاری تەواو لە زۆربەی بارودۆخدا بەدی نەکرێن، لەوانەشە لەبەرامبەر ئەم ڕێوشوێنانە دژە ڕێوشوێنی دیکە لە ناو خاکی دوژمنەوە بگیرێتەبەر، چونکە لەوانەیە دوژمن سزا بەسەر سەربازو سڤیلەکانیشیدا بسەپێنێ، ئەگەر گوێ لە ئامرازەکانی میدیای نەیارانیان بگرن.

**دووەم: ئامانجی تاکتیکی:**

ئەم ئامانجانە کاتین و بەشێوەیەک دادەڕێژرێ لەگەڵ ئامانجی پلان و پرۆسە قۆناغییەکان یەک بگرێتەوە، کە لایەنێک دەیەوێ جێبەجێی بکات، زۆرجاریش شان بەشانی کارەکانی جەنگ ئامادە دەکرێ، ئەمەش مۆرکێکی کاریگەرییانەی ڕاستەوخۆی پێ دەبەخشێ، لە نموونەکانیشی ئەو هەوڵانەیە کە ڕاستەوخۆ لە مەیدانی جەنگدا بۆ بڵاوکردنەوەی بێزارکردن و ڕوخاندنی گیانی ورە لە نێو ریزەکانی هێزە چەکدارەکانی دوژمن دەدرێن، بە ئامانجی پەلەکردن لە شکستپێهێنانی. بۆ ئەوەش بڵاونامەکان بەکار دەهێنرێن کە بە هۆی تۆپ و فڕۆکەو بڵندگۆی دەنگ و ئێستگەی بێ تەلەوە دابەش دەکرێن، هەروەها ڕۆژنامەو نامیلکەو گۆڤارەکان کە لە فڕۆکەوە فڕێ دەدرێن.

جەنگی دەروونی ئامانجی بەهێزکردنی گیانی ورەی تاکەکانی نەتەوەیەو ڕووخانی گیانی ورەی دوژمنە، کاریگەریشی لە تێکشکاندنی ورەی دوژمن دەردەکەوێ و وای لێ دەکات بەشێوەیەک بچێتە جەنگەوە کە دڵنیا بێ تێیدا شکست دێنێ، تەنانەت ئەو دوژمنە ئەگەر لایەنی بەهێزیش بێ، چونکە لە ناوەوە هەست بە لاوازی دەکات وەک

کاردانەوەیـەک بـۆ ئەو پروپاگەندەیە کە هێرش دەباتە سـەر ورەی و گومان لە هێزو توانای دەکات و لایەنی بەرامبەری بەهێزتر لە واقیع دێتە بەرچاو.

جەنگـی دەروونـی جەنگـی ئایدۆلۆژیایە، ئامانجـی کۆنترۆڵکردنی ئـاوەزی پیاوان و زەلیلکردنـی ویسـتیانە، هەروەهـا جەنگـی ئەعسـاب و جەنگـی سیاسـی و جەنگـی پروپاگەندەو جەنگی وشـەو دەنگۆیە، جەنگێکە ئاوەزەکان دەهەژێنی و رەفتار دەگۆڕێ، بەکارهێنانی چەمکەکانی دەروونناسی میدیایە بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن.

## ئامرازەکانی جەنگی دەروونی:

جەنگـی دەروونـی لەپێنـاو گەیشـتن بـە ئامانجەکانـی بە هەمـوو ئـەو ئامرازانەی لەبەردەسـتدایە پاسـاو بـۆ خـۆی دەدۆزێتـەوە، بەمەبەسـتی ورووژاندنـی دەنگـۆو پروپاگەنـدە لەنێـو ریزەکانی جەماوەرو ئەوەی لەو ئامرازانە بۆی فەراهەم دەبێت، کە لەم سەردەمەدا زۆر زیاترە لە سەردەمەکانی رابردوو.

ئامـرازی ئـەم جەنگە لە رابردوودا، گواسـتنەوەی هەواڵی درۆ یان دەنگۆی دەماو دەم بـووە، بـۆ ئـەم کارەش چەند کەسـێک تەرخـان دەکران، بـەڵام هەنووکە ئامرازو دەزگای جۆراوجـۆرو ئاژانسـگەلێکی دەنگوباسـی خـاوەن کاریگـەری فـراوان هەیە، هەروەسا ئێستگەی چالاک (نهێنی و ئاشکرا) و بڵاونامەو رۆژنامەی رۆژانەو گۆڤارو شانۆو سینەماو تەلەڤزیۆن و شتی دیکەی هەیە.

ئـەوەی وا لـە جەنگـی دەروونـی بکات رووبەرێکـی فراوان بێـت و، وای لێ بکات بەهێزتـر بێـت لـە بڵاوبوونـەوەو خێراتر بـێ و کاریگەری زووتـر بگەیەنێت و توندتر بێت، ئەگەر لە رابردووشـدا پشـتی بە ئەزموونی کەسـیی و زیرەکی و توانای خودی لەسـەر فروفێڵ بەسـتبێ، بۆ وەشاندنی گورز بە لایەنی نەیار ئەوا شان بەشانی ئەوە سـوود لـە دەروونناسـی میدیا دەبینێ بە هەمـوو چەمکەکانی ئەو زانسـتانەی پێوەی بەسـتراون، جەنگـی دەروونـی وای لێ هات لە توانایدا بێت لـە چۆنێتی کارتێکردن لە سـۆزی گرووپەکان و ئایدۆلۆژیا و ئاوەزیان شـێوازی زانسـتی بگرێتەبەر، لەمیانەی ئەوەی زانستی نوێ فەراهەمی کردووە لە توێژینەوەو راستی و زانیارییەکان.

جەنگی دەروونی خەریکە لە خودی خۆیدا دەبێتە زانستێک، دوای ئەو پاڵپشتییە زۆرەی زانستەکانی سەردەم لێی کرد، سەرباری ئەزموونی دوورو درێژی مێژوو، لێرەوە جەنگی دەروونی شێوەو جۆری تایبەتی هەیە لەوانەیە ڕێساو پرەنسیپگەلێک بنوێنێ، کە هەموو پەیوەندیداران بەهۆیەوە یەک بگرنەوە.

لە شێوەکانی جەنگی دەروونی کە بە شێوەی کرداری بەکارهێنراوە:

١- پڕوپاگەندەی سیاسی وەکو دۆزینەوەی لایەنی ئۆپۆزسیۆن لەناو ریزەکانی گەل یان لەناو سوپاو، پاڵپشتیکردنی بەتایبەتی لە ڕێگەی میدیاکانەوەو زیادەڕۆییکردن لە قەوارەو ئامانجەکانی ئۆپۆزسیۆن و، کردنەوەی نوسینگەو ئێستگەو تەلەفزیۆن و بوارەکانی تری میدیا بۆیان.

٢- ژەهراویکردنی سیاسی و بێ نرخکردنی بیروباوەڕ، لەو هەولانە دەردەکەوێ کە بۆ نەهێشتنی باوەڕی سیاسی و ئایدۆلۆژی دەدرێ و، هەوڵدان بۆ دوورخستنەوەی تاکەکان و هاندانیان بۆ بەرژەوندی کەسیی و، گرنگیدان بە خۆشگوزەرانی خێزانیان و خۆهەڵنەقورتاندن لە گەندەڵی سیاسی.

٣- لە ڕێگەی دەنگۆوە گومان و دڵەراوکێ بڵاو دەکرێتەوە، وەک بڵاوکردنەوەی هەواڵی گرانیی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و گەندەڵی و، مافیای دزینی منداڵ بۆ فرۆشتنی ئەندامی جەستەیان و، بڵاوکردنەوەی هەواڵی بڵاوبوونەوەی مادەهۆشبەرەکان.

٤- تیرۆرکردنی سیمبول و سەرکردەکان و، کەسانی خاوەن بیرو ڕاو دیاری ناو گۆرەپانی سیاسی و کرداری.

٥- هاندانی یاخیبوون لەلایەن تاکەکانەوە، وەک نانەوەی ئاژاوەو دروستکردنی هەرا لەناو دامودەزگاکانی دەوڵەت و بڵاوکردنەوەی ترسان و تۆقین.

٦- شۆشتنەوەی مێشک بە سڕینەوەی بیرو باوەڕو، دروستکردنی کەسانی تازە کە باوەڕیان بە بیرو ڕای سیاسی نەمێنێ.

٧- بەکارهێنانی کەمینەکان چ کەمینەی نەتەوەیی، ئایینی یان هەر جۆرە تایەفەگەری و زیندووکردنەوەی خێڵ و عەشیرەت بێت و، گەورەکردنی کێشەکانیان و گرنگیپێدانیان.

٨- بەکارهێنانی ڕێکخراوە جیاوازەکانی لەڕێگەی کڕینیان و کارکردنیان بۆ بەرژەوەندی لایەنی خاوەن دەنگۆو، سیخوڕیکردن و کۆکردنەوەی زانیاری و سوکایەتپێکردن بە کەسانی سیاسی و تەشهیرکردن بە پیرۆزییەکانی بیرو ڕاو، گێڕانەوەی نوکتەی سیاسی و بە کەم تەماشاکردنی چالاکییەکان.

٩- فشاری ئابووری و ئاماژەکردن بۆ بەکارهێنانی ئابلۆقەی ئابووری و گەمارۆدانی بازرگانی و دارایی.

١٠- لەکارخستنی ئامرازەگانی گەیاندن بە بەکارهێنانی ژاوەژاوو، لێدانیان و دروستکردنی میدیای بەرامبەر.

١١- ساختەکردنی پارەو بڵاوکردنەوەی لەناو خەڵکداو، گەورەکردنی ئەم پرسە.

١٢- پابەندبوون بە شێوازی دووبارەکردنەوە، ڕۆژنامەکانیش بایەخێکی تایبەتی پێ دەدەن و لە یەکەم لاپەڕەیاندا دەیخەنەڕوو، لە کورتەی هەواڵەکانیش دووبارە بڵاو دەبێتەوە.

**هەنگاوەکانی بەرەنگاربوونەوەی جەنگی دەروونی:**

١- دەستنیشانکردن و شیکردنەوەی ئەو ئامرازەی بەکارهاتووەو، دیاریکردنی ئامانجەکانی ئایا بۆ پڕوپاگەندەیە یان دەنگۆیە یان سیخوڕیکردنە و، توخمەکانی چین و بنەماکانی کامانەن.

٢- خۆئامادەکردن بۆ چۆنێتی بەرەنگاربوونەوەکەو دروستکردنی دژە پڕوپاگەندە بەسوودوەرگرتن لە زانستەکانی دەروونناسی و پسپۆرانیەوە.

٣- دەستنیشانکردنی ئەو ئامرازانەی بەکاردێن بۆ بەرەنگاربوونەوە، لە ئامرازی بینین و بیستن و نوسراوو دیدارو فیستیڤاڵ و کۆڕو کۆبوونەوەو ...هتد.

٤- دەسپێکردنی دژە هێرش بۆ لاوازکردنی بانگەشەکانی بەرامبەر.

٥- لەگەڵ بەدەستهێنانی ئەنجامی باش ئەگەر کەمیش بێ دەکرێ گەورە بکرێ، بۆ بەدەستهێنانی ڕای گشتی و بەدرۆخستنەوەی بەرامبەر.

**دیارترین ئامرازەکانی جەنگی دەروونی:**

**یەکەم: پڕوپاگەندە:**

پڕوپاگەنـدە بـە ئامـرازی سـەرەکی لـە جەنگـی دەروونیـدا دەژمێـردرێ، ڕۆڵێکی زۆر گەورەشـی لـە دیرۆکـی جەنگـە دەروونییەکانـدا بینیوە. پڕوپاگەنـدە هەوڵێکە بۆ کارتێکردنـە سـەر بۆچوونی تاکـەکان و بیروڕاو جۆری ڕەفتاریـان و، بەپێی پلانێکی دیاریکـراو ڕەواج بـە زانیـاری هەڵبژێـردراو دەدات، بـۆ کارتێکردنـە سـەر لایەنێکـی دیاریکراو بەمەبەستی ئابووری، سەربازی یان سیاسی.

دەکرێ وا پێناسەی پڕوپاگەندە بکرێ کە «بریتییە لە شێوازی نەخشە بۆدارێژراو بۆ بڵاوکردنەوەی بیرۆکە، باوەڕ یان هەواڵێک و، بڵاوکردنەوەی زانیاری بۆ ئامانجێک کە بەلای سەرچاوەی پڕوپاگەندەکە بایەخی هەیە».

کەواتـە پڕوپاگەنـدە «بریتییـە لە بڵاوکردنـەوەی زانیاری جیاواز لەوانەیە ڕاسـت یـان نیمچـە ڕاسـت بـن، لەوانەشـە درۆ بن، بـەڵام لەڕاسـتیدا هەوڵێکی ڕێکخـراوە بۆ کارتێکـردن لـە ڕای گشـتی، لە ڕێگـەی بەکارهێنانی ئامـرازە جیاوازەکانی میدیاوە کە گرنگترین سەرچاوەی کاریگەرن لە مەیدانی جەنگدا».

شـێوەی پڕوپاگەنـدەی چـڕ لەوانەیـە سـەرکەوتنێکی هەنووکەیـی بـەدی بێنـێ و قەرەبـووی دۆخی ڕاسـتەقینەی ڕەوشـی باو دەکاتـەوە، بەڵام لەوانەیە تـا ماوەیەکی دوور بـەردەوام نەبێ، چونکە ڕاسـتییەکان ئەوەنـدەی پێناچێ بە ڕوونی دەردەکەون، بەڵام خودی شێواندن لەوانەیە پێویست بێ هەندێجار بەهۆی ناچاری هەڵسوڕێنەرانی پڕوپاگەندە بۆ دەرخستنی لایەنێکی وێنەکەو شاردنەوەی لایەنەکانی دیکە بەمەبەستی شـاردنەوەی شکسـتەکان، توندیـی هاوارکردنـی بەهێـز شکسـتییەکە لە پشـتی خۆی دەشـارێتەوە، بەڵام کاتێک لە ئاسـۆی میدیایی گوڕو تینێکی نائاوەزی کە ڕۆژنامەکان دۆبـلاژی دەکـەن و، ئامرازەکانـی بیسـتراوی میدیـاو تەلەڤزیـۆن بەشـێوەیەکی دووبارەبـۆوەو بـە فۆرمێکی بێزارکەرو لەرزۆک پەخشـی دەکەن، ئـەوا بەڵگەیەکە بۆ بوونی کەندو کۆسپ سەبارەت بە ڕاستی زانیارییە پەخشکراوەکان.

لەوانەیـە پڕوپاگەنـدە چالاکی خـۆی چڕ بکاتەوە، بۆ ورووژاندنـی تۆزێکی چڕ کە

هەڵوێستەکەی داپۆشیوەو وای لێ دەکات گومانی لێ بکرێ، جۆرە سەرکەوتنێک باس دەکات کە لە واقیعدا هیچ بوونێکی نییە، وا لە مرۆڤ دەکات لە دەوروبەرێکی پڕ رواڵەتی فریودەر بگوزەرێنێ، چونکە ئەوە ئامانجی کۆتاییەتی، بەڵام راستی چەسپاو ئەوەیە کە پروپاگەندەی کاریگەر ئەوەیە پشت دەبەستێ بە راستییە بەڵگەدارەکان و، ماشینی خۆی دەسوڕێنێ بۆئەوەی وێنەی راستەقینە بخاتەڕوو، بەتایبەتی کاتێک باوەڕی بەوە هەیە کە ئاماژەی پێ دەدات.

بەڵام لەو دۆخانەی کە تێیدا سوپا ناتوانێ سەرکەوتن و دەستکەوت لە گۆڕەپانی کوشتار بەدەست بێنێ، لێرەدا پێویستە ئەو دەزگا میدیاییانەی تەرخان کراون دەبێ لە خزمەتی سەرکردایەتی سەربازیدا بن، لەو ساتەوەختانەدا دەمارەکان توندن، بەهۆی ناڕوونی هەڵوێستەکەو توندی لەپڕهاتەکان. لێرەدا پێویستە لەسەر پروپاگەندە هەوڵەکانی خۆی ئاراستە بکات بۆ کارتێکردنە سەر مێشک، هەروەها لەسەر دەروون کە لە دۆخی بارگرژی و پەشێوی دایە نەک لەسەر ئاوەز، چونکە ئەوەی لەسەری پێویستە ئەوەیە دەست بە پاڵپشتیکردنی ناوەناوەی هەست بکات بۆ دڵنیایی، چونکە ئەوە دەبێتە سەقامگیرییەکی دەروونی تاک کە ئەمیش کارێکی زۆر گرنگە لە قۆناغە سەخت و یەکلاکەرەوەکان.

**لە دیارترین ئامانجەکانی پروپاگەندەو گرنگترینیان لە بواری سەربازی:**

١- سەرنجڕاکێشانی ئەو گرووپە یان گرووپانەی ئامانجی جەنگەکەیە.

٢- تێرکردنی پێویستییە هەستی و نەستییەکانی گرووپەکە.

٣- دووبارەکردنەوە بەهەر ئامرازێک لەبەردەستدا بێت.

٤- بەکارهێنانی سادەیی و ساکاری بۆ زوو کارتێکردنە سەر بەرامبەر.

٥- پاراستنی گیانی ورەی سوپاو ئاراستەکردنی لە رووی هزری و دەروونی، بەمەبەستی پەسەندکردنی بارودۆخی شەڕو ئەنجامەکەی.

**پروپاگەندەی سیاسی:**

پروپاگەندەی سیاسی «بریتییە لە کرداری وروژاندنی میدیایی سایکۆلۆژی

نەخشـە بۆکێشـراو، بـۆ کارتێکردنـە سـەر بۆچـوون و هـۆش و سـۆزو مەیـل و هەڵوێسـتەکانی جەماوەرو بیرو باوەڕیان و هزرو هەڵسـوکەوتیان». یان «بریتییە لە هونەری کارتێکردن و زاڵبوون و گۆڕین و پەسندکردنی تێڕوانینێکی نوێ و کارکردن لە رای گشتی، بۆ ئەمەش پەنا بۆ زۆر ئامرازو شێواز دەبردرێ».

لە تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە پڕوپاگەندەیە:

- بۆچوون و تێڕوانین یان ناوەڕۆکێکی هزریی سایکۆلۆژی ئاراستەکراو دەنوێنێ.
- بوونی هەنجەتێک پاڵپشتی بۆچوون و تێڕوانینەکە بێ.
- شێوازێک یان زمانێکە بۆ خستنەڕووی بۆچوون و تێڕوانینەکە.
- بوونی گرووپێکی بەئامانجکراو.
- ئامرازێکی کاراو کاریگەرە بۆ گواستنەوەی بۆچوونەکە.

**جۆرەکانی پڕوپاگەندە:**

- پڕوپاگەنـدەی سـتراتیژی دژی گەلانـی دوژمـن بـۆ بڵاوکردنـەوەی گیانـی خـۆ بەدەستەوەدان و بێزاربوون.

- پڕوپاگەندەی تاکتیکی دژی هێزە چەکدارەکانی دوژمن بۆ بڵاوکردنەوەی گیانی رووخان.

- پڕوپاگەندەی تایبەت: ئاراستەی وڵاتانی بێلایەن دەکرێ بەمەبەستی بەدەستهێنانی لایەنگیرییان.

- پڕوپاگەندەی سـپی: پڕوپاگەندەی راشـکاوی ئاشکرایەو سەرچاوەکەی زانراوە، دەوڵـەت بەرپرسـیارێتی لـە ئەسـتۆ دەگـرێ و سـەرجەم ئامرازەکانـی میدیـا بـەکار دەهێنرێ.

- پڕوپاگەنـدەی رەش: پڕوپاگەنـدەی شـاراوەی نهێنـی نافەرمییـە و، بەرپرسـیار نییەو بەرەنگاربوونەوەی زەحمەتە.

- پڕوپاگەنـدەی خۆڵەمێشـی: پڕوپاگەندەیەکە سـەرچاوەکەی نەزانـراوەو لەنێوان ئاشکرایی و نهێنیدایە.

**لە ئامرازەکانی پڕوپاگەندەی جەنگی دەروونی:**

- ئێستگە: پەیامی خۆ بەدەستەوەدان ئاراستەی دەوڵەتی دوژمن دەکات.

- سینەماو تەلەڤزیۆن: ئەو وێنانە پێشکەش دەکات کە ئەو هێزو وێنەیە روون دەکاتەوە، کە لاوازی و رووخانی دوژمن ڕوون دەکاتەوە، هەروەسا سروودی نیشتمانی بڵاو دەکاتەوە، کە هێزی لەشکر نیشان دەدات و نەخشەکێشانی تاکەکانی کۆمەڵ بۆ رووخانی دوژمن.

- رۆژنامەوانی: رۆڵێکی گرنگ لە پرۆسەی پڕوپاگەندە دەگێڕێ، لە رێگەی هەواڵەکان و بڵاونامەکان و بەدواداچوونە رۆژنامەوانییەکان.

- نامیلکەو بڵاونامەکان و ئەوەی لەخۆی دەگرێ لە سەرکەوتنەکانی بەسەر دوژمنداو، گومانکردن لە توانای دوژمن و ئەو باوەڕەی لە پێناویدا دەجەنگێ.

- ئینتەرنێت: لە میانەی بڵاوکردنەوەی پەیامە وێنەدارەکان کە سەرکەوتنەکانی لەشکرو یەکڕیزی گەل نیشان دەدات، تێیدا تاکەکانی کۆمەڵ تێڕوانینی لایەنگری خۆیان بۆ بڕیاری جەنگ دەردەبڕن.

- مۆبایل: لەرێگەی مۆبایلەوە کورتەنامە رەوانە دەکرێ، تێیدا داوای پشتگیریکردن لە سوپا دەکات و، یەکە یەکەی سەرکەوتنەکانی سوپای تێدا بڵاو دەکرێتەوەو، دیارترین رووداوە خێراکان کە یەک لە دوای یەک لە مەیدانی شەڕەوە روو دەدەن دەخاتەڕوو.

**هۆکارەکانی سەرکەوتنی پڕوپاگەندە:**

١- پێویستە پڕوپاگەندە پێویستیە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی تاکەکان تێر بکات، ئەگەر ئەو پێویستیانەش نەبن، دەبێت دروست بکرێن.

٢- هەڵوێستە ناڕوون و تەماوییەکان بوارێکی بە پیتە بۆ پڕوپاگەندەو پێویستە بقۆزرێنەوە.

٣- پێویستە پڕوپاگەندە لەگەڵ بیرو باوەڕو بەهاکانی گرووپەکە گونجاو بێت.

٤- پێویستە ئامانجی پڕوپاگەندە راستکردنەوەی بۆچوونی خەڵک بێت سەبارەت

بە بابەتی پڕوپاگەندەکە و، تەرکیزکردن لەسەر ئەو راستکردنەوەیە زیاتر لە هێرشبرنە سەر بابەتەکە.

٥- پێویستە ئەو ئامرازانە بەکار بهێنرێ کە سەرنجی خەڵک رادەکێشێ.

٦- پڕوپاگەندە زیاتر لەناو ئەو گرووپانە بڵاو دەبێتەوە، کە یەکگرتنیان هەیەو یەکگرتنەکانیان وەک تۆڕێک وایە، ئەمەش زووتر ئامانجەکە دەپێکێ.

٧- ئەو کەسانە پڕوپاگەندە ئەنجام بدەن کەسانی خاوەن کەسایەتی بن و، لەناو خەڵکدا خۆشەویست بن.

٨- پێویستە بارە دەروونییەکانی تاک وەک سروشپێدان و پاساوهێنانەوەو لکاندن و دۆنای دۆنێتی بقۆزرێنەوە، کە دەچنە ناو پرۆسەی پڕوپاگەندەوە.

**شێوازەکانی بەرەنگاربوونەوەی پڕوپاگەندە:**

- بەردەوامی لە بەرزکردنەوەی ورەی یەکە سەربازییەکان و نێوان مەدەنییەکان و، ئاشکراکردنی پڕوپاگەندەی ناڕەوای دوژمن.

- خێرا بڵاوکردنەوەی هەواڵە راستەکان هەرچەندیشە ناخۆشیش بن، بۆئەوەی دوژمن و بەکرێگیراوانی نەیگۆڕن و زیادەڕۆیی تێدا نەکەن.

- رێگرتن لە دزەکردنی هەر زانیارییەک بۆ دوژمن.

- زانست و زانیاری کە لە میانەیدا دەکرێ کلتووری نیشتیمانی بپارێزرێ، لەو گەندەڵییەی دوژمن هەوڵ دەدات بیخاتە ناویەوە.

**دووەم: دەنگۆ:**

دەنگۆ هەمان مۆرکی پڕوپاگەندەی هەیە، ئامانجی شێواندنی راستییەکانە، لەنێو تاکەکان بە وشەی دانپێدانراو جموجووڵ دەکات، بەمەبەستی دووبەرەکی نانەوەو فراوانکردنی درزی ناکۆکی لەنێوان دوژمن و هاوپەیمانانی لە ناوەوەو دەرەوەو، ناچارکردنی بۆ گۆڕینی پلان و بەرنامەکانی. دەنگۆ هەمیشە گوێگری خۆی و مەیلێکی بەهێز بۆ پەسندکردنی وەک راستییەکی جێگیر دەدۆزێتەوە، سەرەڕای ئەوەی

بەڵگەیەک هەڵناگرێ بۆ دروستی ئەو راستییەو وردو درشتیشی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێ.

دەنگۆ وەک پڕوپاگەندە بە تەواوی مەترسی بۆ واقیعی مەدەنی و سەربازی وەک یەک پێکدێنێ، چونکە تەکانێکی نوێ دەخاتە دەروون و گیانەوە، کە چالاکی تاکەکان گەشەیەکی بەرەو پێش یان وەستان دیاری دەکات، دەنگۆ هەمیشە لە نێو دەروونی لاوازەکان و دەمارەکان وەک هاتوچۆی ئاگر لە ناو پووش و پەلاش هاتوچۆ دەکات.

دەنگۆ لە ئامرازە بنەڕەتییەکان دەژمێردرێ بۆ ئەو فشارەی دەکەوێتە پێش قۆناغی میدیای جەنگی نێوان دوو لەشکر، کە هەردوو لای ململانێیەکە بە باشترین ناوبەند لێی دەڕوانن، بۆ رووخاندنی بەرامبەرو گەمارۆدانی بۆئەوەی بێ توانای بکات لە بەرەو پێش چوون و مانەوەی لە دۆخی ملکەچی تەواو. دەنگۆ راستەوخۆ دەست دەخاتە رێڕەوەی بزاڤی سیاسەتی دەوڵەت و تانەی خۆیشی لە ناخی دامەزراوەکانی، بێ ئاوارتە (استثناء) دەدات.

ئاسایش و ئارامی و سەقامگیری باری دەروونی یەکێکە لە پێویستیە دەروونییەکانی تاک، بە تێکدانی ئەو ئاسایشە، ئارامی تاک تێکدەچێ، ئەوەی قورەکە خەستتر دەکاتەوە دەنگۆیە، لەڕووی سایکۆلۆژییەوە دەنگۆ رەفتارێکی شەڕخوازییە دژی کۆمەڵ و گوزارشتە لە هەندێ گرێی دەروونی کە لە ناوەوەی تاکدا چەقیوە، ئەم رەفتارە شەڕانگێزییە دەبێتە هۆی کرداری راستەوخۆی رۆژانەو ناوازەیی لە کردارو گفتاردا دروست دەکات، دیارترین جۆرەکانی دەنگۆ ئەوەیە کە پەیوەندی بە ئاسایش و ئارامی خەڵکەوە بێت، چونکە تووشی دڵەراوکێ و ترس و لەرزیان دەکات و، کار لەژیانی رۆژانەیان دەکات بەتایبەتی کار لەباری ئابووری و گوزەران و ئاسایشی کۆمەلایەتی.

### جۆرەکانی دەنگۆ:

دەنگۆ بە جیاوازی هەڵوێستەکانی جیاوازە، لەوانەش:

١. دەنگۆی رەش: مۆرکی رەشبینی لەخۆدەگرێ و زۆر خێرا بڵاو دەبێتەوە،

ئامانجیشی لەرزاندنی دوژمنە.

٢. دەنگۆی سپی: بانگەشەی گەشبینی و چەسپاندنی متمانە لە دەروون و بەهێزکردنی ورە دەکات.

٣. دەنگۆ دۆخی هەڵچوونی تاک زیاد دەکات، ئاشکرایە کەوا هەڵچوون لە هەستەوەری دەروونی لای تاکەکان زیاد دەکات و رای گشتی لەق دەکات، لەبارەشیەوە وتراوە کە باشترین شێوازی وێرانکەرە لە شەڕدا، چەکێکی وێرانکەریشە لە چەکەکانی جەنگی دەروونی.

دەزگاکانی میدیا رۆڵێکی گرنگیان لە بەربەستکردنی دەنگۆ یان پێچەوانەکەی هەیە، دەنگۆ دەبێتە هۆی رەنگدانەوەی نەرێنی لای رای گشتی، ئەگەر بە دروستی سەرچاوەو زانیاری و دیاریکردنی پاڵنەرەکانی نەبەسترێتەوە.

## دیارترین سیماکانی دەنگۆ:

- کورتی و ئاسانی گوتنەوەی و، ئاسانی گواستنەوەو گێڕانەوەی و، ناکۆکبوونی و گرنگی و ناڕوونی.

- دەنگۆ لە دۆزینەوەی هەواڵێکەوە دەست پێدەکات کە بنەمای نییە، یان هەڵبەستنی هەواڵ کە تۆزێک راستی تێدایە، یان زیادەڕۆیی لە گواستنەوەی هەواڵەکە بە تۆزێک راستییەوە.

- دەنگۆ لە کاتی پێویستبوون بە هەواڵ پێش دەکەوێ، کاتێکیش هەواڵ لەوپەڕی فەراهەمبوونیدایە، کاتێکیش تاکەکان گومان لە هەواڵ دەکەن.

- دەنگۆ هەناسەدانەوەیەکە بۆ دەرپەڕاندنی هەستی چەپێنراو، ئەوەی دەیگێڕێتەوە هەست دەکات پیاوێکی گرنگە و پەیوەندی بە سەرچاوەی کاروبارەکانەوە هەیە.

## فاکتەرەکانی زوو بڵاوبوونەوەی دەنگۆ:

١- گومانی گشتی: «مونتگومر بلگیون» دەڵێ زوو بڵاوبوونەوەی دەنگۆ بەندە بە گومان و ناڕوونی هەواڵ یان رووداو، چونکە کاتێک راستی لەئارادا بێت بواری

دەنگۆ نامێنێ.

٢- بەشداری پێکردنی وەرگر لە بیرکردنەوە لە ئەنجامەکان کە دەبێتە هۆی والاکردنی فەزایەک لە خەیاڵی وا لای تاک، کە بۆ خەیاڵ و ئارەزووی خۆی ملکەچ نەبێت.

٣- بوونی دڵەڕاوکێی کەسیی و نائارامی دەروونی.

٤- خێرایی وەرگرتنی دەنگۆ یان ساویلکەیی وەرگر یان عەقڵیەتی گرووپەکە.

٥- چاودێریکردن و پێشبینیکردن، نەبوونی سەقامگیری و متمانە.

٦- بوونی کەش و هەوایەکی دەروونی ئەوتۆ کە باڵ بەسەر کۆمەڵدا دەکێشێ.

٧- نالەباری رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

٨- بوونی ڤالایی لە ئەنجامی بێکاری.

**ئامانجەکانی دەنگۆ:**

ئامانجی سەرەکی دەنگۆ ئامانجی کەسییە، پراگماتی و هەنوکەییە، هەمیشەش بۆ قازانجی تیمێک یان چینێکی دیاریکراوە، «چارلز ئیتندال» پێیوایە دەنگۆ وەک پەردەیەک بۆ شاردنەوەی راستییەکی دیاریکراو و پێکهێنانی وێنەیەکی زۆر دوور لە واقیع بەکاردەهێنرێ، لە ئامانجەکانیشی:

- دوژمن بخاتە دۆخێکی دەروونی لاوازەوە.

- کارتێکردنە سەر شێوەی پەیوەندییەکان و، تێکدانی کەشوهەوا تاڕادەیەکی ترسناک.

- کۆنترۆڵکردنی تواناکانی دوژمن بۆئەوەی گورزێکی توند لە ساتی کۆتایی بوەشێنێت.

هەروەها دەنگۆ پەنا بۆ رەواجدانی ئەو هەواڵانە دەبات کە ترس دەخاتە دەروونی جەنگاوەران و بەهێزکردنی دۆخی رەشبینیان، کە داخوازی لە رەواجکارانی ئەوەیە رێگە نەدەن دوژمن پلانە سەربازییەکانی جێبەجێ بکات، ئەو خواستانەش بەدی بێنێ کە سەرکردایەتی بڕیاری لەسەر داوە.

**تایبەتمەندیی دەنگۆ:**

دەنگۆ لە واقیعی ئەو کۆمەڵگایەوە دەست پێدەکات کە تێیدا بڵاو دەکرێتەوە، پێویستی تاکەکانیش لە کاتی بڵاوکردنەوەیدا ڕەچاو دەکرێت، بەوە دەناسرێتەوە کە نا روونە، لەبەرئەوەی سەرچاوەیەکی دیاریکراو پشت راستی ناکاتەوە، چونکە ناڕوونی گومان دروست دەکات، ئەمیش پێویستە بۆ سەرخستنی مەبەستەکانی، دەنگۆ لە هەواڵێکی بێ بنەما، یان دۆبلاژکردنی هەواڵێک کە تۆزێک راستی تێدایە دێتە ئاراوە، هەمیشەش کورتە بۆئەوەی بڵاوکردنەوەی ئاسان بێ.

دەروونناسان کۆکن لەسەر ئەوەی دەنگۆ بریتییە لە دەرپەڕاندن (تنفیس)ی هەست و نەستە چەپێنراوەکان، تاک شتی وای تێدا دەبینێ لە هیچ شتی دیکەدا نییە، هەمیشە سەرکەوتووە لە بڵاوکردنەوەی ژەهرەکانی، چونکە رەواجکارانی دەنگۆ بەشێوەیەکی بریق و باق پێشکەشی دەکەن، دەرناکەوێ دوای هۆنینەو داڕشتن و باش هەڵبژاردنی وشەکان و کاتەکەی نەبێ، بۆئەوەی خۆی بەسەر رای گشتیدا بەهێزیی بسەپێنێ.

پرۆسەی گواستنەوەی دەنگۆ، لە کاتی جموجوڵی دووچاری پرۆسەی گفتوگۆ لەسەر کردن دەبێتەوە، ئەم گفتوگۆ لەسەر کردنەش یان کە پێی دەوترێ پاڵپشتیکردن رەواجکارانی دەنگۆ سوودی لێ دەبینن، چونکە پرۆسەی گفتوگۆ لەسەر کردن خزمەتی ئەو ئامانجە دەکات، کە لەپێناویدا ئەو دەنگۆیە هاتۆتە ئاراوە.

**چۆنێتی بەرەنگاربوونەوەی دەنگۆ:**

١- ئاگادارکردنەوەی جەماوەر لە دەنگۆکان و ئەوانەی بڵاوی دەکەنەوە.

٢- رێککەوتن و هەماهەنگی نێوان میدیاکان بۆ نیشاندانی راستییەکان لە کاتی خۆیداو دروستکردنی متمانەو بڵاوکردنەوەی وشیاری لە نێو جەماوەردا.

٣- رێنمایی کردنی خەڵک بۆ چەسپاندنی باوەڕو متمانەی ئاڵوگۆڕ لە سەرکردایەتی و حکومەتدا.

٤- بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەنگۆکان سوود لە کەسانی پسپۆڕو خاون ئەزموون وەربگیرێ.

٥- بەدرۆخستنەوەی دەنگۆکان بە هێنانەوەی بەڵگەو راستییەکان و دۆزینەوەی سەرچاوەکەی و روونکردنەوەی ئامانجی دەنگۆکان.

٦- کارکردن بەشێوەیەکی زانستی و فێرکردنی تاکەکان لە بەرەنگاربوونەوەی دەنگۆ بە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری سایکۆلۆژی سەبارەت بە دەنگۆو جەنگی دەروونی لەلایەن پسپۆرانەوە.

- هاوکاریکردنی جەماوەر لە ئاگادارکردنەوەی دەنگۆو بە درۆخستنەوەی و دووبارە نەوتنەوەی.

- هاوکاریکردنی دەزگاکانی میدیا لەپێناو خستنەڕووی راستییەکان لە کاتی خۆیداو بڵاوکردنەوەی متمانە لەنێوان هاوڵاتیان.

- هۆشیارکردنەوەی بەردەوام بۆ چەسپاندنی ئەو بیرو باوەڕەی جەماوەر لەسەرێتی و متمانەکردن بە بەلاغە فەرمییەکان لەرێگەی کۆڕو کۆبوونەوەو سیمنارو گفتوگۆ.

- وەستان لەسەر هێڵی بەڕێوەچوونی دەنگۆو گەیشتن بە رەگ و ریشەی و، دەرکردنی بەیاننامەی راست و راشکاو لەبارەی.

- متمانەکردن بە سەرکردەو سەرۆکەکان و نهێنی و شاراوەیی کاروبارە سەربازییەکان، متمانەش بەوەی دوژمن هەوڵی دروستکردنی دەنگۆ دەدات.

### سێیەم: ئامرازەکانی میدیاو جەنگی دەروونی:

میدیا یەکێکە لە گرنگترین ئامرازە بەکارهاتووەکانی جەنگی دەروونی، کە بەکارهێنانی ئامرازو بابەتەکانی بەشێوەیەکی سیستماتیکیانەیە، بۆ کارتێکردن لە باوەڕی لایەنی نەیارو بەئامانجکراو بێت، بەکارهێنانی هێزی سەربازی و توانای ئابووری و جموجوڵی سیاسی، بەڵام میدیا لەلایەکی دیکە جیاوازە لەو هەموو ئامرازانە لەبەرئەوەی هۆکاری هاوبەشی هەموویانەو گوێزەرەوەی بنەڕەتی ئامانج و تێڕوانینەکانە لە کارتێکردنە سەر لایەنی نەیار، چونکە:

ا. هەواڵی سەربازان و وردو درشتی جەنگ دەگوازێتەوە، بەشێوازێک ورە زیاد

یان لاواز دەکات.

ب. لە بەهای سەرکەوتنی سەربازی کەم دەکاتەوە کە بە کردەوە روویداوە، یان لە زیانێک زۆر دەکات کە گەورە نییە، بۆئەوەی دۆخێکی ناهەمواری کوشندە بێتە ئاراوە.

ج. لە کاریگەری گەمارۆی ئابووری لەسەر وڵاتێک هەراو ترس دروست دەکات، بە ئامانجی راکێشانی بۆ جێبەجێکردنی ئامانجگەلێکی دیاریکراو.

د. توانای دیبلۆماسی دەوڵەتێکی دیاریکراو گەورە دەکات، بۆ ناچارکردنی کەسانی دیکە لە هەڵکردن لەگەڵ تێڕوانینە نەخشە بۆکێشراوەکانی.

ئەگەر جگە لەوانە ئەرک و شێوازی گواستنەوەی هزرو هەواڵ و زانیارییەکان و، پێویستی جەماوەر پێی لە بەدواداچوون و رەواجکردن و تێرکردنی پێویستییەکان، هەروەها توانـاو هەمەلایەنی لە کارتێکردنمان بۆ زیاد کرد، ئەوا میدیا لەم دۆخەیدا ئامرازێکی کاریگەرترە لە ئامرازو هۆیەکانی جەنگی دەروونی رەخساوی ئەم سەردەمە، بەتایبەتی لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنیکی پەیوەندیکردن و رێگەکانی کارتێکردنە سەر سیستمی گەردوونی هەمەلایەن.

**چوارەم: شووشتنەوەی مێشک:**

شوشـتنەوەی مێشـک (brain washing) پرۆسـەی ملکەچ پێکردنـی مێشـکە یان سـەر لەنـوێ پێکهێنانـی بیرکردنەوەیە، پرۆسـەی گۆڕینـی بۆچوونـە دەروونییەکانە، کـە گۆڕانەکەش بە شـێوەی تەقاندنـەوە دەبێت، هەوڵی ئاراسـتەکردنی هزری مرۆیی یـان کاری مرۆییـە دژی ئـارەزووی تـاک یان دژی ویسـتی، یان دژی ئـەوەی لەگەڵ ئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕو بەهاکانیدا کۆکە.

شوشـتنەوەی مێشـک پرۆسەی سـەرلەنوێ فێرکردنەوەیە، پرۆسەی وەرچەرخانی باوەڕە بۆ کوفر پێکردنی، پاشان بۆ باوەڕهێنانی بە دژەکەی. خزاندنی هێزە دەروونییە ژینگەییـەکان لـە هەڵچوونەکانـی نـاوەوەی تـاک، لە راسـتییە گرنگەکانە لە پرۆسـەی شوشـتنەوەی مێشـک و ملکەچپێکردنـی و، سـەرلەنوێ پێکهێنانـەوەی بیرکردنـەوەی. گرنگیپێدەرانـی جەنگـی دەروونـی توێژینەوەکانیـان سـەبارەت بـە کارئەندامزانـی و

کۆئەندامـی دەمـاری و، پەیوەنـدی نێـوان کارئەندامزانـی و زاڵبوونی بەســەر مێشـک قۆستەوە.

**هەنگاوەکانی ششتنەوەی مێشک:**

١. گۆشــەگیرکردنی تــەواوی کۆمەڵایەتیانــەی تــاک و بێبەشـکردنی لــە هــەر وروژێنەرگەلێکی تایبەت بەو بابەتانەی پێویستە بشۆردرێتەوەو، دانانی لە نەخۆشخانە، گرتووخانە یان زیندانێک و، بانگکردنی بە ژمارەیەک نەک ناوی خۆی و، قۆستنەوەی پاڵنەرەکانی برسێتی و ماندوبوون و ئازارو هێدمە کارەباییەکان.

٢. لاوازکردنی کەسەکە لە رێگەی کەمکردنەوەی ماوەی نووستن یان بێبەشکردنی لێـی، یـان کەمکردنــەوەی خـۆراک یـان بێ بەشـکردنی، هەروەسـا بێ بەشـکردنی لە جلوبەرگی گونجاوی تەواو و بەکارهێنانی هەر شـتێک وا لە کەسـەکە بکات لە دۆخی خەمۆکی تونددا بێت، کارکردن بۆ پەشێوکردنی ئاراستەکردنی و هەستپێدانی کە ئەو لەژێر فشاری تەواودایە.

٣. دروسـتکردنی گومـان لەلای لەبارەی هاورێیـان و ئەو کۆمەڵ و دامەزراوانەی ئینتیمـای بۆیـان هەیـە، هەروەها لە پێـوەرە رەفتارییەکانی پێشـووتری و، هاندانی بە دانپیانان تا چاک ببێتەوەو، تووشکردنی بە نەخۆشی جەستەیی و ئاوەزی، تا لەمردن نزیک دەبێتەوە.

٤. بەکارهێنانی نەرم و نیانی و میهرەبانی و ئاسـانکاری و هاورێیەتی و لێبوردن سـەبارەت بە مامەڵەکردنی پێشـتر لەگەڵیداو، دەرخسـتنی هاورێیەتی و رەخسـاندنی هەلێـک بۆ ئەو کەســە تا لەمسـی بکات، رێگـەی بدرێ بچێتە بەر هەتـاوو هەوا لەژێر چاودێرییەکی سـووک یان تەنانەت بێ چاودێری و، رێگەی خواردن و جگەرەکێشـان و چا خواردنەوەو قاوەی پێ بدرێ و، لێکۆڵینەوەکان ببێتە گفتوگۆ.

٥. هـان بـدرێ بۆ دانپیانان، کـە بە ناچارکردن بۆ دانپیانان ئەژمار دەکرێ، چونکە کەســەکە کـە زانی ئەگەر دانی پیا بنێت، ئـەوا مامەڵەکردن لەگەڵیدا وردە وردە بەرەو باشتر دەچێت و دەتوانێ لەئەماندا بژیت.

٦. قەناعەتپێکردنی لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی کەسیی بەو بیرو بۆچوونە دەست پێدەکات کە دەیانەوێ تێیدا بیچێنن، ئەمیش پرۆسەی سەرلەنوێ فێرکردنەوەیە کە ئەوە فێر دەبێ ڕەخنە لەخۆی بگرێ و، نەفرەت لە هەر شتێ بکات کە پەیوەندی بەوەوە هەبووە.

٧. دواتر قۆناغی دانپیانانی کۆتایی دێت.

٨. گۆڕان لە چەمکی خود لای کەسەکە ڕوو دەدات و شێوازگەلێکی وەک نواندنی سروشی بەکار دەهێنرێ، کە کەسەکە بە تەواوی دەکەوێتە ژێر سروشەوە.

٩. ئەو بیروڕایەیە کە ئامانجە بۆ سڕینەوە بە تەواوی دەسڕێتەوە.

١٠. ئەوجا بیروڕای نوێ پێشکەش دەکرێ و بۆ فێربوونی پێوەرە ڕەفتارییە تازەکان و، ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان هان دەدرێ و لە ئەستۆی دەگرێت و، دەبێتە کەسێکی نوێ.

**پێنجەم: نوکتە و جەنگی دەروونی:**

نوکتە گێڕانەوە، لە دێر زەمانەوە مرۆڤ خۆڕسکانە بۆ زۆر مەبەستی جیاواز بەکاری هێناوە، چ وەک پێکەنین بۆ کات بەسەربردن، چ وەک چەکێکی زاڵبوون بەسەر بەرامبەردا، چونکە لە نوکتە گێڕانەوە پێکەنین دروست دەبێت، پێکەنینیش مرۆڤ دەخاتە بارێکی دەروونی تازەوە ئەویش زاڵبوون و هێزو دەسەڵاتە، درامای پێکەنیناویش بەرامبەر درامای تراژیدیا هەمان مەبەستە، بۆیە وەکو جەنگی دەروونی بەکاردەهێنرێ بەتایبەتی لەکاتی جەنگەکاندا، کە لە رادیۆو تەلەڤزیۆن و ڕۆژنامەو کەناڵەکانی تری میدیادا زۆر بەکارهاتووە، تەنانەت بەرنامەی گەڵتەجاری و پێکەنینی تایبەت بۆ کەمکردنەوەی ورەو ئاستی سەربازی دوژمن و ڕووخاندنی و بڵاوکردنەوەی لەناو گەلی بەرامبەر بەکار هاتووەو، سوکایەتیکردن بە سیستمی حوکمڕانی دوژمن و بە سووک تەماشاکردنی هێماکانیان و بەرزکردنەوەی ورەی سوپای خۆت و، گێڕانەوەی متمانەو باوەڕ بەخۆبوون و شانازیکردن بە مێژووی باو باپیران و شکۆدارییان.

**قوتابخانە میدیاییەکانی جەنگی دەروونی:**

**١. قوتابخانەی هزری میدیایی بۆرژوازی:**

میدیای رۆژئاوایی نوێنەرایەتی ئەم قوتابخانەیە دەکات، ئامانجی هەناردنە دەرەوەی هزرێکە لەبارەی رۆژاوا، بەوەی مایەی رزگاربوونە بۆ هەر کەسێک لە دواکەوتوویی و هەژاری و زۆرداری، هەر کەسێکیش لە خوارەوەی رۆژئاوایە دەکەوێتە دوا ریزی شارستانییەت و پێشکەوتنەوە.

**٢. قوتابخانەی هزری میدیایی شوێنکەوتوو:**

ئەم قوتابخانەیە لە میدیای وڵاتانی تازەگەشەسەندوو خۆی دەنوێنێ و ئەوە پێشکەش دەکات، کە رۆژئاوا بەسەریدا دەیسەپێنێ لە ئایدۆلۆژیاو وێناندن و، بە رێگایەکی راستەوخۆ دەیەوێ بیگەیەنێتە ئەم گەلە تازە گەشەسەندووانە، بۆئەوەی لەرووی واتاییەوە ئەم گەلانە بڕووخێنن و ئومێد لە نێو رۆڵەکانیاندا بکوژن.

**٣. قوتابخانەی هزری میدیایی فریودەر:**

ئەم قوتابخانەیە لە میدیای هەلپەرستی بێ ئامانج خۆی دەنوێنێ، هزرگەلێکی پڕوپووچ بۆ لاوان دەخاتە روو، بۆ کوشتنی هیمەت و بڵاوکردنەوەی خراپەخوازی و نەزانین لەناو کۆمەڵ و، وازهێنان لە بابەتی گرنگ و زیندەگی و تەرکیزکردن لەسەر شتی پڕوپووچ.

**جەنگی زانیاری:**

لەم سەردەمەدا زانیارییەکان بە چەندین شێوە گەمارۆی مرۆڤیان داوە، سەرەتا لە رێگەی ئامێری چاپەوە ئینجا رادیۆو تەلەڤزیۆنەکان، پاشان کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت سەریان هەڵدا. کاتێک ئێستگە داهێنرا وەک ئامرازێکی نوێ بۆ جەنگی زانیارییەکان خرایە کار، بەوپێیەش یەکێک لە لایەنەکان بە ئامانجی دروستکردنی کاریگەری دەروونی لەسەر بەرامبەری چەند زانیاریەکی بڵاوکردەوە، وەک زانیاری نهێنی یان ناڕاست بەمەبەستی کەمکردنەوەی متمانەی بەرامبەر بەو زانیارییانەی بە دەستی دەگات.

لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمپیوتەرو بەستنەوەی بە تۆڕی ئینتەرنێتەوە، بەکارهێنانی ئەم داهێنانە نوێیەش رۆژ بە رۆژ پەرەی سەندو جەنگی زانیارییەکانیش رەهەندێکی نوێی بەخۆوە بینی. لێشاوی زانیارییەکان و رێکخستنی داهێنانە نوێیەکانی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر وایکرد زۆرترین کات بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی رۆژانە پشتیان پێ ببەسترێ و بەکارهێنانی زانیارییەکان وەکو چەکێک، دژوارترین کاریگەری دروستکرد.

لەو سەردەمەدا تەنها بیرکردنەوە لە تێکدان و پەکخستنی سیستەمەکانی پەیوەندیکردن و زانیاری، کاریگەری ترسناکی لەلای هەمووان دروست دەکرد، چونکە ئەوکات بۆچوون وابوو، پەکخستنی ئەو زانیارییانە واتە ئیفلیج کردنی کۆمەڵگەو ژیانی شارستانیی سەردەم. سەرەنجام ململانێ و بەرژەوەندی لایەنە دژ یەکەکان و داهێنانە تازەکانی تەکنەلۆژیای نوێ، دەرگایەکی فراوان و ترسناکیان بە رووی جەنگی زانیارییەکاندا کردەوە، هەڵبەت جەنگی زانیارییەکان شتێکی تازە نییە و لە سەرەتای بەکارهێنانی سیستمی زانیارییەکانەوە مرۆڤایەتی پیادەی کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا بەکارخستنی زانیارییە کلاسیکییەکانی وەک ئامێری چاپ و بڵندگۆکان، هەر لە نێو ریزبەندی هۆیەکانی جەنگی زانیارییەکاندا ماونەتەوە، سەرەڕای ئەوەی دەتوانرێ وەک هۆکارێکی یارمەتیدەر لە جەنگە کلاسیکییەکاندا بەکار بهێنرێن، هەروەها زۆرجار زانیارییەکان خۆیان دەبنە گۆڕەپانی جەنگی نێوان دوو لایەنی دژیەک.

جەنگی زانیارییەکان لە سێ رەگەزی بنەڕەتی پێکهاتووە (هێرشبەر، بەرگریکەر، زانیاری و سیستمەکانی). هەروا دوو جۆر جەنگی زانیاری هەیە کە بریتین لە:

**١- جەنگی زانیاری هێرشبەرانە:**

ئامانج لێی وەدەستهێنانی زانیاری دیاریکراوە یان ئەو سیستمی زانیاریانەیە کە لایەنی بەرامبەر پشتی پێدەبەستێ، بۆ رێکخستن و زیاد کردنی بەهای زانیارییەکانی لایەنی هێرشبەرە، یاخود کەمکردنەوەی بەهای زانیارییەکانی لایەنی بەرگریکەرە.

لێرەدا بەهای زانیارییەکان و شێوازی رێکخستنیان پێوەری سەرەکین بۆ زانینی

ڕادەی کۆنترۆڵکردنی یەکێک لەو لایەنانە، لەلایەن ئەوی دیکە. زۆرجار ئەوەی لایەنی هێرشبەر لە شەڕی زانیارییەکاندا هەوڵی بۆ دەدات، دەشێ ئامانجی دارایی هەبێ یان ئامانجی سیاسی و سەربازی، زۆر جاریش تەنها مەبەست لێی دروستکردنی کاریگەری و دەرخستنی توانای ئەو لایەنەیە.

چەندین جۆر جەنگی زانیاری هێرشبەرانە بۆ ڕێکخستن و زیادکردنی بەهای زانیارییەکان هەیە، گرنگترینیان پرۆسەی سیخوڕیکردنە لەسەر لایەنی بەرگریکەر، بۆ دزینی زانیاری نهێنی و ئامانج لێی زیاتر بازرگانی کردنە لەنێوان کۆمپانیاکان، یان ئامانجێکی ستراتیژی و سەربازییە لە نێوان دەوڵەتاندا. بەهۆی ئاسانی بڵاوبوونەوەو نەبوونی سانسۆر لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت ئەم پرۆسەیە بەشێوەیەکی بەرچاو تەشەنەی کردووە، وەک چەتەگەریی لەسەر داهێنانە تاکە کەسییەکان و دزینی بەرنامەکانی کۆمپیوتەرو دابەشکردنی بابەتی وێنەیی یان نوسراو بەبێ ڕەزامەندیی خاوەنە ڕەسەنەکەی.

هەروەها (دزینی کەسێتیی یەکێکیتر) لە ریزی جەنگی زانیاری هێرشبەرانەدا پۆلێن دەکرێ، کە لایەنی هێرشبەر هەڵدەستێ بە بەکارهێنانی ناسنامەی کەسێکیتر بە مەبەستی ناوزڕاندنی ئەو کەسە، یان بۆ دزینی هەر شتێکی دیکەی پەیوەندیدار بەو کەسە.

پرۆسەی جەنگی زانیارییەکانی تایبەت بە کەمکردنەوەی بەهاو سیستمی زانیارییەکانی بەرگریکەر، دوو شێوەی هەیە: یان تێکدان و پەکخستنی زانیارییە تایبەتییەکانی بەرگریکەرە، وەک (کۆمپیوتەرو سیستمەکانی پەیوەندی و پەیوەندیکردن)، یان دزین و شێواندنی زانیارییەکانە.

لە جەنگی زانیاری هێرشبەرانەدا، بەهاو سیستمی زانیارییەکان لەلای هێرشبەر بە شێوەیەکی گەورە پشت بە ڕادەی تواناکانی خودی هێرشبەر دەبەستێ بۆ گەیشتن بە سیستمی زانیارییەکانی بەرامبەر، هەروا پشت بە گرنگی و بەهای ئەو زانیاریانەش دەبەستێ کە بۆ جەنگەکە دەیانخاتە گەڕ.

بەشی دووەمی هێرشبەرانی جەنگی زانیارییەکان ئەوانەن کە هەوڵ دەدەن

زانیاری وردو هەستیار لە ناوەندە بازرگانی و حکومییەکان بدزن و بەو ناوەندەیان بفرۆشنەوە کە پێویستییان بەو جۆرە زانیارییانەیە. بەشی سێیەمیش کە بە (هاکەرز) ناودەبرێن و لە جەنگی زانیارییدا مەبەستیان سەرکێشی و نیشاندانی توانای خۆیانە لەئاست بەرامبەرەکەیاندا.

بەشی چوارەم ئەوانەن کە رکابەرایەتی یەکتر دەکەن و هەوڵدەدەن بۆ وەدەستهێنانی زانیاری وردو هەستیار لەسەر یەکتر، هەریەکەشیان مەبەستیان ئەوەیە کێبرکێی ئەویتر بکەن و پێگەی باشتر بۆ خۆیان دروست بکەن. بەشی پێنجەم حکومەتی هەندێ لە دەوڵەتان دەگرێتەوە کە هەوڵدەدەن لەرێی جەنگی سیخوڕییەوە، زانیاری ستراتیژی و سەربازیی لەسەر وڵاتانی دیکە وەدەستبێنن.

### ٢- جەنگی زانیاری بەرگریکارانە:

هەموو شێوازەکانی خۆپاراستن و سنووردانان دەگرێتەوە، بۆ بەرگرتن لە هەر هەوڵێکی تێکدانی سیستمی زانیارییەکانی لایەنی بەرگریکەر لەلایەن هێرشبەرەوە. ئەم شێوازەی خۆپاراستن بۆ سنووردارکردن یان کەمکردنەوەی مەترسییەکانی سەر ئامرازەکانی وەک کۆمپیوتەرو دەزگاکانی دیکەی بەرگریکەرە. پەرەسەندن و بڵاوبونەوەی پیشەسازی تەکنیکی زانیارییەکان لەم ساڵانەی دواییدا بووە هۆی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی زیاتری پیشەسازی و هۆیەکانی تێکدانی سیستمی زانیارییەکان. کەسێکی کەمئەزموون لە رێگەی زۆربەی ماڵپەرەکانی ئینتەرنێتەوە دەتوانێ جۆرەها رێگەی تێکدان بدۆزێتەوەو هێرشی پێ ئەنجام بدات، بۆ سەر ئەو کۆمپیوتەرانەی بە تۆڕی ئینتەرنێتەوە بەستراون و بەهۆیانەوە چەندین کاری تێکدان ئەنجام بدات.

رێگەکانی تێکدانی سیستمی زانیارییەکان و زیانەکانیشیان جۆراوجۆرن، کاری تێکدان و دزینی زانیارییەکان و گۆڕینیان لە گرنگترین ئەو رێگەو شێوازانەن، هەندێ ئامرازی تێکدانی دیکەش هەڵدەستن بە زیانپەیوەندیکردن بە ئامێرەکانی ئەو سیستەمە. (لیوتار) لەبارەی ئەم سەردەمە دەڵێ «زانین، وەک کاڵایەکی زانیاری بە گرنگترین

بوارەکانـی رکابـەری جیهانـی دادەنـرێ لەپێناو وەدەسـتهێنانی هێـزدا، دووریش نییە وڵاتانـی جیهـان بچێتـە نێـو جەنگێک لەپێنـاو کۆنترۆڵکردنـی زانیـاری، وەک چۆن لە رابردوودا لەپێناو کۆلۆنیالکردنی ناوچەکان و دەستکەوتنی مادەی خاوو قۆستنەوەی دەجەنگا».

**تەکنەلۆژیای زانیاری:**

تەکنەلۆژیـای زانیـاری هەرچەندە پیشەسـازییەکی تازەیە، بەڵام گەشـەو باڵایەکی تەکنیکی بێ وێنە دەکات و، سـەردەمی زانیارییەکان بە سـەردەمی زانست و دەزگایی مـەزن دادەنـرێ و، سـەرکەوتن تیایـدا پەیوەسـتە بـە بـاش بەکارهێنانـی داهاتـەکان بەتایبەتـی داهاتـە مرۆییـەکان. لـە شۆڕشـە تەکنەلۆژییـەکان، کۆمەڵگـە وردە وردە سەرتاپای دەگۆڕێت و، رێژەی گۆڕانکارییەکەی دەوەستێتە سەر سروشتی تەکنەلۆژیا کاریگەرەکان و کارلێکی لەگەڵ توخمەکانی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی.

تەکنەلۆژیـای زانیـاری یەکەم تەکنەلۆژیایە کە مامەڵە لەگەڵ زانین و سـایکۆلۆژی و فەلسـەفەو مرۆییەکان دەکات، بۆیە زەحمەتە پێشـبینی کاریگەری ئەم تەکنەلۆژیایە بکرێ تەنانەت ئەگەر بۆ داهاتوویەکی نزیکیش بێ و، ئەو کاریگەریەشـی کە تائێسـتا دەرکەوتووە تەنها بەشێکی زۆر کەمە لەو پێشبینییە ئەگەرانەی خراونەتەڕوو.

هەنـدێ بە گەشـبینییەوە دەڕوانن تەکنەلۆژیای زانیـاری و پێیانوایە (تەکنەلۆژیای هیوا)یـە کە کەموکوڕی شۆڕشـی پیشەسـازی دووەمی تێدا نییـە و، دەتوانێ لە چەند سـاڵێکی کەم ئەوە وەدی بێنێت کە شۆڕشـی پیشەسـازی لەماوەی چەند سـەدەیەک نەیتوانی وەدی بێنێ.

لەبەرامبـەردا رەشـبینان وای دەبینن ئەم تەکنەلۆژیایـە دەبێتە مایەی فراوانبوونی کەلێـن لەنێـوان جیهانی پێشـکەوتوو و جیهانی تازە گەشەسـەندوو، بەجۆرێک کار لە پێکهاتەی کۆمەڵگەی مرۆیی دەکات و، دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری و نامۆیی مرۆڤ زێدەتـر دەکات و ژینگـەی کارەکەی تێکدەچێ، لەبەرامبـەر هەژموونی ئامێرو ئاڵۆزی سیسـتەمەکەی و، برەوپێدانـی سـەنترالیزمی و زیادبوونـی دەسـەلاتی بەڕێوەبـەران

لەسەر کارمەندان، هەروەها ئەوان هۆشداری ئەگەری پەیدابوونی رکابەری و ململانێی توند دەدەن لەنێوان ولاتە پێشکەوتووەکان بۆ کۆنترۆلکردنی بازاڕەکان.

ئەم جیهانەی ئەمڕۆ تێیدا دەژین جیهانی خێرایی و پەیوەندیکردنی زووی هەواڵ و نامەو تێبینییەکانە، شۆڕشی پیشەسازی ئەو راستییەی بۆ سەلماندین کە هەرچی زیاتر خێرابوونی ماشینەکان، مانای هێندە زۆرتری بەرهەم و لە دوا دەرەنجامیشدا مەبەستی هێندە گەورەترکردنی قازانج دەگەیەنێ.

خێرایی، ئەو دەرکەوتە نوێیەیە کە چیدی هەموو بوارەکانی ژیانمان بە چەشنێک لە چەشنەکان دیاری دەکات و دەبێتە قەدەرێکی کۆمەلایەتی نوێ، کە ناتوانین خۆمانی لێ دەرباز بکەین. ئەو وتەیەی کە دەلێ: ئەوەی درەنگ بێ ژیان سزای دەدات، دەقاودەق لەم دونیایەدا کە خێرایی دەستنیشانکەری هەموو سەرکەوتن و بالادەستییەکە، راستێتی خۆی هەمیشە دەسەلمێنێ.

خێرایی بۆ خۆی لە جیهانی میدیای ئەلیکترۆنی دەبێتە ئامانج، ناوەڕۆک و چەشنی رووداوەکان مەسەلەیەک نین، بەلکو ئەوەی مەبەستمە، کێ یەکەم هەوالی پێیە و کێ دەبێتە چاوگی ئەو هەوالە. گەورەو بچووکی هەوالەکان رۆلی خۆیان لە دەست دەدەن و چیدی ئەوەی مەسەلەیە ئەو کاتەیە کە تا دوا ئەندازە کورت دەکرێتەوە بۆئەوەی هەوالەکانی پێدا تێپەڕبن و بگەنە جێی مەبەست. بەم چەشنە وەکو (ڤیریلیو) دەلێ: «زانیاری بۆ خۆی دەبێ بە خێرایی». ئەم خێراییەش کاریگەری گەورەو فەرامۆش نەکراو لەسەر چۆنێتی بینین و تێگەیشتن و هەست و نەستمان بەجێدێلێ. پاوانکردنی شوێن و کاتی شتەکان دەبێ بە کۆلەگە و خەسلەتێکی گەوهەری سەدەی نوێ.

کاتێک دەگوترێ پاوانکردنی جیهان لەرێگەی خێراییەوە چنگ دەکەوێ، مانای ئەوەشە کە لەپال ئەم حالەتەدا هێزی پاوانخواز وەکو جاران پێویستی بە دوو چاو نییە، تا بەهۆیانەوە تەنها سنوورێکی دیاریکراوی توانای بینینی هەبێ، بەلکو پێویستی بە چاوێک هەیە کە هەموو شتەکان ببینێ و بزاوتیان دیاری بکات، بۆ ئەم مەبەستەش چاو دەبێ بە کایەیەک بۆ کۆنترۆلکردن، ئەو چاوەش کە توانای تێرکردنی ئەم ئەرکەی هەیە سەتەلایتەکانە.

تاکو توانـای تەکنیـک لـە بینینی شـتە بچوکـەکان گەورەتـر بێ، هێنـدەش توانای بچوککردنـەوەی دونیـا گەورەتـر دەبـێ، جیهانی خۆبزێـو چیدی پێویسـتی بە چاوی ئاسـایی نییـە بۆئەوەی شـتە راسـتییەکان ببینی و لـە نهێنییەکان بکۆڵێتـەوە، جیهانی ئێستا لەلایەن چاوەکانی ماشینەوە چاودێری دەکرێ. ئەمە جیهانێکە کە بە خێراییەکی سـەیر دەتوانـێ وێنـەو زانیاریمـان پێکـەوە بۆ بگوازێتـەوە، دەتوانێ لە کات و سـاتی فەرمان دەرکردنیدا هەموو ئەو زانیارییانە بەتوانای بینینەوە بخاتە بەردەستمان، واتە خێرایـی بینیـن و زانیـاری دەچنە ناو یەک قاوغەوەو لە یەک ئان و سـاتدا پێکەوە کار دەکەن، بەم چەشـنە تەکنەلۆژیای نوێ دەتوانێ ئان و سـاتێتی راسـتیەکانمان بداتێ. بە ڕای (ڤیریلیۆ) ئەم توانایە قۆناغێکی نوێ لە هێزی بینین بەرهەم دێنێ، قۆناغی بێ مانابوونی بینینی ئاسایی و قۆناغی ونبوونی کات و شوێن، بینینی ئاسایی کە بینینێکی مرۆڤانەیە، لەم سەردەمەدا بێ نرخ دەبێ.

کـرداری کۆکردنـەوەی زانیارییەکان لەم جیهانـە نوێیەدا بە وردترین و ئاڵۆزترین کێشە دادەنرێ کە روبەڕووی ئەو کەسە دەبێتەوە کە دەیەوێ بڕیاری سیاسی بدات، چونکە شۆڕشـی میدیاو شۆڕشی رێکخستنی زانیارییەکان، کە فەرمانڕەوایی هەموو رواڵەتێکی پێشـکەوتنی تەکنەلۆژی دەکەن لەم سـەردەمەدا، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو گۆڕاوی سەرەکی کە بریتین لە:

١. زۆری زانیارییەکان و بەلێشاو هاتنیان لەسەر هەموو ئاستەکاندا.

٢. ئەو ئاڵۆزییەی کە مرۆڤایەتی ئەمڕۆ تیایدا دەژیت پسپۆربوونی لەبواری کرداری کۆکردنەوەو رێکخستنی زانیارییەکانی کردووە بە راستییەکانی رەها، بەشێوەیەک کە تێگەیشـتنی جیـاوازو نموونـەی جیـاواز لە تێڕوانین و هەسـتکردن بە هەمان راسـتی دروسـت کردووە، لەبواری گواسـتنەوەی زانیارییەکان لە نێرەرەوە بۆ وەرگر یان لە سـەرچاوەی زانیارییەوە بۆ ئەو کەسـەی سوودی لێ دەبینێ. لە لایەنە سیاسییەکەی ئەوەمـان بیـر دێتـەوە ئـەو کەسـەی بڕیاری سیاسـی دەدات خـۆی لە هەڵوێسـتێکدا دەبینێتەوە کە سێ تایبەتمەندی تێدایە:

یەکەمیان ئەوەیە ئەو سیاسەتمەدارە هەر بە سروشت و پێکهاتەی خۆی شێوازێکی

جەمـاوەری زاڵـە بەسـەر بیرکردنەوەیدا، ئەم سـیفەتەش زۆرجـار دژ لەگەڵ کرداری مامەڵەکردن لەگەڵ کێشـەکاندا. لەلایەکی دیکە پێویسـتە لەسـەری زۆرجار بەخێرایی بڕیـار بـدات، چونکـە لەوانەیـە خۆی لـە هەڵوێسـتەیەکدا ببینێتەوە، کە زیاتـر لە چەند خولەکێکـی بەدەسـتەوە نەبـێ بـۆ بڕیاردان لە کێشـەیەک کە پێویسـتی بـە بڕیاردانە. سەرەڕای ئەمەش لەوانەیە ناچار بێ بۆ بڕیاردان بەبێ هەبوونی زانیاری تازەو نوێ بـووەوە، ئەمـەش جۆرە مامەڵەکردنێک بەسـەریدا دەسـەپێنێ بـۆ مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییە کۆنەکانی گەر هەیبێ.

زانستی زانیارییەکان تەنها شێوازی مامەڵەکردن نییە لەگەڵ کۆمپیوتەرەکاندا، ئەم چەمکـەش کە لەناو زۆر لە چینە زانسـتییەکاندا بڵاوە، راسـت نییـە، چونکە پەیوەندی زانیاری بە بڕیاردانەوە لە سێ ئاستدا دەردەکەوێ:

یەکەمیـان، کاتێـک زانیارییەکـە دەبێتـە بابەتێکـی تێرامـان دواتـر ئامرازێـک بـۆ پشـتگیریکردنی بڕاڤەکە، کە دەبێ بەو شـێوەیە ئەو زانیارییە دابنرێ کە بوار بدات بە بەکارهێنانی و بە سەربەخۆییەکی تەواو لە ناوەڕۆکی ئەو زانیارییە.

دووەمیان کاتێک کە پێویست دەکات زانیارییەکە لەگەڵ زانیاری دیکەدا تێکەڵ بکرێ بەمەبەسـتی دۆزینەوەی گریمانێکی دیاریکراو یان گەیشـتن بە تیۆرێکی دیاریکراو بۆ گەیشـتن بە زانینێکی ئەنجام دیاریکراو، یان بۆ رادەی کاریگەری ئەو گریمانە لەسـەر زانیارییەکـە ئەمـەش دەبێتە توخمێکی بنەڕەتی بۆ گفتوگۆکردن لەنێوان عەقڵی مرۆڤ و ئەو ئامێرە بێدەنگەدا.

لایەنەکانـی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان تەماشـای پەیوەندییە ژینگەییەکان دەکەن لـە گۆشـەنیگای توانـای هەمـوو لایەنێـک بۆ بەدەسـتهێنانی چـی لە توانایـدا هەبێ لە سوودو قازانج لەسـەر حیسابی لایەنی بەرامبەر، ئەمەش بەبێ بەدەستهێنانی زۆرترین زانیـاری دەربـارەی لایەنەکانی دیکە ناتوانـرێ بەئەنجام بگەیەنرێ، بە لایەنی کەمەوە ئەو وڵاتانەی کە لەچوارچێوەی ئەو هەرێمەدا دەژین.

لێرەش گرنگی کۆکردنەوەی زانیارییەکان لەبارەی وڵاتێک لەبەر چەند پێویستییەک دەردەکـەوێ، لەئەنجامـدا هێزی راسـتەقینەی ئەو وڵاتەت بۆ دەردەکەوێ، سـەرەڕای

ئەمـەش ئـەو زانیارییـە بەدەسـتهاتووانە لەبـارەی ئابـووری و سیاسـەت و کلتوورو ئاییـن و بـاری کۆمەڵایەتـی و نەژادی لەو وڵاتەدا گرنگی زۆریان هەیە، چونکە بواری بڕیاردانی ڕاست و دروست دەڕەخسێنن، بەمەش دەتوانرێ بەشێوەیەکی کاریگەرانەو ئاراستە دیار بڕیار بدرێ، بۆیە زانینی زانیارییەکان خۆی لەخۆیدا بەهێز دادەنرێ.

ئەگەر ڕادیۆو تەلەفزیۆن سەرکەوتوو بووبن لە گۆڕینی میدیای سیفەت بۆ میدیای گرۆکار (کتلە) یان جەماوەر، ئەوا تەکنەلۆژیای زانیاری هەوڵدەدات بۆ گواسـتنەوەی میدیای جەماوەری لە قۆناغی میدیای تایبەتمەندیەوە، پێشتر قسە لەبارەی پەخشەوە دەکـرا لەچوارچێوەیەکـی فـراوان (broodcast)، بـەڵام ئێسـتا لـە چوارچێوەیەکـی تەسک (narrowcast)ەوە گوێبیستی دەبین، بەئامانجی پێکانی بارگاویی میدیایی بۆ توێژگەلی دیاریکراو.

میدیا لە سیستمی پەخشکردنی پەیامەکەی بۆ سەرجەم بینەران بەرەو سیستەمێک دەڕوات کـە بـوار بـدات بـە بینـەر خۆی مـاددە میدیاییـەکان و کاتی تەماشـاکردنیان هەڵبژێـرێ، یاخـود هەڵبژاردنـی بابەتەکانـی ڕۆژنامەکـەی لەچوارچێـوەی بنەمایەکی گەورە لە ماددە ئامادەکراوەکان بۆ بڵاوکردنەوەو دیاریکردنی شێوەی دەرهێنانی ئەو ڕۆژنامەیە، ئەمەش ڕووی نەدەدا ئەگەر ئەو پێشـکەوتنە مەزنە لەبواری تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن ڕووینەدابایە، کە ئامرازی کرداری دەسـتەبەر بوون بۆ پێکەوەبەسـتنی ناوەندەکانـی پەخشـی میدیایی بـە جەماوەرەوە لەرێگـەی کێبڵەکانـی پەیوەندیکردنی ڕاسـتەوخۆ یـان کـۆدی تایبەتـەوە. ئەمە سـەبارەت بـە پەیوەنـدی ناوەندەکانی میدیا بـە بینەرانـی، بـەڵام سـەبارەت بـە پەیوەنـدی بینـەر بـە ئامێرەکانی وەرگـری ماددە میدیاییـەکان، بـەرەو یەکگرتـن دەچێ لە سیسـتمێکی تـەواو کە ڕادیـۆو تەلەفزیۆن و ڕێکـۆردەر بەهەمـوو جۆرەکانی و ئامێری پیشـاندان، کە هەموویـان لەژێر کۆنترۆڵی کۆمپیوتـەردا کار دەکـەن و، ڤیدیۆی وەڵامدەرەوە (interactive video) شۆڕشـێکی ڕاسـتەقینەیە لە جیهانی ڕۆشـنبیری و فێربوون و کاتبەسەربردن، کە بینەر لە ماڵەوە لەشـوێنی دانیشـتنی خۆیەوە، دەتوانێ چالاکی هاوشـێوەی چالاکی ڕاستەقینە ئەنجام بـدات، بـەم نزیکانـە دەتوانێ سـەردانی مۆزەخانـەکان و گەڕان بەنێو پێشـانگەکان و

سەردانی شوێنەوارە دێرینەکان بکات. میدیا بە پاڵپشتی تەکنەلۆژیای زانیاری دەتوانێ ڕۆڵێکی سەرکی ببینێ لە لە پەیوەندیکردنی خزمەتگوزاری فێربوون بۆ ناوچە گوندنشینەکان و پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکان لەمبارەیەوە، گرنگی میدیاش زیاتر دەبێ لە پڕکردنەوەی کاتبەتاڵی و فێربوونی بەردەوام و بەرزکردنەوەی هۆشیاری روناکبیری بۆ جەماوەرێکی زۆر.

ئەو رۆڵە گرنگەی تەکنەلۆژیای پەیوەندییەکان لە کۆمەڵگەی نوێ دەیگێڕێ، دەکرێ بۆ چەند هۆکارێکی سەرەکی بیگەڕێنینەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- گۆڕانی ئابووری بۆ جیهانێتی، ئەمەش کارێکە زەحمەتە لێک جیا بکرێنەوە، ئایا جیهانێتی دەرەنجامی بڵاوبوونەوەی تۆڕەکانی زانیارییە؟ یاخود بڵاوبوونەوەی تۆڕەکانی زانیاری یەکێک لەو دیاردانە بووە کە بۆتە مایەی دیاردەی جیهانێتی؟

٢- لەگەڵ زیادبوونی خێرایی ریتمی جموجوڵی کارەکان و ئاڵۆزبوونی، پێویستی بە خێرایی ئاڵوگۆڕی زانیاری گەشەی کرد لەنێوان شوێنەکانی کاری جیاواز لە نێو دەزگایەک یان چەند دەزگایەکدا.

٣- ئاراستەگرتن بۆ داڕزاندنی میدیای جەماوەری بۆئەوەی پێکراوتر بێ (نمونە کلاسیکیەکەی تەلەفزیۆنی کێبڵە)، لەپێناو جۆراوجۆرێتی خزمەتگوزاری میدیایی و رێکلامی و پەخشکردنی بۆ جەماوەری ئامانجدار، لەجیاتی شێوازی پەخشی باو کە سەرجەم جەماوەر وەریدەگرێ، ئەم پەیوەستبوونەی جەماوەر بە سەنتەرەکانی میدیا لەمیانەی تۆڕگەلی تایبەتییەوە دەبێ.

٤- پرۆسەی بڕیاردان تەنها پشت نابەستێ بە زانیاری فەراهەمبوو لەنێو دەزگادا، بەڵکو زۆرجار پشت بە زانیاری لە دەرەوەیدا دەبەستێ، بەهۆی تێکئاڵانی جیهان و پێکەوەبەستوویی ڕووداوەکانی.

٥- زیادبوونی ئاراستەگیری دەزگاکانی کار بەرەو کەمکردنەوەی جموجوڵی تاکەکان و، قەرەبووکردنەوەی بە پەیوەندی تەلەفۆنی و فاکس و سازدانی کۆنگرە لەدوورەوە، بەمەبەستی دەستەبەرکردنی وزەو کەمکردنەوەی تێچوونی پارەو کات.

**شوناسی کۆمەڵگەی زانیاری:**

کۆمەڵگەی زانیاری بەهاو چەمک و شێوازگەلی نوێ دەخاتەڕوو، بەرەنگاربوونەوەی سەختیش دەسەپێنێتە سەر تاکەکانی و هۆشداری ململانێگەلی نوێ دەدات و، گرنگی زانین و کلتوورو زمان دەدرەوشێنێتەوەو، پرسگەلی فەلسفی پەیوەست بە مرۆڤ لە روبەڕوبوونەوەی ئامێردا دەورووژێنێ.

یەکەمجارە چارەنووسی نەتەوەکان بە توخمگەلی ناماددی و هەستپێکراوەوە پەیوەست بێت، لەکاتێکدا خودی تەکنەلۆژیا خولقاوی خواستی مرۆڤەکانە، لەمبارەیەوە ژمارەکان هەندێ راستی دەردەخەن وەک، ئاکامی گشتی پیشەسازی زانیاری لەساڵی ٢٠٠٠ بە هەزار بلیۆن دۆلار دەنرخێنرێ، بەمەش بووە یەکەم پیشەسازی لە مێژووی جیهاندا کە ژمارەی تریلیۆن تۆمار بکات. هەروەها پێشخەرانی سیستمی سوپەرکۆمپیوتەر خەریکی سەرقاڵی پەیوەندیکردنی خێرایی ئەو جۆرەی کۆمپیوتەرن بە تریلیۆنێک کرداری ژمێریاری لە یەک چرکەدا کە بەرامبەر ٥٠-١٠٠ هێندەی خێرایی ئێستا دەبێ.

کۆمەڵگەی زانیاری پەیوەستە بە هەردوو پرەنسیپی زانین و ئازادییەوە، کۆمەڵگەیەکی زانیاری لە دەرەوەی سیستمی دیموکراتی کە مافی هاوڵاتیبوون فەراهەم دەکات، وێنا ناکرێن، ئەمە پێویستی بە شوناسێکە بڕوای بە دیموکراتی هەبێ و لە پرەنسیپەکانی تێر نەبێ، چونکە ئازادی و گفتوگۆ جیاوازی بەهاگەلێکن، ناکرێ لە کۆمەڵگەی زانیاری جودا بکرێنەوە. کۆمەڵگەیەکی زانیاریش وێنا ناکەین لە دەرەوەی پێکهاتەی سەرەکی بێ کە مافی دەستپێشخەری و گەیشتن بە زانیاری بۆ تاکەکان دەستەبەر بکات.

ئەم پێکهاتە بنەڕەتییە بە مەرجی دەزانێ کە سیستمێکی پەروەردەیی و توێژینەوەیی پێشکەوتوو پەیوەست بە تۆڕی زانیارییە جیهانییەکان، هەروەها کلتوورێکی دیجیتاڵی هەبێ کە رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و دەزگا تایبەت و گشتییەکان تیایدا بەشدار بن، چونکە ئاراستەی ستراتیژی کۆمەڵگەی زانیاری لە بنەڕەتدا خۆی لە پێکهێنانی کلتووری تاک و رێکخستنی فەزای گشتی لەسەر هەردوو بیرۆکەی ئازادی

و مەعریفە، دەبینێتەوە.

ئـەم شۆڕشــە کلتوورییــە لــە ڕەفتــارو چەمکــەکان پێویســت بــە بڕینی شوناســی کلاســیکی دەکات بـۆ شوناســێکی نوێ کە بتوانــێ پێکەوە گونجان لەنێوان چەســپاوە کەلەپوورییــەکان و مێشــککی ئینتەرنێتــدا دروســت بــکات. چەســپاوەکان بەشــێکن لە ئێستاو، ئێستا تاکە زەمەنە کە خاوەنین بۆ ئەوەی تیایدا بژین، شوناسیش لە بەردەم بەرەنگاربوونەوەکانی کۆمەڵگەی زانیاریدا، بەشێکە لە پرۆژەی نوێکاری گشتگیر، نەک تەنیــا بەمانــا هزرییەکەی بەڵکو بە مانا مەدەنی دەزگایــی مەعریفییەکەی کە بەهاکانی پەروەردەو ڕەفتارو ڕێکخستنی سیاسی و فەزای گشتی دەگرێتەوە.

ئەگەر بڕوانینە نهێنی ئەو ســەرکەوتنەی وڵاتانی پیشەســازی وەدەســتیان هێناوە، دەبینیــن گرنگتریــن پێکهاتــە لە کارلێکــی گەشــەپێداندا مرۆڤی زانایــە. کارلێکی ئەمڕۆ لەنێــوان هێــزو مەعریفەیــە، کۆمەڵگەی زانا، کۆمەڵگەیەکی بەهێــز دەبێ، چیتر ژمارەی دانیشــتوان و زۆری داهــات و هێــزی ســوپا کاریگــەری ئەوتۆی نەما لــە دیاریکردنی سەرچاوە ڕاستەقینەییەکانە هێز.

مێشــکە داهێنانــکارەکان و کۆنترۆڵکــەری تەکنیکەکانــی زانیــاری و پەیوەندیکردن ئەمڕۆ لەسەر ئاراستە سیاسی و ئابووری و ناوەندەکانی بڕیارو هەژموونداکاریگەر دەبن. بۆمان دەردەکەوێ کە پەیوەندی مشتومڕی نێوان شوناس و کۆمەڵەی زانیاری کــە پەیوەندییەکــی کاریگــەرو قووڵە، لەوانەیە ســەلبی بــێ یان ئیجابــی، بەپێی توانای کلتوورەکــە بۆ تێکهەڵکێشــی شوناســەکە لــە بزاڤی مێژوو لەلایەک و، توانای مێشــکی سیاســی بــە بەرپرســیارێتی بڕیاردان لەســەر تاوتوێکردنــی هەڵبژاردنــە نوێیەکان لە سیســتمی هــزرو ڕەفتــارو دەزگاکانــدا. جیاکردنەوەی ڕاســتەقینە لەنێوان شــوناس و شۆڕشــی زانیارییەکانــدا، کلتــووری دیموکراتییــە بەمانــا مەدەنییەکــەی کــە هاووڵاتای نوێگەری و هاوڵاتیتی ئازادی زانایە.

**زانیاری.. ململانێی دواڕۆژ:**

میدیا کرۆکی کۆمەڵگەی زانیارییە کە نەوەی دیموکراتییە و، مەرجێکە لە مەرجەکانی

ئازادی و هاوڵاتیبون و، دەروازەی راستەقینە بۆ برەودانی بە کردەیی دیموکراتی و کۆمەڵەی دیالۆگ و پەیوەندی بەستوودا، سەرەڕای ئەوەی کە کارلێکی پەیوەندیکردنی نابێتە هۆی دیموکراتی، بەڵام رۆڵی شوناسی کلتووری نوێ خولقاندنی ئەم کارلێکەیە بۆئـەوەی کۆمەڵگەی زانیاری تەنیا ئەفسانەیەکی تەکنیکی کلتووری نوێ نەبێ لەنێو دەستی کەمینەیەک کە رێگا ئەلیکترۆنییەکان بەرەو میدیا بەکاردێنن بۆ هەرمێندان بە بەهاو پرۆژە بازرگانی یان سیاسییەکان.

بڵاوبوونەوەی ئامرازەکانی پەیوەندیکردن هاوکات بوو لەگەڵ دوو رەوتی جیاواز لە سیستمی هزری نەتەوایەتی، رەوتێک بانگەواز بۆ جۆرایەتی خولقێنەرو کلتووری جیاوازی و گفتوگۆی شارستانیەتیەکان و کۆتایی عەقڵانییەتی گشتگیر دەکات و، رەوتێکی لوتکەگیری تاک لایەنانە کە جیهانگیریی سەرمایەداری خستوویەتیە گەڕو، لەمیانەی کلتووری تاک هزرو یەکبوونی زۆرە ملێیانە تێپەڕی، لە ژێر بەیداخی دیموکراتی رۆژئاوا.

مۆرکی دەستەبژێری بۆ تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن و میدیا خێرا بۆ مۆرکی جەماوەری دەگۆڕێ، واتە بەرەو پێکهاتەکانی شوناسی کلاسیکی ئاراستە دەگرێ، کە هەڵگری ناوەرۆکی بەهادار بێ کە مەرج نییە ئامادەباش بێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵی بە تێڕوانینێکی کلتووری رەخنەگرانەی کراوەوە، کە وا دەکات لەو توێژە کۆمەڵگەییە فراوانە تەنها بازاڕێکی بەکاربردن بێ بۆ ناوەڕۆکگەلێک کە بەشدار نابێ لە بەرهەمهێنان و ئاراستەکردنیدا. ئەم هۆشدارییە لە مەترسییەکانی جیهانگیری زانیاری بۆ سەر شوناس، لەلایەن خودی بیرمەندانی رۆژئاواوە سەرچاوەی گرت بۆ دانانی ئاستێک بۆ ئەو گەشبینییە زیاد لەپێویستەی کە سەرانسەری جیهانی گرتۆتەوە.

ئایدۆلۆژیای ئەمرۆ کلتوورە، شوناسی کلتووریش تاکە قەڵغانە کە ماوەتەوە لەبەردەم کشانی جیهانگیریدا. کۆتایی ئایدۆلۆژیا کە (دانیل بێل) باسی لێ دەکات، لەدایکبوونی کۆمەڵگەیەکی پاش پیشەسازی رادەگەیەنێ، کە لەسەر تەکنەلۆژیای زیرەکی و پیشەسازی میدیا دادەمەزرێ، کە سەبارەت بە رۆژئاوا کۆتایی ململانێکەیەتی لەگەڵ مارکسیەت و هەڵوەشانەوەی سیستمی سۆسیالیستییە، بەڵام

ئایـا مانایـەک دەبەخشـێ بۆ ئـەو وڵاتانـەی نەچوونەتە نێو کۆمەڵگەی پیشەسـازی و ململانێی هەژموونی نییە لەسەر جیهان لەگەڵ هزری گشتگیردا؟ ئایا شتێک دەگەیەنێ بـۆ ئـەو کۆمەڵگایانـەی کە بەسـەر داهێنانە زانیـاری و پەیوەندیـەکان زاڵ نەبوونە و هێشتا بە چەسپاوەکانی شوناسەکەی پەیوەستە؟

ئەمـە ئـەو مەترسـییەیە کـە ئایدۆلۆژیای جیهانگیریـی و ئایدۆلۆژیـای بەربڵاو کە بـە ئامێـرە بیسـتنی بینینیـەکان کار دەکات و، زانیارییـە ژمارەییـەکان هێزی مەرجی ئایدۆلـۆژی هەیـە بـۆ وەرگر بە جۆرێک ملکەچـی لۆژیکی بازرگانی دەبـێ، کە مانای دۆڕانـی کەلتـوورو پەرتوبڵاوکردنـی شـوناس دەگەیەنـێ. لێرەوە شوناسـی خاوەن توانای خۆڕاگرو خستنەسەر لە کۆمەڵگەی زانیاری، ئەو شوناسە رەخنەگرەیە کە بە چەسپاوە کلتووریی و نیشتمانییەکەی تێرە.

هەڵقولانـی زانیارییەکان مێشـکێکی ئابووری کۆنترۆڵـی دەکات دژە لەگەڵ رەوتی رەخنەگرانـە، هەروەهـا عەقڵـی سیاسـیش دژە لەگـەڵ رەوتـی رەخنەگرانـە. گونـدی ئەلیکترۆنیش کە مێشکی جیهانگیریی هەوڵدەدات بیسەپێنێ، جیاوازی لەنێوان هەژارو دەوڵەمەند، خێراو لەسەرخۆ، لەنێوان بەرهەمهێنەرانی مەعریفەو بەکاربەرانیدا قووڵتر دەکات.

وەک دیـارە ململانێـی دواڕۆژ ئاراسـتە کـراوە بـۆ کۆنترۆڵکردنـی کۆمپیوتـەرو تەلەفزیۆن و تەلەفۆن، کە دەکرێ لەسـەر ئینتەرنێت بتوێنرێتەوە، بۆیە لە توانای ئەو هێزانەدایە کۆنترۆڵی تەکنیکەکانی ئینتەرنێت دەکەن، بەپێی تیۆری داروین «مانەوە بۆ چاکترین و بەهێزترینە» لە دواڕۆژدا کۆنترۆڵی جیهان بکەن.

## بەشی پێنجەم
## دەروونناسیی جەماوەرو ئامرازەکانی میدیا

لە جەماوەری ئامرازەکانی میدیادا تاک شتەکان پەسند دەکات یان رەتی دەکاتەوە، نزیک دەبێتەوە یان لەگەڵ ئامرازەکانی میدیا خۆی دوور دەگرێت، لەسەر بنەمای بڕیاری هەڵبژاردنی و پێ باشبوونی و، ئاستی ئەم پێ باشبوونە یان توندییەکەی روبەڕوو دەکرێتەوە یان ناکرێتەوە. لەبەر ئەمە، سەرەتاکانی گەڕان بە دوای هۆکارەکانی پێ باشبوون یان بایەخدان و بەهێزی ئەم پێ باشبوونە و چڕییەکەی، لە چوارچێوەی بەکارهێنانی تاک بۆ ئامرازەکانی میدیاو روبەرووکردنەوەی بۆ ناوەڕۆکەکەی. بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی تایبەت بە بەکارهێنانی جەماوەرو هۆکارەکانی ئەم بەکارهێنانە، وایکرد بونیاتی دەروونی تاک لە پەیوەندییەکەی بە بڕیاری بەکارهێنان دووپات بکرێتەوە، بەوپێیەی شێوازێکی رەفتارە.

**تایبەتمەندییەکانی جەماوەر:**

دەکرێت جەماوەر بۆ چەند دەستەیەک دابەش بکرێت، لەوانە:

**- خاوەن ئاراستەی زانستی:**

ئەوانەی ئارەزوویان بەلای بڕیاردان لەسەر شت و کەس و ماناو سیماکانی چالاکی مرۆییە، لە چوارچێوەی یاساو تیۆرو پەیوەندییە گشتییەکانداو، رەفتاری پەیوەندیکردنی تاک بەرامبەر ئامرازەکانی میدیا بەم تێگەیشتنە کاریگەر دەبێت، چونکە تاک لە خاوەنانی ئەم ئاراستەیە، بە پێوەری رازیبوون یان پەسندکردنی پێوەرە زانستییەکان پەسندی دەکات یان رەتی دەکاتەوە، هەروەها بە بەهایەک کە کارکردن بە زانینی مرۆیی زیادی دەکات، ئەم ئاراستەیە بە ئاستی دەسکەوتی زانستی کاریگەر دەبێت.

**- خاوەن ئاراستەی ماددی یان کرداری:**

لەم دەستەیەدا تاک لە چوارچێوەی قازانجی راستەوخۆو داهاتی ماددی بڕیارەکانی دەدات، هەروەها بە تێگەیشتنی سزای راستەوخۆ بۆ رەفتاری پەیوەندیکردنیانەی لەگەڵ ئامرازەکانی میدیادا.

**- خاوەن ئاراستەی مەعنەوی:**

ئەم ئاراستەیە بە پێچەوانەی ئاراستەی پێشووە، بڕیاردانەکانی تاک بە قازانج یان داهاتی واتایی کاریگەر دەبێت، بە گونجان و خۆگونجاندن و تێرکردنی ویژدانی و سۆزداری کاریگەرە، لەم ئاراستەیەدا پێوەرە باوەکان ماناو هێماکانن، کە پاڵپشتی خۆشەویستی و خێرو ئاشتی و برایەتی و هاوسۆزی و ئاشنایەتی دەکەن.

**- خاوەن ئاراستەی کۆمەڵایەتی:**

ئەم ئاراستەیە پەیوەستە بە چوارچێوەی ئەو بڕیارانەی کۆمەڵە و کۆمەڵگەکان بۆیان دەمێنێتەوە، بۆ شێوازێکی باو لە دابونەریت و عورفەکان کە کۆنترۆڵی پەیوەندی تاک بەویترەوە دەکات لەناو کۆمەڵە جیا جیاکاندا.

**تیۆرەکانی راڤەکردنی ئاراستەکانی جەماوەر بۆ ئامرازەکانی میدیا**

لێرەدا ئەو تیۆرە دەروونییانە دەخەینە روو کە راڤەی ئاراستەکانی جەماوەرو پاڵنەرەکانیان دەکات، لە کاتی تەماشاکردن یان چاودێریکردنی ئامرازەکانی میدیا:

**یەکەم: تیۆری هاوسەنگی زانین و بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا:**

توێژینەوەکان بایەخیان بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندیکردن و پەیوەندییەکەی بە تیۆری هاوسەنگی یان رێکوپێکی و گونجان داوە، گرنگییەکەی لە گۆڕینی ئاراستەکان و پێکهێنانی لەسەر بنەمای ئەو پرەنسیپانەیە کە (فرتیز هیدەر F.Heider) لە هاوسەنگی دایڕشت، بەلام کەمێک لەم لێکۆڵینەوانە هەوڵیاندا پرەنسیپەکانی ئەم تیۆرانە بە بەکارهێنانی تاک بۆ ئامرازەکانی میدیا ببەستنەوە، سەرەڕای گەشەی چەمکی جەماوەری وەرگر کە بڕیارەکەی لەسەر بنەمای زانیاری پێشوو لەبارەی چەمکی ئامرازو سەرچاوەو ناوەڕۆکەکە و رۆڵی زانینی درککردن دەدات، وەک یەکێک لەو هێزانەی رۆڵێک لە پرۆسەکانی ناوەندیاری دەبینن کە چەمکی کاریگەری و

ئاراستەکانی گۆڕیوە.

ئێستا هەوڵدەدەین باس لە تەوزیفکردنی تیۆرەکانی هاوسەنگی بکەین لە وەسفکردن و بەکارهێنانی تاک بۆ ئامرازەکانی میدیا، لە روانگەی ئەم گریمانانەوە:

* جەماوەری ئامرازەکانی میدیا بە جەماوەرێکی چالاک دادەنرێت، لە ئامرازەکانی میدیاو ناوەڕۆکەکەی ئەوە هەڵدەبژێرێت کە لەگەڵ بایەخ و پێ باشبوونەکانیدا دەگونجێت و، چالاکییەکەی کارایی پێوە دیارە کە رۆڵەکەی بایەخ بە لابردنی ماناکان لەسەر ئەو هێما پەیوەندیکردنانە دەدات، کە لە ئامرازەکانی میدیا وەری دەگرێت.

* بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا بە شێوازێکی رەفتاری تاک دادەنرێت، هەمیشە لەگەڵ ئاراستەکانی تاک کۆکە کە ئەم رەفتارە ئاراستە دەکات. بونیاتی زانین لەپاڵ بونیاتی ویژدانی لە بونیاتنانی ئاراستەکان رۆڵی هەیە، چونکە ئاراستە کار دەکاتە سەر رەفتار وەک چۆن کار دەکاتە سەر بونیاتی زانین. پەیوەندی نێوان بونیاتی زانینی تاک و بونیاتی ئاراستەکان و رەفتار بە گەوهەری تیۆرە زانینییەکان دادەنرێت، جا ئەوە بێت کە بە دوای هاوسەنگی یان جیاوازی زانین لای تاک دەگەڕێت، لە چوارچێوەی پرۆسەکانی پەیوەندیکردنی خودی و بڕیاردانی رەفتاردا، یان پرۆسەکانی کارلێک لە پەیوەندیکردنی مرۆییدا.

* تاک ئاراستەکەی بەرەو ئامرازەکانی میدیا دیاری دەکات، لەرێگەی ئەو وێنە هزرییەی لە هەگبە زانینییەکەی دەیکێشێت لەبارەی ئەم رەفتارانە یان یەکێکیان، یاخود لەئەنجامی شارەزایی کەڵەکەبوو لە نزیکبوونەوەی ئەم ئامرازانە و، پەیوەندییەکەی بەو هەستانە کە تاک هەڵی دەگرێت لە چوارچێوەی شارەزاییەکەیدا، لەلایەکی دیکە ئاراستەی وەرگری پەیوەندکار لە رێگەی هەڵسەنگاندنی بۆ تایبەتمەندییەکانی پەیوەندکار دیاری دەکرێت، هەروەها پەیوەندییەکەی بەو چەمکانەی پێشکەشی دەکات لە ناوەڕۆکی ئەو پەیامانەی بڵاوی دەکاتەوە یان پەخشی دەکات، هەروەها ئاراستەی تاک بەرەو ناوەڕۆکی بڵاوکراوە یان پەخشکراو، لە میانەی ئاستی رێککەوتنی یان ناکۆکی لەگەڵ بونیاتی زانینی تاک، یان ئەو مانایانەی ئەم ناوەڕۆکە لە خۆی دەگرێت.

نموونە لەبارەی تیۆری هاوسەنگی زانین (تیۆری هیدر لە هاوسەنگی):

تیۆری (هیدر) لەو تیۆرانە دادەنرێت کە لە هاوسەنگی زانینی لای تاکی کۆڵیوەتەوەو، باس لە پەیوەندی نێوان سێ توخم دەکات، کە تاک و ئەوانی دیکە و شتەکان یان رووداوەکانە کە تاک و ئاراستەی تاک درکی پێ دەکات و، درککردنی تاک بۆ ئاراستەیەکیتر بە رەوشتەکان.

ئاراستەی تاک کاریگەر دەبێت بە دوو جۆر لە پەیوەندی، یەکەمیان: پەیوەندی هەستەکانە یان پەیوەندی ویژدانی یاخود سۆزداری، کە هاوکارە لە هەڵسەنگاندنی کەسەکان یان شتەکان و، دەربڕی ئارەزوو یان رێگری، خۆشەویستی یان رک لێبوون، پەسندکردن یان رەتکردنەوەیە و، تاک ئارەزووی بونیاتنانی ئەم پەیوەندیانە بەشێوەیەکی هاوسەنگ دەکات، چونکە ناکرێ کەسێک یەکێکی خۆش بوویت کە ریزی لێ نەگرێت، یان مەیلی بە لای شتێک بێت کە بێ بەها بێت. دووەم: پەیوەندی یەکێتییە کە ئاماژە بە پلەی درکپێکراوی یەکێتی توخمەکان لەنێوان خۆیاندا دەکات و، بە لێکچوون یان لێک نەچوون، نزیک یان دوور، ئینتیما یان نەبوونی ئینتیما دەری دەبڕێت، (هیدر) وای دەبینێت ئەگەر پلەی یەکێتی لەنێوان توخمەکان بەرز بوو ئەوا بە ئەرێنی دادەنرێت، بەپێچەوانەشەوە راستە.

لە روانگەی ئەوەی پێشوو، دوو جۆر ئاراستە لای تاک هەیە، کە لەوانەیە ئاراستەکانی تاک بەرەو توخمەکان ئەرێنی یان نەرێنی بێت، پاشان ئەو ئاراستەیەی لەسەر درککردنی تاک لەبارەی پەیوەندییەکانی یەکێتی نێوان توخمەکان وەستانەوە، ئەمەش لەوانەیە بە ئەرێنی یان نەرێنی بێت.

باری هاوسەنگی ئاماژە بەو بارە دەکات کە تاک تیایدا درک بەو ئاراستانە دەکات، بەوپێیەی لەگەڵ یەکتر هەماهەنگ و پێکەوە گونجاون، کاتێک تاک تیایدا درک بە ناهاوسەنگی یان کەموکورییەک دەکات، ئەوا هەست بە بارێک لە گرژیی یان دڵەڕاوکێ دەکات، وای لێ دەکات ئارەزووی بە لای یەک ئاراستە یان زیاتر لە پەیوەندی هەستەکان یان یەکێتی بشکێتەوە، تا دەگەڕێتەوە بۆ بارەکە یان هەماهەنگی یاخود پێکەوە گونجان.

## دووەم: تیۆری هەماهەنگی زانین/ ویژدانی:

تیۆری (رۆزنبێرگ M.G.Rosenberg) لە هەماهەنگی زانینی ویژدانی، لە تیۆرە سەرەکییەکان دادەنرێت کە چۆنێتی پێکهێنانی ئاراستە و گۆڕینی دیاری دەکات، ئاراستە بەپێی ئەم تیۆرە نابێت لە سنووری بڕیارە توندڕەوەکاندا تەنیا لەگەڵی بێت یان دژی بوەستێتەوە، ئەرێنی یان نەرێنی بێت، ئەمە کەسەکە لە نیوەی رێگە رادەگرێت، چونکە تاک لەپاڵ هەستەکەی بە چەمکێکی دیاریکراو، بیرو باوەڕی دیاریکراوی لەبارەی ئەم چەمکە هەبە، بۆیە پێویستە لەو ئاراستانە بڕوانرێت بەوپێیەی ئەنجامی پێکهاتە زانینییەکان (بیرو باوەڕەکان) و پێکهاتە ویژدانییەکان (هەستەکان)ە لە یەک کاتدا.

گۆڕان لە پێکهاتەی زانین دەبێتە هۆی گۆڕان لە پێکهاتەی ویژدانی، بەپێچەوانەش راستە، چونکە ئەگەر زانینەکانی تاک بەرەو شتەکە گۆڕان ئەوا هەستەکەشی بەرامبەر دەگۆڕێت، (رۆزنبێرگ) وای دەبینێت بونیاتنانی ئاراستە بە رێکخستنێکی هاوسەنگ دادەنرێت، کار بۆ پارێزگاریکردن لەم هاوسەنگییەی نێوان پێکهاتەکان دەکات، کاتێک گۆڕان لە یەکێک لە پێکهاتەکان وا دەکات رێکوپێکی لەدەست بدرێت، ئەوا زۆربەی جار ئەم چالاکییە یەکێک لەم شێوانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

- لەوانەیە تاک ئەو زانیارییانە رەت بکاتەوە کە بۆتە هۆی لەدەستدانی رێکوپێکی.
- لێک هەڵوەشانی ئاراستەی ناوخۆیی و بڕیاردان بە بوونی ئاراستەی زۆر بەرەو شتەکە، وەک ئەوەی ئەو قسەیە پەسند بکرێت کە شتەکان هەندێکی بەسوودەو هەندێکی زیانبەخشە.
- گۆڕینی زانینی دەبێتە هۆی گۆڕینی ویژدانی، بە پێچەوانەشەوە راستە.

لێرەدا جێبەجێکردنی ئەم تیۆرە لەسەر بەکارهێنانی تاک بۆ ئامرازەکانی میدیا دەخەینە روو:

ئەوەندە بەس نییە کە هەستی تاک بەرامبەر ئامرازەکانی میدیا یان ناوەڕۆکەکە ئەرێنی بێت، بۆئەوەی رەفتارەکەی لەپاڵ بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە هەروەها ناوەڕۆکیش بێت، بەڵکو کارەکە سەرەڕای ئەوە پێویست بە هۆشیاری دەکات و

درککردن بەوەی ئەم بەکارهێنانە لە دەرەنجام بەدەستی دێنێت جا ئەرێنی یان نەرێنی بێت، بۆئەوەی ئەنجامی ئاراستەکان لەکۆتاییدا لەنێوان بونیاتی زانینی و ویژدانی لە بەرژەوەندی رێکوپێکی یان نا رێکوپێکیدا بێت، دواجار ئارەزووی بەکارهێنان یان ژەنین لای تاک دروست دەبێت، لەسەر بنەمای پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی بونیاتی زانینی و ویژدانی.

هەستی تاک بەرەو ئامرازەکانی میدیا ئەگەر ئەرێنی بێت، ئەمە وەک پاساوێک بۆ بەکارهێنان بەش ناکات، لەبەرئەوەی دەبێت زانینی بە لایەنە جیاجیاکانیشی بخرێتەسەر، کە لەوانەیە هەڵسەنگاندنی بە نەرێنی یان ئەرێنی ببێتە هۆی بارێک لە نا رێکوپێکی ئەمەش گرژیی لێ بکەوێتەوە، کە کار دەکاتە سەر ئاراستەی تاک بەرەو بەکارهێنانی، بۆئەوەی جارێکیتر رێکوپێکی بۆ تاک وەدی بێنێت.

لەم بارەدا تاک هەست بە بارێکی نا رێکوپێکی دەکات، کە لەسەر رەفتارەکانی تاک و بەکارهێنانی بۆ ئامرازەکانی میدیا کاریگەرە، چونکە ئەنجامی ئاراستەکان نەرێنییە و لەم بارەدا یان هەستەکانی دەگۆڕێت لەبارەی ئەم ئامرازانە، یاخود بە گۆڕینی بیرۆکەکەی لەبارەی بلاوکردنەوەی مەترسی بونیاتە زانینیەکەی دەگۆڕێت، بۆئەوەی ئەنجامەکە ئەرێنی بێت یاخود بیرۆکەی هەڵوەشاندنەوەی ئاراستە پەسند بکات، کە دەزانێت لەپاڵ ئەوەی لە رۆڵەکان ئەنجامی دەدات بۆ دوورکەوتنەوە لە مەترسییەکان، کاریش دەکات بۆئەوەی مەترسی بلاو بکاتەوە.

بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا لەلایەن تاکەوە بە ئاراستەکەی کاریگەر دەبێت، کە لە هەموو بونیاتێکی زانینی ویژدانی پێکەوە پێکدێ کە پێویستە پەیوەندی نێوانیان لە بارێکی رێکوپێکیدا بێت، بۆئەوەی تاک بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا پەسند بکات یان لێی دوور بکەوێتەوە.

**سێیەم: تیۆری تەبایی و پێکهاتن:**

ئەم تیۆرە پشت بە پێشبینییەکی سەرەکی دەبەستێ، کە بریتییە لەوەی چوارچێوەی بڕیارە مەرجەعییەکان بۆ تاکەکان بە لای سادەییدایە، بۆیە ئاسانە لە ئەنجامی

ئارەزووکـردن بـۆ توندـڕەوی بڕیاری توندڕەوانـە بدرێت، بۆ نموونە هەموو شـتێک یان هیچ شـتێک، لەسـەر ئەم بنەمایە دەبینین لای تاک فشـاری بەردەوام هەیە، تاکو لەو چەمکانە دوور بکەوێتەوە کە سەبارەت بە کەسی سادە ناکۆکی دروست دەکات، بـەڵام ئەو کەسـانەی زۆر زیرەکن یان ئاسـتی خوێندنیان زیاتـرە یان بیرمەندن، ئەوا ئـارەزووی توندـڕەوی ناکەن بەڵکو هەوڵ دەدەن بۆئەوەی ناکۆکی یان جۆراوجۆری لە چەمکەکان بدۆزنەوە.

تەبایـی یـان گونجـان کـە وا ناودەبرێت یان لای تاک لە چوارچێوە ئاماژەییەکەی دەناسێنرێت و، تاک هەست بە نەبوونی گونجان یان نەبوونی تەبایی لە ئاراستەکانی بـەرەو شـتەکان یـان کەسـەکان یاخـود چەمکەکان ناکات، سـەرەڕای لێـک نەچوونی ئەگـەر پێکـەوە پەیوەسـت نەکرێـن. بەپێـی ئەم تیـۆرە، وەرگر هـەوڵ دەدات لە خۆی لـە ناپێکهاتنـی دوور بخاتـەوە، بـە کەمکردنەوەی بۆشـایی نێـوان ئەوەی لـە بیرۆکە یـان چەمکـەکان ڕوبەڕووی دەکرێتـەوەو لەنێوان ئەوەی بـاوەڕی پێیەتی، ئەوەش بە گۆڕینی ئاراسـتەکانی یان دووبارە هەڵسـەنگاندنی ئەو سـەرچاوانەی ئەم چەمک یان زانیـاری یاخـود هەڵسـەنگاندنی چەمـک و زانیاریانەی لێ دەردەچێـت کە ڕوبەڕووی خۆی دەبێتەوە، تا دەگاتە وەدیهێنانی پێکهاتن یان گونجان بە کاریگەری چوارچێوەی بڕیـارە مەرجەعییەکانـی، بـۆ نموونـە ئەگەر وەرگـر بەردەوام بەرهەمی نووسـەرێک بخوێنێتەوە لەو بابەتانەی پاڵپشتی ئاراستە بەرەو فرەژنی دەکات، بەڵام ئاراستەکانی بە کاریگەری چوارچێوە مەرجەعییەکەی لەگەڵ بیرۆکەی نووسەرو ئاراستەکەی لەم بابەتەدا یەک ناگرێتەوە، لەم بارەدا تاک هەست بە نەبوونی پێکهاتن و گونجان دەکات، ئەمـەش فشـارێکی لەسـەر دروسـت دەکات و وای لێ دەکات لەنێـو ئەڵتەرناتیڤەکاندا ئـەوە هەڵبژێرێـت کـە پێکهاتـن و گونجانـی بۆ دەسـتەبەر دەکات، کەچی بـاوەڕی بە کاریگەری چوارچێوە سـەرچاوەکەی هەیە و، ئەوەی لە بیرۆکە یان چەمک ڕوبەڕوو دەکرێتەوە.

لێـرەدا جێبەجێ کردنی ئەم تیۆرە لەسـەر بەکارهێنانـی ئامرازەکانی میدیا لەلایەن تاکەوە دەخەینەڕوو:

تـاک ئـارەزووی روبەڕووکردنەوەی بۆ ئامرازەکانی میدیـاو ناوەڕۆکەکەی هەیە، یـان بـۆ پەیوەنـدکارو بیرۆکـە وەک بابەتـی پەیوەنـدار لەنێوانـی و نێـوان خۆیان و ئاراستە یەکەمینەکەی لەبارەی ئەو ئامرازانە یان پەیوەندکار یاخود بیرۆکەکە، ئەگەر لەئەنجامـی ئاراسـتەکان بـەرەو ئەم دەسـتەواژانەش کە پەیوەنددارن هاوسـەنگییەک نەبێـت، دەبینیـن بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا کار دەکاتە سـەر باری ناهاوسـەنگی یان ڕێکوپێکی یان گونجان و بڕیاری هەڵبژاردنەکەی، پێ باشبوونەکەی لەو لایەنەی ئەم هاوسەنگییە وەدی دێنێت و، لە گرژیی و دڵەڕاوکێ دووری دەخاتەوە.

گرژیی و دڵەڕاوکێ لە ئەنجامی ناهاوسەنگی یان ڕێکوپێکی یاخود گونجان، یەکێک لە رەگەزەکانی سـزا پێکدەهێنێت کە هەوڵ دەدات وەرگر لە لێکدانەوەکانی تایبەت بە تیۆرەکانی دەروونناسی دوور بکەوێتەوە، یان بچێتە نێو بازنەی سزاو کۆششەوە.

### چوارەم: تیۆری بەکارهێنان و تێربوون:

ئەم تیۆرە لە چلەکانی سەدەی رابردووەوە باس دەکرێ، بۆئەوەی بزانرێ خەڵک ئامرازەکانـی میدیـا بۆ تێربوونی چ ئارەزوویەک لـە ناخیدا بەکار دەهێنێت. ئەم تیۆرە لـە جەمـاوەری ئامرازەکانـی میدیـا دەکۆڵێتەوە، بەتایبەتـی ئەو تاکانەی کـە میدیا بۆ تێرکردن پێداویستییە دەروونییەکانیان بەکاردەهێنن.

ئـەم تیـۆرە بەپێچەوانـەی تیۆرەکانی پێش خۆی هەوڵدەدات بەشـێوەیەکی جیاواز بڕوانێتە پەیوەندی نێوان ئامرازەکانی میدیاو جەماوەری وەرگر، لەسـەر بنەمای ئەم تیۆرە، ئامرازەکانی میدیا ناتوانن پەیامێکی راگەیاندراو بۆ جەماوەر هەڵبژێرن و دیار بکـەن، بەڵکـو جەماوەر خۆی بڕیار دەدات و ئامرازەکانی میدیا دیاری دەکات و، هەر خۆی پەیامی ناو ئامرازەکان دیاری دەکات، ئەو بڕیارەشـی دەکەوێتە ژێر کاریگەری گرنگیدانە تایبەتییەکانی و ئارەزوو و تێربوونەکانی.

تیـۆری بەکارهێنـان و تێربـوون لـە جەمـاوەری ئامرازەکانـی میدیـا دەکۆڵێتـەوە بەتایبەت ئەو تاکانەی میدیا بۆ تێرکردنی پێداویستییە دەروونیەکانیان بەکار دەهێنن، بەپێـی ئـەو تیۆرە هەمـوو ناوەڕۆکـی ئامرازەکانی میدیا کاریگەری لەسـەر جەماوەر

نابێ، بەڕادەیەک کە کۆنترۆڵی بیرکردنەوەو ڕەفتاری بکات، بەڵکو جەماوەر بڕیار دەدات سەبارەت بە بەکارهێنانی چ ئامرازێک دواتر بۆ تێرکردنی چ پێداویستییەکی دەروونی.

لێکۆڵینەوەکان پێویستی بەکارهێنانی تاکەکانیان دابەش کردووە، کە لەڕێگەیەوە لایەنێک لەلایەنەکانیان تێر دەکەن، گرنگترینیان ئەمانەن:

- پێویستی زانیاری: پێویستی تاکەکانە بۆ بەدەست هێنانی زانیاری و ئارەزووی تاک بۆ تێگەیشتن و دەست بەسەرداگرتنی ژینگەی دەورووبەری، هەروەها لەگەڵ ئارەزووی بۆ ئاشکراکردنی شتە شاراوەکان.
- پێویستی ویژدانی: هەوڵدان بۆ تێرکردنی پێویستی سۆزداری و خۆشگوزەرانی.
- پێویستی کەسایەتی: ئەو پێویستییە پەیوەندی بە پلە و پایەی تاکەکان هەیە.
- پێویستی کۆمەڵایەتی: پەیوەندی بە بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەیە.
- هەڵاتن لە واقیع: ئەو پێویستییە پەیوەندی بە کەم کردنەوەی پاڵەپەستۆی دەروونییەوە هەیە.

پاڵنەری خوێنەران بۆ خوێندنەوەی بەرهەمە میدیاییەکان، لە پێنج خاڵی سەرەکیدا کۆ کراوەتەوە:

- پێویستی و گەڕان بەدوای زانیاری و تێگەیشتن لە بابەتەکانی دەورووبەر.
- هەستە چالاکەکانی مرۆڤ وەک ئارەزوو، خۆشبەختی و سۆز.
- پێویستییە تایبەتییەکان وەک هەبوونی پێگەیەکی کەسی.
- پێویستییە کۆمەڵایەتییەکان وەک هاوڕێیان و خزم و کەس و کار.
- خۆئاراستەکردن بەرەو بوارە جیاوازەکان، ڕاکردن لە ڕۆتینییەکانی ژیان.

**پێنجەم: تیۆری یاری:**

(ویلیام ستینفسۆن W.Stevenson) ئەم تیۆرەی لە ساڵی ١٩٦٧ دانا، تیۆرەکە ئاماژە بەوە دەکات کە لە پەیوەندیکردنی جەماوەریدا وەرگر هەست بە نغرۆبوون و

تام و چێژ دەکات، لەوەی ئەو مادە میدیاییانەی ڕووبەڕوو دەکرێتەوە، ئەگەر ڕاگەیاندن ئەرکێک لە ئەرکەکان بێت، ئەوا کاتگوزەری و تاموچێژ بینین لایەنی گەورەترە لەم ئەرکانە و، ئامرازەکانی میدیا بایەخ بە پێکهێنانی ڕای گشتی دەدەن، بۆیە دەبێت بایەخ بە پێکهێنانی حەزی گشتی بدەن، لە ڕێگەی ئەوەی لە ڕەگەزەکانی کاتگوزەری و قەناعەتپێکردن پێشکەشی دەکات.

**پێشبینییە سەرەکییەکان لە تیۆری یاریدا:**

کارلێککردن لەنێوان ئامرازەکانی میدیاو وەرگراندا بە دوو ڕێگە دەبێت:

یەکەم: کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی: بەشێوەیەکی ئاشکرا لە بیرو باوەڕو بەهاو دابونەریتەکاندا دیارە، ئامرازەکانی میدیا کاریگەری لەسەر بەها کەسییەکان هەیە و ئەمە لە پێکهێنانی ڕای گشتیدا بەڕوونی دەردەکەوێت.

دووەم: خەڵک لە میانەی لێکنزیکبوونەوەی سەرپشکانە کارلێک دەکەن، کە ڕێگە بە خەڵک دەدات کەمێک لە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی ئازاد بن، هەروەها ڕێگەیان پێ دەدات بۆ خۆیان بژین و خۆیان خۆشحاڵ بکەن.

تاکەکان بەدوای پەیوەندیکردنی تام و چێژ دەگەڕێن و وەرگران بە باری خودی پەیوەندی دەبەستن. تێکەڵەی ڕۆژانە لە ناوەڕۆکی میدیا لەسەر بنەمای چەند قۆناغێک لە میدیا دەڕوات، کە خۆی لە گرژیی دەبینێتەوە، پاشان قۆناغی چێژبینین دێ کە خۆی لە ئارامی و خاوبوونەوە دەبینێتەوە، دواجار کاتگوزەری و خۆشگوزەری فشار بەرز دەکاتەوەو وەرگران هەست بە چێژ دەکەن.

ئەم تیۆرە دووپاتی ئەرکی کاتگوزەری و خۆشگوزەری دەکاتەوە، وەک یەکێک لە ئەرکەکانی ئامرازەکانی میدیا لە خولە دووبارەکەیدا بۆ نیشاندانی شێوەکانی ناوەڕۆک، یەکێک لە هۆکارەکانی ڕووبەڕووکردنەوەی تاکەکان بۆ ئامرازەکانی میدیایش بریتییە لە ڕزگاربوون لە فشارەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی و، ڕیتمی جدی بۆ ناوەڕۆکی میدیایی یان ڕاڤەکردنی تایبەتی بۆ وەدیهێنانی ئەرکەکانی دیکە، جگە لە کاتگوزەری یان خۆشگوزەری.

(کاتز Katz) وای دەبینێت ئەو چوار ئەرکە سەرەکییە، کە دەکرێ ئاراستە

کەسـییەکان تیایدا خزمەتی هەر تاکێک بکەن و دواجار کار لە رەفتاری بکات، بریتین لە:

**- ئەرکی قازانج یان خۆگونجاندن:**

تـاک خـۆی بەو ئاراسـتانەوە دەبەسـتێتەوە کە سـوودی گەورەی لـێ دەبینێت و، سـزای چاوەڕوانکـراو لەلایـەن ژینگەی دەرەکییەوە کـەم دەکاتەوە، لـەم روانگەیەوە ئاراسـتەی تـاک بـەرەو شـتێک لە چوارچێوەی ئەو سـوودە دیاری دەکرێـت کە لەو شـتە وەدەسـتی دەهێنێت، دەبینین تاک لەم بوارەدا هەندێ پرسـیاری تایبەتی دەکات بـەوەی بەکارهێنانـی ئامرازەکانی میدیا ئاکامەکەی بۆی چی دەبێت؟ هەروەک هەندێ لـە زانایانـی وەک (ویلبور شـرام) دووپاتیان کردۆتەوە، کـە بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیـا لەلایـەن تاکـەوەو بەکارهێنانـی ناوەڕۆکەکەی، سـەرەتا پەیوەسـتە بەوەی ئەو قازانجـەی تـاک لـەم بەکارهێنانە وەدەسـتی دەهێنێـت، لەبەرامبەر ئەو کۆششـەی بۆ دەسکەوتنی ئەم قازانجە دەیکات.

**- ئەرکی بەرگری لەخۆکردن:**

ئەم ئەرکە رەنگدانەوەی ئاراستەی تاکە، بۆ بەرگریکردن لەو وێنانەی کە لەبارەی خۆیـەوە پێکهاتـووەو رەتکردنـەوەی جگـە لەوانە، ئـەم ئەرکە بە روونی لـە رەفتاری کەمینـەکان و دەمارگیریـدا دیارە، لەو روانگەیەوە پێشـبینی دەکەین تاک ئامرازەکانی میدیـاو ناوەڕۆکەکـەی بەکاربهێنێـت، کاتێـک لـە پێشکەشـکردنی وێنەیەکـی گونجـاو لەبارەیەوە سەرکەوتوو دەبێت، تاکیش بە خراپ لەسەر ئامرازەکانی میدیا دەخوێنێت، کاتێک پێچەوانەی ئەمە پێشکەش بکات.

**- ئەرکی دەربڕین لەبارەی بەهاکان:**

تـاک هەسـت بە رەزامەندی دەکات، کاتێک ئاراسـتەکان ئەو بەهـا باوانەی تیایاندا رەنـگ بداتـەوە کـە پێـوەی پابەنـدە، چونکە ئـەو ئامرازانـەی میدیا کە پاڵپشـتی بەها باوەکان دەکەن ئەوەیە، کە دەکرێ تاک روبەڕووی بکرێتەوە.

**- ئەرکی زانین:**

تاک پێویستی بە زانین و زانیاری هەیە، کە لە بونیاتنانی درککردنە خودییەکەی و

پێکهێنانی واتاکان لەلای پارمەتیدەرە، بۆئەوەی بتوانێت لە هەڵوێست و ئاراستەکەی لە هاندەرەکانی ژینگەیی دەوروبەری تێ بگات و راڤە و دیاری بکات، کە لە زۆربەی کاتەکاندا رووبەڕووی دەکرێتەوە.

**شەشەم: تیۆری پێچ پێچی بێ دەنگی:**

ئەم تیۆرە لە حەفتاکانی سەدەی رابردوو لەلایەن تیۆردانەری ئەڵمانی (ئەلیزابیت نۆیلە) دارێژرا، بە بەردەوام خولانەوە لە بێ دەنگی یان پێچ پێچی بێ دەنگی ناسراوە. (نۆیلە) داوای رۆڵی سەرەکی بۆ ئامرازەکانی پەیوەندیکردن کرد لە کاریگەری کردنە سەر جەماوەر، دواتر رەنگدانەوەی لە پێکهێنانی رای گشتی. روخساری تیۆرەکەش لەسەر ئەم ئەگەرانە دەوەستێت:

- خەڵک هەستی شەشەمیان هەیە لە زانینی ئاراستەکانی رای گشتی، بێ ئەوەی ئاماریان لەبەر دەست بێت.

- خەڵک ترسیان لە جیاکردنەوە هەیە، ئەوەش دەزانن کە پاراستنی بیرو بۆچوونەکانیان هەستکردنیان بە جیاکردنەوە زیاتر دەکات، بۆیە دەترسن بچنە چوارچێوەی کەمایەتییەکان.

- ئامرازەکانی میدیا بەگشتی و تەلەڤزیۆن بەتایبەتی، رۆڵی سەرەکی دەبینین لە پێکهێنانی رای گشتی، زۆر جاریش ئەو ئاراستانەی لە تەلەڤزیۆن رەواجیان پێ دەدات، پاڵپشتی لەو رایە دەکات.

ئەم تیۆرە دووپاتی دەکاتەوە کە ئامرازەکانی میدیا بە گشتی هەندێ جار لایەنگیری یەکێک لە کێشە یاخود کەسایەتییەکان دەکات، کە وا دەکات بەشێکی زۆری جەماوەر پاڵپشتی لەو لایەن یان ئاراستانە دەکات، کە ئامرازەکانی میدیا پشتیان پێ بەستووە، بۆ دۆزینەوەی تەوافقی کۆمەڵایەتی.

لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری جەماوەر وا مەزندە دەکەن، ئەو لایەنەی هۆکارەکانی میدیا پاڵپشتیان لێ دەکات ئەوا ئەوان دەربڕین لە لایەنی باوی ناو کۆمەڵگا دەکەن، ئەو رایەی ئامرازەکانی میدیا تەبەنی دەکات بە بەهێزی دەمێنێتەوە لەوانەشە فشارێک

بۆ سەر ئەوانە دروست بکات، کە رای جیاوازییان هەیە لەو رایەی، ئامرازەکانی میدیا تەبەنی دەکات بۆیە پەنا بۆ بێ دەنگی دەبەن، بۆیە ئێمە شوێنەوارێکی پێچ پێچ (لولب) مان دەست دەکەوێ، کە زیاتر بەرەو ئەو ئاراستەیە دەڕوات، کە ئامرازەکانی میدیا تەبەنی دەکەن ئەمەش بێ گوێ پێدانە هەڵویستی ڕاستەقینەی جەماوەر.

(ئەلزابیت نۆیلە) تیۆرەکەی بە پاڵپشتی لەسەر توێژینەوەی تاقیکردنەوەیی پەرە پێدا، سێ گۆڕانکاری سەرەکی تێبینی کرد، کە بەشداری لە بەهێزکردنی کاریگەری ئامرازەکانی میدیا دەکات، ئەوانیش:

١. کاریگەری چەندایەتی لە میانەی دووبارە بوونەوە: ئامرازەکانی میدیا، هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی نامەکانی میدیا وەک یەک و دووبارە کراوە، لەبارەی کێشە، بابەت، یان کەسایەتییەکی دیاری کراو، بە شێوەیەک کەڵەکە بووە لە ماوەیەکی دوورو درێژدا کاریگەری لەسەر وەرگر دەکات، بێ ئەوەی خۆی ئیرادەی لەسەری هەبێ، هەرچەندە هێزی وەرگرەکە بەرامبەر پەیامی میدیا بەهێزو زۆر بێت.

٢. بەڕێوەبردنی نا ویستیی وەرگرو کاریگەری تەواو لەسەری: ئامرازەکانی میدیا کونترۆڵی مرۆڤ دەکات و لە هەموو شوێنێک ئابلۆقەی دەدات و، بەسەر ژینگەی زانیارییەکان زاڵ دەبێ، بەمەش کاریگەری تەواوی بەسەر تاکەکان دەبێ، کە زەحمەتە لێی دەرباز بێت بە شێوەیەک بە بێ ئیرادەی ئەو هەموو دیدو ڕایەکانی پێک دێنێ.

٣. چوونەیەک و زاڵبوونی میدیایی: ئەوانەی لە نێوەندی پەیوەندیکردن و میدیایی کار دەکەن، پەیامەکانیان بەشێوەیەک پێشکەش دەکەن، لەگەڵ هەڵوێستی خاوەنی دامەزراوە میدیاییەکە بگونجیت، کە لەگەڵیان کار دەکەن.

هەموو ئەو هۆکارانە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی هەلی تاکەکانی وەرگر، کە ڕایەکی سەربەخۆی بۆ خۆی دروست بکات لەبارەی کێشە وڕووژێنەرەکان، (نۆیلە) وای دەبینێ، هۆکاری زۆر هەن وا لە خەڵک دەکەن سووربن لەسەر ئەوەی ڕایان بدەن، ئەو هۆکارانەش:

- دەربڕینی ڕا وا لە کەسەکان دەکات هەست بە ئەندامێتی لە ڕۆڵی زۆرینە بکات، بەڵام ئەگەر ڕای جیاوازیان هەبێ ئەوا بێ دەنگ دەبن.

- کەسەکان حەز بە قسەکردن لەگەڵ ئەوانە دەکەن کە هاوڕان لەگەڵیان، زیاتر لەوانەی کە لەگەڵ ئەوان جیاوازە.

- زانین و بە هێند زانینی خودی خۆی، وا لە تاکەکان دەکات ڕای خۆی بدات.

- تاکەکان لەو کاتانە حەز دەکەن رای خۆیان بدەن کە هەست بکەن زۆرینەن.

جگە لەم بارو دۆخانە، تاکەکان حەز دەکەن بێدەنگ بن کاتێک فشار بۆ بەرژەوەندی رای زۆرینە زیاتر بێت. لە سیستمی دکتاتۆری ئەم بێدەنگییە زیاد دەبێ بەهۆی بوونی دەوڵەت و دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی، نەک بەهۆی بوونی زۆرینە.

ئەو رەخنانەی ئاراستەی تیۆرەکە کراون:

١. تێگەیشتنی چەمکی (کەمینەی بێ دەنگ) ورد نییە، چونکە زۆر جار ئەم کەمینەیە گفتوگۆ دەکەن و بەشێوەیەکی بەهێز رەخنە دەگرن، سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ رای زۆرینە جیاوازن.

٢. بێدەنگی تاکەکان بۆ ترسانیان لە جیاکردنەوەی کۆمەڵایەتی ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە زانیاری تەواو یان هیچ زانیارییەکی لەسەر کێشەکان نەبووە.

٣. گومان لە ئەگەری دووبارە بوونەوەو زاڵبوون و بەڕێوەبردنی لا ئیرادی، لەلایەن ئامرازەکانی میدیا لە پێکهێنانی رای گشتیدا.

٤. ئامرازەکانی میدیا بەپێی پێویست ڕای زۆرینە دەرنابڕن، بەڵکو هەندێ جار رای زۆرینە پێچەوانە دەکاتەوەو رەواجی بۆ دەدات.

٥. زەحمەتە شیکردنەوەو پێکهاتنی رای گشتی دوور بێت لە رۆڵی زانیاری و تاقیکردنەوەکان، کە تاکەکان لە میانەی ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوروبەری بە دەستی دێنن، بەتایبەتی لە کێشە گرنگەکاندا.

### حەوتەم: تیۆری پێویستی و پاڵنەرەکان:

پێویستی و پاڵنەرەکان بە هۆکارە بزوێنەرەکانی پەیوەندیکردن دادەنرێن، ئەو پێویستی و پاڵنەرانەی کە تاک پێشبینی دەکات لێی تێ بگات، یاخود ئەوانی دیکە بۆی دەستەبەر بکەن بەمەبەستی گونجاندن لەگەڵ ژینگە، پێویستیش چەند جۆرێکە، لەوانە:

**١- پێویستییە فسیۆلۆژییەکان:**

ئەو پێویستیانەیە کە راستەوخۆ بە مانەوە پەیوەستە، کە بوونەوەرە زیندووەکانیتر تیایدا بەشدارن و، ئەو پێویستیانەش خواردن و ئاوو سێکس و رزگاربوون لە پاشەڕۆ و نووستن دەگرێتەوە، ئەگەر ئەم پێویستیانە تێر نەبوون، ئەوا بەتەواوی کۆنترۆڵی ژیانی تاک دەکات.

**٢- پێویستییەکانی ئاسایش:**

کاتێک پێویستییە فسیۆلۆژییەکان بەشێوەیەکی پێویست تێر دەبن، ئەوا پێویستییەکانی ئاسایش وەک پاڵنەری زاڵ سەرهەڵدەدەن، ئەمەش پێویستی ئاسایش و توانای پێشبینی کردن تیایدا دەگرێتەوە.

**٣- پێویستی ئینتیماو خۆشەویستی:**

کاتێک پێویستییە فسیۆلۆژییەکان و پێویستییەکانی ئاسایش بە تەواوی تێر دەبن، پاڵ بە تاکەوە دەنێت بۆ خۆشەویستی و، خەڵک پێویستی بەوەیە لە جێی خۆشەویستیدا بن و دەورووبەریان خۆش بوێت و، ئەگەر ئەم پێویستییە تێر نەکرێت ئەوا تاک هەست بە تەنیایی دەکات.

**٤- پێویستییەکانی رێزگرتن:**

ئەگەر کەسێک بەپێی پێویست بەختەوەر بێت بە جۆرێک پێویستییە فسیۆلۆژییەکانی و پێویستییەکانی بۆ ئاسایش و ئینتیماو خۆشەویستی تێر دەبێت، ئەوا پێویستی رێزگرتن باڵ بەسەر ژیانیدا دەکێشێت، ئەمەش پێویستی بە رێزگرتن لەلایەن ئەوانی دیکە دەکات، ئەم رێزگرتنە دەبێتە هۆی دۆزینەوەی هەست لای کەسەکە بەوەی کەسێکی پەسندو خاوەن پێگەیە.

**٥- پێویستی بە زانین و تێگەیشتن:**

(ماسلۆ) وای دەبینێت ئارەزووکردن بۆ زانین) و تێگەیشتن بە تێربوونی پێویستییە سەرەکییەکان پەیوەستە، بە واتایەکی دیکە زانین و تێگەیشتن دوو ئامرازن بۆ چارەسەرکردنی کێشەو زاڵبوون بەسەر ئاستەنگەکاندا بەکاردەهێنرێن، دواجار دەرفەت بۆ تێرکردنی پێویستییە سەرەکییەکان دەستەبەر دەکات.

**٦- پێویستییە جوانخوازییەکان:**

پێویستبوونە بە شتگەلێکی رێکخراو وەک سیستەم و هاوشێوەبوون و بونیات و تەواوکردنی کردەکان، کە تاک لای گەورەکان یان لە ئامرازەکانی میدیادا دەیبینێت.

**٧- خۆ بەدیهێنان:**

ئەگەر پێویستییە بنەڕەتییەکان بە باشی تێر بوون، ئەوا تاک دەکرێ ببێتە یەکێک لەو کەسە کەمانەی کە خۆیان سەلماندووە.

پاڵنەر وا دەناسێنرێت کە پێویستییەکی فسیۆلۆژی یان دەروونییە، تاک ئاراستە دەکات و دەیبزوێنی بۆئەوەی رەفتارێکی دیاریکراو ئەنجام بدات، کە بەدەنگەوە هاتنەکەی بۆ وورووژێنەرێک بەهێز دەکات و پێویستییەکانی ئەو تاکە تێر دەکات. تێرکردنی پێویستییەکان و دەستەبەرکردنی پاڵنەرەکان لای تاک پێویستە، بۆئەوەی هاوسەنگییەکی دەروونی بۆ وەدی بێت کە یارمەتی دەدات بۆ بەردەوامی پەیوەندی و گونجان لەگەڵ ژینگەکەدا، ئەمە رەفتاری تاک راڤە دەکات لە ئاراستەکردنی بۆ تێربوونی ئەو پێویستییانەی نییەتی، کاتێک لەگەڵ ئەوانی دیکە راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ مامەڵە دەکات، پەیوەندییەک لەنێوان تێرکردنی پێویستییەکان و پاڵنەرەکان هەیە، چونکە تێرکردنی پێویستی دەبێتە هۆی دەسکەوتنی قازانجێک کە تاک چاوەڕوانی دەکات، لەڕێگەیەوە ئاستی سزاو گرژیی لەلای کەم دەبێتەوە.

لەبەر ئەمە، گرنگی پەیوەندیکردن بۆ تاک خۆی لە تێرکردنی پێویستییەکانی و دەستەبەرکردنی پاڵنەرەکانی دەبینێتەوە، چونکە تاک پێویستی بە هەواڵ هەیە بۆئەوەی لە بارودۆخی دەوروبەری بزانێت، لەلایەکیترەوە زانیارییەکان بەپێویست دادەنرێت بۆ پەیوەندی تاک لەگەڵ ئەوانی دیکە جا تاک یان گرووپەکان بێت، بۆئەوەی پێوەرەکانی ئەم گرووپانەو بەهاکانی و رێککارییە کۆمەڵایەتییەکانیان وەدەست بێنێ، بۆیە دەبینین ئەو کەسەی یەکێک لەم پێویستییە دەروونییە سەرەتاییەکان یان باڵاکان تێر نەکرێت ئەو مرۆڤە ناتوانێ خۆی بەدی بێنێت. ئەمەش پاڵ بە تاکەوە دەنێت رەفتارێکی ئەرێنی بنوێنێت، لەگەڵ ئەو ئامرازانەی میدیا کە بەکارهێنان و رووبەڕووکردنەوەی وەدەستهێنانی ماریفەو زانیاری دەگەیەنێت، کە لە تێرکردنی ئەم پێداویستییە و

دەستەبەرکردنی پاڵنەرەکان بەشدارە، بۆیە تاک هەست بە رەزامەندی و ئاسوودەیی و هاوسەنگی دەروونی دەکات، لەکاتێکدا تاک خۆی لە روبەڕووکردنەوەی ئەو ئامرازانەی میدیا دەپارێزێت کە پێویستی یان پێویستییەکانی بۆی دەستەبەر دەکات. جیاوازی لای کەسەکان لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا بەستراوە بە جیاوازی پێویستییەکانیان.

(ماکویل Mc Quail) وای دەبینێ چوار دەستە بۆ پێویستی و پاڵنەرەکان هەیە، کە خۆی لە کاتگوزەرێ، راکردن لە رۆتین و کێشەکان، پاڵپشتی پەیوەندیە کەسییەکان هەروەها وەدەستهێنانی ناسنامەی کەسێتی دەبینێتەوە، لەمیانەی پاڵپشتی بەهاکان و ئاسایش و تێگەیشتنی خودو زانینی ئەو شتانەی لە دەوروبەری روودەدات، جا ئەوەی کار دەکاتە سەری یان لە ژیان و بڕیارەکانیدا یارمەتی دەدات.

شارەزایان و توێژەرانی دەروونناسی میدیا بایەخیان داوە بە دارشتنەوەی چوارچێوە تیۆرییەکانی پەیوەندی نێوان دەستەبەرکردنی ئامرازەکانی میدیاو پێویستییەکانی تاک و پاڵنەرەکانی و، تێربوونی پەیوەندییەکە بۆ ئەم پێویستییانە و، بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە و ناوەڕۆکەکەی لەلایەن تاکەوە لە چوارچێوەی دەروازە جیاوازەکانی تیۆری بەکارهێنان و تێرکردنەکان، کە هەوڵ دەدات ئەم ئامانجانەی خوارەوە وەدی بهێنێت:

- ئاشکراکردنی چۆنێتی بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا لەلایەن تاکەوە، لەرێگەی وەڵامدانەوەی پرسیاری چۆن؟

- ئاشکراکردنی پاڵنەرەکانی بەکارهێنانی ئامرازێکی دیاریکراو لەلایەن تاکەوە، لەرێگەی وەڵامدانەوەی پرسیاری بۆچی؟

- ئەنجامەکان لە تێگەیشتنێکی قووڵ بۆ پرۆسەی پەیوەندیکردنی جەماوەری بەشدارن.

(کاتز) و هاوڕێیانی بایەخیان بە دارشتنەوەی پەیوەندی نێوان پێویستییەکانی تاک و ئاراستە رەفتارییەکانی دا، بۆ تێرکردنی ئەو پەیوەندییە لە نێو ئەڵتەرناتیڤە جیاوازەکاندا، لەوانەش ئامرازەکانی میدیا و ناوەڕۆکەکەی. ئەو وای دەبینێت لای هەر

کەسێک هەندێ هۆکاری کۆمەڵایەتی و دەروونی هەن کە پێویستییە دیاریکراوەکانی تاک بۆ کەسەکە بەرهەم دەهێنێ. بەهۆی ئەزموونی تاک دەست بە وێنەکێشانی پێشبینییەکانی دەکات، لە دەستەبەرکردنی ئامرازەکانی میدیا بۆ ئەم پێویستییانە بە بەراورد بە سەرچاوەکانی دیکە، بۆ تێرکردنی ئەم پێویستیانە (پێویستی بۆ کاتگوزەری و هەڵهاتن، پێشبینییەکانی لەبارەی توانای وەدیهێنانی ئەمە لەرێگەی بینینی تەلەڤزیۆن یان چوون بۆ یانە وێنە دەکێشێت)، لەسەر ئەم بنەمایە بڕیارەکەی دەدات بە هەڵبژاردنی نێوان ئامرازەکانی میدیا یان سەرچاوەکانی دیکە، لەئەنجامی بەرکەوتن هەندێ پێویستی لەپاڵ ئەنجامە شاراوەکانیتر تێر دەبن، کە جارێکی دیکە دەبێتە هۆی دروستبوونی پێویستی یان پێشبینی تازە، کە لە کارلێک لەگەڵ رەگەزە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان دەست پێ دەکات.

بەم جۆرە خولی پەیوەندی نێوان دروستبوونی پێویستی و بڕیاری تاک، بۆ روبەڕووکردنەوە بۆ ئامرازەکانی میدیا تەواو دەبێت بە ئومێدی تێربوونی و، پەیدابوونی پێویستی تازە یان تێرنەبوونی هەندێ پێویستی وا دەکات کەسەکە جارێکی دیکە دووبارەی بکاتەوە بە ئومێدی ئەوەی هەموو پێویستییەکان تێر بێت، بەم جۆرە پێویستییەکان پەیدا دەبن و بەکارهێنان دووبارە دەبێتەوە، بۆ تێرکردنی ئەو پێویستیانە.

لە نموونەی پێشووەوە دەکرێ ئەو ئەگەرە سەرەکییانە بناسین، کە تیۆری بەکارهێنانەکان و تێربوون لە نموونەی (کاتز) لەسەری بونیات نراوە، دەکرێ ئەم گریمانانە لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە:

١- جەماوەری وەرگر جەماوەرێکی چالاکە و، بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا لەلایەن ئەوانەوە بەکارهێنانێکی ئاراستەکراوە، بۆئەوەی ئامانجی دیاریکراو وەدی بهێنێت.

٢- ئەندامانی جەماوەر دەستپێشخەرییان تێدایە، بۆ دیاریکردنی پەیوەندی نێوان تێرکردنی پێویستییەکان و هەڵبژاردنی ئامرازگەلی دیاریکراو، وای دەبینێت پێویستییەکانی تێر دەکات.

٣- ڕکابەری ئامرازەکانی میدیا بۆ سەرچاوەکانی دیکە بۆ تێرکردنی پێویستییەکان، وەک پەیوەندیکردنی کەسیی یان دامەزراوە ئەکادیمیەکان یاخود دامەزراوەی تر، چونکە پەیوەندی نێوان جەماوەرو ئامرازەکانی میدیا بە چەندین هۆکاری ژینگەیی کاریگەر دەبێ، وا دەکات ڕوو بکاتە سەرچاوەی دیکە بۆئەوەی پێویستییەکانی تێر بکات.

٤- تەنیا جەماوەرە دەتوانێ وێنە ڕاستەقینەکە دیاری بکات بۆ بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا، چونکە ئەوە کە بایەخدان و پێویستی و پاڵنەرەکانی دیاری دەکات، دواجار دەستنیشانکردنی ئەو ئامرازانەی پێویستییەکانی تێر دەکات.

٥- بڕیارەکان لەبارەی بەهای پەیوەندی نێوان پێویستییەکانی جەماوەرو بەکارهێنانی بۆ ئامرازێک یان ناوەڕۆکێکی دیاریکراو، پێویستە جەماوەر خۆی دیاری بکات.

**پشتبەستن بە ئامرازەکانی میدیا:**

پشتبەستنی تاک بە ئامرازەکانی میدیا، بە بەشێک لە تیۆری پشتبەستنی ئاڵوگۆڕ لەنێوان ئامرازەکانی میدیاو سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان دادەنرێ، کە لەلای خۆیەوە پەیوەندی جەماوەر لەگەڵ ئامرازەکانی میدیا پێکدەهێنێت، چونکە تاکەکان پشت بە ئامرازەکانی میدیا دەبەستن، بەوپێیەی سەرچاوەیەکی وەدیهێنانی ئامانجەکانیانە، چونکە تاک ئامانجی پشتگیریکردنی مافەکەیەتی لە زانینی بڕیاردانی کەسیی و کۆمەڵایەتی جۆراوجۆر، وەک ئامانجێکیش لە هەمان کاتدا پێویستی بە کاتگوزەری و خۆشگوزەری هەیە، بەڵام تاکەکان ناتوانن جۆری ئەو ئامرازە کۆنترۆڵ یان دیاری بکەن کە ئامرازەکانی میدیا دیاری دەکات ئەوەی بڵاو دەبێتەوەو نابێتەوە، لەسەر بنەمای پەیوەندی بازنەیی لەگەڵ کەسانی وەرگر هەروەک سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان، دواجار کاریگەری تایبەتمەندی و خەسڵەتە کەسیی و کۆمەڵایەتییەکان لەسەر ئەم پەیوەندییە بازنەییە لەگەڵ ئامرازەکانی میدیا دەردەکەوێت.

پشتبەستنی تاکەکان بۆ ئامرازەکانی میدیا لەسەر دوو بنەمای سەرەکی وەستاوە،

بریتین لە:

یەکـەم: ئامانجگەلێک بـۆ تاکـەکان هـەن هەوڵـدەدەن وەدی بهێنـن، بەهـۆی ئـەو زانیاریانەی سەرچاوە جیاوازەکان دەستەبەری دەکەن، جا ئەم ئامانجانە کەسیی یان کۆمەڵایەتی بن.

دووەم: دانانـی سیسـتەمی ئامرازەکانـی میدیـا وەک سیسـتەمی زانیـاری، کـە کۆنترۆڵـی سـەرچاوەکانی وەدیهێنانـی ئامانجەکانـی تایبـەت بە کەسـەکان دەکات و، ئەم سـەرچاوانە خۆیان لە قۆناغەکانی وەرگرتنی زانیارییەکان و بڵاوکردنەوەیان، تا دەگاتە پرۆسـەی ئامادەکردن و ڕێکخسـتن و هەماهەنگی ئەم زانیارییانە دەبینرێتەوە، پاشان بەشێوەیەکی دیکە بڵاو بکرێتەوە.

**کاریگەرییەکانی پشتبەستن بە ئامرازەکانی میدیا:**

ئـەو کاریگەریانـەی لە ئەنجامی پشتبەسـتن بە سیسـتەمەکانی میدیـا ڕوو دەدەن، ڕەنگدانـەوەی پەیوەنـدی نێـوان پلـەی پشتبەسـتنی ئەم سیسـتەمانە و ئاراسـتەکانی گۆڕانە لە زانین یان هەسـت یاخود ڕەفتاری تاکەکان، بەوپێیەی بوارگەلی کاریگەری دەرەنجامی ئەم پشت پێ بەستنەن، لێرەدا ئەم کاریگەرییانە ڕوون دەکەینەوە:

**یەکەم: کاریگەرییە زانینییەکان:**

خۆی لە چەندین بواردا دەبینێتەوە، لەوانە:

تێپەڕاندنـی کێشـەی تەمـاوی: لە دەرەنجامـی لێکنەچوونی ئـەو زانیاریانە بەرهەم دێ کە ڕووبەڕووی تاک دەکرێتەوە، یان کەموکوڕی زانیارییەکان یان نەبوونی ڕادەی پێویسـت بـۆ تێگەیشـتنی واتای ڕووداوەکان یـان دیاریکردنی لێکدانەوە دروسـتەکان بـۆ ئـەم ئامانجانـە، ئەمەشـە کە بەسـەر تاکدا دێ کاتێـک بـە ڕووداوەکان دەزانێت و لەبـارەی ناوەڕۆکـی ڕووداوەکە یان لێکدانەوەکانی شـارەزایی نییە، ئەم تەمومژییەی لـە ئەنجامـی کەمیـی زانیارییەکان یـان ناکۆکبوونـی ڕاپۆرتەکانـی ئامرازەکانی میدیا ڕوودەدات، لەڕێگەی ئەوە زانیاری یان لێکدانەوانەی ئەم ئامرازانە پێشکەشی دەکەن، چارەسەر دەکرێت.

کاریگـەری دیکـەی زانینـی هەیە کە ئـەو ڕۆڵانە ڕوون دەکاتەوە، کـە ئامرازەکانی

میدیا لە پێکهێنانی ئاراستەکاندا ئەنجامی دەدەن، ئامرازەکانی میدیا پاڵ بە ژمارەیەکی دیاری نەکراو لە راو بابەت و کەسایەتییەکان دەنێت کە وەرگر دەورووژێنێ بۆئەوەی بایەخی پێ بدەن، بەتایبەتی لە کاتی تەنگژەو پشێوی و جەنگەکاندا:

أ/ کاریگەری ئامرازەکانی میدیا لە دیاریکردنی ریزبەندکردنی ئەوەی وەرگر بایەخی پێ دەدات، سەبارەت بەو بابەت و بیرۆکانەی ئامرازەکانی میدیا بڵاوی دەکەنەوە.

ب/ کاریگەری لەسەر بیرو باوەڕی تاکەکان لەمیانەی ئامرازە جیاوازەکانی میدیاوە.

ج/ کاریگەرییە زانینییەکان کاریگەری لەسەر سیستەمی بەهاکان لای ئەو کەسانە دەکات، کە پەیامە میدیاییەکەیان وەرگرتووە.

**دووەم: کاریگەرییە سۆزدارییەکان:**

نموونە لەمبارەیەوە هەستەکانی خۆشەویستی و رک لێبوونەوەیە، پەیامەکانی میدیا کاریگەرییان لەسەر هەستی کەسەکان و بەدەنگەوەهاتنەکانیان هەیە، نموونە لەبارەی ئەم کاریگەریانە:

١- ساردیی سۆزداریی: بەپێی گریمانەیەک ئەگەر بابەتەکانی توندوتیژی لەرێگەی ئامرازەکانی میدیاوە بەشێوەیەکی چڕ ئاراستەی تاک کرا، دەبێتە هۆی ساردی سۆزداریی، ئەمیش دووپاتکردنەوەی کەمی ئارەزووی هاوکاریکردنی کەسی دیکەیە، بەهۆی پێشکەشکردنی بابەتی چڕی توندوتیژی لەلایەن دەزگاکانی میدیاوە، پاشان تاک وا هەڵسوکەوت دەکات کە توندوتیژی ژیانی راستەقینە بێت. دەروونناسان وای دەبینن هەندێ بەڵگە دووپاتی دەکەنەوە کە ئەو ورووژاندنە دەروونییەی لەئەنجامی روبەڕوبوونەوەی تاک بۆ کارە توندو تیژەکان لە ئامرازەکانی میدیا دروست دەبێت، بە تێپەڕبوونی کات کەم دەبێتەوە.

٢- دڵەڕاوکێ و ترس: پێشکەشکردنی پەیامی میدیایی سەبارەت بە شارێک کە وا نیشانی بدات دیاردەی توندوتیژی پێوە دیارە، لەوانەیە ئەم پەیامە ببێتە هۆی مەترسی ژیان بەسەربردن لەو شارە یان مەترسی سەردانیکردنی.

### سێیەم: کاریگەریی ئاکاری و واتایی:

ئـەم کاریگەرییـە لە ئەنجامـی ڕووبەڕووبوونـەوەی ئامـرازە جۆراوجۆرەکانی میدیا ڕوودەدات، کە زانیاریگەلێکی لەخۆگرتووە کاریگەری لەسەر ورەی تاکەکان و ئاستی ئاکاریان هەیە، نموونە لەمبارەیەوە، بوونی زانیاری ئەرێنی و ڕێکخراوە لە ئامرازەکانی میدیـادا، لەبـارەی ئـەو گـرووپ و دەسـتانەی تاکـەکان ئینتمایـان بـۆی هەیـە، وەک کۆمەڵگەو دەسـتەو تاقمەکان یان پیشـە یان گرووپە ئیتنییەکان، ئەم جۆرە زانیارییانە لـە ئامرازەکانـی میدیـا دەکرێ کاریگەرییەکی واتایی لەسـەر ئەو کەسـانە هەبێت، کە پشـت بە سیسـتەمی ئامرازەکانی میدیا لـە چوارچێوەی کاریگەرییە سـۆزدارییەکاندا دەبەستن، چونکە هۆکارە ویژدانییەکان لە پێکهێنانی بۆچوونەکاندا، لەوانەیە ئەنجامی کۆمەڵایەتی وەک گرژیی کۆمەڵایەتی و سیاسی هەبێت.

### چوارەم: کاریگەرییە ڕەفتارییەکان:

گۆڕیـن لـە ئاراسـتە یـان بیروبـاوەڕ یاخود بـوارە سـۆزدارییەکان جێـی بایەخی هەموانـە، بـەڵام کارتێکـردن لـە ڕەفتـاری تاکـەکان لـە ئاسـتی جیاوازدایـە، چونکـە کارتێکردنەکانی ڕەفتار دەرەنجامی کۆتایی کارتێکردنی زانینی و سۆزدارین، بۆ نموونە دەبینیـن خەڵـک دەکرێ بە تیرۆوانین یان چارەسـەرکردنی کێشـەیەک پەیوەسـت بێت، لەئەنجامی ئاراستەگەلێک کە بە زانین و هەستەکان پێکیهێناوە، لەرێگەی ئامرازەکانی میدیـاوە پـەرەی پێ داوە، بە پێچەوانەی ئەمەش هەندێجار دەبینین ئامرازەکانی میدیا کاتێـک تـرس لەبارەی شـتێکەوە دەورووژێنـن، وا دەکات تاک لـە ئەنجامدانی کارێک دوور بکەوێتەوە، مەبەستیشی ئەوەیە لەو کارە دوور بکەوێتەوە.

## بەشی شەشەم
## پەیوەندیگیری لە دەروونناسیی میدیایی

**چەمکی پەیوەندیکردن:**

زاراوەی پەیوەندیکـردن communication دەگەڕێتەوە بۆ زمانە ئەوروپییەکان دواتر بۆ زمانەکانیتر وەرگێڕدراوە، لە بنەڕەتدا لە وشەی communts ی لاتینییەوە هاتووە بە مانای شـتی هاوبەش، پاشـان وشەیcommune ی لێ هاتە ئاراوە کە لە سەدەکانی ١٠و ١١ بە مانای کۆمەڵەی مەدەنی هاتووە.

وشەی Communication مانای کردنی (شتێک)ە بەگشتی، و بە مانای بەگشتی کردنی زانیاری دەبێت بۆ جەماوەر بە هەموو چین و توێژەکانیەوە، ئەمەش لە رێگای گواسـتنەوەی زانیاری لە تاکەوە بۆ کۆمەڵ بە شـێوەیەکی گشتی یارمەتی خێراکردنی پێشکەوتنی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بدات، بەشێوەیەکی گشتی میدیا نواندنی بەیەک گەیشتن و گۆڕینەوەی زانیاری دەنوێنێت.

(پەیوەندی) کردارێکی هاوبەشـە لەنێوان نێرەرو وەرگر نەک کرداری گواسـتنەوە بەتەنهـا، گواسـتنەوە واتـە کۆتایـی پێهێنـان لە سـەرچاوەکەوە، بەڵام هاوبەشـی واتە تێکەڵبـوون یـان یەکگرتنـەوە، ئەمـەش لـە کـرداری پەیوەندیکـردن نزیکتـرە. کەواتـە (پەیوەندیکـردن) کـرداری بەشـداریکردنە لـە هـزرو زانیـاری لـە رێگـەی نـاردن و پەخشکردنی واتا، ئاراستەکردن و بەرێکردن پاشان وەرگرتنی بە چوست و چالاکییەوە بۆ دروستکردنی وەڵامگۆیەکی دیاریکراو لەنێوەندێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا.

(یاگـی) وا پێناسـەی دەکات کـە «بریتییـە لـە پرۆسـەیەک ئامانجی گواسـتنەوەی زانیارییـە لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی دیکـە، بەمەبەسـتی دۆزینـەوەی جۆرێـک لـە تێگەیشـتنی ئاڵوگـۆڕی نێوانیـان». هەروەهـا کۆمەڵـەی راهێنـان و پەیوەندییەکانـی ئەمریـکا وا پێناسـەی دەکات کـە «بریتییـە لـە پرۆسـەی ئاڵوگـۆڕی هـزرو زانیاری، لەپێنـاو دۆزینـەوەی تێگەیشـتنێکی هاوبـەش و متمانـە لەنێوان توخمـە مرۆییەکان لە

ڕێکخراوەکە».

لەسەر ڕۆشنایی ئەوەی رابورد، دەکرێ پێناسەی پەیوەندیکردن (الاتصالات) وا بکەین کە «بریتییە لە پرۆسەی ئاڵوگۆڕی هزرو زانیاری، لەپێناو دۆزینەوەی تێگەیشتنێکی هاوبەش و متمانە لەنێوان توخمە مرۆییەکان لە قوتابخانەدا». بەڵام پەیوەندی (التواصل) ئاماژە بە بەشداریکردنی نێوان دوو لایەنە، واتە پردێک بۆ دانانی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤێکی دیکە، زۆرجاریش پەیوەندییەکە مۆرکێکی بەشداری پێوەیە.

**ئامانجەکانی پەیوەندیکردن:**

پەیوەندیکردن بناغەی ژیانی رۆژانەمانە، چونکە بڕو جۆرێکی زۆر لە زانیاری و داتا ئاڵوگۆڕ دەکەین، لە هەواڵپرسی تا ئاڵوگۆڕی هەست و نەست و گواستنەوەی هزرو، نمایشکردنی هەواڵ و گواستنەوەی بۆچوونەکان و فەراهەم کردنی زانیاری، چەندین ئامانجیشی هەیە، لەوانە:

١- دروستکردنی گۆڕانە لە ژینگە یان لە کەسانیتر، نێرەر ئامانجی لە ناردن کارتێکردنە لە وەرگری دیاریکراو، لەبەرئەوە پێویستە جیاوازی بکرێ لەنێوان وەرگری دیاریکراوو وەرگری گشتی، کەواتە پەیامی میدیایی دەبێ بگاتە لایەنی مەبەست (دیاریکراو) نەک کەسانیتر، بۆئەوەی پەیامەکە ئامانجی خۆی بپێکێ.

٢- دروستکردنی کارلێکە لەنێوان نێرەرو وەرگر لەڕووی بەشداریکردن لە هزر، ئایدۆلۆژیا، چەمک یان کارێک.

٣- لایەنێکی پەیوەندیکردن کار لەوی دیکە بکات، کە ئەم کارتێکردنە گۆڕانی ئەرێنی لە رەفتاری فێرخواز دروست بکات، بۆیە پرۆسەی فێرکردن و فێربوون کرداری پەیوەندیکردنە، هەورەها گۆڕینەوەی زانیاری و نیگارکێشان و هەر کارێک لەنێوان فێرکارو فێرخواز کرداری پەیوەندیکردنە.

**گرنگی پەیوەندیکردن:**

بنچینەی پرۆسەی پەیوەندیکردن هێنانەدی گشتگیری و هاوبەشییە، ئەمەش نایەتەدی ئەگەر بەلای کەم جۆرە لێکگەیشتنێک لە نێوان بواری ئەزموون و شارەزایی

نێرەرو وەرگردا نەبێ، کە ببێتە هۆی تێگەیشتنێکی هاوبەش و چوونیەک لە واتای پەیامی پەیوەندیکردنەکەی نێوانیان و بوونە هۆی تێگەشتنێکی بونیادنراو لە سەر گۆڕینەوەی زانیاری و شارەزایی و کارامەیی لە نێوان هەردوو لایەنی پرۆسەی میدیادا. گرنگی پەیوەندیکردن لەم خاڵانەدا دەردەکەوێ:

- هەڵچوون (سۆز) ئاراستەی هەست و نەست دەکرێ، بەئامانجی زیادکردنی پلەی پەسندکردنی رۆڵ.
- پاڵنەرێتی بۆ کاریگەرێتییە بەمەبەستی پابەندبوون بە ئامانجەکان.
- زانیارییەکان تەکنیکی ئاراستەی فەراهەمبوونی داتای پێویست دەکرێ بۆ بڕیاردان.
- چاودێری ئاراستەی بونیاد دەکرێ، بەمەبەستی روونکردنەوەی ئەرک و بەرپرسارێتی.

روونکردنەوەی ئەم ئامانجانەش لەمیانەی ئەم خاڵانەدایە:

١- توانای گەیشتن بە ئامانجەکان بە توانای پەیوەندیکردنەوە بەندە.

٢- پەیوەندیکردن بەشێکی گەورە لە کاری رۆژانەی تاکەکان دەنوێنێ.

٣- بۆ گواستنەوەی زانیاری و داتاو ئامارو چەمکەکان لەرێگەی کەناڵە جۆراوجۆرەکانەوە بەکەڵکە، کە بەشداری لە بڕیاردان و بەدیهێنانی سەرکەوتنی تاکەکان و پەرەسەندنیاندا بکات.

٤- مەرجێکی بنەڕەتییە لە ئاراستەکردن و گۆڕانی رەفتاری تاک و کۆمەڵ.

٥- لە گواستنەوەی چەمک و بیروڕاو هزر لەرێگەی کەناڵە فەرمییەکان بەشداری دەکات، بۆ دروستکردنی یەکگرتنی نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵ و یەکخستنی هەوڵەکانی بەشێوەیەک کە ئامانجەکانی وەدی بێنێ.

٦- ئامرازێکە ئامانجی زامنکردنی کارلێککردن و ئاڵوگۆڕی هاوبەشە بۆ ئەنجامدانی چالاکی جۆراوجۆر.

٧- ئامرازێکی چاودێری و رێنماییە بۆ تاک وکۆمەڵ.

٨- ئامرازێکە بۆ هاندانی تاک بۆ ئەنجامادنی ئەو رۆڵەی پێی دەسپێردرێ.

### جۆرو شێوەکانی پەیوەندیکردن:

چەندین شـێوەی پەیوەندیکردن هەیە، دامەزراوەی میدیایی پێویسـتە ئەو شێوەیە هەڵبژێرێ کە ئامانجەکانی وەدی دێنێ، شێوەگەلێکی دیکەش زۆرجار بۆ گواستنەوەی داتاو زانیاری بەکاردەهێنرێ، لەوانە:

**یەکەم: بەپێی سروشتی پەیوەندیکردنەکە:**

- پەیوەندیکردنـی فەرمـی: پەیوەندیکردنێکـە لـە چوارچێـوەی ئـەو ڕێسـایەیە کە دامەزراوە میدیایەکە پێی بەڕێوە دەچێت و سیسـتمی فەرمی دامەزراوەکە ڕۆڵی تێدا دەبینـێ. پەیوەندیکردنـی فەرمی یەکێک لەم شـێوانە وەردەگرێ: خوارەوە، سـەرەوە، ئاسـۆیی. گرێدانـی ئەنجومەنـە جیاوازەکانـی دامەزراوەیـەک جۆرێکـە لـە جۆرەکانی پەیوەندیکردنی فەرمی.

- پەیوەندیکردنـی نافەرمـی: هەموو ئەو جـۆرە پەیوەندیکردنانەیە کە لەدەرەوەی چوارچێـوە فەرمییـە دیاریکراوەکانـی پەیوەندیکـردن ڕوو دەدەن، لەوانەش گفتوگۆی نێـوان مامۆسـتایان و مامۆسـتایان یـان بەڕێوەبـەرو مامۆسـتایان سـەبارەت بـە کێشەیەکی پەروەردەیی، هەورەها لەنێوان خزمان و هاوڕێیان و دراوسێ ڕوودەدات. پەیوەندیکردنـی نافەرمـی بەندە بە پەیوەندیکردنی کەسـی و کۆمەڵایەتی بۆ ئەندامانی گەورەتر زیاتر لەوەی لەسەر بنەمای دەسەڵات و پێگە بێ، هەورەسا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئامانجە کەسییەکان زیاتر لە تەرکیزکردنی لەسەر ئامانجەکانی دامەزراوەیەک.

لایەنە باشەکانی پەیوەندیکردنی نافەرمی ئەمانەن:

- تەواوکەری پەیوەندیکردنی فەرمییە.
- سوودی هەیە لە ئاڵوگۆڕی زانیاری پێویست بۆ جێبەجێکردنی کارەکان.
- یارمەتیـدەرە بـۆ مەعریفەو بڵاوکردنـەوەی زانیاری و هزر، کە ڕەنگە بە فەرمی باسکردنی زەحمەت بێ، یان ڕاستکردنەوەی زانیارییە هەڵەکان.
- هاوکاری دروستکردنی پەیوەندی مرۆیی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ دەدات.

**لایەنە کەم و کورتییەکانی پەیوەندیکردنی نافەرمی ئەمانەن:**

- لەوانەیە بۆ مەرامی کەسیی بەکار بێت.

- وا لـه تاکـەکان دەکات زانیارییـەکان بشـارنەوە یان راسـتییەکان بشـێوێنن، کە ڕەنگە بۆ خەڵکیتر بەهای هەبێ.

- دروستکردنی کەشێکی ڕکابەری ڕک و کینە لەنێوان تاکەکان.

- زۆرجار خێراو هەڕەمەکییە و زوو باوەڕی پێ دەکرێ.

**دووەم: بەپێی ئامرازی وەرگرتن:**

**١- پەیوەندیکردنی بێژەیی (زارەکی):**

ئەم پەیوەندیکردنە ڕاستەوخۆ لەڕێگەی ئاخاوتن و گفتوگۆ بە هەموو شێوەکانیەوە دەبێـت، بەکارهێنانـی زمـان بـۆ پەیوەنـدی مرۆڤـەکان لـەو کاتـەوە دەسـتیپێکرد، کە کۆمەڵگاکمـان پەرەیـان سـەندو توانـای ئەوەیـان هەبووە وشـە دابڕێـژن و واتای بۆ دابنێن، بەهۆیەوە تاکەکان پەیوەندیان بە یەکتر دەکردو لە ڕێکخستنی پەیوەندییەکانیان پشـتیان بە نیشـانەکانی دەبەسـت و گوزارشـتیان لە هەسـت و نەسـتەکانیان دەکرد، شـتێکی سروشتیشـە زمـان پێـش بکـەوی وەک ئامرازێکـی نوێـی پەیوەندیکـردن لە چوارچێـوەی پەیوەندیکردنـی نابێژەیی، کە پشـتی پێ دەبەسـتێ و بۆ ڕوونکردنەوەو شـیکردنەوە، بۆنموونـە سەرڕاوەشـاندن و وتنـی وشـەی بەڵـێ هـەردوو پێکەوە بۆ گەیاندنـی پەیامێـک، هەرچەنـدە پەیوەندیکردن پشـت بـە بێژەکانی زمـان و هێماکانی دەبەستی، کەواتە پێویستە میدیاکار پەیامەکەی وا پێشکەش بکات ئەو هێمایانەی تێدا بێ کە وەرگر تێی بگات، واتە پەیامەکە بەشـێوەیەک دابڕێژرێ ئەو وشـانە بەکاربێنێ کە لای وەرگر ناسراوو باون، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە:

- وشە و دەستەواژەکان هەمان واتا بۆ نێرەرو وەرگر بگەیەنن.

- پەیامەکە تەرکیز لەسەر ئەزموونی هاوبەش بکات.

- جەماوەری جیاواز لەوانەیە پێویستی بە وشەگەلێکی جیاواز بێ.

**لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی پەیوەندیکردنی بێژەیی:**

- ئامرازێکی ڕاستەوخۆی پەیوەندیکردنە.

- نزیکی نێوان نێرەرو وەرگر.

- ئاڵوگۆڕی خێرای هزر.
- فیدباکی راستەوخۆ.
- ئاسانکردنی پرۆسەی قەناعەتپێکردن.
- رێگەی بەشداریکردنی ئامادەبووان دەدات.
- کاریگەری ٤٥٪ لەسەر وەرگر هەیە، ئەگەر هەڵچوون و چینەکانی دەنگی لەگەڵدا بوو.

بەڵام کەموکورتییەکانی ئەمانەن:
- گرانی روبەڕوبوونەوەی بەرهەڵستکاران.
- گرانی کۆنترۆڵکردنی ژمارەیەکی زۆر.
- کەمیی کات بۆ بڕیاردانی ژیرانە.
- نەبوونی بەڵگەیەکی نووسراو.

**٢- پەیوەندیکردنی نابێژەیی (نازارەکی):**

مەبەست لەو جۆرە پەیوەندیکردنانەیە کە ئاخاوتنی تێدا نییە، بەڵکو هێماو سیمبول و وێنەو نووسین و راپۆرت و یادەوەری و جوڵەی لەش و گوزارشتەکانی دەموچاوی تێدا بەکاردێ، کە هەریەکەیان واتای خۆی دەگەیەنێ لە بەکارهێنانیان هزرێک یان هەستێک یان مەرامێک بەلایەنی دووەم دەگەیەنێ، هێما یان ئاماژە زمانێکی بینراوە، ئەگەر لەگەڵ (بێژە)دا بەکار هات ئەوا کاریگەری مەزنی دەبێ. ئاماژە هەر جوڵەیەکی لەشە لە نیشانەو هێمای خۆی پێکهاتووە، چ بەدەست بێ یان راوەشاندنی سەر بێ، یان بە چاوەکان و دەم و لوت بێ، توێژینەوەکانی بواری پەیوەندیکردن ئاماژەیان بەوە داوە کە ئاماژەو نیشانەکان دەتوانن رۆڵی دووبارەکردنەوەی پەیامە بێژراوەکە ببینن، ئەویش پێی دەوترێ پەیوەندیکردنی بێژەیی بە نابێژەیی (Repetition of Verbal by Non Verbal Communication)، توێژەران دەڵێن چاو لەرێگەی جوڵە جیاوازەکانیەوە توانای زۆری هەیە لە ئاشکراکردنی ناوەوەی مرۆڤ و گەیاندنی پەیامێک، بۆنموونە چاوی کراوە رک و ترس و سەرسوڕمان دەگەیەنێ، چاوی داخراو نیشانەی خاکەڕایی و رک و کینە دەگەیەنێ، چاوێک بڕوانێتە ئاسمان

واتـای پاڕانـەوە دەگەیەنێ و، بڕاونێتە خوارەوە واتای کاریگەربوون و ملکەچکردن و گوێڕایەلی و شەرم و حەیا دەگەیەنێ و، چاوی جێگیر گوزارشت لە تکاکاری و توندی و خۆڕاگـری دەگەیەنـێ، بۆیـە وتوویانە چاو تـێ دەگات و بەچاو تێدەگەی. هەندێ لە توێژەرانیـش دەڵێن ئەو کەسـەی روو لەخـوار دەکات ئەوە گرنگی بە جەماوەر نادات و متمانەشی بەخۆی نییە.

هەروەهـا دەکـرێ پەیوەندیکردنـی نازارەکی بەچاو بێت، ئەمەش بەشـێوەو وێنەو سیمبول و دەستەواژەی جیاواز گوزارشتی لێ دەکرێ، نموونە: وێنەو فیلم و سلایدو نەخشـەو وێنەی روونکردنەوەیی و، خشـتەو پەیوەندیکردنی نازارەکی و گوزارشـتی دەم و چاوو جوڵەی لەش و شێوەی دانیشتن.

**پەیوەندیکردن بەچاو بەمانە جیا دەکرێتەوە:**

- دووپات لەسەر پەیوەندیکردنی زارەکی دەکاتەوە.
- هانی سەیرکردن دەدات.
- پەیامە نووسراوو زارەکییەکان ئاسان دەکات.
- نمایشکردنی سادەو روون تایبەت بە ژمارەکان.
- فەراهەمکردنی بەڵگەی بینینی وێنەکراو.
- کاریگەری لەسەر وەرگر دەبێت بە رێژەی ٥٥٪.

کەموورتییەکانیشی ئەمانەن:

- شیکردنەوەی بێ ئاخاوتن یان نووسین زەحمەتە.
- پێویستی بە کارامەیی تایبەت هەیە بۆ تێگەشتن و وەرگرتن.
- کاتێکی زۆری دەوێ بۆ بەرهەمهێنانی.
- خەرجی دەوێ.

**پەیوەندیکردنی نازارەکی بەمانە جیا دەکرێتەوە:**

- فەراهەمکردنی بەڵگەیەکی نووسراو.
- روونکردنەوەی هزرە تەمومژاوییەکان.
- توانای شیکردنەوە.

- توانای پوختەکردن و هەڵسەنگاندن.
- کارکردن بۆ روونکردنەوەی پەیوەندیکردنی زارەکی.
- بنچینەیەک بۆ رێککەوتەکان پێکدێنێ.
- دیاریکردنی بەرپرسیارێتی.
- نەبوونی توانا بۆ بەلاڕێدابردن.

دیارترین کەموکورتییەکانیشی ئەمانەن:

- کاتی دەوێ بۆ بەرهەمهێنانی.
- رەنگە خەرجی زۆر بوێت.
- مۆرکێکی فەرمی هەیە.
- فیدباکی راستەوخۆی نییە.
- دوای ناردنی دەستکاریکردنی زەحمەتە.
- رێگە نادات بەخێرایی بیرورا ئاڵوگۆڕ بکرێت.

**سێیەم: بەپێی شێوەی ئاراستە:**

لە میانەی ئەم ئاراستانە دەردەکەوێ:

**١- ئاسۆیی:**

لەنێوان دوو کەس یان پتر لەهەمان ئاست روودەدات، پەیوەندیکردنی لاوەکییە لەنێوان تاک و گرووپەکان لە ئاستە هاوتاکاندا روودەدات، نموونە (گەیاندنی مامۆستایان بە یەکدی)، ئەم جۆرە پەیوەندیکردنە بە پەیوەندی هەرەوەزی نێوان ئاستە جیاوازەکان بەهێز دەبێت، بەتایبەتی ئەگەر تەرکیز لەسەر ئەمانە بکات: هەماهەنگی کار، ئاڵوگۆڕی زانیاری، چارەسەری ئاریشەکان، کەمکردنەوەی ململانێکان، مامەڵەکردن و پاڵپشتیکردنی هاریکاری نێوان کارمەندان.

**٢- ستونیی بەرەو سەرەوە:**

ئەو پەیوەندیکردنانەیە لە خوارەوە بۆ سەرۆکەکان دەردەچێ، ئەنجامی جێبەجێکردنی پلانەکان و شرۆڤەکردنی کۆسپەکان و ئاستەنگەکانی بەردەم جێبەجێکردن و تێبینیەکان و بیرورا لەخۆ دەگرێ، ئەم پەیوەندیکردنانە ئامانجە

داواکراوەکان بەدی ناهێنێ، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە لەخوارەوە هەست بەبوونی پلەیەک لە متمانە بکەن لەنێوان خۆیان و سەرۆکی راستەوخۆ کە ئامادەباشی هەمیشەیی هەبێ، بۆ وەرگرتنی پێشنیارو بیروڕاکان کە ئامانجیان پەرەپێدانە، ئەم پەیوەندیکردنانە لەرێگەی سیاسەتی دەرگای کراوە لەلایەن سەرۆکەوە، هەروەها لەرێگەی سەندوقی پێشنیارەکان و شتی دیکەوە بەهێز دەبێت.

**٣- ستونیی بەرەو خوار:**

ئەو پەیوەندیکردنانەیە لەبەرزترین رێکخستنەوە هەڵدەقوڵێ بۆ خوارەوە (لە سەرۆکەوە بۆ خوارەوە)، ئامانجی گواستنەوەی فەرمان و رێنمایی و ئاراستەو بڕیارەکانە، هەمیشە بە چەندین شێوازی باوی پەیوەندیکردن دەبێ، وەکو یاداشت و گشتاندندن و بڵاونامە و دیدارە کۆمەڵییەکان، زۆرجاریش فیدباکی لەم جۆرە پەیوەندیکردنانە نزمە.

**چوارەم: بەپێی پلەی کاریگەری:**

**ا/ پەیوەندیکردنی جەماوەری:**

پەیوەندییەکی دیراسەکراوو رێکخراوە بەندە بە ناردنی پەیامی ئاشکراو نهێنی و سەرچاوەکەی دامەزراوەیەک بێ بۆ پەیوندیکردن بە جەماوەرەوەو، پەیامە میدیاییەکە لە رێگەی ئامرازێکی میدیایی میکانیکی بنێرێ، کە جیا دەکرێتەوە بە توانای کۆپیکردنی زۆر لە پەیامە رەسەنەکە بۆ دابەشکردنی بەسەر جەماوەرو گەلێ ئامانجی هەیە. ئامانجی پەیوەندیکردنی جەماوەری گواستنەوەی ناوەڕۆکی پەیامی میدیاییە لە میانەی وەڵامدانەوەی چەندین جۆرە پرسیارەوە کە ئەمانەن: چی؟ بۆ میدیا، چۆن؟ بۆ شیکردنەوە، بۆچی؟ بۆ رەخنە، لەکوێ و چۆن و کەی، جۆراوجۆرێتی لەپێناو پروپاگەندەو خۆشگوزەری.

هەروەها میدیای جەماوەری ئەم ئامانجانەی هەیە:

- گەیشتن بە سەرجەم کەرتەکانی کۆمەڵ، پەیوەندیکردن و کارتێکردنی تا دەگاتە تەواوکاری.
- یەکخستنی هەست و نەستی لە رێگەی بەشدارپێکردنی نیشتمانیانەو نەتەوەییانە،

زمانیش تاکە پێکهاتەیەکە بۆ ئەمەو ئەڵقەی بنەڕەتییە لە زنجیرە ئەڵقەکانی ئامرازەکانی پەیوەندیکردن.

ئەو هۆکارانەش کە کار لە پەیوەندیکردنی جەماوەری دەکەن ئەمانەن: شۆڕشی زانیاری و شۆڕشی پەیوەندیکردن و پروپاگەندە.

**ب/ پەیوەندیکردنی ناجەماوەری:**

جۆرێکە لەپەیوەندی بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەنێوان کەسەکان و گروپەکان بۆ ئاڵوگۆری زانیاری و هزرو هەواڵ بێ بوونی کەناڵی یان ئامرازی پەیوەندی. ئاراستەی خودی تاک دەکرێ، یان بۆ کەسێک یان کەسانێکی دیاریکراو. دەکرێ وتارو هێماو پەیوەندی تەلەفۆنی و نامەی پۆستەو هەندێ بەکارهێنانی ئینتەرنێت و نێوبەندی جۆراوجۆری کارلێککردن بگرێتەوە.

**رەگەزەکانی پەیوەندیکردن:**

پرۆسەی پەیوەندیکردن لە رەگەزگەلێک پێکدێ کە پرۆسەی پەیوەندیکردن بێ ئەم رەگەزانە پێک نایەت، کە ئەمانەن (نێرەر، پەیام، ئامراز، وەرگر، فیدباک)، بە کورتی هەریکە لەو رەگەزانە باس دەکەین:

**یەکەم: نێرەر:**

سەرچاوەی پەیامە یان خاڵی دەستپێکردنی پرۆسەی پەیوەندیکردنە، بەمەبەستی وروژاندنی رەفتاری لایەنێکی دەرەکی، نێرەر رۆڵێکی بنەڕەتی و زیندەیی دەگێڕێ، چونکە پرۆسەی پەیوەندیکردن کارلێک دەکات و دەکەوێتە بەر کاریگەری دیدو بۆچوونی نێرەر بۆ پرسەکان، لە میانەی ئەو ئیعتباراتە کەسیانەی لەڕووی رۆشنبیری و کۆمەلایەتییەوە بۆی ماوەتەوە، هەروەها لەمیانەی ئەو ئەزموون و رەفتارو پێگەیەی هەیەتی.

نێرەر بە یەکەم رەگەز لە رەگەزەکانی پرۆسەی میدیا دادەنرێ، ئەرکەکەی بریتیە لە چۆنیەتی دارشتنی ئەو پەیامەی کە بۆ خەلک ئەگوازرێتەوە، بەبێ گوێدان بە جۆرو شێوە و ئامانجە دواییەکانی پەیامەکە، پێویستە شارەزاییەکی باشی لە ناوەڕۆکی

پەیامەکـە هەبێت، بۆ سەرنجڕاکێشـانی وەرگر، بـۆ وەرگرتنـەوەی وەڵامدانەوەیەکی ئەرێنییانە لەبارەیەوە، چونکە نێرەر دەسـت بە گفتوگۆ دەکات، بە داڕشـتنی بیرۆکەی خۆی بە شێوەی کۆد کە دەربڕی ئەو ناوەڕۆکەیە کە خۆی مەبەستیەتی، ئەم کۆدانە پەیامەکـە پێـک دەهێنێت کە ئاراسـتەی وەرگرێک دەکات، ئەگەر سـەرکەوتوو بوو لە هەڵبژاردنی ئەو کۆدانەی بەشێوەیەکی راست و رەوان گوزارشت لە بیرو رای دەکات، ئەوا دەبێتە هۆی پێکانی ئامانجەکە.

یەکێـک لـە بیـردۆزە گرنگەکانـی میدیـا کـە پێـی دەوتـرێ پاسـەوانی دەرگا (the gatekeeper)، پێیوایـە نێـرەر ئەرکی دانانی بیرۆکەیە لە بۆسـەیەکداو بەکارهێنانی ئامرازەکە بۆ ناردنی بۆ جەماوەری وەرگر، مافی ئەوەشی هەیە کۆنترۆڵی بیرۆکەکەو زانیاری بکات و کاتی ناردنی یان شاردنەوەشی دەستنیشان بکات.

**هەنـدێ سـیفاتیش دەبـێ لە نێرەردا هەبـێ بۆئەوەی پەیامی میدیایی بە راسـتی و روونی بنێرێ، کە ئەمانەن:**

١. دەبێ چێژ لەوە وەربگرێ، کە متمانەی بە خوی هەیە لە ناردنی پەیامی میدیاکە.

٢. دەبێ پسـپۆر بێ لە بواری میدیاو پشـت بە مادەی زانسـتی و راهێنانی گونجاو ببەستێ.

٣. راستگۆیی و ئەمانەت و شارەزایی لەوەی دەینووسێت.

٤. کارامەیـی زمانەوانـی کـە یارمەتـی گوزراشـتکردنی راسـت لـە هزرەکانـی و نووسینی بابەتە میدیاییەکەی دەدات.

٥. توانای قەناعەتپێکردن و خستنەڕووی هەنجەت و بەڵگەی لۆژیکی.

٦. توانای سەرنجڕاکێشانی جەماوەرو دوورکەوتنەوە لە وشکی و بێزاری.

٧. بتوانێ ئامرازی پەیوەندیکردن بەشێوەی دروست بقۆزێتەوە.

لەم پرۆسەیە نێرەر ئەم کارانەی خوارەوە دەکات:

- لـە قۆناغـی دەستنیشـانکردنی بیرۆکەدا، نێـرەر ئەو بیرۆکەیـە هەڵدەبژێرێت کە ئەیـەوێ دایبڕێـژێ و رەوانەی وەرگری بکات، لەوانەیە بیرۆکەکە سیاسـی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، هونەری، وەرزشی یان زانستی بێت.

- لە قۆناغی دارشتنی بیرۆکەدا، بە شێوەی هێمای نوسراو وەک نامەی پۆستەیی، یان هێمای دەنگی وەک لە قسەکردنی ئاسایی لەگەل کەسانێتر دادەرێژرێتەوە.
- لـە قۆناغـی ناردنـدا، واتـە گواسـتنەوەی پەیام پـاش دارشـتنەوەو دڵنیابوون لە راستی و دروستی پەیامەکە لە رووی زمانەوانی و دارشتنەوە.

**دووەم: پەیام:**

بریتیە لە کۆمەڵێک مانا کە نێرەر بۆ وەرگری رەوانە دەکات، بەمەبەستی کاریگەری لەسـەر رەوشـتی وەرگر یاخود گۆڕینی. ئەو بنچینەیەی سەرچاوە دای دەرێژێ و بۆ وەرگری دەنێرێت پێی دەوترێ (پەیام)، دەبێت ئەو پەیامە ناوەرۆکی هەبێت و شـێوە کەدیدەنی گواستنەوەیە بەهۆی ئامرازێکی میدیا.

ئـەو بابەتـە یـان نـاوەڕۆک (واتـا، هزر)ەیـە، کـە نێـرەر دەخـوازێ بـۆ وەرگـری بگوازێتـەوە، هەمیشـەش بـە سـیمبولی زمانەوانـی یـان بێژەیـی یـان نابێژەیـی یـان هەردووکی پێکەوە گوزارشتی لێ دەکرێ، بەمەبەستی کارتێکردن لە رەفتاری وەرگر یان راستکردنەوەی رەفتاری، پرۆسەی تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی پەیام و پوختەکردنی ناوەڕۆکەکەی هەنگاوێکی گرنگە لە پەیوەندیکردن، لەبەرئەوە پێویسـت ناکات لەسـەر مرۆڤ تەنها راستی و هزرو پەندەکان بگوازێتەوە، بەڵکو پێویستە گرنگیش بە سۆزو هیواو مەترسـی و دەسـتکەوتەکانی و، خۆشەویسـتی و دڵەڕاوکێ و شکسـتییەکانی بدات.

سەرچاوە ئەو مانایانە دادەنێت بۆ بەشداری کردنی کەسانیتر لەگەڵی بۆ دروست کردنـی ئەو شـتانەی بۆیان دەگوازێتـەوە، واتە ئەو هێمایانە کـە لەناو دادەنرێ وەکو هێمـاو وشـەو وێنـە و نەخشـە یاخـود دەنـگ و هـی تر لـەو هێمایانەی کە بـە زمانی وتـن پێـی دەوتـرێ ( Verbal language) و بـە زمانی نا وتەیـی (Non -Verbal language).

**سێیەم: ئامراز:**

ئـەو رێـگا یـان کەناڵەیـە کـە پەیامەکـە لـە میانەیـەوە لـە نێـرەرەوە بـۆ وەرگـر دەگوازرێتەوە، ئەویش ئامرازی بیسـتراو یان خوێندراو یان نووسـراو یان بینراو یان

نابیژەییە.

جۆری ئامرازەکان بەگوێرەی قەبارەی وەرگرەکان دەگۆڕێت، چونکە هەندێ ئامراز هەیە بۆ میدیای کەسی یان کۆمەڵی یان ناوەندی و جەماوەری بەکاردێت، ئامرازی وا داهێنراوە بۆ دۆزینەوەی جۆری تر لە میدیا، نەک میدیای ڕوبەڕوو، ئەویش میدیای نا ڕوبەڕووە، بەم شێوەیە:

**- ئامرازی زارەکی:**

ئەو ئامرازانەیە بە هۆیەوە زانیاری لەنێوان پەیوەندکارو پێگەیەنراو بە شێوەی زارەکی ئاڵوگۆڕ دەکرێ، لە ڕێگەی وشەی دانپێنراو نەک نووسراو وەک (چاوپێکەوتنە کەسییەکان، ئاخاوتن بە تەلەفۆن، کۆڕو کۆبوونەوەکان و کۆنگرەکان)، ئەم شێوازە بە کورتترین ڕێگا بۆ ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و هزر دادەنرێ و لە هەموویان ئاسانترو ڕاشکاوانەترە، بەڵام کەم و کورتییەکەی لەوەدایە بۆ شێواندن و بەدحاڵیبوون زانیاری دەخاتەڕوو.

**- ئامرازی نووسینکاری:**

ئەو ئامرازانەیە بە هۆیەوە زانیاری لە نێوان پەیوەندکارو پێگەیەنراو لە ڕێگەی وشەی نووسراو وەکو (سیستم و بڵاونامەو ڕاپۆرت و گشتاندن و یاداشت و پێشنیارو سکاڵاکان) ئاڵوگۆڕ دەکرێ، ئەم شێوازە لە زۆربەی ڕێکخراوە حکومییەکان کاری پێ کراوە، پەیامی نووسراو پێنج مەرجی لەخۆ گرتووە، کە هەموویان بە پیتی (C) دەست پێدەکات، ئەوانیش ئەمانەن: تەواوکار (Complete)، کورتکراو (Concise)، ڕوون (Clear)، ڕاست (Correct)، جوان (Courteous).

ئامرازەکانی نووسینکارییش چەندین جیاکەرەوەی هەیە: پاراستن و توانای گەڕاندنەوە بۆی و پاراستنی زانیارییەکان لە شێواندن، هەروەها کەمی تێچوونی، بەڵام گرنگترین کەموکورتییەکانی: سستی لە پەیوەندیکردنی زانیاری، ئەگەری خراپ تێگەیشتن بەتایبەتیش ئەگەر وشەکە پتر لە واتایەکی هەبێ.

**- ئامرازی نابیژەیی:**

ئەو ئامرازانەیە بەهۆیەوە زانیاری لەنێوان پەیوەندکارو پێگەیەنەر لەڕێگەی

نیشـانەو هێمـاو ڕەفتـار (گوزارشـتی دەموچـاوو جوڵـەی چـاوو دەسـت و شـێوەی دانیشتن) دەگوازێتەوە، پێشی دەوترێ زمانی جەستە (body language)، لەوانەشە ئەم ئاماژە پێدانانە بەمەبەسـت بێ یان بێ مەبەسـت لە سەرچاوەی پەیوەندیکردنەوە، ڕێژەی بەکارهێنانیشـی لە پەیوەندیکردن دەگاتـە نزیکەی ٩٠٪ی واتاکان، بەتایبەتیش لەو پەیامانەی کە بە هەستەکانەوە پەیوەندن، جیاوازی تێگەیشتن لە پەیامە نابێژەیەکان بەهۆی جیاوازی کلتوورەکانەوەیە لەناو ڕێکخراوەکە هەروەها لەناو کۆمەڵگاش.

**لەم بارەیەوە پۆلێنێکی تریش هەیە، بەم شێوەیە:**

- ئامرازی میدیای کەسی، وەک ( مۆبایل، تەلەفۆن، نامە).
- ئامـرازی میدیـای کۆمەڵیـی، وەک (مایکـی دەنـگ، کۆنفراسـەکان، ئینتەرنێت، بڵاوکراوەی قوتابخانەکان)
- ئامرازی میدیای ناوەندی، وەک (ئێستگە ناوخۆییەکان، بڵاوکراوەکان).
- ئامـرازی میدیـای جەمـاوەری، وەک (ڕۆژنامـە، گۆڤار، ڕۆژنامـەی ئەلیکترۆنی، رادیۆ، تەلەڤزیۆن).

**چوارەم: وەرگر:**

ئـەو لایـەن یان کەسـەیە کـە پەیامەکەی ئاراسـتە دەکـرێ و، لەمیانـەی یەکێک لە هەسـتەوەرەکانی یـان هەمـوو هەسـتەوەرە جیاوازەکانـی (بیسـتن، بینیـن، بۆنکردن، تامکـردن، بەرکەوتـن) وەریدەگـرێ، پاشـان سـیمبولەکانی شـی دەکاتـەوەو هەوڵـی درککردنـی واتاکانـی دەدات، هەر ئەویشـە پرۆسـەی پەیوەندیکردن دەیـەوێ بیگاتێ و کاری تـێ بـکات، هەروەهـا ئەویـش بە بەشـداری کردن و کارلێک کـردن کاری تێ دەکات.

پەیوەندیکـردن پرۆسـەیەکی خـاوەن ئامانجـە، کـە لـە ئامانجێکـی دیاریکـراوەوە دروسـت دەبـێ ئەویـش پەیوەندیکردنـی پەیامەکەیـە بـۆ وەرگر، بۆئـەوەی کاری تێ بکات و پاڵی پێوە بنێت بەشـداری تێدا بکات و لەگەڵیدا کارلێک بکات، ئەگەر بە رازی بـوون بـێ یان ناڕەزایی، دەسـتپێکردنی پەیوەندیکردن بە ناسـینی وەرگر کە مامەڵەو پەیوەندی پێوە دەکرێ دەسـت پێدەکات، وەک ناسـینی بۆچوونەکانی، ئارەزووەکانی،

پێویستییەکانی و ڕەچاوی هەڵچوونەکانی.

**قۆناغەکانی وەرگرتنی پەیامیش بەم شێوەیەیە:**

١- لـە قۆناغـی وەرگرتنـی پەیام وەرگـر پەیامێکی دەنگیی، نووسـراو یان هێمایی وەردەگرێت.

٢- لـە قۆناغـی کردنەوەی کۆدەکاندا، وەرگر هێماکانی پەیامەکە شـی دەکاتەوە لە ڕێگای گۆڕینی هێماکان (وشە) بۆ بیرۆکە، چونکە وشـەکان ئامرازێکن بۆ گواستنەوەی بیرۆکە.

٣- لـە هەڵوێسـت وەرگرتـن لەبـارەی پەیـام، وەرگـر هەڵوێسـتی خـۆی لەبارەی پەیامەکە بەهۆی چوار هۆکارەوە دەستنیشـان دەکات، ئەوانیش:

- باوەڕبوون بەو بیرۆکەیەی وەری دەگرێ.
- نەبوونی باوەڕ بەو بیرۆکەیەی وەری دەگرێ.
- گوێ نەدان بەو بیرۆکەیەی وەری دەگرێ.
- خستنەسەری بیرۆکەکە بۆ گەنجینەی خۆی.

**پێنجەم: فیدباک (بەرسڤدانەوە):**

بریتییـە لـە دووبارە ناردنـەوەی پەیامەکە لە وەرگرەوە بۆ نێرەرو ڕادەسـتکردنی و دڵنیابوونـەوە لـە تێگەیشـتنی، نێرەریـش لـەم دۆخـەدا سـەرنجی ڕەزامەنـدی یـان ناڕەزامەنـدی لەسـەر ناوەڕۆکـی پەیامەکە دەدات، هەروەهـا زوو ڕوودانی فیدباک بە جیاوازی هەڵوێسـت دەگۆڕێ، بۆ نموونە لە گفتوگۆی کەسـیی دەرەنجامی کاردانەوە لەهەمـان کات دێتـە دەسـت، لەکاتێکـدا کاردانـەوەی هەڵمەتێکی ڕێکلامـی لەوانەیـە ڕوونەدات دوای ماوەیەکی درێژ نەبێت.

پرۆسـەی پێوانەکردنـی کاردانـەوە لە پرۆسـەی پەیوەندیکردن گرنگـە لەو کاتەدا دەردەکەوێ ئەگەر پرۆسـەی پەیوەندیکردن بە ڕێگایەکی سـەرکەوتوو بەڕێوەبچێ لە سـەرجەم قۆناغەکانی یان نا، هەروەها کاردانەوە نیشـانەی گۆڕانە بەهۆی پرۆسـەی پەیوەندیکردن جا لەسەر ئاستی تاک بێ یان لەسەر ئاستی سەرچاوەکەی.

**ئەم شێوەیەش ڕەگەزەکانی پرۆسەی پەیوەندیکردن دەردەخات:**

لەبەرئەوەی پرۆسەی پەیوەندیکردن بەپێی دابەشکردنەکەی پێشووی رەگەزەکانی پەیوەندیکردن نابێ، بەڵکو تەنها بەمەبەستی توێژینەوەی تیۆرییە، بۆیە پەرە بە چەند نموونەیەک دراوە بۆ روونکردنەوەی هەنگاوەکانی پەیوەندیکردن، رەگەزەی دیکەش هێنرایە ئاراوە -هەرچەندە پشتی بە رەگەزەکانی پێشتر بەستووە- لە بەناوبانگترین ئەو نموونانەش نموونەی (دیفز ١٩٩٧)ە، کە پرۆسەی پەیوەندیکردن بۆ شەش هەنگاوی یەک لەدوای یەک دابەش دەکات، کە ئەمانەن: دروستبوونی بیرۆکەیەک لای نێرەر، پاشان کردنی بیرۆکەکە بە سیمبول، ئەوجا گواستنەوەی پەیامەکە لە میانەی کەناڵی پەیوەندیکردن، پاشان رادەستکردنی پەیامەکە، ئەوجا شیکردنەوەی سیمبولەکان و کردنی بە پەیام جارێکی دیکە، پاشان ئەنجامدانی کارێک یان هەر رەفتارێک.

**چوار جۆر فیدباک هەیە کە بریتیە لە:**

**١- دەنگدانەوەی نووسراوو بیستراو:**

دەنگدانەوەی نووسراو کاتێک دەبێت، بە رێگای نووسینی نامەیەک کە ئەنووسرێت بەهۆی ئامرازێکی نووسین، بەڵام دەنگدانەوەی بیستراو دەبێت بەبەکارهێنانی هێمای بیستراو.

**٢- دەنگدانەوەی بێ دەنگ و روون:**

دەنگدانەوەی بێ دەنگ کاتی پەیدا دەبێ ئەگەر وەرگر هەست بە پەیامەکە بکات بەڵام دەری نەبڕێت، بەڵام ئەگەر دەریبڕی ئەوا دەنگدانەوەی روونە.

**٣- دەنگدانەوەی ئێستاو دەنگدانەوەی دواخراو:**

دەنگدانەوەی ئێستا کاتێک پەیدا دەبێت کە وەرگر پەیامەکە وەردەگرێ و یەکسەر دەنگدانەوەی بۆ پەیامەکە دەبێت. بەڵام ئەگەر یەکسەر دەنگدانەوەی نەبوو بۆ پەیامەکە بە هەر هۆیەک بێت، ئەوا دەنگدانەوەکە دواخراوە.

**٤- دەنگدانەوەی ئەرێنی و نەرێنی:**

دەنگدانەوە ئەرێنی دەبێ لەبارەی پەیامێک ئەگەر وەرگر پەیامەکە بە سینگێکی فراوان وەربگرێ، بەڵام ئەگەر بە نارەحەتی وەری بگرێت ئەوا دەنگدانەوەکە نەرێنی دەبێت.

**بیردۆزەکانی پەیوەندیکردن:**

بیردۆزەکانی پەیوەندیکردن کە پەیوەندییان بە میدیاوە هەیە، بە کورتی باسیان دەکەین:

### یەکەم: بیردۆزی کاریگەری راستەوخۆ:

(هارۆلد لاسویل) ئاماژەی بەم بیردۆزە داوەو بە بیردۆزی فیشەکی جادوویی یان فاکسینی ژێر پێست ناوزەدی کردووە، ئەم بیردۆزە پێیوایە کەسەکان تەنها کۆمەڵگەیەکی جەماوەرین لە کۆمەڵێک کەسانی گۆشەگیر پێکهاتوون (بە بیرۆدزی فرۆید کاریگەر بووە). ئامرازەکانی میدیا سەرچاوەگەلی بەهێز دەنوێنێ بۆ کاریگەری و، خەڵکیش پەسندی دەکەن و وەکویەک تێی دەگەن، هەر کەسێکیش بە شێوەی تاکێتی زانیاری وەردەگرێ، بەشێوەی تاکێتیش وەڵام دەداتەوە، ئەو ئەگەرەش کە دەڵێ میدیا کاریگەری بەهێزو لەپڕە، گرنگییەکەی لەوەدایە کە سەرەتای توێژینەوەی کاریگەری میدیا بووە.

### دووەم: بیردۆزەکانی کارتێکردنی بژارخوازی:

پەرەسەندنی زانستە مرۆییەکان سەلماندی کە ئامرازەکانی میدیا بەشێکی سادەیە لە گشت کۆمەڵگا، تاک پێش ئەوەی بگاتە ئەم ئامرازانە روبەڕووی کاریگەری هۆکارگەلێکی دیکە دەبێتەوە کە بە نەشونماکردنی کۆمەڵایەتییەوە پەیوەستە. ئەم بیرۆکەیە لەمیانەی توێژینەوەکانی (میلفن دفلر) و (روکچی) هاوڕێی بەرجەستە بووە، لەسەر بنەمای ئەو بیرۆکەیە کە لە وزەی تاکدا نییە بتوانێ ئەو هەموو پەیامە کە رۆژانە دەیگاتێ وەربگرێ، ئەو درک بەو هەمووە ناکات کە دەیگاتێ، بەڵکو بیرکردنەوەی دەکەوێتە سەر درککردن و تێگەیشتنی ئەو پەیامانەی کە ئەو چەمکانە لەخۆ دەگرێ کە بەلایەوە گرنگە یان بەلایەنی کەمەوە پێویستی پێیەتی.

بابەتەکان بەسەر وەرگردا ناسەپێنرێ بەڵکو ئەوە هەڵدەبژێرێ کە دەیەوێ و واز لەوەش دێنێ کە پێویستی پێ نییە، ئەم بیردۆزە لەمیانەی چەند چەمکێکەوە بەرجەستە دەبێ، کە ئەمانەن:

* وەرگرتنی بژارخوازی: ئاماژە بە سەربەستی وەرگرو ئەوەی دەیگاتێ دەدات، ئەو خۆی لە هەموو ئەو پەیامانە نادات کە لە ڕێگەی کەناڵەکانەوە پەخش دەکرێ، بەڵکو گرنگی بە هەندێکی دەدات و هەندێکی دیکەی فەرامۆش دەکات.

* درککردنی بژارخوازی: ئەم ڕەگەزە بەو بابەتانەوە بەستراوە کە مرۆڤ گرنگی پێ داوە، ئەو درک بە هەموو شتێک ناکات کە دێتە پێشی، بەڵکو درککردنی بۆ هەندێ بابەتە کە خۆی هەڵیبژاردووەو دەیەوێ بیبینێ.

* وەبیرهاتنەوەی بژارخوازی (التذكر الانتقائي): تاک بۆ تەرکیزکردنی لەسەر هەندێ درککردنەکانی بۆئەوەی لەیادی بێ و پارێزراو بێت، کار دەکات، بۆئەوەی کەی پێویستی پێ بوو بەکاری بێنێ.

* هەڵسوکەوتی بژارخوازی: دوا ڕەگەزە لە ڕەگەزەکانی بیردۆزی بژارخوازی، مانای ئەوە دەگەیەنێ کە پرۆسەی کردار دەکەوێتە ئەستۆی وەرگر لەگەڵ سەربەستکردنی لە چۆنێتی هەڵسوکەوتکردن.

**لە گرنگترین بیردۆزەکانی کاریگەری بژارخوازی:**

**أ. بیردۆزی جیاتاکی (نظرية الاختلافات الفردية):**

بە سادەو ساکاری پێیوایە کەسانی جیاواز بەشێوەی جیاواز کاردانەوەیان بۆ پەیامە میدیایەکان دەبێ، بەپێی بۆچوونەکانیان و بونیادی دەروونیان و سیفاتی بۆماوەییان یان دەردەستیان، ئامرازەکانی میدیا بەشێوەی بژارخوازی وەردەگرێ و شی دەکاتەوە، ئەمیش بەهۆی جیاوازی ئەو درککردنەی کە هەر کەسێک پێی بیر دەکاتەوە، هەروەها جیاوازی سیستمی هەر کەسێک لە بیروباوەڕو بەهاو بۆچوونەکان، لەبەر ئەوەش کە درککردن کارێکی بژارخوازییە، کەواتە وەبیرهاتنەوەو وەڵامدانەوەش بژارخوازین، پاشان کاریگەری ئامرازەکانی میدیا وەکو یەک نین.

**ب. بیردۆزی توێژە کۆمەڵایەتییەکان:**

خەڵک بۆ توێژە کۆمەڵایەتییەکان دابەش دەبێ و ڕەفتاری پەیوەندییش لەناو هەر توێژێک هاوشێوەیە، پێگەی تاکیش لە بونیادی کۆمەڵایەتی کارلە شێوەی وەرگرتنی دەکات، توێژیش لەسەر ئەم بنەمایانە دیاری دەکرێت: تەمەن، ڕەگەز، داهات،

خوێندەواری، پیشـە. چەشنەکانی بەرسـڤدانەوە لەناو هەر توێژێک هاوشێوەیە، لەبەر ئـەوە کاریگـەری ئامرازەکانی میدیا بەهێز نییە، وەک یەکیش نین، بەڵام بە کاریگەری توێژە کۆمەڵایەتییەکان جیاواز دەبێت.

ئـەم بیـرۆدزە هەروەهـا لـە شـیمانەیەکی بنەڕەتییـەوە سـەرچاوە دەگـرێ کە بە سروشتی مرۆڤەوە پەیوەندە، ئەمیش بە سروشت بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، کە مەیلی کۆبوونـەوەی لەگـەڵ رەگەزی خۆی هەیەو لەژێر چەتـری کۆمەڵی مرۆیی دیاریکراو دەگوزەرێنـێ، کە لەگەڵ پێویسـتی و پاڵنەرەکانی و بۆچوونە دەورنییەکانی گونجاوە. تـاک لـەو روانگەیـەوە ناتوانـێ بەتەنها بژی کە توانـای دابینکردنی پێویسـتییەکانی و هەمەچەشنێتی بە تەنها نییە، بۆ نموونە ناتوانێ بەرهەمهێن و بازاڕکارو بەکاربەر بێ لەهەمـان کاتـدا، ئەگـەر بەرهەمهێن بێ ئەوا پێویسـتی بە کەسـێکە پەیامی میدیایی بۆ دیزاین بکات.

هەروەهـا گرووپەکان سروشـتیان هەرچییـەک بێ ناتوانن سـەقامگیری خۆیان و بەردەوامیان هەروا کوێرانە بپارێزن، بەڵکو پێویستە کۆمەڵی یاساو رێسای باو دابنێ کە سەرجەم تاکەکانی پێی ئاشنان، ئەم بیردۆزە لەسەر بیرۆکەیەکی بنەڕەتی دانراوە ئەویش ئەوەیە، تاکەکانی ناو کۆمەڵگە مرۆییەکان رێسـایەکی سیستماتیکی دیاریکراو رێکیـان دەخـات، کـە تاکەکانـی لێـی تـێ دەگـەن و لەسـەر بنەماکەی مامەڵـە دەکەن، هەروەهـا بـواری زیاتریـان بۆ دەڕەخسـێنێ کـە رۆڵ و ئەرک و مافـی خۆیان و ئەو رەفتـارەی پێویسـتە پەیـڕەوی بکـەن تێ بگـەن، ئەم رێسـا سیسـتماتیکانە ئەوەیە کە دەبێتـە هـۆی نموونـەی دیاریکراوی رەفتار، کـە پێکەوە پێیان دەوترێ سیسـتماتیکی کۆمەڵایەتی، واتە رێکخستنی رەفتاری کۆمەڵایەتی تاک.

**ج. بیردۆزی پەیوەندی کۆمەڵایەتی:**

جەمـاوەری ئامرازەکانـی میدیـا تەنهـا تاکی گۆشـەگیر نیـن، یـان تاکگەلێک بن لە چەنـد توێژێکـی کۆمەڵایەتـی کۆبووبنـەوە، بـەڵام لەشـێوەی یەکێتی و خێـزان و یانە بەیەکتر بەسـتراون، توێژینەوەکانی سەر هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکا ساڵی ١٩٤٠ دووپاتـی دەکەنـەوە، گفتوگـۆ سیاسـیەکان کاریگـەری گەورەتـری لـە رادیۆو

ڕۆژنامەوانی بەسەر بڕیارەکانی خەڵکەوە هەبووە. ئەوانەی زیاتر ڕووبەڕووی ئامرازی میدیا دەبنەوە لەوانەیە بەلای کەمەوە لەکەمترین ڕووبەڕووبوونەوەدا کاریان تێ بکرێ، پەیوەندییەکانیش دەبێ لەبەرچاو بگیرێن.

ئەم بیردۆزە لەو ئەگەرە سەرچاوە دەگرێ کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تاکەکانی ناو یەک کۆمەڵ، یان تەنانەت لەنێوان چەندین کۆمەڵی بنەڕەتی بایەخی هەبێ لە مامەڵکردنی تاک لەگەڵ پەیامەکانی میدیادا، ئەم پەیامانە لە ڕێگەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان تێدەپەڕێ، بۆئەوەی بەشێوەیەکی ڕوون بگاتە ئەو ڕادەیەی تاک درکی پێ بکات. هەروەها بایەخی ئەم بیردۆزە شان بە شانی بایەخی لە پەیوەندی سیاسی لە بایەخی بازرگانی دەردەکەوێ، تاک پێش ئەوەی بەرهەمهێنێک هەڵبژێرێ ڕاوێژکاری تاکەکانی کۆمەڵەکەی دەکات، ماقوڵیش نییە تاک کوێرانە بڕیاری کۆتایی بدات کە زۆر لەسەری بکەوێ و پەشیمانی بکێشێ.

**سێیەم: بیردۆزەکانی کارتێکردنی ناڕاستەوخۆ:**

**ا. بیردۆزی کاریگەری پشتبەستوو بە پێشکەشکردنی نموونە:**

ئەم بیردۆزە پێیوایە گەیشتنی مرۆڤ بە نموونەگەلێکی ڕەفتار کە ئامرازەکانی پەیوەندیکردن دەیخەنەڕوو، سەرچاوەیەک لە سەرچاوەکانی فێربوونی کۆمەڵایەتی پێشکەشی تاک دەکات، کە پاڵی پێوە دەنێ لە ڕەفتاری ڕۆژانەی پەیڕەوی ئەو نموونانەی ڕەفتار بکات.

**ب. بیردۆزی واتا:**

دەشێ ئامرازەکانی میدیا واتاگەلێکی نوێ پێشکەش بە وشەکانی زمان بکەن، هەروەها توخمی نوێ بخەنە سەر واتا کۆنەکان، لەبەرئەوەشە هۆکارێکی یەکلاکەرەوەیە لە درککردن و شرۆڤەکردن و بڕیارەکان، ئەوا ئامرازەکانی میدیا ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی دەبێ لە پێکهێنانی ڕەفتار بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ (شۆڕش-نسکۆ).

### ج. نموونەی پێویستی و تێرکردن:

ئــەم بیردۆزە بەشــێکی گرنگە لە بەکارهێنانــی ئامرازەکانی میدیا لەلایەن خەڵکەوە بەئاراســتەی بەدیهێنانــی ئامانجگەلێکــی دیاریکــراوی تاکــەکان، ئــەوان ئامرازگەلێکــی دیاریکراوی میدیا بۆ تێرکردنی پێویســتییەکانیان هەڵدەبژێرن، هەروەک (مارک لیفی) دەڵێ «پێنج ئامانجی لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا لەلایەن خەڵکەوە هەیە، ئەوانیش چاودێریکردنی ژینگە، ئاراستەی ماریفی، ناڕەزایی، ئاراستەی سۆزی، کاتگوزەرییە».

### چوارەم: بیردۆزەکانی پەیوەندیکردنی قەناعەتپێکردن:

پەیوەندیکردنی قەناعەتپێکردن لە بۆشاییەوە سەرچاوە ناگرێ، بەڵکو لە ڕێسایەکی بیردۆزییەوەیە، کە لەمیانەی چەندین بیردۆزەوە بەرجەستە دەبێ ئەمانیش گرنگترین بیردۆزی پەیوەندیکردنی قەناعەتپێکردنە:

#### ١- بیردۆزی سێ (ت)ەکە:

بــە تێڕوانینــی میشــال لونــد (michel le nid) پەیوەندیکردنــی قەناعەتخــوازی و کاریگەری لەســەر رەفتاری تاکەکان، بە ســێ قۆناغ دەبێ ئەوانیش: هۆشــیارکردنەوە، بە یاســاکردن و بەدواداچوون یان چاودێریکردنە، کە هەموویان بە پیتی (ت) دەســت پێ دەکەن و ناوەکەشی هەر لەوەوە هاتووە.

قۆناغی یەکەم: بریتییە لە هۆشــیارکردنەوە، میکانیزمی قەناعەتپێکردن بە زمان و روونکردنــەوە لەخۆدەگرێ، پاڵپشــتیکردنی ئەمانەش هەمــووی بە بەڵگەی قەناعەتکەر دەبــێ کــە دەڕژێتە ناو ئــاوەزی وەرگرانەوە، مەرجــی زانیارییەکانی نێرەریش ئەوەیە ســادە بێ، بۆئەوەی تێگەیشــتن و درککردنی ئاســان بێ، هەروەها مەرجی دیکەشــی ئەوەیە ناکۆک نەبێ بۆئەوەی راســتگۆیی بەرجەســتە بێ، پێویستیشــە داڕشتنی پەیام و دیاریکردنی تەوەرەکانی بەشێوەیەکی روون بێ بۆئەوەی زیاتر قەناعەتکەر بێ، کە پێویستە وەرگر لێی تێ بگات بێ ئەوەی پێویستی بە هەوڵی زیاتر بێ.

قۆناغــی دووەم: بریتییــە لــە یاســادانان، بایەخی ئــەم قۆناغە لە هەڵمەتــە میدیاییە گشــتییەکان دەردەکــەوێ، بــەڵام لــە پەیوەندیکردنــی میدیایــی کاریگــەر نییــە، ئــەو

درککردنەمـان پـێ دەبەخشـێ کـە هۆشـیارکردنەوە مەبەسـتەکە بە تـەواوی ناپێکێ، مەترسـییەکانی بابەتەکە سوودەکانیشـی دەردەخات، بەڵام یاسادانان رۆڵێکی ئیجابی لـە پەیرەوکردنـی جۆرە فشـارێک بۆ سـەر وەرگر دەگێڕێ لەپێناو رۆیشـتنی، لەتەک نێرەر لەوەی بانگەشەی بۆ دەکات.

قۆناغـی سـێیەم: قۆناغـی بەدواداچوونە، پێویسـتە نێـرەر بزانێ گەیشـتۆتە کوێی ئامانجەکانی، بە رای (میشال لونی) سەرکەوتنی پرۆسەی قەناعەتکردن و کاریگەرێتی، بە بەدواداچوون و چاودێری پرۆسـەکە بەگشـتی بەسـتراوە، چونکە مرۆڤ پێویستی بـە وەبیرهاتنـەوەو دووپاتکردنـەوەی بەردەوام هەیـە، تەنانەت لە کاروباری سـادەو ساکاری رۆژانەیدا.

**٢. بیردۆزی لێک دابڕانی زانین:**

ئـەم بیـردۆزە لیـون فسـتنگەر (leon festinjer١٩٦٢) ئامـاژەی پـێ داوە، لـەو بیرۆکەیـەوە سـەرچاوە دەگـرێ کە مـرۆڤ قەوارەیەکـی دەروونییە، هەمیشـە هەوڵ بـۆ گونجاندنـی هەڵوێسـتەکانی و بیروڕاکانی و ئەو بابەتانە دەدات کە لە کەسـێتی و بونیـادی دەروونـی یەک دەگرێتەوە، بیردۆزی لێکدابڕانـی کۆمەڵایەتی لەو ئامانجەوە سـەرچاوە دەگرێ کە مرۆڤ بەرهەڵسـتکاری و روبەڕووی هەموو شـتێک دەبێتەوە، کە بەرەنگاری بونیاتی زانینی دەبێتەوە.

ئـەم بیـردۆزە تەرکیـز لەسـەر هەوڵ و تێکۆشـانی تـاک دەکات لەپێناو پاراسـتنی هاوسـەنگی دەروونـی لەمیانـەی ئـەم توخمانـە کە گونجاوتر بـن، لێکدابـڕان (التنافر) دۆخێکـە لـە دۆخەکانـی پاڵنەرێتی، پاڵ بە مرۆڤـەوە دەنێ رەفتارو بیـروڕای بگۆڕێ، بەپێی ئەم بیردۆزە سێ جۆر پەیوەندی لەنێوان توخمەکانی زانین هەیە:

ا. پەیوەندی گونجاندن لەنێوان ئەم توخمانە.

ب. لەوانەیە پەیوەندی گونجاندن لەنێوان ئەم توخمانەدا نەبێ.

ج. لەوانەیە پەیوەندی ناکۆکی و بەرهەڵستکاری لەنێوان ئەم توخمانەدا هەبێ.

لـەم دۆخـەی دوایـدا (ج) تـاک ناچار دەبێ ئـەو ناکۆکییە رەت بکاتـەوە یان کەمی بکاتەوە، ئەویش یان بە پشتبەستن بە توخمێکی نوێ و دەستبەرداربوون لە کۆنەکە،

یان لەرێگەی خولّقاندنی جۆرێک لە خۆگونجاندن، یان بەرەنگاربوونەی ئەو توخمەی هاتۆتە ناوەوە، لە رێگەی فەرامۆشکردن یان غافڵبوون لە سەرچاوەکەی یان پۆلێنکردنی لە چوارچێوەی توخمە نالۆژیکییەکان، کە ناکرێ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ یان تەنانەت بیریشی لێ بکرێتەوە.

لەم چوارچێوەیەدا (لیون فستنگەر) سێ نموونە دەبینێ کە ناکۆکی زانین لە روونترین وێنەیدا دەردەکەوێ، ئەوانیش بڕیاردان، کاریگەری درۆو ئیغرابوونە:

**• بڕیاردان:**

بژارکاری مرۆڤ لەنێوان دوو شت ناچاری دەکات کە واز لە جێگرەوە (بدیل) یکیان بێنێ، بەڵام دوای بڕیاردانەکە هەندێ تایبەتمەندی باش لە جێگرەوە دەست لێ هەڵگرتووەکە دەبینێ، لە هۆکاری لێکدابڕانی زانینی و زاڵبوون بەسەر ئەو بەرهەڵستکارییە یان کەمکردنەوە لێی لەبەردەم تاکدا دوو چارەسەر هەیە: یان ئەوەتا تاک قەناعەت بە خۆی بکات کە جێگرەوەی وازلێهێنراو سەرنجڕاکێش نییە و، تایبەتمەندییەکانی جێگرەوەی هەڵبژێردراو هێزی کاریگەری لەسەر بڕیاری نییە، یان پەنا بۆ پاساودانەوەی هەڵبژاردنەکەی دەبات، لەمیانەی رەخساندنی کۆمەڵێ هۆکار کە لایەنگیری دەکات، وەکو زێدەڕۆیی لە وەسفکردنی تایبەتمەندییەکانی جێگرەوەی هەڵبژێردراو.

**• کاریگەری درۆ:**

ناکۆکی لێرەدا دەردەکەوێ، ئەگەر تاک بەپێچەوانەی ئەو توخم و هەڵوێستانە کە باوەری پێیەتی رەفتار بکات و، هێزی لێکدابڕان لەسەر دوو توخم بەندە ئەوانیش: قسەو بڕیاری چەند ناکۆک بن لەگەڵ باوەڕی کەسیی جیابوونەوە زیاتر دەبێ، یان هێزی لێکدابڕان کەم بۆوە تاک هەوڵی پاساودانی دەدات سەرەڕای بەرهەڵستکاری ناوەوەی لەگەڵیدا.

**• کاریگەری ئیغرابوون:**

لەم بارەدا مەیلێکی ناوەکی لای تاک پەیدا دەبێ بۆ بەدەستهێنانی یان ئەنجامدانی شتێک پێچەوانەی باوەڕی بێ، لێرەدا هۆکاری لێکدابڕان زۆر دەبێ، وەک ئەوەی

دوورەدەست بێ یان پێچەوانەی راشکاوانەی بیروباوەڕی یان نایاسایی بێ، یان لە کێشەگەلێکی بێ کۆتایی هەڵیقورتێنێ.

### ٣. بیردۆزی شیکردنەوەی زانینیانەی میدیا:

ئەم بیردۆزە لەوەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ کە مرۆڤ بوونەوەرێکی ئاوەزمەندە، کە ئاوەز خۆڕسکانە بیر لە هەر توخمێکی نوێ دەکاتەوە بە دانانی لە تەرازووی لۆژیک و باوەڕ لەمیانەی شیکردنەوەی بەخشراوەکان (المعطيات) و، ئەو زانیاریانەی کە توخمە نوێیەکەی پێکهێناوە بۆ زانینی رادەی هێزی و لۆژیکێتی و، گونجاندنی لەگەڵ ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژی.

«مارتن فیشباین» ئاماژەی بەم بیردۆزە داوە کە جەخت لەسەر هۆکاری زانین دەکات لە پرۆسەی قەناعەتپێکردن و گۆڕینی بۆچوونەکان و راستکردنەوەی، زانیارییە پێکهێنەرەکانی توخمی نوێیە، کە دەگاتە درککردنی وەرگر پاڵی پێوە دەنێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا، یان رەتکردنەوەی.

### ٤. بیردۆزی هاوسەنگی زانین:

ئەم بیرۆزە ئاماژە بە چەمکێکی بنەڕەتی دەدات کە پێویستی مرۆیی پێکدێنێ، بەوپێیەی کەسێتییەکی لێکدراوە لە رێکخستنی کۆمەڵێ لێکدراو، کە جۆرێک لە هاوسەنگی بەسەر تاکدا دەسەپێنێ بۆئەوەی ژیانێکی سروشتیانە بگوزەرێنێ، کە هاوسەنگیی لەگەڵیدا ببێتە پێویستییەکی دەروونی و داخوازییەکی بایەخدار، تاکیش هەوڵی پاراستنی دەدات و تەنانەت دۆزینەوەی ئەگەر لەدەستی دا.

خاوەنی ئەم بیردۆزە «هەیدەر فریتز» پێیوایە چەمکی دۆخی هاوسەنگبوون بوونی هەڵوێستگەلێکی دیاریکراوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاک بەبێ فشار درکی پێ بکات بۆئەوەی هاوسەنگی و گونجاندن لەنێوان پێکهاتەکانی کەسێتیدا بخوڵقێنێ، واتە هاوسەنگی لەنێوان ئاستی ناوەوەی و رەفتاری دەرەوەی. (هەیدەر) لە میانەی بیردۆزەکەیدا تەرکیز لەسەر دوو جۆر لە پەیوەندی نێوان خەڵک و شتەکان دەکات:

- ئەو پەیوەندیانەی بە هەست و نەستەوە پەیوەندن: ئەنجامی ئەو شێوازەیە کە هەستی پێ دەکەین و پێی هەڵدەسنگێنین، هەروەها هەست و نەستەکانی خۆشەویستی،

سەرسامبوون، پەسندکردن و دژەکانی ئەم هەست و نەستانە دەگرێتەوە.

- ئەو پەیوەندیانەی پێکەوە بەستراون: تەرکیز لەسەر ئەو یەکانە دەکاتەوە کە لەمیانەی بەستنەوەی کۆمەڵی توخم پێکدێ، بۆنموونە: پیاوو ژنەکەی بریتییە لە یەکەیەک، هەروەک مامۆستاو قوتابیەکانی.

ئەم بیردۆزە لە رێکلامدا بەرجەستە دەبێ لەمیانەی هەوڵی تاک بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی پێویست کە هاوسەنگی ناوەوەی بۆ بەدی دێنێ، مامەڵەکردنی لەگەڵ بەرهەمهاتووەکان بە ئامانجی رازیکردنی دەروونی خۆیەتی بە پلەی یەکەم، پاشان پاراستنی ئەو پەیوەندیانەی کە بەدەوروبەریەوە دەیبەستێتەوە.

## پێنجەم: شیکردنەوەی هەمەلایەنی کاریگەری میدیا، یان ئەوەی پێی دەڵێن بیردۆزی پشتبەستنی ئاڵوگۆڕ لەنێوان جەماوەرو ئامرازەکانی میدیاو کۆمەڵگە:

لە گفتوگۆکردن لەبارەی کاریگەری ئامرازەکانی میدیا هەر دەبێ سێ پەیوەندی لەبەرچاو بگیرێ: سیستمی کۆمەڵایەتی، رۆڵی ئامرازەکانی میدیا لەو سیستمە، پەیوەندی جەماوەر بە ئامرازەکانی میدیاوە. بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا بەبێ کاریگەری سیستمی باوی کۆمەڵایەتی نابێ، شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ئامرازانەش دەکەوێتە بەر کاریگەری ئەوەی تاک لە رابردوودا لە کۆمەڵگە فێری بووەو، ئەوەی لە ساتی وەرگرتنی پەیامەکە روودەدات. لەم پێودانگەوە ئامرازەکانی میدیا سێ جۆر کارتێکردن دروست دەکات:

ا. کارتێکردنی زانین: وەکو نەهێشتنی لێڵی و دانانی ئەجێنداو، زیادکردنی سیستمگەلی بیروباوەڕو بەهاو رەفتار.

ب. کارتێکردنی ویژدانی: وەکو هەستیاریی لە ئاست توندوتیژی و، مەترسییەکان و نامۆبوون.

ج. کارتێکردنی رەفتار: جوڵەو کردەوە یان نەمانی ئارەزووی جوڵەو کردەوە، کە هەردووکیان دەرەنجامی کاریگەری زانین و ویژدانین.

**پەیوەندیکردنی جەماوەری:**

زۆربەی توێژینەوەکانی ئەم بوارە لەوەتەی نیو سەدەیە تا سەردەمی ئێستامان پەیوەندی دەکەن بەچەند بەشێکەوە یان چەند نموونەیەکەوە دیارترینیان پەیوەندی خودی، پەیوەندی کەسی، پەیوەندی کۆمەڵی و پەیوەندی جەماوەری (میدیایی)یە، ئەم جۆرەی دوایی بە شێوە سەردەمییە تەکنیکییەکەی دیداری راستەوخۆو کارلێککردنی کۆمەڵایەتی روبەڕوویانەی تێپەڕاندووە، بە بەکارهێنانی ئامرازی تەکنیکی ئاڵۆزو بەهای بەرز وەک چاپخانە و ئێستگەو تەلەڤزیۆن و سینەماو مانگی دەستکردو ئینتەرنێت. ئەمەش وایکردووە چەمکگەلێکی جیاوازو بیرۆدزو بۆچوونی جیاواز سەبارەت بەم بوارەی ژیان سەرهەڵبدەن.

دامەزرێنەرانی پەیوەندیکردنی جەماوەری (ماکلود و بلومەر)، لە بەناوبانگترین کارەکانیان لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و کاریگەری پەیوەندیکردنی جەماوەرییە، کە لە بڵاوبوونەوەی چەمکی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن بەشدار بوو، لە جۆرایەتی ئامرازەکانی پەیوەندیکردنی جەماوەری بەشداربوو.

پەیوەندیکردنی جەماوەریش وا پێناسە دەکرێ کە «پرۆسەیەکە بەهۆیەوە پەیوەندی بە جەماوەر دەکرێ بۆئەوەی زانیاری و را بە تاکەکان بدرێت، هەمیشە کاریگەری لە بیرۆکەکان لەڕووی ناوەڕۆکەوە دەبێت».

(مارشاڵ) پەیوەندیکردنی جەماوەری وا ناساندووە کە «لە رێکخراوە گەورەکان لە رووی قەبارەوە پێکدێ و، یەکێک یان زیاتر لە هۆکارە تەکنەلۆژییەکان بۆ پەیوەندیکردن بە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک بەکار دەهێنرێت».

پەیوەندیکردنی جەماوەری ئەو پرۆسەیەیە بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیای جەماوەری دەبێت، بە هۆیەوە پەیامەکانی جەماوەری فراوانی ئاراستە و ئاست جیاواز دەگەیەنرێت، هەمیشە تاکەکان بۆ پەیوەندکار نەناسراو دەبن، کە لەهەمان ساتداو بە خێراییەکی لە رادەبەدەر پەیامەکەیان پێ دەگات، بۆئەوەی رای گشتی دروست بکات و گەشە بە ئاراستە و شێوازەکانی رەفتار بدات، هەروەها توانای گواستنەوەی زانینەکان و خۆش بەسەربردن هەبێت.

دەزگای میدیایش پرۆسەی گواستنەوەی زانیاری و زانین ئەنجام دەدەن، لە میانەی چەند ئامرازێکەوە لەوانە رۆژنامە و ئێستگە و تەلەڤزیۆن و ئینتەرنێت و کەناڵە ئاسمانییەکان و فیلمە سینەماییەکان و کتێب و بڵاوکراوەکان.

توێژەران وای دەبینن پەیوەندیکردنی جەماوەری چەند ئەرکێکی هەیە، گرنگترینیان:
- ئەرکی میدیا و بڵاوکردنەوەی زانین.
- لێکدانەوەو ئاراستەکردنی بیرۆکە و پێکهێنانی رای گشتی و، رەفتارو بەها ئاراستەکانی جەماوەری وەرگر.
- گواستنەوەی کەلەپووری رۆشنبیری لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە، هەروەها پێوەرو بەها رەفتارییەکان.
- پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی و فێربوون.
- پڕوپاگەندە لە هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی پرەنسیپ یان بیرۆکەی دیاریکراو بەشێوەیەکی مەبەستدار.
- رێکلام و بازاڕکاری، ئەرکێکی ئابووریشی هەیە.
- خۆش بەسەربردن، کە لە بەسەربردنی کاتی ڤاڵایی یارمەتیدەرە، بەشێوازێک کە بۆ تاک و کۆمەڵگە بەسوود دەبێت.

**کۆسپەکانی بەردەم پەیوەندیکردن:**

چەندین تەگەرەی بەردەم پەیوەندیکردن هەیە، دەکرێ ئەو هۆکارانە بکرێنە دوو کۆمەڵەوە:

**یەکەم: شێواندنی زانیاری:**

پرۆسەی پەیوەندیکردن لە چەندین قۆناغی لەناویەک و ئاڵۆز پێکدێ، لەبەرئەو هەڵەو شتە نابەجێیانەی لەوانەیە لە هەریەکەیاندا روو بدەن، رەنگە واتا یان واتاگەلێکی نامەبەست لە پەیوەندیکردن دروست ببێ، ئەم هەڵانەش دەچنە ریزی چوار تەگەرەوە کە ئەمانەن:

**١. ئەدگارەکانی ئاینده:**

کەســەکان لەبەر هۆکارو پاڵنەرگەلێکی کەسـیی جیـاوازەوە، وەک خوێندەواری و ئەزموونەکانــی پێشــتریانەوە بەرسـڤیان بـۆ هەمــان پەیـام جیاواز دەبێ، لەســەر ئەو بنەمایــەش کاردانــەوەی دوو کــەس لە دوو ژینگەی جیاواز ســەبارەت بە یەک بابەت جیـاواز دەبـێ، هەروەها پاڵنەرە کەسـییەکان کار لە کردنــەوەی کۆدەکانی پەیامەکەو شـیکردنەوەیان دەکات، ئـەو فەرمانبــەرەی جیـاوازە لـە پێویسـتبوونی زۆری بـۆ پێشـکەوتن لــە رێکخراوەکــەی و بــە گەشـبینی باس دەکـرێ، لەوانەیــە زەردەخەنەی ســەرۆکی راســتەوخۆی و قســە سـەرپێییەکانی وەک نیشـانەیەک شی بکاتەوە، کە ئەو کەسـێکی خۆشەویسـتەو چاوەڕێـی پاداشـت دەکات، بـەڵام ئەو کەســەی بـە لاوازی پێویسـتبوونی بـۆ پێشـکەوتن باس دەکرێ و مەیلی رەشـبینی هەیــە، لەوانەیە هەمان قسەی بەڕێوەبەرەکەی وا شی بکاتەوە کە شتێکی سەرپێییەو پەیوەندی بە هیچ شتێکی بابەتەکەوە نییە.

**٢. درککردنی بژارخوازی پەیامی میدیایی:**

کە خەڵک بەئاراســتەی بیسـتنی بەشـێک لــە پەیامەکە بچـێ و زانیارییەکانی دیکە فەرامـۆش بـکات لەبــەر چەندین هــۆکار، لەوانــەش دوورکەوتنەوە لــە توندی ناکۆکی زانیـن، ئــەوا چاویش لەو زانیاریانە دەپۆشـن کە ناکۆکە لەگەڵ ئـەو بیروڕایانەیان کە پێشـتر تیایاندا چێنـدراوە، ئەوجا درککردنیان بۆ پەیامەکــە بژارخوازیانە دەبێ کاتێک وەرگر شـێوازی پەیوەندیکردنەکە هەڵدەســەنگێنێ، لەوانەش رۆڵ و کەسێتی و بەهاو میزاج و پاڵنەرەکانی نێرەر.

**٣. گرفتە زمانەوانییەکان لەکاتی ناردنی پەیامی میدیایی:**

زمـان دیارتریـن ئــەو کۆمەڵــە بەکارهێنراوانایە لــە پەیوەندیکردن، بــەڵام گرفتەکە ئەوەیــە زۆر لە وشــە بـاوە بەکارهێنراوەکانی بواری پەیوەندیکـردن واتای جیاواز بۆ کەســانی جیـاواز لەخـۆ دەگرێ، لەوانەیە وشــەیەک دەســتەواژەو واتـای فرەی هەبێ کــە شـیکردنەوەی جیـاواز هەڵبگرێ، یـان زمانەکە زمانێکی تایبەت بـێ بۆ گرووپێکی هونەری دیاریکراو کە زەحمەتە لێی تێ بگەن، وەکو ئەوەی مامۆستایەک زەردەخەنە

بـۆ قوتابیەکـەی بکات و پێی بڵێ پیـرۆزە کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکەش نەرێنی بووە، لەکاتێکدا قوتابیەکە درک بەو واتایە ناکات کە تاقیکردنەوەکە نەرێنی بووە.

**٤. فشاری کات لەمیانەی پێشکەشکردنی پەیامی میدیایی:**

بەگشتی تاکەکان سکاڵای ئەوە دەکەن کە کات دەگمەنترین داهاتە، هەمیشەش کەمی کات دەبێتە هۆی شێواندنی زانیارییە ئاڵوگۆڕکراوەکان، کەمی کاتیش دەگەڕێتەوە بۆ پەنابردن بۆ کەموکورتی کەناڵە فەرمییەکانی پەیوەندیکردن، وەک ئەوەی بەرپرسێک فەرمانێکی زارەکی بە یەکێک لە فەرمانبەرەکان بدات، بۆ راپەڕاندنی کارێکی دیاریکراو بـە بیانـووی تەواوبوونـی ماوەی دەوام، پاشـان ئـەو فەرمانە لە تۆمـارە فەرمییەکان تۆمار نەکات، بۆئەوەی لەمیانەیدا بەرپرسیارێتییەکان دیاری بکات، سەرباری ئەوەی فەرمانبەرەکـە بەهـۆی کەمیـی کاتەوە ئەو فەرمانە بەشـێوەیەک جێبەجـێ دەکات کە لەبنەڕەتدا لە زەینی بەرپرسەکەدا هەر نەبووە.

**دووەم: قەوارەی زانیارییەکان:**

دووەم ئەو تەگەرە سەرەکییانەی پەیوەندیکردنە لە زێدەڕۆیی لەبڕی زانیارییەکان، لەو سکاڵا باوانەی لە نێوەندی دامەزراوە میدیاییەکاندا هەیە ئەوەیە کە ئەوان نگرۆی زانیـاری بـوون، ئەگـەر بایـەخ بـە هەمـوو زانیاریـەکان درا ئـەوا کاری راسـتەقینەی دامەزراوەکە هەرگیز جێبەجێ ناکرێ.

**پەیوەندیکردنی کارا:**

پەیوەندیکـردن، نهێنـی بەردەوامـی ژیانـە لەنێـوان بوونەوەرەکان و پێشـکەوتنی، هەنـدێ لە لێکۆڵەرەوان پێیانوایە پەیوەندیکردن خودی ژیانە. بۆئەوەی پەیوەندیکردن کارا بێت، پێویست بەمانەی خوارەوە دەکات:

- لوتـف و ئارامی لە گواسـتنەوەی پەیام: خـودا رووی کردۆتە پێغەمبەر محەمەد (د.خ) و فەرموویەتـی: «ئەگـەر تـۆ وشـک و دڵـرەق بوویتایـە ئـەوا لـە دەورت دوور دەکەوتنەوە». پێغەمبەری خوداش دەفەرموێ: «هاوڕێیەتی لە شتێکدا نەدەبوو ئەگەر جوانی تێدا نەبێ، لە شتێکیش دوور ناکەویتەوە کە جنێوی تێدا نەبێ».

- زەردەخەنـەی جـوان لـە كاتـی ناردنـی پەیام: پەنـدی بەناوبانگـی چینیش دەڵێ «ئەوەی زەردەخەنەی نییە نابێ فرۆشگایەكی بازرگانی بكاتەوە».

- سـووربوون لەسـەر شـێوەگەلێكی پەسـندو بێ زێدەڕۆیی وەكو ئاوازی دەنگ و بەرزی و توندی و بێدەنگی.

- گوێگرتـن بـە وردی و كردنـەوەی مێشـك بـۆ ئەو پەیامەی كەسـانی دیكە بۆت دەگوازنەوە: لەمیانەی گەڕان بە دوای هەر شتێك كە پەیامەكە لەخۆی دەگرێ.

- روونی و دیاریكردن و ناگشـتاندن لەكاتی گواسـتنەوەی پەیامی میدیایی، باشتر وایە قسە لە بارەی شتە گشتییە نا روونەكان نەكرێت.

- لێكۆڵینـەوە لـە هـۆكاری پەیوەندیكردنەكـە: لەمیانـەی پرسـیار لەخۆكردن پێش چوونەوە ناو پرۆسەی پەیوەندیكردنەكە ئامانج چییە لێی؟ ئەگەر ئامانجەكە روون و ئاشكرابوو ئەوە دەهێنێ بە دوایدا بچیت و، پەیوەندیكردن كارێكی پێویستە، ئەگەر نا وازی لێ بهێنیت باشترە.

- سـەرچاوەی پەیامەكـە بـەردەوام لـە ئیعتباری خـۆت دابنێ: لە میانەی ناسـینی ئەو كەسەی دەتەوێ پەیوەندی پێوە بكەی، بۆئەوەی بتوانی پەیامەكەت بەشێوەیەكی راست پێ بگەیەنیت.

- دارشـتنی پەیـام بەشـێوەیەک لەگەڵ بیسـەران بگونجێ: لە میانـەی هەڵبژاردنی وشـەو چەمـک و هزرگەلێـک كـە وا لە تاكـەكان دەكات بەپێی ئـەو باگراوندە زانینەی هەیانە كارلێک بكەن.

- پرسیارەكان بكە و پاشان رێگە بدە وەرگری پەیامەكە دڵنیات بكاتەوە كە ئەوەی تێگەیشـتووە لەواقیعدا وایە: (ئایا ئەمە ئەوەیە كە تۆ مەبەسـتە ....؟ ببورە .. تۆ گرنگی بە ... دەدەی؟)

- بزانە لەبارەی چییەوە قسە دەكەی: كارتێكردن لە كەسانی دیكە و رازیكردنیان بـەوەی دەتـەوێ هـەر دەبێ پشـت بـە زانینێكـی بـاش و توانایەكی باش لـە بابەتەكە ببەستی.

- ئەگـەر كاتێكـت تەرخان كرد بۆ پەیوەندیكردن لەگەڵ كەسـێک، ئەوا بایەخی پێ

بدەو ئاگاداری قسەکانی بەو بەشداری تێدا بکە، کە زانیت ئەوە بەرژوەندی پرۆسەی پەیوەندیکردنە.

- نەبڕینی قســەی لایەنەکەی دیکە لە پرۆســەی پەیوەندیکردن لەگەڵ بایەخدان بە گوێگرتـن و ئـاگادار بوونـی بـاش: چونکە بڕینی قســە وەک ئەوەیە تـۆ لایەکەی دیکە بەم دەســتەواژەیە ئاگادار بکەیتەوە: بە یارمەتی خۆت بێدەنگ بە.. چونکە ئەوەی من دەیڵێم پتر گرنگە.

- هەوڵبـدە هزرەکانـت لـە کات و شـوێنی گونجـاودا بخەیتـەڕوو، چونکـە پێگـەو چوارچێـوەی زەینـی کـە تـۆ تێیدای لەگـەڵ لایەنێکی دیکـە بەشـێوەیەکی زۆر کار لە ئاستی پێشوازیکردن لە بیروڕاکانت و پەسندکردنی دەکات.

- دووپاتـی بکـەوە کـە پەیوەندیکردنـی روبـەڕوو پرۆســەیەکی بەردەوامــە: توێژینـەوەکان ئامـاژە بـەوە دەدەن کـە ناردنی یـەک پەیام واتای ئـەوە دەگەیەنێ کە بەلای کەمەوە پەیامگەلێکی جیاواز لە دوو توێی ئەو پەیامەدا هەیە.

- لەســەر نێرەری پەیامەکە پێویســتە گرنگی بە رواڵەتی دەرەوەی و جلوبەرگی و دیمەنی بدات، بۆئەوەی کاریگەری زیاتری ئیقناعکردنی وەرگری پەیامە میدیاییەکەی هەبێ.

پەیوەندیکـردن لەگـەڵ کەســانی دیکـە تەنها بەنـد نییە بە لایەنی بێژەییــەوە، بەڵکو زیاتریش پشت بە زمانی جەستەو ئاوازی دەنگ دەبەستێ.

## کارامەیی پەیوەندیکردنی کارا:

## یەکەم: کارامەیی نووسینکاری:

١. ناونیشان و مادەو ئامانجی بابەتە نووسراوەکە دەبێ روون بێت.

٢. دەقە نووسراوەکە دەبێ لەگەڵ ناونیشان و ئامانجەکەی راستەوخۆ رێک بێت.

٣. بابەتە نووسراوەکە دەبێ روون بێت.

٤. بابەتە نووسراوەکە دەبێ لەگەڵ رێزماندا گونجاو بێت.

٥. دەبێ رەچاوی زنجیرەبەندی میتۆدو لۆژیک لە بڕگەکانی نووسینەکەدا بکات.

٦. دەبێ رەچاوی بنەمای میتۆدی توێژینەوەی زانستی بکات لە رووی بەشەکان و پێرست و دیکۆمێنتاری.

٧. بابەتەکە بێ ناواخن بێ و درێژدادڕ نەبێت.

٨. جیاکردنەوە لە نێوان ئاستی گرنگی لە هزرەکانی ناو بابەتەکەو کورتکردنەوەش لەسەر گرنگی بێت، هەروەها دەکرێ بە خەت یان رەنگ یان شێوەش جیا بکرێتەوە. زاراوەکان لە پەراوێز یان وەک پێرستێکی سەربەخۆ پێناسە بکرێن.

**دووەم: کارامەیی خوێندنەوە:**

- وەرگر لەکاتی خوێندنەوەدا بە ئامانجی بابەتەکە ببەستێتەوە.
- خوێنەر بتوانێ هزرە گرنگەکان و شتی دیکە لێک جیا بکاتەوە.
- خوێنەر بتوانێ ئەوەی پەیوەندی بە بابەتەکەو شتی دیکەوە هەیە بناسێتەوە.
- خۆی بخاتە شوێنی نووسەر (نێرەر) و لە روانگەی ئەوەوە بڕوانێت.
- وەرگر بە بابەتێتی و بنەمای رەخنەو هەڵسەنگاندنەوە پابەند بێ.
- وەرگر ئاستی بابەتەکە بەرز بکاتەوە ئەگەر لەو بەرزتر بوو.

**سێیەم: کارامەیی گفتوگۆ:**

١. نێرەر لە هیچ بابەتێک کە توانای بەسەردا ناشکێ گفتوگۆ نەکات.

٢. تەرکیز لەسەر ناوەڕۆکی بابەتەکە بکرێ و روو نەکرێتە بابەتە لابەلاکان.

٣. خاوەن هەنجەت بێ بۆ بەرگریکردن لە هزرەکان و کەمکردنەوەی دەرخستنی گوڕوتین بە تەنها.

٤. رێگەدان بە ئامادەبوونی گفتوگۆ بۆ دڵنیابوون لە گەیشتنی هزرەکان.

٥. گفتوگۆ بەخێراییەکی ئاسایی بۆئەوەی بتوانرێ بەدواداچوون بکرێ.

٦. روونی لە بێژەی وشەکان.

٧. رەچاوکردنی ئاوازی دەنگ بۆ گونجاندن لەگەڵ هزرە نمایش کراوەکان.

٨. رێز لە تێڕوانینی کەسانی دیکە بگیرێ ئەگەر لەگەڵ نێرەریش ناکۆک بوون.

٩. جەخت لەسەر هزرە نوێیەکان بکرێ نەک هزرە کۆنەکان.

**چوارەم: کارامەیی گوێگرتن:**

- ڕێزگرتن لە بیروڕای کەسانی دیکەو ڕاهاتن لەسەر ئەوە.

- تەرکیزکـردن لەســەر جۆرەکانی هزر لە نوێ، کـۆن، گرنگ، کەمتر گرنگ، خاڵی یەکگرتنەوەو خاڵی جیاوازی، چ شتێک لەناو بابەتەکەیەو چ شتێک لە دەرەوەیەتی.

- نەبڕینی قسەی گفتوگۆکار.

- سوربوون لەسەر پیشاندانی گرنگیدان و جدێتی لە بەدواداچوونی گفتوگۆکار.

**نموونەی پەیوەندیکردنی کارا:**

پەیوەندیکردنی تەلەفۆنی کە دەشێ لە ڕێگەی ئەم هەنگاوانەوە بێت:

**یەکەم: پێش پەیوەندیکردن:**

- ئامانجی پەیوەندیکردنەکە دیاری بکە.

- بـەراورد لەنێـوان تەلەفۆن وەک هۆکارێکی پەیوەندیکردن و هۆیەکانی دیکە بکە (باشترین ئامراز).

- ئەو پەیامە بنووسە کە دەتەوەی بیگەیەنیتە ئەوی دیکە.

- دەفتەری تێبینییەکان ئامادە بکە بۆ نووسینی هەر تێبینیەک لە کاتی قسەکردندا.

- ئەگـەر پەیوەندیـت لـە میانەی دابەشـکار (مقسـم)ەوە بێ، ئەوا ڕەفتـارت لەگەڵ کارمەندی دابەشکار جوان بێ.

**دووەم: لە کاتی پەیوەندی:**

- بە سڵاو دەست پێ بکە.

- ئارام بە.

- یەکەمجار خۆت بناسێنە.

بە پەیوەندیکردن، لایەنەکەی دی هەست بە گرنگی دەکات، ئەگەر وەرگرت دەست نەکـەوت ئـەوا ئـەم زانیاریانــەی بۆ بەجێ بهێڵـە: ناو، دامــەزراوە، تەلەفـۆن، ئامانجی پەیوەندیکردنەکەت، کاتی گونجاو بۆ دووبارە پەیوندی پێوەکردن یان وەڵامدانەوەت.

- نابێ بە پێشەکی کات بەفیڕۆ بدەی.

- ڕاستەوخۆ بچۆرە ناو بابەتەکەوە.

- پەیوەندیکردنت دەبێ لە شوێنێکدا بێ ژاوەژاوی تێدا نەبێ.

- کاتێک زەنگی تەلەفۆن لێدەدا دەستبەجێ دایمەخە، چونکە لەوانەیە وەرگر لێی دوور بێت.

- رێگە مەدە وەرگر لەسەر تەلەفۆن چاوەڕێ بکات لەبەرئەوەی لە شتێک دەگەڕێی، بەڵکو داوای لێبوردن بکەو دووبارە پەیوەندی پێوە بکە.

- پەیوەندی کردنت لەبەردەم میوان نەبێ، داوای لێبوردن بکەو کاتێکی دیکەی بۆ دابنێ.

- باشتر وایە تەلەفۆنی سەرۆکەکەت وەڵام بدەیتەوە ئەگەر لە دەرەوە بوو، بە پەیوەندیکەریش رابگەیەنە کە دەرچووەو بزانە چی دەوێ و لەخزمەتیدا بە.

- لە وەرگرتنی زانیاری لە وەرگر ورد بە بەتایبەتیش ژمارەکان، دڵنیاش بە لە وردبینی و دووبارە خوێندنەوەی.

## بەشی حەوتەم
## چەمکەکان لە دەروونناسیی میدیا

**یەکەم: پلاندانانی میدیا:**

پلاندانانــی میدیـا بەهـۆی پێشـکەوتن و گەشـەکردن و شۆڕشـی زانیارییەکان بە یەکێک لە بابەت و پرسـە گرنگەکان هەژمار ئەکری لەلایەن زانایانی میدیا. پلاندانانی میدیا لەسـەر هەردوو ئاسـتی ناوخۆیی و جیهانی وڵاتان بەکاردێ. وەک زانسـتێکی پێویسـت و هاوچـەرخ و خـۆی سـەلماندووە جێـی گرنگـی پێدانـی زۆر پسـپۆڕان و زانایانی پرۆسەی پەیوەندیکردن و میدیایە، بەڵام خودی پرۆسەکە نوێیە و بەتەواوی بنەماو چوارچێوەکەی روون نەبووتەوەو پێویستی بە شرۆڤە و لێ توێژینەوەی زیاتر هەیە.

پلاندانانی میدیا لە ناوەڕاسـتی حەفتایەکانی سـەدەی بیسـتەمەوە سەریهەڵدا وەک دەرئەنجامـی شۆڕشـی میدیـاو پەیوەندیکردنـی کـە گۆڕانکارییەکی ریشـەی بەسـەر شـێوازی پەیوەندیکردن و میدیاو ئاراسـتەکانیدا دروست کرد کاتێک میدیا کاریگەری راستەوخۆی لەسەر رەفتارو دابونەریت دروست کرد.

پلاندانانــی میدیـا «کردارێکـی ئارەزوومەندانـەی بـە ئەنقەسـتە لـە کرداری بـە کۆمەڵەکان لە یەکێک لە دام و دەزگایەکانی میدیا ئەنجام دەدرێ لەپێناو رێکخستن و بە گەڕخستنی تواناکان، وەک تاکەکانی دەزگاکان لەپێناو بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە و جێبەجێکردنی ئامانجە دیاریکراوەکان».

پلاندانانی میدیا «پرۆسـەیەکی ئارەزوومەندانەیە کە لە دەزگاکانی میدیادا ئەنجام دەدرێ، بەمەبەسـتی خوێندنەوەی رەفتارو هەڵسـوکەوت و هـزرو بیرە هەنگاوەکانی ئایندەو، کارکردن لەسـەر شـیکردنەوەی وردی زانسـتی ئاستی هوشیاری و زانین و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، بە ئامانجی رەخساندنی کەشێکی لەبارو گونجاو پێویست بۆ دەزگاکانی میدیا بۆ کۆمەڵگەیەکی تەندروست».

(هایمان) دەڵێ: پلاندانان دەستنیشـانکردنێکی پێشترە لەوەی دەبێت ئەنجام بدرێ، دیاریکردنێکە بۆ هێڵی ڕێگەی کار لە داهاتووداو، کۆمەڵێک پرۆسەی گونجاوو هەماهەنگ لەخۆ دەگرێت، بۆئەوەی هەندێ ئامانجی دیاریکراو وەدی بهێنێت، پلاندانانیش لەسەر بنەمای بیرکردنەوەی زانسـتی وردی گشـتگیر دەبێت، کە بۆ تێگەیشـتنی واقیعەکە لە کۆمەڵـەی خێرخـوازی یارمەتیدەرە، هەروەها لە دروسـتکردنی وێنەیەک بۆ دواڕۆژو پێشـبینیکردنی هەنـدێ لـە ئەنجامەکانـی بـە پشتبەسـتن بـە بنەماگەلی زانسـتی نەک لەسەر گومان بەشدارە، هەروەها لە ئامادەباشی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو دواڕۆژەو کێشەکانی یارمەتیدەرە.

**ئامانجەکانی پلاندانان:**

پلاندانانی میدیا چەندین ئامانج وەدی دەهێنێت، چونکە ئەو باشـترین شـێوازەکان بـۆ گەیشـتن بە جەماوەر روون دەکاتەوە، هەروەهـا زامنی وەدیهێنانی ئامانجەکان و کاریگەری کارایانەیە لە جەماوەری ئامانجدارو، لە دەسـتەبەرکردنی کۆشـش و کات بەشدارەو، پارەکە لە کاتی کارکردن بە هەڕەمەکی بەفیڕۆ دەچێت.

پلاندانـان خەسـڵەتێکی جیاکـەرەوەی ژیانـە، تەنانەت خـودی ژیانیشـە و، بریتییە لـە سیسـتم و پێچەوانەکـەی پشـێوی و سـەرپێییە، چونکە مـرۆڤ ئامانجێـک دیاری دەکات و لە هەموو توانا فەراهەمبووەکان و هێزە دەستەبەرەکانی دەکۆڵێتەوە، پلانێک دەکێشێت و لەڕێگەی گەیشتن بەو ئامانجە جێبەجێی دەکات.

پلاندانانـی میدیـا لـە سـادەترین پێناسـەکانی بـەوەی لـە بەهـای ئامـاژە پێکـراو هەڵیگرتـووە، بریتییـە لـە «کۆکردنـەوەی هەمـوو وزە میدیـا مرۆیـی و مادییەکان و، هەموو دامەزراوە میدیاییە جەماوەری و کەسـییەکان، هەر لە بڵاوکراوە بچووک یان پۆسـتەرو دروشـمەکان، تا دەگاتە دامەزراوە گەورە رۆژنامەنووسییەکان، لە ئێستگە بچووکە ناوخۆییەکان تا دەگاتە تۆڕە تەلەڤزیۆنی و ئێستگەییە زەبەلاحەکان».

پلاندانانـی تـەواوی میدیـا ئـەو پلاندانانەیـە، لەسـەرەتاوە یەکێتـی کاری میدیایـی بـە هەمـوو وێنە و شـێوەکانی ڕەچـاو دەکات، لەگەڵ قۆسـتنەوەی کەناڵـە میدیایی و

پەیوەندیکردنـەکان و رەگـەزە مرۆیـی و مادییەکانـی و، وای لـێ بکرێـت لـە خزمەتی ستراتیژیەتی باڵای نیشتماندا بێت.

### ریزبەندکردنی لۆژیکیانەی پلاندانانی میدیا ئەمانە لەخۆ دەگرێت:

- سـتراتیژیەتە گشـتییەکان کـە ئامانجەلـی بـاڵای چەسـپاو بۆ نیشـتمان و گەل لەخۆدەگرێت، ناکرێ تا ماوەیەکی زۆر سەرپێچی بکرێت و چەسپاوەکانی پێ دەوترێ، کە شێوازی مانەوەی کۆمەڵگە دەنوێنێ و ئامانجی درێژخایەنی هەیە.
- ستراتیژیەتێکی میدیایی ئەم ئامانجە باڵا چەسپاوانە لەخۆ دەگرێت.
- سیاسەتە باڵا میدیاییەکان بەشێکە لە ستراتیژیەت و لەسەر بنەمای ئاراستەکانی کار دەکات و، لێیەوە سەرچاوە دەگرێت.
- پلانە جێبەجێکراوەکان کە شێوەو ناوەڕۆک پێکەوە دەنوێنن، وەک بەرنامەیەکی بابەتی جێبەجێکردنە بۆ سیاسـەتی میدیایی پشتبەسـتوو بە سـتراتیژیەتێکی میدیایی، لەسەر بنەمای ستراتیژیەتی گشتی کۆمەڵگە و دەوڵەت.

### گرنگی پلاندانان لە دەزگاکانی میدیا:

پلاندانان لە دەزگاکانی میدیا بۆ هەر لایەک پرۆسەیەکی گرنگە و چەندین سوودی دەبێت، لەوانە:

١- چاودێری بەردەوام بۆ راپەڕندنی کارەکان بە جوانترین و چاکترین شێوە.

٢- ئامانجی هەریەک لە کارمەندان دەردەخات، ئەمەش یارمەتی زوو وەدیهاتنیان دەدات.

٣- بە ئاشکرا دیار خستنی دۆزی رێکخراوو دەزگاکان و هەر کەسێک لە دەزگایەک کار بـکات دەزانێـت چـی دەوێ بەدەسـتی بهێنێ، دوای ئەوە هـەوڵ دەدات لە رێگەی ئەنجامدانی کارەکانی بە شێوەیەکی باشتر بگاتە مەبەستەکەی.

٤- ئەو توانا مرییانە بۆ لێژنەیەکی میدیایی دیاری دەکات کە پێویسـتی پێیەتی و، داهاتە داراییەکانی و لەوانەیە یارمەتی پاشەکەوت کردنیش بدات.

٥- بەدەستهێنانی ئامانجەکان بەشێوەیەکی روون و دیار بەبێ کەم و کورتی.

٦- هەماهەنگی دەکات لە کاری نێوان لیژنەی میدیایی و لیژنەکانی دیکە.

٧- یارمەتیدان لە دیاریکردنی ئاراستە بونیات نراوەکان لەسەر ئەو ئامانجانەی پێشتر دیاری کراوە.

٨- یارمەتیدەرە لە زانینی کێشە چاوەڕوانکراوەکان و، کار بۆ نەهێشتنی یان کەم کردنەوەی کاریگەرییەکەی دەکات.

٩- لە وەدیهێنانی رەزامەندی نێوان فەرمانبەرەکان و لە زیادبوونی بەخشش و بەرهەمەکانیان یارمەتیدەرە.

١٠- هەموو کارمەندان لەسەر سیستم را دەهێنێ و، قۆناغ و کاتەکان بۆ جێبەجێکردن دیاری دەکات و، بنەماو چۆنێتی کارەکە روون دەکاتەوە.

١١- بەرزکردنەوەی توانای دەزگاکە و زۆرکردنی چالاکییەکان.

١٢- یارمەتیدەرە لە وەدیهێنانی سانسۆر بۆ بەرپرسان و چاودێری کارەکە و، لە گرنگترین هۆکارەکانی وەدیهێنانی ئامانجە میدیاییەکانە کە پلاندانەر مەبەستێتی.

١٣- زاڵبوون بەسەر ئەو گرفتانەی تووشی بەڕێوەچوونی کارەکان دەبن.

١٤- ئامانجەکان بە کەمترین تێچوون وەدی دەهێنێت، هەروەها جێبەجێکردنی کارەکە ئاسان دەکات و یارمەتیدەرە لە کۆنترۆڵکردنی.

١٥- ئاشکرا کردنی دۆزو کاری باش و خراپی دەزگاکان و نەهێشتنەوەی هیچ کارێک بە نهێنی، کە وا دەکات دەزگاکە کارە خراپەکانی بۆ چاکە بگۆڕێ و چاکەکانیشی باشتر بکات.

**جۆرەکانی پلان:**

- پلانە بەردەوامەکان: باس لە سیاسەت و رێوشوێن و بنەما گشتییەکان دەکەن.

- ئەو پلانانەی یەک جار بەکاردەهێنرێن: بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو لە ماوەیەکی دیاریکراودا دادەنرێت.

- پلانە ستراتیژییەکان: بە مەسەلە گشتییەکان پەیوەستە، کار لەسەر چالاکی

بەشێوەیەکی گشتی دەکات.

- پلانە کارگێڕییەکان: جەخت لەسەر وەدیهێنانی ئامانجەکان دەکاتەوە لە چوارچێوەی کاتی، بەم شێوەیە دابەش دەبێت: پلانە درێژخایەنەکان، پلانە مامناوەندەکان و پلانە کورتخایەنەکان. هەرچەندە ماوەی پلانەکە درێژ بێت، ئامادەکردنەکەی سەختتر دەبێت، بە پێچەوانەشەوە راستە.

**هەنگاوەکانی پلاندانانی میدیا:**

**پلاندانانی میدیا بە چەندین هەنگاودا تێپەڕ دەبێت:**

**١- دەستەبەرکردنی زانیارییەکان:**

هەنگاوی یەکەم و زیندەیی لە پلاندانان، بریتییە لە دەستەبەرکردنی زانیاری پێویست و دروست لەبارەی هەر رەگەزێک لە رەگەزەکانی کاری میدیا، چونکە لە رێگەیەوە پلان دادەنرێت و بە توندوتۆڵی دادەڕێژرێتەوە، لێرەدا گرنگە سروشتی زانیارییە ویستراوەکان دیاری بکرێت و، سەرچاوەکانی و شێوازەکانی کۆکردنەوەی بزانرێت، بۆئەوەی شی بکرێتەوەو پەیوەندی نێوانی لەگەڵ خشتەکەی دیاری بکرێت و بە وردی شرۆڤە بکرێت. ئەمە یارمەتی پلاندانەر دەدات، لە دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان هۆکارو هۆی هۆکارەکە و، لەو زانیاریانەی بە بواری پلاندانانی میدیا پەیوەستە، زانینی گۆڕاوە ژینگەییەکان کە گۆڕاوی کۆمەڵایەتی و ئابووری و یاساییە لە وڵاتداو، سنووری کارەکەی و سیستەمە پەیوەندارەکان پێی دیاری دەکات، هەروەها کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی جەماوەرو ئامرازە فەراهەمبووەکان، هەموو ئەوەی دەکرێ یارمەتیدەر بێت لە وەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی مەبەستێتی. لە روانگەی ئەم داتایانە چوارچێوەی کاتیی دەستنیشان دەکرێ، کە پلانەکە بەپێی توانا ماددی و مرۆییەکەی پێویستی پێیەتی، لێرەدا گرنگ نییە تەنیا ئەم زانیاریانە دەستەبەر بکرێت، لەوە گرنگتر زانینی رێگەی سوود لێ وەرگرتنێتی.

**لە زانیارییە بنچینەییەکانی دەستپێکی پلاندانانی میدیا:**

- پێویستە زانیارییە بەدەستهاتووەکان لە بارەی پێداویستییە ماددی و توانا

مرۆییەکان ژێر دەست وردبن.

- ژمارەو دابەشبوونی دانیشتوانی. بەبێ نوێترین سەرژمێری هەموو ساڵێکیش بەردەوام نوێ بکرێتەوە، گرنگترین سیماکانی گەشەی دانیشتوان و تایبەتمەندییەکان لەبەرچاو بگرێ.

- پێویستە زانیارییەکان لەبارەی پلانی نەتەوەی گشتگیرو پلانی هەرێمی ناوچەیی لەبەر دەستدابن.

- چالاکییە ئابوورییەکان و کۆمەڵگە جیاوازەکان کە پێکهێنەری ئابووری دەوڵەتن.

**٢- شیکردنەوەی هەڵوێست:**

پلاندانەر لە هەڵوێستی هەنووکەیی لە هەموو لایەنەکانی بە شێوەیەکی لەسەرخۆ بکۆڵێتەوەو، شیکردنەوەی هەموو هۆکارە پەیوەستدارەکان پێی کە زۆرجار زۆر لە بەرپرسان لەو بڕوایەدان، روونە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەو تێ ڕامان نییە.

**٣- دیاریکردنی ئامانجەکان:**

دوای لێکۆڵینەوەیەکی لەسەرخۆ بۆ هەڵوێستەکە و شیکردنەوەیەکی دروست لەلایەن پلاندانەرەوە، ئامانجە میدیاییە درێژ خایەنەکان و ئامانجە میکانیزمەکان (کورتخایەن) دادەڕێژرێتەوە.

**٤- لێکۆڵینەوەی پرۆژە یان بەرنامە:**

لەوانەیە پلاندانەر ئامانجی باسکردنی خزمەتگوزارییەکی دیاریکراو بێت، کە دامەزراوەکە پێی جیا دەکرێتەوە، یان بۆ بازاڕکاری بەرنامەیەکی دیاریکراو وەک بەرنامەیەکی پروپاگەندەیی بۆ یارمەتیدانی توشبووان بە شیرپەنجە، یان شتی دیکە بێت.

**٥- لێکۆڵینەوە لە جەماوەر:**

دەستنیشانکردنی جەماوەرو لێکۆڵینەوەی تایبەتمەندییەکانی، یەکێکە لە رەگەزە گرنگەکان لە پلاندانانندا، ئەم جەماوەرە پێویستە بناسرێت و بە وردی دیاری بکرێت، چونکە ئەمە ماندوبوون و داهات دەگەڕێنێتەوە، هەروەها لە هەڵبژاردنی ئامرازی گونجاوو داڕشتنەوەی شیاو یارمەتیدەرە، پێویستە پلاندانەر بزانێت بەرنامە یان

پرۆژەیەک نییە کە چاوەڕوان دەکرێت هەموو خەڵک گەلاڵەی بکەن، بۆیە دەبێت بەدوای جەماوەری کارلێک لەگەڵ پرۆژەکەماندا بگەڕێین، کە دەکرێ دوای قەناعەتکردن پێی شتێکی پێشکەش بکات و، ئایا ئەو جەماوەرە لە شوێنێکی جوگرافی دیاریکراوە؟ ئایا تایبەتمەندی دەروونی دیاریکراوی هەیە؟

**٦- هەڵبژاردنی ئامرازەکان:**

پێش گەیشتن بۆ قۆناغی هەڵبژاردنی ئامرازەکان یان دیاریکردنی ئامرازێک، پێویستە قۆناغەکانی دیاریکردنی ئامانجەکانمان تێپەڕاندبێ، کە لە بەرنامە خراوەڕووەکەدا هەولی وەدیهێنانی دەدەین، هەروەها دیاریکردنی جەماوەری ئامانجدار لەم بەرنامەیەدا، ئێمە بە وردی ئامانجمان ئەوەیە گونجاوترین ئامراز هەڵبژێرین کە لەگەڵ بارودۆخی دەوروبەری هەریەک لە رەگەزەکانی پرۆسەی پەیوەندیکردنەکە و بارودۆخی دەوروبەری خۆی بگونجێت و، لەسەر پلاندانەری میدیاکار پێویستە لە کاتی هەڵبژاردنی ئامرازەکان میتۆدی زانستی پەیڕەو بکات:

- هەڵبژاردنی ئەو ئامرازانەی دەگەنە جەماوەری ئامانجدار.
- هەڵبژاردنی ئەو ئامرازانەی لەگەڵ ئامانجە دانراوەکان دەگونجێن.
- هەڵبژاردنی ئەو ئامرازانەی لەگەڵ تواناکانی دامەزراوەکەدا دەگونجێن.
- هەڵبژاردنی ئەو ئامرازانەی لە پێگە جوگرافیەکەیدا دەستەبەرە.

روونی ئەم ئامانجانە بۆ پلاندانەر وای لێ دەکات، کۆمەڵەیەکی کەمتر لەو ئامرازە جۆراوجۆرانە دیاری بکات کە لە گۆڕەپانی میدیایی هەیە، پاشان قۆناغی دیاریکردنی میتۆدێتی دێ، کە لە رێگەیەوە گونجاوترین ئامراز هەڵدەبژێررێت.

**٧- دیاریکردنی کات:**

بەپشتبەستن بە هەموو رەگەزەکانی پێشتری پلانەکە، پێویستە پلاندانەر ئەوە دیاری بکات کەی دەست بە جێبەجێکردنی پلانەکەی دەکات؟ کاتی هەر بەرنامەیەک تیایدا بە وردی دیاری دەکات، دەبێت ئەم کاتە لەگەڵ رەوشی گشتی و رووداوە کۆمەلایەتییەکان و شتی لەو شێوەیە هەماهەنگ بێت، چونکە هەڵبژاردنی کاتی نەگونجاو زۆر لە هەوڵە میدیاییەکان پووچەڵ دەکاتەوە، تەنانەت ئەگەر پلان بۆدانراوو

وردیش بێت. پاشــان قۆناغی خشــتەکردن دێت، کە دانانی خشــتەی جێبەجێکارییە بۆ مــاددە تــەواوە میدیاییەکان کە لە ماوەی ئەو قۆناغەی دیاری کراوە بۆ جێبەجێکردنی پلانەکە بڵاو دەکرێتەوە یان دەخرێتەڕوو یاخود پەخش دەکرێت.

**٨- دیاریکردنی بودجە:**

بودجــەی لێژنــەی میدیــا لەســەر ئــەو ئامانجانە دەوەســتێ کــە دامەزراوەکە حەز دەکات وەدی بهێنێت و، قەبــارەی ئــەو کارانــەی لێژنەکە جێبەجێــی دەکات و بە هەر ئامرازێــک بێــت، زۆرجــار لەبەردەم پلانەکانــدا کەمترین و زیاتریــن رادە بۆ بودجەکە دادەنرێت.

**٩- بەدواداچوون و هەڵسەنگاندن:**

بەدواداچوون و هەڵســەنگاندن لە کاری میدیاییدا هەنگاوێکی گرنگە، بۆ دڵنیابوون لــە بەڕێوەچــوون لــە رێگــەی دروســت بۆ تــووش نەبوون بەهــەر کــەم و کورتییەک و دەســتبەجێ چارەســەرکردنی. لــە هەڵســەنگاندنەوە روون دەبێتــەوە ئامانجــەکان خــوازراون یــان زانیارییە ئاماژە پێ کراوەکان هەڵــەن، یاخود ئامرازەکان نەگونجاون و شــتی لــەو شــێوەیە، ئەمــە وا دەکات هەموارکردنێک لە پســپۆرێتییەکان بکرێت یان گۆڕانکارییەک بەســەر ئەرکەکاندا بکرێت، هەروەها گرنگی هەڵسەنگاندن لە پلاندانانی دوور مــەودا دەردەکــەوێ، چونکــە ناکــرێ لــە کاتــی جێبەجێکردنــی کارە میدیاییەکە پێشبینی بکرێت، کە چی ڕوودەدات پێش چەند مانگێک پلانی بۆ دانراوە.

**هەڵسەنگاندنی پلانی میدیا:**

دەکــرێ کاری میدیــا بە ئامــرازو پەیامەکانیەوە، پێــش جێبەجێکردنی پلانەکە و لە کاتی جێبەجێکردنی و دوای ئەوەش هەڵبسەنگێنین و، وردەکارییەکەی بەم شێوەیە:

**▪ هەڵسەنگاندنی پێشوەخت:**

پێش جێبەجێکردنی پلانی میدیاییەکە دەکرێت، بە ئەنجامدانی چەند تاقیکردنەوەیەکی جیا جیا لەسەر ئامرازەکانی میدیا، بۆ دڵنیابوون لە شیاوییەکەی لە میانەی خستنەڕووی بۆ چەند سمپڵێکی جەماوەر، بۆئەوەی رای خۆیان لەبارەوە دەرببڕن، پێش ئەوەی لە

ڕێگـەی ئامـرازە جیاوازەکانی میدیاوە پەخش بکرێن، لەو شـێوازانەش جێبەجێکردنی تەواوی پلانەکە لە گوند یان شـارێکدا یاخود لایەنێکی فێرکاری، پێش ئەوەی پلانەکە بە سەر تەواوی جەماوەردا بگشتێنرێت.

**▢ هەڵسەنگاندنی قۆناغیی:**

لـە میانـەی جبێبەجێکردنی پلانەکەدا دەبێت، چونکە دوای هەر قۆناغێک تەماشـای مـەودای جێبەجێبوونـی ئامانجەکانـی ئـەو قۆناغـە دەکەیـن و، دوای هـەر قۆناغێـک هەمواری پێویستی بۆ دەکرێ، بەمەش بەپێی توانا لە هەڵەکان دوور دەکەوینەوە.

**▢ هەڵسەنگاندنی پاشوەخت:**

پـاش تەواوبوونـی هەڵمەتەکـە ئەنجـام دەدرێـت، لەم قۆناغـەدا هەڵسـەنگاندن بۆ لێکۆڵینەوە لە سـەرکەوتنی پلانەکە یان زانینی هۆکارەکانی شکسـت لە کاتی شکسـتدا بەسوودە.

**دووەم: کلتووری میدیایی:**

کلتوور، داینەمۆی سەرەکی کردەی مرۆییە، چونکە پێوەری شارستانی نەتەوەکان و گەشـەکردنی بە پێشـکەوتنی کلتووریەوە پەیوەسـتە. بەڵام کلتووری میدیا بریتییە لەو ناوەڕۆکە کلتووریانەی، تاک و گرووپەکە لە سەرچاوە میدیاییەکان وەریدەگرێت و، بیروبـاوەڕو تێڕوانیـن و تێگەیشـتن و بەهاکانیـان پێـک دەهێنێـت، کە کار لەسـەر پێکهێنانی رەفتارو دابونەریت و شێوازی ژیانیان دەکات.

تێبینی ئەوە دەکرێت سـەرچاوەکانی کلتووری میدیایی زۆرە، چونکە ئامرازەکانی میدیـا بـە کاریگەرتریـن ئامرازەکانـی لە رای گشـتی دادەنرێ، تەنانەت ئـەم ئامرازانە بوونەتـە سـەرچاوەیەکی سـەرەکی بـۆ رۆشـنبیری گشـتی بـۆ هەمـوو دەسـتەکانی کۆمەڵگە و، کاریگەرییەکەی بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە پەلی هاوێشتووە، لە میانەی ئەوەی لە ناوەڕۆک پێشکەشی دەکات. لە گرنگترین ئەو سەرچاوانەی ئێستا تاکەکان لە کلتوورە میدیاییەکەیان پشتی پێ دەبەستن، بریتییە لە:

- **میدیای گەردوونی:**

لە دیارترین سەرچاوەکانی رۆشنبیری میدیاییە، مەترسییەکەی لەوەدایە ناتوانرێت

ئاست بۆ كاریگەرییە خراپەكانی دابنرێت، سەرەڕای بوونی لایەنی باش كە ناكرێ فەرامۆش بكرێت و، سەرچاوەیەكی باش بۆ رۆشنبیری میدیایی پێكدەهێنێت. زۆربەی لێكۆڵینەوەكان لە بواری دەروونناسی كۆمەڵایەتی ئاماژە بۆ ئاستی كاریگەری ئامرازەكانی میدیا دەدەن، لەسەر پێكهێنانی رۆشنبیری تاك و رەفتارو كەسایەتییەكەی.

- **ئامرازە تەكنەلۆژییەكانی میدیا:**

شۆڕشی زانیاری سەردەمێكی نوێی بۆ مرۆڤایەتی كردەوە، هاوشێوەی سەردەمی شۆڕشی پیشەسازییە كە ژیانی مرۆڤایەتی گۆڕی، شۆڕشی زانیاری ئاسۆگەلێكی بۆ زانین و رۆشنبیری كردەوە، وای لێ هات مرۆڤ بە بێ رێگر توانای پەیوەندیكردنی لەگەڵ ئەوانی دیكە هەیە، بەمەش سەرچاوەكانی زانین زۆر بوون، كە لە بەرزكردنەوەی ئاستی رۆشنبیری كارپێكردووانی یارمەتیدەرە. بۆنموونە تۆڕی زانیاری ئینتەرنێت بازدانێكی گرنگی جۆریی لە میكانیزمەكانی فێركردن و فێربوون هێنایە ئاراوە، كار بۆ دەستەبەركردنی خزمەتگوزارییە پەروەردەییەكان بەشێوەیەكی پێشكەوتوو و بە تێچوونێكی كەم دەكات.

- **ئامرازە كاغەزییەكانی میدیا:**

ئامرازە كاغەزییەكانی میدیا كە خۆی لە رۆژنامە یان میدیای خوێندراو دەبینێتەوە، لە سەرچاوە رۆشنبیرییە میدیاییەكان باڵی سێیەمە، لە كەم كاریگەرترین ئامرازە رۆشنبیرییەكانی میدیایە لەسەر نەوەی لاوان.

**سێیەم: بیرۆكەی میدیایی:**

ماددەی سەرەكییە كە هەموو رەگەزەكانی تری لەسەر بونیات دەنرێت، لەسەر ئەو بنەمایە بونیاتی میدیایی دروست دەبێت، بیرۆكەیەكە لە دەروون و سنگ و ئاوەزی خاوەنەكانی، بۆ كارێك دەگۆڕێت دەخوێنرێتەوە یان دەبیسترێ یاخود دەبینرێ، وەك هەمەڕەنگ، سەروتارەكان، وتارە رەخنەییەكان، وتارە شرۆڤەییەكان، ستوونەكان، گۆشەكان، لاپەڕە تایبەتییەكان، وێنە و كاریكاتێر.

**بیرۆكەی میدیایی چەند رەهەندێكی هەیە، لەوانە:**

- سەرلەنوێ باس لە بیرۆکەیەکی کۆن دەکات.

- بیرۆکە تازەکە تەنیا جەخت لەسەر بەکاربردن یان پێشەکی بکاتەوە.

- جەخت لەسەر لایەنی مێژوویی بەتەنیا بکاتەوە، سەبارەت بە کاری بابەتیی داهێنانکارانە لەرێگەی پێشکەش کردنی چیرۆکەکانی و پەرەسەندنەکانی.

- جەخت کردنەوە لەسەر بیرۆکەیەکی کۆن لە گۆشەیەکی تازەوە.

- جەخت کردنەوە لەسەر هەڵبژاردنی پاڵەوانەکانی شانۆگەرییەکە و دەرهێنەرو هەموو سیما تازەکان کە کاریان تیا کردووەو، بینەر پێشتر هیچی لەبارەوە نەبیستوون.

- بیرۆکە تازەکە دەبێت لە کاتی گونجاوی بڵاوکردنەوەدا بێت.

- جەخت لەسەر گۆشەکە بکاتەوەو هەمان پاڵەوانە کە لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە و لە کارێک دەچێت بۆ یەکێکی دیکە دەچێت.

- جەختکردنەوە لەسەر چوارچێوەی شوێن، چونکە جێ و پێگەی جوگرافی و شوێنی تایبەتمەند، ئەو چوارچێوەیەیە کە رووداوەکانی تیا روودەدات و، ململانێ و پیاهەڵشاخان روودەدات.

- دەبێت تێڕوانینی تازەی هاوچەرخ بێت بۆ دەقی کۆن و بە گیانی هاوچەرخانە پێشکەش بکرێت و، چەمک و بەها باوەکانی کە زۆر لەوەی کۆنەکە جیاوازە.

**جۆرەکانی بیرۆکەی میدیایی:**

**☒ بیرۆکەی مێژوویی:**

ئەوەیە لە مێژوو و رووداوەکانی و کەس و بەڵگەنامە و سیماو شوێنەکانی بابەتێک هەڵدەبژێردرێ، بۆئەوەی سەرنجی بیسەران و بینەران را بکێشرێت.

**☒ بیرۆکە خراوەڕووەکان:**

لە بەناوبانگترین ئەو بیرۆکانە دادەنرێت کە لە بوارە جیاوازەکانی میدیادا بەکاردەهێنرێت و، روو لە گۆشە و لایەکانی خستنەڕووی راستەوخۆ دەکات.

**☒ بیرۆکەی شیاندن:**

بیرۆکەیەکی زۆر هەستیارە، پێویستی بە عەقڵیەتێکی میدیایی بە ئەزموون و رۆشنبیر هەیە، چونکە هەر کەسێک بە میدیایانە بیری کردەوە ناتوانێت پاڵپشتی

هەستی شیاندنی خۆی بکات.

**⊠ بیرۆکەی ئاراستەیی:**

بریتییە لەو ئامانجانەی ئامرازەکانی میدیا لە گرووپەکەیدا رووی تێ دەکەن و، بە جۆرەهاو ڕێگەو شێواز ئەنجام دەدرێت.

**⊠ بیرۆکەی ڕەخنەگرانە:**

نووسەر یان کارمەندی ئێستگە و تەلەڤزیۆن یاخود پەیوەندییە گشتییەکان، بەرەو پلاندانـان و جێبەجێکردنـی بابـەت و بەرنامە و داتاکان دەبات، کە راسـت لە هەڵە جیا دەکاتەوە.

**⊠ بیرۆکەی وەسفی:**

ئـەم بیرۆکەیـە لـە هەمـان بازنـە میدیایـی و ئێسـتگەیی و تەلەڤزیۆنییەکـەی دەخوولێتـەوەو، دەسـتوەردانی زۆریشـی تیـا دەکرێـت، لێرەدا دەسـتوەردان لەپێناو پێشکەش کردنی وەسفێکە بۆ بیرۆکە میدیاییەکە.

**چوارەم: تایبەتمەندییەکانی میدیاکار:**

میدیاکار، هۆکاری نێوان هەموو لایەنە کرداری و میدیاییەکان و تەوەرەکانێتی و، چەندین تایبەتمەندی هەیە لەوانە:

**⊠ خەسڵەتی ڕۆشنبیری:**

میدیـاکار دەبێـت هەمـوو لایەنەکانـی ڕۆشـنبیری لە خۆیـدا کۆ بکاتـەوە، وا خۆی نەبینێتەوە کە زانین و ڕۆشـنبیریی کەمە، واتا درککردنەکانی فراوان بێت و بیرۆکەی ئامـادە بێـت، گفتوگۆی پاراو بێت، ئەمە وای لێ دەکات لە ڕۆشـنبیری ئەوانی دیکەش تێ بگات، پێش ئەوەی بیگوازێتەوەو لەگەڵیدا کارلێک بکات.

**⊠ خەسڵەتی ئاکاری:**

لـە گواسـتنەوەی پـرس و بیرۆکـەکان دەبێـت دەسـت و داوێن و زمـان پاک بێت، خاکیـی بێـت و لەخۆبایـی نەبێت لەوەی پۆسـتە میدیاییەکەی دەرفەتـی چاوپێکەوتنی گـەورە کەسـایەتییەکانی پـێ دەدات، هەروەهـا جێـی متمانـە بێـت و پابەنـد بێـت بـە

نموونەی باڵا کە خەباتی بۆ دەکات، دەبێت کۆمەڵایەتی بێت و بەشداری لە خۆشی و ناڕەحەتییەکانی خەڵک بکات.

**☒ خەسڵەتی کەسیتی:**

توانای تێگەیشتنی ئەوەی هەبێت کە دەیخوێنێتەوە یان دەیبیستێ یاخود دەیبینێ، توانای شیکردنەوەی ئەمەی هەبێت، بەشێوەیەکی ئاگامەندانە پەی بەو پرسانە دەبات و، تێڕوانینێکی کاریگەرو بڕێکی زۆر لە هاوسەنگی پێوە دیار بێت، هەروەها دەبێت لای ئەوانی دیکە پەسندکراو بێت، نابێت قسە زۆر بکات، بەڵکو دەبێت خۆی لە خۆپەرستی دوور بخاتەوە، لەگەڵ وتوویژکەران دادپەروەرو بەویژدان بێت، لە مەسەلەکان زیادەڕۆیی نەکات و گەورەیان نەکاتەوە.

**☒ خەسڵەتی کرداری:**

پێویستە میدیاکار هەست بە کێشەکانی کۆمەڵگەکەی بکات و لەگەڵیدا کارلێک بکات، ئەم کارلێکە لەگەڵ توانای میدیاکار پەیوەستە، بۆ دروستکردنی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەوانەی سەرچاوەیەکی گرنگی کۆکردنەوەی زانیارین.

**پێنجەم: ئازادی ڕادەربڕین:**

ئازادی ڕادەربڕین، ئەو ئازادییەیە کار دەکات بۆئەوەی تاک بە سروشتی خۆڕسکی بەبێ ئاستەنگ لەبارەی خۆی و کۆمەڵگەکەی بدوێ. بۆ وەدیهێنانی ئازادیش پێویست دەکات بەپێی توانا هاووڵاتیان لە حکومەت یان دەسەڵات بێلایەن بن و، بڕوای پتەویان بەو ئاوەزە هەبێت کە گفتوگۆو مشتومڕ بەرهەم دێنێ و، بوونی ژینگەیەک کە لێبووردەیی تیا ڕەنگ بداتەوەو ئازادی ڕادەربڕینی تیا فەراهەم بێت.

ئازادی ڕادەربڕین بەپێی شارستانی چاخە جیاوازەکان، جیاوازن:

**☒ ئازادی ڕادەربڕین لە شارستانیەتە کۆنەکاندا:**

سەرەتا لە (کۆنفۆشیۆس)ی دانای چینەوە بوو، وای دەبینی زانین واتە ژیریی و یارمەتی ژیریی دەدات بۆئەوەی ژیانێکی باشتر بۆ تاک و کۆمەڵگە وەدی بهێنرێت، (ئەرستۆ) باسی لەوە کرد کە تاک بەرپرسیارێتی هەڵبژاردنی ئازادانەی دەکەوێتە

ئەستۆ.

**⊠ ئازادی دەربڕین لە سەردەمی مەسیحی:**

تیایدا ئـازادی را روبـەڕووی چەوسـاندنەوەو زۆرداری بـووەوە بەتایبەتـی لـە سـەردەمی قەشـە (ئۆگەسـتین)دا، کە کاری دەکرد مەسـیحیەت بە زۆر بسەپێنێت، بە بیانووی دژایەتیکردنی بێ باوەڕیی.

**⊠ ئازادی رادەربڕین لە ئیسلامدا:**

ئایینی ئیسلام لە بواری ئازادی دەربڕین لەبارەی را تەنانەت لەگەڵ سەرکردەکانیشدا دەوڵەمەندە.

**⊠ ئازادی دەربڕین لە سەردەمی حەڤدە و هەژدەیەم:**

رەوشـێکە فەیلەسـووف (تۆماس هۆبس) لە تیۆری ئاوێتەکردنی کۆمەڵایەتی دانیا، کـە بریتییـە لـە ئاماژەگەلێک لەبـارەی سـەرەتای کۆمەڵگـەی رێکخـراوو پەیدابوونی حکومەتـەکان. هەروەها فەیلەسـووفی ئەڵمانـی (ئیمانوێل) بانگەشـەی ئەوەی کرد کە پرەنسـیپەکانی رەفتـارو ئـاکار پێویسـتە لەرێگـەی هۆکارەکانەوە پێی بگەین. پاشـان شۆڕشـی فەرەنسـی لەسـاڵی ١٧٨٩ بەرپابـوو و دروشـمی ئازادی مرۆڤـی راگەیاند، بەمەبەسـتی هەڵگرتنـی سـتەم و زۆر کـە بەدرێژایی سـەردەمەکانی پێشـوو لەسـەر مرۆڤ بوو.

**⊠ ئازادی دەربڕین لە سەردەمە تازەکاندا:**

لـە سـەدەی نۆزدەیەمدا بیرۆکەکانی (میل)ی فەیلەسـووف بڵاو بـووەوە، (قازانج) ی وا لێکدایەوە کە هەڵسوکەوتێکی ئاکارییە و ئامانج لێی خێری گشتی و وەدیهێنانی خۆشـنوودییەکی گەورەترە بۆ زۆرترین خەڵک، هەروەها بانگەشـەی ئەوەی کرد کە تاک بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندی تێکڕا هەوڵ دەدات بەهەمان ئەو گیانەی بۆ وەدیهێنانی قازانجی کەسـیی هەوڵ دەدات. پاشـان پەیدابوونی پێشـکەوتنی خێرا لە ئامرازەکانی پەیوەندیکردن لە سـەدەی بیسـتەمداو، ئەو ئەنجامەی لە هەردوو جەنگی جیهانییەوە پەیـدا بـوون، کـە جەخـت لەسـەر مافی تاک لـە ئـازادی رادەربڕین و هەڵسـەنگاندنی زانیاری و بیرۆکەکان دەکاتەوە.

**شەشەم: ئازادی رۆژنامەگەری:**

رەگ و ریشـــەی ئـازادی رۆژنامەگـەری دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـازادی تاکەکەسـی لـە دەسـکەوتنی زانیـاری و بەدواداچوونـی لەســـەر کـۆی ئـەو رووداو پێشـهات و گۆڕانکارییانـەی لە کۆمەڵگاکەیدا روو دەدەن، چونکە ئازادی رۆژنامەگەری بەشـێکی دانەبـڕاوە لـە ئازادیـە گشـتییەکان و مافـە بنەڕەتییەکانـی مـرۆڤ لـە هەمـوو کات و شوێنێکیدا.

راو بۆچـوون لەبـارەی چەمکـی ئـازادی رۆژنامەگـەری جیـاوازن، لـە سـەدەی نۆزدەیەمـدا (لـورد تۆمـاس ماکولـی) رای وا بووە ئازادی رۆژنامەگـەری مانای مافە لـە بڵاوکردنـەوەی ئـەو شـتەدا کە دەتـەوێ و، پارێزگاریشـی لێ بکرێ لـە دژی هەر بەرپرسیاریەتییەک لەم کارە، ئەمە جگە لە بڵاوکراوە بێ باوەڕی و ئابڕووبەرەکان، یان ئەوانـەی ئابڕووبـەری و جنێـو لەخـۆ دەگرن، ئـەو بڵاوکراوە درۆزنانـەش کە زیان بە ئابڕووی مرۆڤ و بەرژەوەندییەکانی دەگەیەنن.

(ڤۆلتێـر) پێیوایـە «رۆژنامەگـەری دەزگایەکە بە کەس ناشـکێ، بەڵام خۆی دنیای کـۆن دەڕووخێنـێ تـا دنیایەکی نـوێ دامەزرێنـێ». ئەمەش کاتێک دێتـە دی کە ئازاد بێـت، ئەگەرنـا ناتوانـێ رۆڵـی خۆی ببینـێ و، لە دەزگایەکـی بەهێزو کاریگـەر دەبێتە ئامرازێکـی چەواشـەکارو گوێڕایەڵ. هەروەها (هیتلـەر) رۆژنامەگەری بە قوتابخانەی جەماوەری وەسف کردووەو، دەڵی «رۆژنامەگەری قوتابخانەیەکە جەماوەر زانیاری رۆژانەی لێ وەردەگرێ». ئەو کاتە رۆژنامەگەری دەبێتە قوتابخانەو گەل زانیاری لێ وەردەگرێ، کە ئازاد بێت.

ئازادی بیر لەســـەردەمی نوێماندا بەهای نوێی وەرگرتووەو دابەکانی چەسـپیون، بەهۆی ســـەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی ئازادی میدیا لە دوای شـەڕی جیهانی دووەمـەوە، ئەگـەر ئـازادی بیـر بـەر لـە سـەدەیەک لـە ئەوروپا لـە شـێوەی ئازادی رۆژنامەوانیـدا بەرجەسـتە بووبێـت، ئـەوا ئـازادی بیـر لەجیهانی ئەمڕۆدا لـە ئازادی میدیادا بەرجەسـتە دەبێت، لەبەر گرنگی رۆڵی دەزگاکانی پەیوەندیکردنی جەماوەری نوێ، بەتایبەت رادیۆو تەلەفزیۆن و رۆژنامەو سینەما.

ئەگەر ئەو رایەی هارتلیپ (Hartlep) وەرگرین کە دەڵێت: ئازادی رۆژنامەوانی پێویستی بەوەیە سەرجەم ئەو ئامرازانەی پەیوەندیکردن تەواو ئازادبن کە هەواڵ بە رۆژنامەکان دەدەن، بۆمان دەردەکەوێت کە رەگەزەکانی ئازادی میدیا بریتین لە: رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن و سینەما، چونکە فەرمانی سەرەکی دەزگاکانی میدیایی جەماوەریی بریتییە لە ئاگادارکردنی جەماوەر لەو شتانەی لە ژینگەی ناوخۆیی و نەتەوەیی لە دوای ئەودا روودەدەن.

رۆژنامەگەری ئازاد بەو جۆرە راگەیەنراوە دەوترێت، کە کۆمەڵێک، کەرتی تایبەت، خاوەن سەرمایە، رۆژنامەیەکی سەربەخۆ دەردەکەن، بەو مانایەی پەیوەست نین بە هیچ هێزێکی ئایدۆلۆژییەوە، لەگەڵ ئەوەش لەسەر لاپەڕەکانی رۆژنامە کە هەموو هێزێکی ئایدۆلۆژی و هزری شوێنێک بۆ خۆیان داگیر دەکەن.

لە سیستەمە دیموکراتەکاندا رۆژنامەگەری بە ئازادی و دوور لە سانسۆری حکومەت کار دەکات. حکومەتە دیموکراتەکان وەزیری میدیایان نییە تاکو ناوەڕۆکی رۆژنامەکان یان چالاکی رۆژنامەنووسان کۆنترۆڵ بکەن، بەهەمان شێوە هیچ رێوشوێنێکی دیکەیان نیە تا بەسەر رۆژنامەنووساندا بیسەپێنن بۆئەوەی لەژێر سانسۆری دەوڵەتدابن، یان رۆژنامەنووسان ناچار بکرێن ببنە ئەندام لەو فیدراسیۆنانەدا کە حکومەت سەرپەرشتییان دەکات.

رۆژنامەگەری ئازاد بەرچاوی جەماوەر رۆشن دەکاتەوەو زانیاریان پێ دەگەیەنێت و لێپرسینەوە لەگەڵ سەرکردەکاندا دەکات و، سەکۆیەک بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر مەسەلە لۆکاڵی و نیشتیمانییەکاندا دەستەبەر دەکات.

رۆژنامەنوسان لەکاتی راپەڕاندنی کارەکانیان توشی ئاستەنگ و بەربەست دەبن، ئەمەش کارێکی ئاساییە، چونکە پیشەکە خۆی بەکارێکی زەحمەت و پرسەرئێشە ناسراوە، بەلام ئەم ئاستەنگانە لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی ترجیاوازە، بۆنمونە لەولاتێکی دیموکرات و پێشکەوتوو رێگرێکی ئەوتۆ نیە لە بەردەم کاروو پیشەی رۆژنامەنوس بە پێچەوانەی ولاتە دکتاتۆرو حکومەتە تاکڕەوەکان یان ئەو ولاتانەی لە سەرەتای پرۆسەی دیموکراسی دان و ئازادیەکان تێیدا رێژەییە.

ئازادی رۆژنامەگەری بەبێ سیستەمێکی دیموکراس و کراوە هەلی سەرکەوتن و گەشەسەندنی بۆ نارەخسێ و زۆر زوو سنووردار دەکرێ، دەسەڵاتدارانیش ئەگەر مەبەستیان بێ کۆمەڵگا بە روویان نەتەقێتەوەو درێژە بە مانەوەی خۆیان بدەن دەبێ چەند دەریچەیەک لە بەردەم دەربڕینی ئازادانەی هاوڵاتیان و رۆژنامەگەریدا واڵا بکەن تاکو لەڕێیەوە خواست و نهێنییەکان ئاشکرا بکەن.

ئازادی رۆژنامەگەری یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی هەمیشە لای رای گشتی و کۆمەڵگەی دیموکراسیەوە جێگای بایەخ بووە، چونکە ئازادی وشە سەرەتای دیموکراسیەتە. بە گشتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەم چەندین رێگری و سانسۆری پێشوەخت لەبەردەم ئازادی رۆژنامەگەریدا سەرهەڵدەدەن، هەندێ جاریش لەڕێی چەندین برگەی دەستوری و یاساییەوە میدیاکان لغاو دەکرێن و گوشاری زیاتریان دەخرێتە سەر.

**حەوتەم: میدیای پەروەردەیی:**

میدیای پەروەردەیی زاراوەیەکی تاراددەیەک تازەیە، لە کۆتایی حەفتاکان سەری هەڵدا، کاتێک رێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ پەروەردەو رۆشنبیری و زانست (یونسکۆ) بەکاری هێنا، بۆ ئاماژەدان بەو پێشکەوتنەی بەسەر سیستەمەکانی زانیاری پەروەردەییەدا هات، هەروەها شێوازەکانی دیکۆمێنت کردن و پۆلێنکردن و سوود لێ وەرگرتنی.

لەگەڵ پێشکەوتنی گەورەی تەکنەلۆژی کە لە سێ دەیەی دواییدا بە سەر ئامرازەکانی میدیادا هات، کە خۆی لە هەڵوەشانەوەی بەربەستە کاتیی و شوێنییەکان دەبینێتەوە، بەهۆی تەکنەلۆژیای پەخشی ئاسمانی لە رێگەی مانگە دەستکردەکانەوە، پێشکەوتنی چەمکی میدیای پەروەردەیی، پەلی هاویشت بۆ ئەوەی ئەرکە پەروەردەییەکانی ئامرازە گشتییەکانی میدیایش بگرێتەوە، کە خۆی لە هەوڵدان بۆ وەدیهێنانی ئامانجە گشتییەکانی پەروەردە لە کۆمەڵگەداو، پابەندبوون بە بەها ئاکارییەکان دەبینێتەوە، ئەم پێشکەوتنەش بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

١- پێشکەوتنی چەمکی پەروەردە کە ئاسۆی فراوانتر بووەو، مانادارتر بووە لەو رووەی پەیوەندی بە رەفتارو هەڵسەنگاندنەکەی هەیە و، تێڕوانینی بۆ پەروەردە بەوەی پرۆسەیەکی گشتگیرو بەردەوامە و، ئازادکردنی لە کۆتوبەندی شێوازی فەرمی دامەزراوەیی.

٢- بڵاوبوونەوەی ئامرازەکانی میدیا لە چوارچێوەیەکی فراوانداو، گەشەکردنی تواناکەی بۆ راکێشانی وەرگری پەیامی میدیایی، دواجار توانای بۆ رۆڵبینینی پەروەردەیی هاوشێوەی ئەوەی دامەزراوەی فەرمی پەروەردەیی ئەنجامی دەدات.

٣- دزەکردنی هەندێ بەهای نەرێنی و، دابونەریتی نامۆ بۆ کلتووری کۆمەڵگەکان، بەتایبەت لە وڵاتانی تازە گەشەسەندوو لە سایەی ئازادی میدیادا.

سەبارەت پێناسەی میدیای پەروەردەیی، ئاراستەی یەکەم وای دەبینێت، مەبەست لە میدیای پەروەردەیی ئەو پێشکەوتنەیە بەسەر سیستەمەکانی زانیاری پەروەردەیی و، شێوازەکانی دیکۆمێنت کردن و پۆلێنکردنی و سوود لێ وەرگرتنیدا هاتووە. ئەو کەموکورییەی لەم پێناسەیە دەگیرێت ئەوەیە، ئاماژەیەکی لەخۆگرتووە لە چەمکی سیستەمەکانی زانیاری پەروەردەیی نزیکترە، نەک چەمکی میدیای پەروەردەیی، چونکە بوارەکانی میدیای پەروەردەیی بۆ خۆی بوارەکانی پرۆسەی پەروەردەییە و، هەموو زانیارییە زانستی و پیشەیی و کۆمەڵایەتییەکان دەکرێ بابەتیک بن بۆ پرۆسەی پەروەردەیی و توێژینەوەی پەروەردەیی، چونکە دواجار دەکرێ بابەتێک بن بۆ میدیای پەروەردەیی.

بەڵام ئاراستەی دووەم وای دەبینێت میدیای پەروەردەیی پەل دەهاوێت بۆئەوەی وردەکارییەکانی ئامرازە گشتییەکانی میدیا بگرێتەوە. ئەوەی خاوەنانی ئەم ئاراستەیە پێشکەشیان کردووە، لە تەنیا رایەک تێ ناپەڕن و، بە پێناسەیەک بۆ میدیای پەروەردەیی دانانرێ، لەبەرئەوەی کەموکوڕەو گشتێتی پێوە دیارە، هەروەها دوو کێشەی سەرەکی دەوروژێنێت، کێشەی یەکەم خۆی لە دیاریکردنی ئەو پێوەرانە دەبینێتەوە کە دەکرێ لە دەرکردنی بڕیار لەسەر ناوەڕۆکی ئامرازە گشتییەکانی میدیا پشتی پێ ببەستین، لەکاتێکدا کێشەی دووەم لە بنەماکانی پابەندبوونی پەروەردەیی

و ئاكاری ئامرازەكانی میدیا خۆی دەبینێتەوە.

ئاراستەی سێیەمیش پێیوایە، میدیای پەروەردەیی هەوڵێكی جدییە بۆ سوودوەرگرتن لە تەكنیكەكانی پەیوەندیكردن و زانستەكانی، لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجی پەروەردەیی بەبێ زیادەڕۆیی لە جدیەتی پەروەردەو رەسەنایەتییەكەی، یان زیادەڕۆیی لە كۆنترۆڵ كردنی هونەرەكانی پەیوەندیكردن و ورووژاندنی بەسەریدا.

ئەو رەخنەیەی لەم پێناسەیە دەگیرێت ئەوەیە، پێناسەیەكی رێككەوتنی كاریگەرە بە واقیعی ناكۆكی نێوان پەروەردەكاران و میدیاكاران لەبارەی پاشكۆیەتی ئەم زاراوەیە، سەرەڕای جیا نەكردنەوە لە نێوان چەمكی پەیوەندیكردن و میدیا، هەروەها پشتگوێ خستنی هەندێ لایەنی گرنگی وەك: ناوەڕۆكی پەیامە میدیاییەكان بۆ میدیای پەروەردەیی.

هەرچی ئاراستەی چوارەمە وای دەبینێ، میدیای پەروەردەیی پشت بە بەرنامە پەروەردەییەكان لە ئێستگە و تەلەفزیۆن دەبەستێ و، لەسەر گۆڤارو بڵاوكراوە پەروەردەییەكان و وانە و كۆڕەكان. لەگەڵ ئەوەی ئەم پێناسەیە ژمارەیەك لە ئامرازەكانی میدیای پەروەردەیی دیاری دەكات، بەڵام چییەتی بەرنامە پەروەردەییەكان و، سروشتی ناوەڕۆكەكەی روون ناكاتەوە، ئایا مەبەست لێی پرۆگرامە فێركارییەكانە، وەك وانە میتۆدییە پاڵپشتەكان بۆ قوتابیانی قوتابخانەكان و، بەرنامەكانی مەشقی مامۆستایان لە كاتی خزمەتدا؟ یان بەرنامە پەروەردەییەكان بەپێی چەمكی گشتگیری پەروەردەی بەردەوامە؟

میدیای پەروەردەیی بایەخمەندە بەو گەشەكردنەی كە بەسەر سیستەمەكانی زانیاری پەروەردەیی و، شێوازەكانی دیكۆمێنتكردنی و پۆلێنكردنی و سوود لێ وەرگرتنیدا هاتووە. میدیای پەروەردەیی فەلسەفەكەی لە فەلسەفەی كۆمەڵگە و سیاسەتەكانی لە بواری سیاسی.. هتد وەردەگرێت، جۆرێك لە پەیوەندی لە نێوان فەلسەفەی میدیاو فەلسەفەی كۆمەڵگە هەیە، لە میانەی پەیوەندی لە پەروەردەكردنی گەلان و فێركردنیان و، قەناعەتپێكردنیان بە فەلسەفەی سیستەمی سیاسی وڵاتەكە، كە هەریەك لە میدیا و فێركردن رۆڵی سەرەكی لە پاڵپشتی فەلسەفەی كۆمەڵگە

دەبینن، کە کار بۆ زیادبوونی ئاگایی جەماوەر دەکات کە بە مەرجێکی گەوهەری بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دادەنرێت و، کار بۆ بونیاتنانی مرۆڤ دەکات.

**لێرەدا پێویستییەکانی میدیای پەروەردەیی دەخەینەڕوو:**

١- ناسینی کۆڵەکە سەرەکییەکانی فەلسەفەی کۆمەڵگەیە لە هەموو بوارەکاندا.

٢- ڕەوتکردن لەگەڵ کۆشش و پلان و بەرنامە جێبەجێکارییەکان، کە ئامانجی وەدیهێنانی ئەم فەلسەفەیەیە و بۆ واقیعی میدیای بەردەوام و، پەیوەست بە گۆڕاوە سیاسی و ئابوورییە نێودەوڵەتی و ناوخۆییەکان دەیگۆڕێت، بۆئەوەی ڕەنگدانەوەی لەسەر بونیاتی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کۆمەڵگە هەبێت.

٣- ناسینی پێداویستی سەرەکی تاکەکان و کۆمەڵگەیە لە قۆناغە جیاوازەکانی پێشکەوتندا.

٤- ئامادەکردن و مەشق و هۆشیاری بەردەوام بۆ توخمە مرۆییەکان، کە ئەرکی میدیا لەم بوارەدا ئەنجام دەدات.

٥- جەخت کردنەوە لەسەر پابەندبوونی ئاکاری و پەروەردەیی لە ناوەڕۆکی پەیامی میدیایی، بۆ خزمەتکردنی پرۆسەی پەروەردە بە لایەنە جۆراو جۆرەکانی، ئەم پرۆسەیەش بەم جۆرە ئەنجام دەدرێت:

أ/ ئاراستەکردن و ڕێنمایی کە بۆ پێکهێنانی هەڵوێستەکان و گەڵاڵەکردنی ئاراستەکان یارمەتیدەرە.

ب/ زیادبوونی ڕۆشنبیری و زانیارییەکان.

ج/ گواستنەوەی کەلەپووری ڕۆشنبیری لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە.

ء/ گەڵاڵەکردنی پرۆگرامگەلی جدی میدیای بەسوودو ئامانجدار، ئامانجی بەرزکردنەوەیە بە بوارەکانی زانینی مرۆڤایەتی پابەندبوو بە بەهاو ئاکارو شتی دیکە.

**ئەرکی میدیای پەروەردەیی بەرامبەر منداڵان:**

ئەرکی ئومێدبەخش لە میدیا بەرامبەر منداڵان پەروەردەیی و ڕۆشنبیرییە، وڵاتە جیاجیان گەیشتنە ئەو بڕوایەی وەبەرهێنان لە بواری چاودێری کردنی منداڵ و

پێگەیاندنی لـە گرنگترین وەبەرهێنانەکانـە، بۆیـە میدیـا لەگەڵ خێزاندا لە پێشـەوەی ئـەو هۆکارانـە دێ، کە ئـەم چاودێرییە پەروەردەییە و پێگەیاندنە رۆشنبیرییە وەدی دەهێنێت.

قۆناغـی منداڵـی بەوە جیـا دەکرێتەوە کە قۆناغی بونیاتنانـی زانین و دامەزراندنی بەهاکانە و پێویستی بە چاودێرییەکی تایبەتە، هەر لە باوک و دایکەوە کە چاودێری هەڵسوکەوتی منداڵەکانیـان دەکەن و رێکخستنی پێداویستییەکانیان، بـاوک و دایک بەتواناترین ئەندامانی خێزانـن بۆ چاودێریکردنی منداڵەکانیان و خۆشنوودکردنیان. ئەگەر باوک و دایک بینییان منداڵەکەیان لاساری و کارێکی خراپی کردووە، پێویستە تەمبێی بکەن، بەتایبەتی ئەگەر گەیشتە تەمەنی جیاکاری یان هەرزەکاری، بەوپێیەی ئـەم دوو قۆناغـە هێـزە عەقڵییەکـەی تیایـدا زیـادە بێـت و خەیاڵـی فـراوان دەبێت و، چەمکەکانی تیایدا گەشە دەکات و هەستە دروستکراوەکەی بەرز دەبێتەوەو، لەڕووی سێکسییەوە ئامادەباشـی دەبـێ، بۆیە پێویسـتی بە چاودێری کـردن و تەمبێ کردنی زیاترە.

ئامرازەکانی میدیا لەئێستادا لەگەڵ خێزان و قوتابخانە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ کاریگـەری هاوبەشـی هەیـە و، لـە تواناداد هەیـە کۆنترۆڵی ئەو بابەتانـەی میدیا بکات کـە بـڵاو دەبێتـەوە، کۆنترۆڵ بکرێ، بەڵکو وای لێ هاتـووە رۆڵێکی پەروەردەیی کارا بەرامبەر منداڵەکانمان پەیڕەو دەکات، کە خەریکە لە ئاستی ئەرکی پەروەردەیی باوک و دایـک رکابـەری یان کەم دەکاتـەوە. لێکۆڵینەوە زانسـتییەکان ئاماژەیان بەوە داوە، بارودۆخی خێزانی و سەرقاڵبوونی باوک و دایک کاریگەری گەورەی لە رەخساندنی دەرفەت هەیە، بۆئەوەی میدیا ئەرکە پەروەردەییەکەی خۆی پەیڕەو بکات، بەمەش وا دەکات ئامرازی میدیاو ناوەڕۆکەکەی گرنگییەکی گەورەی لە دیاریکردنی لایەنە باش و خراپەکان هەبێ بۆ چاودێریکردنی میدیای پەروەردەیی.

ئەگەر ئامرازەکانی میدیا ئەم کاریگەرییەیان هەیە، ئەی لەبەر چی تەوزیف ناکرێن بۆئـەوەی لـە پەروەردەکردنـی تـازە پێگەیشـتووان و فێرکردنیـان ئامـرازی کارا بن، مەسـەلەکە پێویسـت بـە بەڵگە ناکات کە بیسـەلمێنێت منـداڵ لە ئامرازەکانـی میدیاوە

بەتایبەتی تەلەڤزیۆن فێر دەبن، باوک و دایک تێبینی دەکەن کە منداڵەکانیان لە تەلەڤزیۆنەوە هەندێ دەستەواژەی زمانەوانی و هەندێ رەفتار فێر دەبن و، هەندێ زانیاری و هەواڵ و ناویان وەبیر دێتەوە کە دەیبینن. منداڵەکان ئەم مەسەلانە وەردەگرن و هەست ناکەن کە فێر دەبن، ئایا پێویست ناکات هەڵسووڕێنەرانی ئەم ئامێرە کاریگەرە وای لێ بکەن ئامرازێکی پەروەردەیی بێت و، کۆنترۆڵی ناوەڕۆکەکەی و شێوازی پێشکەش کردنی بکەن، بە جۆرێک لەگەڵ بەهاکانمان بگونجێت و، ئامانجی پەروەردەیی بپێکێت؟ ئایا چاوەڕوان نەبین کە دەکرێ بەم ئامرازە سەرنجڕاکێشە ئارەزووی منداڵەکانمان گەشە پێ بدەین؟ بەڵکو دەکرێ چاودێری بەهرەمەندەکانیان بکەین و، بەهۆی بەرنامەی تایبەتەوە لە ئامێزیان بگرین، هەر کاتێک میدیا ئەمەی کرد، ئەوا ئامێرەکانی دەبنە قوتابخانەی دەرگا کراوە بۆ هەموو قوتابییەک و، ئامێزگایەکی بە پیت بۆ گەشەی ئارەزووەکان و کرانەوەی پێشکەوتن و سەرپەرشتی بەهرەکان.

**گرنگترین ئەو بنەماو پرەنسیپانەی میدیای پەروەردەیی پشتی پێ دەبەستێ:**

١- وێنابینینی واقیعی بۆ رووداوەکانی سروشتی ژیان بەبێ زیادەڕۆیی لە خستنەسەری خەسڵەتی رۆشنبیری و تایبەتمەندی خوازراو لە وڵاتانی دیکەوەو، کۆمەڵگەگەلێک کە لەڕووی رۆشنبیرییەوە لە کۆمەڵگەی ئێمە جیاوازن. ئەمەش بەنموونە لەبەرئەوە جێبەجێ دەبێت کە پەیوەستە بە وێنابینی سروشتی ماڵ، بە هەڵسەنگێنراوو ناوەڕۆکەکانی و جۆری کەلوپەلەکەی و شێوازی ژیانی مرۆڤ.

٢- پێویستە کارە درامییەکان جەخت لەسەر دژایەتیکردنی هەندێ بەهای نەرێنی بکەنەوە کە لە نێو لاواندا بڵاو بۆتەوە، بەجۆرێک لەگەڵ قەبارەی مەترسییەکەی و کاریگەرە زیانبەخشەکانی بگونجێت، هەروەها رەچاوکردنی وریایی لە کاتی بەکارهێنانی، واتە بە شێوازێک تاوتوێ بکرێت کە دەرەنجامە ریزبەندکراوە رقلێبووەکان لەسەر دەست پێوەگرتنی روون بکاتەوەو، بەوەی لە بەهاو خاوەنەکەی زامنی ساردیی جەماوەر بێت.

٣- پێویستە رەچاوی ئەوە بکەین کەسایەتی خۆشەویست لە کاری درامی بەهای

نەرێنی پێ بدەین، چونکە ئەنجامی هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان دووپاتیان کردۆتەوە، کە جەماوەر لەگەڵ کەسایەتی خۆشەویست لە کاری درامیدا هاوسۆزە، ئەگەرچی بەها یان هەندێ بەهای نەرێنی هەڵگرتبێ، کە مەترسییەکی گەورەش دەنوێنێ و ئەگەری خۆ نیشاندانی رەفتاری ئەو کەسایەتییە خۆشەویستە زیاد دەبێت، جا ئەرێنی بێت یان نەرێنی، مادام جەماوەر لەگەڵیا هاوسۆز بوو.

٤- پێویستی هەماهەنگی لە نێوان دامەزراوە جیاوازەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی وەک خێزان و قوتابخانە و ئامرازەکانی میدیا، بۆ گەیشتن بە گونجاوترین شێوازەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی بۆ منداڵان لە میانەی بەرنامەی تەلەڤزیۆنی.

٥- پێویستی ئامادەیی پیشەیی بۆ شارەزایان و پسپۆران لە بەرنامەی منداڵان وەک سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ زانیارییەکان، هەروەها دەبێت چاودێری پێویست لەسەر ئەو بەرنامەیە و بەپێی توانا داماڵینی شێوازو بەهاکانی توندوتیژی دەستەبەر بێت، ئەوەش بۆ پارێزگاری منداڵانە لەو بەهایانە.

٦- پێویستی بوونی سیاسەتێکی روونی میدیا، پشت بە فەلسەفەی کۆمەڵگە و بیرو باوەڕەکەی ببەستێ و، بەسەر کارمەندانی بواری ئامادەو پێشکەشکردنی بەرنامەکان و ئەوانی دیکە دابەش دەکرێ، کە لە بواری وشەی بینراوو بیستراوو خوێنراو کار دەکەن، بۆئەوەی روانینەکەیان لا روون بێتەوە.

٧- پێویستە هەماهەنگییەکی وردو تەواو هەبێ لەنێوان سیاسەتە میدیاییەکان کە لە وەزارەتی میدیاو رۆشنبیرییەوە دەردەچن و، سیاسەتە پەروەردەییەکان کە لە وەزارەتی پەروەردەو فێرکردنەوە دەردەچن، بۆئەوەی ناکۆکی نێوان هەردوو سیاسەتەکە بشاردرێتەوە.

٨- باشتر وایە هاریکارییەکی توندو تۆڵ هەبێت، لەنێوان بەرپرسانی پەروەردەکردنی لاوان و ئەوانەی خۆیان لەو لایەنە بەرپرسانە دەبیننەوە، کە وەزارەتەکانی پەروەردەو رۆشنبیری و لاوان و ئەوقاف هەروەها کارو کاروباری کۆمەڵایەتییە، لەمیانەی دانانی سیاسەتی میدیا تاکو ئەوە بێت کە گرووپەکە دەیەوێ و، لەگەڵ بەهاو بیرو باوەڕو ئامانجەکانی کۆمەڵگە بگونجێت.

٩- کەمکردنـەوە لە زنجیـرە تەلەڤزیۆنییەکان کە رەنگدانەوەی وردەکاری تەواوی تاوانەکەیـە، نـەوەک ببێتـە مایـەی چاولێکردن لەلایـەن ئەو گەنجانەی کـە دەروونیان لاوازە، وەک ئەوەی دەرهێنانی تاوانەکانی دزی و بەرتیل بەشێوەیەکی نارەزایی بێت نـەوەک گەنجـان لاسـایی بکەنەوە، لەهەمان کاتدا پێویسـتە ناوەرۆکـی زنجیرەکە ئەو سزایە بە جوانی دەربخات کە لەگەڵ قەبارەی تاوانەکە دەگونجێت.

١٠- بەرهەمهێنانی ئەو زنجیرە درامایانەی مۆرکێکی ئایینی پێوەیە، سەرنجڕاکێش بێت و، بە زمانی میللی بێت تاکو بینەر پەسندی بکات، ئەمە سەرەڕای رەچاوکردنی بۆ بەرزبوونەوەی پلە بە پلە لە ئاستی گەشەی ئاکار، بەجۆرێک لەلایەکەوە لە پێکهێنانی ویژدانـی ئـاکاری یارمەتیـدەر بێـت، لەلایەکی دیکـەوە تەمەنـە جیاوازەکانـی بینەران لەپێنـاو گەشـەپێدانی بەهـا ئاکارییەکانیـان رەچـاو بـکات، جگە لەمەش پێویسـتە ئەو زنجیرانە رەنگدانەوەی ئەو هەڵوێسـتانە بن کە هاندەرە بۆ جێبەجێکردنی کردارییانەی پرەنسیپە ئاکارییەکانە، کە بۆ پەیڕەوکردنی یارمەتیدەر بێت.

١١- پێشـوازی نەکـردن لـە لاسـایی کردنـەوەی کوێرانـەی هـەر هاوردەیـەک لە رۆژئـاواوە، جـا چ لـە بواری ئەدەبیات یـان هونەر یاخود دابونەریـت و ئەتەکێتەکانی هەڵسوکەوت بێت، ئەگەر بمانەوێ هەندێ لایەن لە ئەدەبیات یان هونەر وەربگرین، با لە سـنووری ئەوە بێت کە واقیعەکەمان دەیخوازێت بە بەهای رەسـەنی و دابونەریتی کۆنی و پێویستە پێداگیرەکان.

١٢- پێویسـتی بایەخـدان بـە فیدبـاک لـە جەمـاوەری لاوانـەوە بەتایبەتـی و، پەیوەندیکردنـی بـۆ پەیوەندیکردنـکاران و سـووربوون لەسـەر ئـەوەی بـۆ هەمـوو جەماوەر بگوازرێتەوە، ئەوەش بۆ زامنکردنی بەشـداری لاوان لە دەرەنجامی میدیاو سیاسەتەکەیدا.

١٣- بونیاتی دراماکە لەسەر بنەمای پرەنسیپ و بەهاو چەمکی ناچار بوو بە لای کۆمەڵگەوە بێت، هەریەک بۆ زۆربەی بەرنامە تەلەڤزیۆنییەکان وایە، لە گرنگترین ئەو پرەنسیپانەش:

- دورخستنەوەی دەستەواژەو زاراوەی بازاڕی یان ئەوانەی مانای سووکی هەیە.

- دوورخستنەوەی پەخش نەکردنی ئەوەی زیان بە داب و نەریتی گشتی دەگەیەنێت یان بە وتن یان بە کردەوە ئابڕووبەرە.

- پەخش نەکردنی ئەوەی دارمانی ئاکاری تاکی یان بەکۆمەڵ جوان نیشان دەدات، جا بە وتن بێت یان بە کردەوە.

١٤- پێویستی بوونی توانا نیشتمانییەکان لە بەرهەمهێنانی فیلم و زنجیرە تەلەڤزیۆنییەکان (وەزارەتی میدیا، وەزارەتی رۆشنبیری، وەزارەتی پەروەردە، وەزارەتی لاوان و هی دیکە)، ئەوەش لەبەر دڵنیایی بەرهەمهێنانی زنجیرە درامای تازە کە ناوەڕۆکێکی پەروەردەیی ئامانجداری هەبێت، بەمەبەستی خۆپارستن لە پشتبەستن بە سەرچاوە دەرەکییەکان کە کۆنترۆڵی ناوەڕۆکی زنجیرە دراماکانی کردووە، وەک دڵنیاییەک بۆ داهاتە ماددیەکەی.

١٥- پێویستە بەرهەڵستییەکی بەرپرچدەرانە دژی بەرهەمهێنانی فیلمە ئاستنزمەکان هەبێت، لە ڕێگەی دانانی پێوەری دیاریکراو بۆ پیشەسازی فیلم، بە جۆرێک هەڵسووڕێنەرانی پیشەسازی فیلم پێوەی پابەندبن.

١٦- پێویستە بەرنامە و دراماکان هەستی ئینتیما لای هاووڵاتی قووڵ بکەنەوە، بە جۆرێک لە هەڵسوکەوت و هەڵوێستەکانیدا بەرجەستە بێت، ئەوەش بە دەرخستنی چەندین لایەنی ئەرێنی لە کۆمەڵگەداو جەخت نەکردنەوە لەسەر کەموکوڕییەکان و گۆڕینی بۆ دیاردەی گشتی کە کۆنترۆڵی هەموو کۆمەڵگە بکات، هەروەها ئەوە بە دەرخستنی نموونە باشەکان لە هاووڵاتیان دەبێت کە ئینتیماکانیان بۆ هەڵوێست و رەفتاری روون دەگۆڕن و، هەڵبژاردنی قۆناغ و کەسایەتی دیار لە مێژوودا کە ئەم ئینتیمایە بۆ نیشتمان دووپات بکاتەوەو بەخشینی بێ سنوور بۆی.

١٧- نابێت لە وێناکردنی حاڵەتەکانی گەندەڵی و لادان زیادەڕۆیی بکرێت، بەشێوەیەک ئاماژە بێت بۆئەوەی بۆتە دیاردەو چارەسەری نییە، چونکە ئەمە لە هەستی ئینتیما لای نەوەی تازە کەم دەکاتەوە، هەروەها وێنەی نیشتمان لە دەرەوە ناشیرین دەکات و کار دەکاتە سەر دەرفەتەکانی وەبەرهێنان تیایداو، دووپاتکردنەوەی ئەوەی پەند لەوەدایە کە بەرەنگاری نموونەکانی لادان ببینەوەو کاروانی کۆمەڵگەی

لێ بپارێزین.

١٨- پێویسته گەشەپێدان و بونیاتنان دووپات بکرێتەوەو، بەهای کارو بەرهەمهێنان دەربخرێت، پێویسته بایەخ بە دووپاتکردنەوەی متمانە لە بەرهەمهێنانی نیشتمانی بدرێت، هەروەها بەردەوامی بە وروژاندنی ئاگایی لای جەماوەر بدەین، بە ئامۆژگاریکردنی بە کاربردن لە سەرجەم بوارەکان وەک وزەو ئاوو خۆراک.

١٩- پێویستی بانگەواز بۆ پارێزگاری لە ژینگە و کارکردن بۆ زیادبوونی رێژەی سەوزایی و، کەم کردنەوەی هۆکارەکانی پیسبوون لەگەڵ بەراورد کردن بەوەی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان دەیکەن لە پێناو پارێزگاری کردن لە ژینگەکەی.

٢٠- سوور بوون لەسەر پوختکردنەوەی ئایین لە بیرۆکە و بیرو باوەڕە هەڵەکان وەک جادووکاری و پاڕانەوە لە کەسایەتیە ئاینییەکان، ئەمەش پێویست بە ئاشکراکردنی ئەو نموونانە دەکات کە ئەوەی بە ناوی ئاینەوە رێگە بە خۆی دەدات بۆ ئەو جۆرە مەسەلانە، لە ئایینەوە دوورە.

٢١- پێویستە میدیا بە هەموو دەزگاو دامەزراوەکانییەوە ملکەچی پلانێکی گشتگیر بێت، کە چوارچێوەی گشتی و پرەنسیپە سەرەکییەکان و ئامانجە پێ سپێردراوەکان بەم پرۆسەیە دادەنێت، ئەرکەکەی بریتی دەبێت لە پلاندانان و ئاراستەکردن و بەدواداچوون، لە کاتێکدا پرۆسەکانی جێبەجێکردن و پرۆگرامکاری ئامێرە لاوەکی و تایبەتمەندەکان پشتگوێ دەخات.

٢٢- پێویستە ئامرازەکانی میدیا جا خوێنراو یان بیستراو یان بینراو بێت، لە فەلسەفەیەکی روونەوە سەرچاوە بگرێت کە ئامانجەکانی پرۆسە میدیاییەکە دیاری بکات و، هەموو ئامێرەکانی میدیا کار بەم فەلسەفەیە بکەن، وەک خۆپاراستن لە سەر پێی و تێکەڵکردن و سەر لێ تێکچوون کە هەندێجار دەبێتە هۆی کەوتنە داوی لێک نەچوون و هەندێ جاریش رووکەشیتی.

٢٣- نابێت رۆڵی میدیا تەنیا ئەنجامدانی پرۆسەی هەواڵی بێت یان زانیارییەکان بگەیەنێت، بەڵکو دەبێت لەوەش زیاتر بڕوات و کێشەکان دیاری بکات و بڕیار لەسەر پێشینکاری بدات و پێشنیاری چارەسەری بکات و ئەڵتەرناتیڤ دابنێ، بەمەش

کارتێکردن لە درککردنی لاوان بۆ پێویستییەکانی بۆ فەراهەم دەبێت، هەروەها چۆنێتی دەستەبەرکردنی ئەو پێداویستیانە.

٢٤- دوورکەوتنەوە بەپێی توانا لە قسەکردن لەبارەی کەمینەی جیاکار یان قۆرخکەرو، پێویستی بۆ دروستکردنی پاڵەوانانی ئەرێنی و، پاڵەوان ئەو کەسە راستەقینە یان خەیاڵییەیە کە چیرۆک و رۆمانەکان مەزنی دەکەن کە نموونەی مرۆڤی نوێیە و، دەبێتە سەرچاوەی ئیلهامی ملیۆنەها لاو بەهۆی ئەو نموونەیەی دەهێنرێتەوەو، لەوانەیە پاڵەوان کارمەندێکی سادە یان جوتیارێک یاخود سەربازێک لە سوپادا یان رۆشنبیرێکی ئاسایی بێت، کە بە خەسڵەتە شەرەفمەندە ئاکارییەکەی هەوڵێکی زۆر بۆ هەر شتێکی مەزن دەدات.

٢٥- پێویستی بەفیرۆنەدانی کۆشش و داراییەکان لە پێناو برەودان بە پرەنسیپێکی دیاریکراو یان بیرۆکەیەک، کە لەوانەیە لە بنەمادا ساختە بێت و بۆ جەماوەر چەواشە بێت.

٢٦- بەرهەڵستکردنی هەموو ئەوانەی بەهای مرۆڤ دەبەزێنێ یان لە ئاستی تێگەیشتنی بۆ مرۆییەتیەکەی کەم دەکاتەوە، ئەوەش دیاردەیەکە کە زۆر لەو نووسراوانەدا روونە، کە بانگەواز دەکات بۆ مەزنکردنی دڵڕەقی و بانگەشە بە تاکڕەوی و هەلپەرستی دەکات و، وێنەی حەزبزوێنی ئەو پیاوانە بڵاو دەکەنەوە کە لە ژیانیاندا سەرکەوتوو بوونە، لە رێگای پێشێلکردنی پێوەرە ئاکارییەکان و نقومبوون لە چێژو تامەکان، بە هۆی پارە زۆرەکەیان.

٢٧- پێویستی دەرخستنی مۆرکی نەتەوەیی لە سەرجەم بابەتەکانی میدیاو، پاڵپشتی لایەنە باشەکانی کەسایەتی و روبەڕوبوونەوەی خراپییەکانی.

٢٨- پاڵپشتی بەهای کاری ئاکاریانە کە بەرژەوەندی گشتی بۆ کۆمەڵگە بە گشتی وەدی دەهێنێت و، هاندانی لاوان لە پارێزگاریکردن لە خاوەندارێتی گشتی و پەرەپێدانی و، پشتگیری گیانی بەکۆمەڵ تیایانداو توانای ریزگرتنی ئاڵوگۆڕ و، بایەخدان بە بەهاکانی خێزان و پەروەردەکردنی منداڵ.

٢٩- بایەخدان بە پێویستییە کردەییەکانی جەماوەرو، دانانی بە دەروازەی یەکەم

بۆ پلاندانی بەرنامەی میدیایی، دەستبەرداربوون لەو ئامانجانەی بە قازانجی تایبەت و سوودی سیاسی پەیوەستن و، پێویستی پارێزگاریکردن لە رەوشی ئێستای دامەزراوەکانی پەیوەندیکردن.

٣٠- زێدەڕۆیی نەکردن لە دەرهێنانی کەسایەتی لادەرو دەرخستنی لایەنە جیاوازەکانی، نەوەک ببێتە نموونەیەک چاوی لێ بکرێت، هەروەک لە فیلم و زنجیرە دراماکاندا هەیە، کە وردەکاری کەسایەتی ئاڵودەبوو یان دز یان شتی لەو شێوازە لە کەسایەتی دەردەخات، لەوانەیە ئەم جۆرە وردەکارییە کاردانەوەی خراپی لێ بکەوێتەوە.

٣١- لە کاتی دەرهێناندا ئەوە لەبەرچاو بگیرێت، سەرەڕای ئەوەی پەیدابوونی بەها رەتکراوەکان (نەرێنی) لە هەندێ هەڵوێستدا سەرپێیی بێت، دەبێت لە خستنەڕووی ئەم بەها نەرێنیانە لە رێگەی فیلم و دراماکانەوە وریا بین، لەبەرئەوەی هەرزەکاران و لاوان بە گەرمی پێشوازی لەم جۆرە بابەتە درامیانە دەکەن، دواتر مەبەست لە چارەسەرکردنی ئەم بەهایانە لەوانەیە ببێتە هۆی خراپ تێگەیشتن لای هەندێ لەو دەستانەی کەم خوێندەوارترو کەم تەمەنترن.

٣٢- پێویستی بایەخدانی دەرهێنەران بەو فیلم و درامایانەی مۆرکی ئایینیان پێوە دیارە، بە جۆرێک دەبێتە هۆی قەناعەتکردن بە بینەر بەو پرسانەی بۆ تاوتوێ کردنی ویستراوە، بەهۆی گەڕان بە دوای چیرۆک و بابەتە ئایینیەکان و وەرگێرانی لە وێنەی فیلمی ئامانجداردا، کە دەکرێ لە رێگەیەوە بەها ئاکارییەکان بۆ بینەران بەدەست بهێنرێت و گەشەی پێ بدرێت، ئەمە سەرەڕای بایەخدانیان بە رێگەکانی دەرهێنانی ئەو جۆرە فیلم و درامایانە.

٣٣- پێویستی بایەخدانی دەرهێنەران بە فیلم و دراماکان بەو دیاردانەی لەم دواییە هاتوونەتە سەر رووکەش، بە جۆرێک بۆ پێگەیاندنی کچ لەو کۆمەڵگەدا رێز لە تێڕوانینی باو دەگرن، لەوەی ئەم پێگەیاندنە بۆ پارێزگاریکردنی کچ پێویستییەتی و، رێگە نەدان پێی کە پەیوەندی لەگەڵ رەگەزەکانی بەرامبەردا ببەستێ، بە پشتبەستن بە رێنماییە ئاینییەکان کە ئەم جۆرە پەیوەندیانە قەدەغە دەکات.

٣٤- بڕیاری پەخشی ڕاستەوخۆ پێویستە پێش پەیوەندیکردن و چەسپاندنی بەها پەروەردەییە ئیسلامییە ڕەسەنەکانی تایبەت بە کلتووری کۆمەڵگە بێت، بۆئەوەی خەڵک توانای هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی نێوان ئەو بابەتە میدیاییانەی هەبێت کە پێشکەش دەکرێت.

٣٥- دووبارە پلاندانان بۆ پیشەسازی فیلم تەنانەت ئەگەر دوورمەوداش بێت، بەجۆرێک دەبێتە پلانێک بۆ مامەڵەکردنێکی ئیسلامیانە لەگەڵ سینەمادا، نەک تەنیا لە سنووری تیۆری، بەڵکو لەسەر ئاستی پراکتیکیشدا، هەر لە نووسین تا دەگاتە بەرهەمهێنان، دەرهێنان، وێنەگرتن، مۆنتاژ، نواندن، ئەدای موزیک، دیکۆرو شتی دیکە.

٣٦- بەرنامە درامییەکان کاریگەرییەکی روون دەکەنە سەر بینەرو، زۆر کەس سوورن لەسەر بەدواداچوونی، بەرپرسانی ئەم جۆرە بەرنامانە پێویستە بیقۆزنەوە بۆئەوەی ڕەفتار چاک بکرێت و ئاراستەکان بگۆڕێن و بەهاکان توندو تۆڵ بکرێن.

٣٧- وردبوونەوە لە باش هەڵبژاردنی ئەو درامایانەی تەلەڤزیۆن پێشکەشی دەکات، بە جۆرێک بە بەهاکانی کۆمەڵگە پەیوەندیدار بێت و، بە کێشەکانی پەیوەست بێت و، لەگەڵ بیرو باوەڕی و ئامانجەکانی و هیواکانی بگونجێت.

٣٨- کارکردن بۆ چەسپاندنی ئەو بەها تازەو بەسوودانەی لە جیهانی پێشکەوتووەوە دێن، بە جۆرێک لەگەڵ بەها ئەرێنییەکانی کۆمەڵگە دژ نەبێت.

٣٩- پێویستی دەستپێکردنی میدیای پەروەردەیی لە پلانێکی تازەو ڕێکخراوەوە، لە فەلسەفەیەکی ئادگار ڕوونەوە.

٤٠- دووبارە چاوخشاندنەوە بە پێکهاتەی دەزگای چاودێری لەسەر پۆلێنکراوە هونەرییەکان، هەروەها چاودێری بە تەلەڤزیۆن و ئەم چاککردنە دەبێت لە ڕوانگەی ئەوە بێت لە وڵاتدا ڕووی داوە، کە لە بواری پیشەسازی سینەمادا پێشینەی هەبێت، کە دەزگاکانی چاودێری ئەنجوومەنێکی هەمیشەیی لەخۆ دەگرێت، هەندێ مامۆستای دەروونناسی و پەروەردەو مامۆستایانی ئامرازەکانی پەیوەندیکردنی جەماوەری و، هەندێ لە خاوەن شارەزایانی زانستی، کە دەکرێ لە پێوانی ڕای گشتی و زانینی ئاراستەکانی جەماوەرو، پێوانی هەڵوێستە فیکری و ویژدانییەکانی یارمەتیدەر بن.

٤١- پێویستی دانانی بنەمای بابەتی بۆ چاودێریکردن لەسەر فیلمەکان، بۆئەوەی نەکەوێتە ژێر باری ئارەزووی تایبەتییەوەو، لەنێو ئەم بنەمایانە بە نموونە:

- ناوەڕۆکی فیلمەکە ڕەنگدانەوەی بەهاو پرەنسیپەکان بێت.
- ناوەڕۆکی فیلمەکە ئابڕووی گشتی نەڕووشێنێت.
- فیلمەکان دیمەنە خراپەکان لە تەسکترین سنووردا پیشان بدەن و، تەنیا کاتێکی کەم لە کاتی گشتی فیلمەکە داگیر بکات، بۆئەوەی کاریگەری لەسەر دەروون لاوازان نەکات.
- بوار نەدان بە نیشاندانی ئەو فیلمانەی دیمەنەکانی خواردنەوەی مەی، سێکس، دەربڕینی هەستی سۆزداری لە شوێنی تەنیاو شتی لەو شێوەیە لەخۆ دەگرێت، چونکە دیمەنەکان وا نیشان دەدرێ گوایە شتی ئاسایی و ڕەفتاری دروستە.

٤٢- پێویستی پێداچوونەوەی بە پەخشی هاتوو و بابەتی میدیای هاوردەی بکرێ و، بەرپرسی لایەنی پەروەردەیی سیاسەتەکانی میدیا هەڵبسەنگێنێ و بە ناوەڕۆکی بابەتە میدیاییەکەدا بچێتەوە، مەسەلەکە تەنیا لە لێکۆڵینەوەی ڕێژەی دراما ناوخۆییەکان بەرامبەر دراما هاوردەکان کورت نابێتەوە، بەڵکو لەوە فراوانترە تا دەگاتە لێکۆڵینەوە لەو ڕێژەیە لە هەموو ئەوەی پەخش دەکرێت یان بڵاو دەبێتەوە لە هەواڵ و گفتوگۆو گۆرانی و چاوپێکەوتن و لێدوان و شتی لەو شێوەیە، زیادبوونی ڕێژەی بابەتە میدیا ئاماژەیەکە بۆ شوێنکەوتوویی ڕۆشنبیری و میدیایی زیاتر.

**هەشتەم: حەسانەی دەروونی:**

حەسانەی دەروونی و توندوتۆڵی کەسایەتی کۆڵەکەی سێیەمە، بە کۆڵەکە و تەواوکەری پێداویستییەکانی چوونە ناو بازاڕی کار دادەنرێت، لەکاتێکدا کۆڵەکەی یەکەم توانای زانینە و کۆڵەکەی دووەم ڕۆشنبیری تەواوکردنە. مەبەست لە حەسانەی دەروونی پلەیەکی بەرزە لە بەرگری دەروونی و، نەرم و نیانی و توانای خۆگونجاندن و دۆزینەوەی چارەسەری بۆ کێشە تازەکان و مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵوێستە لەناکاوەکان.

لـه میدیادا، پێویسـتە کەسـەکان لە حەسـانەی دەروونی توانـاو بەهرەیان هەبێت، بـە جۆرێک بە شـێوەیەکی تەواو کاریگەر نەبێت بە هەموو ئەوەی ئامرازەکانی میدیا دەیخەنەڕوو، چونکە ئامرازەکانی میدیا ئامانجەکەی هەمیشـە ئابوورییە و، بە هەموو ڕێگەیەک بە دوای کۆکردنەوەی پارە دەگەڕێن.

حەسـانەکردنیش بریتییـە لە کۆمەڵە ڕێوشـوێن و ڕێکخسـتنێک کـە پەروەردیارو بیرمەندەکان ئامادەی دەکەن، بۆ دوو ئامانجی سەرەکی کە بریتین لە:

١- چەسـپاویی بەرامبـەر باهـۆزە هاتـووەکان، کـە ئامانجی شـڵەژاندنی متمانەی نەتەوەییە.

٢- بەردەوامـی بەخشـینی نەتـەوەو هاندانـی بـۆ ڕابـوون و هۆشـیاربوونەوە بۆ بەردەوامـی لـە کاردانەوەکـەی، واتـا کۆششـی زیاتـر بـۆ باشـترکردنی سـیماکانی شارستانیەتەکە.

حەسانەکردن لەسەر دوو ڕەگەزی سەرەکی وەستاوە، بریتین لە:

یەکەم: حەسانەی خودی (ئاراستەکراو بۆ تاک)، مەبەست لێی:

پاراسـتنی تـاک لـە هەڵەکـردن، بـە پەیڕەوکردنـی شـێوازی پەروەردەیـی کـە لـە کاریگەرییـە نەرێنییەکانـی شارسـتانێتی و تەکنەلۆژیـای پێشـکەوتوو، دەیپارێزێـت ئەوەش بە چەند شێوازێک دەبێت، گرنگترینیان:

- شێوازی پێشەنگی باش.
- شێوازی گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە.
- شـێوازی ئاراسـتەکردن بـە ئامـۆژگاری بـاش و، لـە واقیعـەوە نموونـە بۆ ئەو شێوازانە بهێنرێتەوە.

**دووەم: حەسانەی خودی (ئاراستەکراو بۆ کۆمەڵ)، مەبەست لێی:**

١- گرنگیـدان بـەوەی لـە کەناڵـە جیاوازەکانی میدیا پێشکەشـی تازەپێگەیشـتوان دەکـرێ، بـە مەرجێـک لە ناواخنیـدا ژەهراویکردنی هـزرو عەقڵیەتی تازەپێگەیشـتوان لەخۆ نەگرێ.

٢- سازدانی سیمینارو کۆڕ کە لە ئامرازەکانی میدیا پێشکەش دەکرێت، بە جۆرێک

ئامانجی هۆشیارکردنەوەی باوکان و خێزان و بەخێوکەران بێت و، بەرەو بنەماکانی پەروەردەو پەیامە دروستە پەروەردەییەکان ئاراستە بکرێن، کە دەکرێ باوکان و بەخێوکەران لە قایمکردنی منداڵەکانیان بە باشی لە دژی تەکنەلۆژیای نوێ و زیانەکانی پەیڕەو بکەن.

**حەسانەش جۆری هەیە:**

* حەسانەی بەهایی: بە پەروەردەی دروست بۆ منداڵەکان دەبێت، بە پەیڕەوکردنی شێوازە باشە پەروەردەییەکان.

* حەسانەی تەندروستی: بە زانینی جۆری خواردنە باشەکان و ئەوانەی دەبنە هۆی نەخۆشی، ئەمەش لای بایەخمەندان بە لایەنی تەندروستییەکان بواری خۆی هەیە.

* حەسانەی دەروونی: بە تێرکردنی سۆزداری، ئەوەش بە تێرکردنی پێویستییە سەرەکییە دەروونییەکانی تاک، بەوەی لەگەڵ رەوشتە دروستەکەی بگونجێت و، لەگەڵ سیستەمی بەهایی لە کۆمەڵگەدا کۆک بێت.

* حەسانەی هزری: بە زانست و رۆشنبیری دەبێت و، مەبەست لێی پاراستنی ئاوەزی تازە پێگەیشتووانە لە کاریگەرییە خراپەکان و هزی ناوازە کە لە کۆمەڵگەدا هەیە، جا لەرێگەی وەرگرتنی راستەوخۆ لە ئامرازە تەکنەلۆژییە تازەکان یان لە هاورێیانی خراپ بێت. ئەو برە زۆرەی کەناڵە ئاسمانییەکان کە شەوو رۆژ دێتە سەر تاکەکان، کە لە رۆشنبیری و بەها جۆراوجۆرەکانەوە دێ، ژینگەکانی لە ژینگەکەمان جیاوازە، ئەمەش جیاوازییەکی گەورە لە نێوان رۆشنبیرییەکەمان و رۆشنبیری ئەو وڵاتانە دێنێتە ئاراوەو، کاریگەری لە رۆشنبیری و رەفتارەکانی هەرزەکار دەکات.

**نۆیەم: مەشقی میدیایی:**

مەشقکردن «پرۆسەیەکی رێکخراوە بۆ وەدەستهێنان یان پەرەپێدانی زانیاری یان توانا یاخود ئاراستەی میدیاکاران، بە ئامانجی گەیشتن بە ئاستی پێویست بە شێوەیەکی باشتر».

مەشـقكردن لـە سـەردەمی تـازەدا بۆتـە پێویسـتییەكی پێداگیـرو خەسـڵەتێكە لـە خەسڵەتەكانی سەردەم، بە هۆی پێشكەوتنی زانستەكانی تەكنەلۆژیای خێرا، هەروەها زانسـتەكان خۆیان ئێسـتا لـە تاقیكردنەوەكانیـان و تۆماركردنی تێبینییەكانیان پشـت بـە كۆكردنـەوەو شـیكردنەوەی داتاكان دەبەسـتن، ئەمەش وای لـە دەزگاكانی میدیا كرد مەشـق بە كارمەندانی بكات، لەبەر تواناگەلێك كە لەگەڵ كارەكانیان بگونجێت و، شارەزایی مەشقی ئەوتۆیان پێ بدات كە لەگەڵ گۆڕاوە تەكنەلۆژیا خێراكان بگونجێت.

**گرنگی مەشقكردن لە میدیادا لەم خاڵانەی خوارەوە دیار دەبێت:**

١- مەشقكردنی میدیاكارە تازەكان، بۆئەوەی كارەكانیان بەشێوەیەكی وا راپەڕێنن، لەگەڵ توانایاندا بگونجێت.

٢- گۆڕینی شێوازەكانی كاركردن، لەبەر گۆڕینی ئامێرو كەرەستە بەكارهاتووەكان لـە كاركردنـی میدیایی، چونكە ئامرازە جیاوازەكانی میدیا، هەمیشـە دوایین بەرهەمی نوێی تەكنەلۆژی بەكاردەهێنن.

٣- پێشكەوتنی شێوازەكانی هونەری پێشكەشكردنی خزمەتگوزارییە میدیاییەكان، بووە هۆی ئەوەی پرۆسـەی نوێكراوە ئەنجـام بدرێت، بۆ راپەڕاندنی خزمەتگوزارییە هونەرییەكان بە پلەیەكی بەرزی شارەزایی.

٤- پەیدابوونـی پسـپۆڕێتی هونـەری لـە پیشەسـازی میدیا، پێویسـتی بە بەهرەی جۆراوجۆر هەیە، ئەمەش مەشقكردنی دەوێ.

مەشـقكردن هـەوڵ دەدات وزە مرۆییـەكان وەبـەر بهێنێـت بۆئـەوەی ئامانجـە میدیاییەكان بە ئاستێكی باڵا لە تواناو كارایی وەدی بهێنێت و، لە پرۆسەی مەشقكردندا تیۆرەكانـی دەروونناسـی بـەكار دەهێنرێـت، بـۆ نموونـە، لەوانەیە تیـۆری فێركردنی كۆمەڵایەتی پشتبەسـتوو بە لاسـاییكردنەوە بەكاربهێنین، كە داوا لە میدیاكار دەكرێت تەماشـای نموونەگەلـی زیندوو بكات و پێویسـتە لاسـایی بكاتـەوە، هەروەها دەكرێ تیـۆری رەفتاری لە مەشـقكردندا بەكاربهێنرێت، ئـەوەش بە پێكهێنانی رەفتارو توانای میدیاكاران لە میانەی پاداشتەوە.

## دەیەم: ڕا و ئاراستە:

### أ- ڕا (opinion):

ڕا، «قایلبوونی کەسێک یان چەند کەسێکە، یان بیروبۆچوونیانە لەبارەی دۆز یان دیاردەیەک»، ئەو قایلبوونەشـە کە هەڵوێسـت و بیروباوەڕ دروسـت دەکات. ڕا چەند نـاوو مانایەکـی جیـاواز هەڵدەگرێ: دەکـرێ ڕادەربڕین، بڕیاردان، مەیـل و ئارەزوو، باوەڕ، بۆچوون ڕێباز یان هەڵوێست...هتد بێ، بەڵام هەرچەندە ئەم ماناو ناوانە جودابن، (ڕا) بریتییـە لـە «دەرەنجامێک لە دەرەنجام و بەروبۆکانی بیرو هۆشـی مرۆڤ»، کە دەکرێ بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕاشکاوانە تەعبیری لێبداتەوە یان بەشێوەیەکی پەنهان و نادیـار، ئـەو دەربڕینـە لەشـێوەو شـێوازو بە جۆرو چەشـنی جیاواز بـێ، ئیدی بە وشەیەک، وێنەیەک، ڕوانین و بێدەنگی، یان خەوو هەڵوێستێک...هتد بێت.

ڕا، «تەماشاکردنێکی دیاریکراوە بەرامبەر دیاردەیەکی دیاریکراو»، واتە پەیوەندی بـە عەقڵـی مرۆڤـەوە هەیە، بەڵام مەرج نییـە بەرهەمی بیرکردنەوە بێ، پێویسـتە هەر ڕایـەک تاوتوێیەکـی عەقڵانـی بکـرێ، چونکـە هـەر ڕایـەک کـە دەدرێ، ڕاسـتییەکی حاشاهەڵنەگر نییە و بواری تاوتوێکردنی هەیە.

لـەڕووی سـایکۆلۆژیەوە، ڕا، پەیوەنـدی لەگـەڵ بەرژەوەنـدی خودیـدا هەیە، واتە ڕووداوو قسـە یـان هـەر شـتێکی کاریگـەر، ئەوکاتـە شـوێن دادەنێتـە سـەر (ڕا) کـە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ بەرژەوەندی خودی کەسەکە هەبێ.

#### جۆرەکانی ڕا:

#### ١- پەیوەستە بە کاروبارە کەسییەکانەوە:

بـەلای تاکـەوە لـە بازنە تایبەت و تەسـکەکەیدا بایەخمەندە. تاک لە ئاشـکراکردنی ئـەم ڕایـە ناترسـێ چونکـە لـە ڕای بەرامبـەر (یـان ڕای گشـتی) و زیادبوونـی ئـەم ڕووبەڕووبوونەوەیە ناترسێ، لەو کاروبارە تاکییانەی کە بەهیچ شێوەیەک بەوانیتر یان کۆمەڵەکەوە جێی بایەخ نییە.

#### ٢- پەیوەستە بە کاروباری گشتییەوە:

لـە قەناعەتەکانـی تـاک و تێڕوانینەکـەی بۆ دۆخی گشـتی سـەرچاوە دەگرێ. ئەم

رایـە تاکییـەش رایەکـی تایبەتییە لە کاروبارە گشـتیەکاندا. زۆرجار تـاک وریا دەبێت لەئاشـکراکردنی ئـەم رایـە چونکـە دەترسـێ ئـەو دەرەنجامانـەی لێبکەوێتـەوە کـە نەتوانێ روبەڕووی بێتەوە. بۆ دەسـتەبەریی ئازادی دەربڕینی تاکی بەرامبەر پرسـە گشتییەکان، وڵاتە دیموکراتەکان پەنا بۆ ئامرازەکانی پاراستنی یاسایی و بۆ تەکنیکی دیاریکـراو دەبەن، بۆ دەسـتەبەریی ئازادی تاک لـە دەربڕینی رای خۆی بە دڵنیایی و بەبێ ترس.

**ب- ئاراستە (trend):**

ناکۆکی گەورە هەیە لەنێو توێژەران، لەبارەی رێککەوتن لە دیاریکردنی پێناسەیەک بۆ دەستەواژەی ئاراستەکان. لەبەرئەوەی ئاراستەکان بەرجەستە نین و ناکرێ ببینرێن و دەربکـەون، هەروەهـا تەمومژیەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ تێکەڵبوونـی لەگـەڵ هەندێ چەمکـی دیکـەی وەک: را، بیروبـاوەڕ، بەهـا، سـەرەڕای دانپیانانی زۆر لـە توێژەران بـەوەی لـە ژیانـی کرداریدا جیاکردنـەوە لەنێوان ئاراسـتە و راو بیروباوەڕەکان زۆر سەختە و، دەکرێ بە یەک مانا بەکاربهێنرێن.

ئاراسـتەکان بە تێگەیشـتنە سـادەکەی بریتییە لە راو هەست و بیروباوەڕ لەبارەی شـت یان کەسـەکان و، ئاراسـتەگرتن بەرەو لای. بەڵام بە مانا زانسـتییەکەی ئەوەیە کە ئالپۆرت (Allport) پێناسـەی دەکات، «حاڵەتێکی ئامادەباشی عەقڵی یان دەمارییە، لە رێگەی شارەزایی کەسیی رێک خراوە، کار دەکاتە سەر ئاراستەکردنی بەدەنگەوە چوونی تاک بۆ هەموو ئەو شت و هەڵوێستانەی بەم ئامادەباشییەوە پەیوەستە».

هەروەها گیلفورد (Guliford) پێی وایە «ئاراسـتە خۆسـازدان یان ئامادەباشـییە بۆئەوەی جۆرێک لە شت یان کارە کۆمەڵایەتییەکان بە باش دابنێین یان بەپێچەوانەوە»، ئاراستەکان لە رووی دەروونییەوە بیروباوەڕو هەست لەخۆدەگرن.

**رەگەزە بنەڕەتییەکانی ئاراستە:**

ئاراستە لەسەر چەند گریمانەیەک کار دەکات، لەوانە شارەزای خودیی بۆ هەندێ پـرس یـان بابەت و، شـارەزاییگەلێکن کە بڕیارێکی هەڵسـەنگاندنیی لەخۆدەگرێ و لە میانەی زمانەوە دەردەبڕدرێ، دواجار ئاراستە بە رەفتاری کۆمەڵایەتییەوە پەیوەستە

و، بەپێی ئەو ڕەفتارە دەرناکەوێ.

دەکرێ ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی ئاراستەکان، لەم خاڵانەدا چڕ بکەینەوە:

١- زانین و زانیاری: کە تێگەیشتن و درککردنی بابەت یان هەڵوێست یاخود ڕووداوەکەیە لەلایەن کەسەکە، چونکە ئەوەی لای تاک هەیە لە زانین و ڕۆشنبیری و شارەزایی پێشوو و ئەزموون بەرامبەر بابەتێکی دیاریکراو، لە ڕەفتارو هەستی بەرامبەر بابەتەکە ڕەنگ دەداتەوە.

٢- سۆزو ویژدان: هەستی ئەرێنی یان نەرێنی تاکە بەرامبەر هەڵوێستێک، تاک هەست و نەستی لە سەر بنەمای ڕەگەزی زانین و زانیاری بونیات دەنێ و، لە شێوەی خۆشویستن یان ڕق لێبوون، پێ باشبوون یان باش نەبوون دەری دەبڕێ.

٣- ڕەفتاریی: ئەم ڕەگەزە بە دەرەنجامی کۆتایی هەردوو ڕەگەزی پێشوو دادەنرێ، واتە مەودای ئامادەباشییەکەی بۆ گۆڕانکاری و تێڕوانینەکەی لە ڕووی کردارییەوە.

## گۆڕینی ئاراستەکان:

دەکرێ ئاراستەکان لەژێر بارودۆخی دیاریکراودا بگۆڕدرێن، لە کاتێکدا ئەو بەرەنگاری ئەو گۆڕانە دەبێتەوە بەتایبەتی ئەگەر لە منداڵییەوە فێری بووبێت، بەڵام ئەگەر گۆڕانەکە بە تێرکردنی پێویستی پەیوەست بوو، ئەگەر تاک زانی گۆڕانەکە لە بەرژەوەندیدایە، هۆکارێک دەبێت لە گۆڕینی ئەوەی قەناعەتی پێ هەبووە. دەکرێ ئاراستەکان بەم ڕێگایانە بگۆڕدرێن:

١- پێدانی زانیاری بە تاکەکان لەبارەی بابەتی ئاراستەکان.

٢- قەرەبووکردنەوەی تاک بۆ هەندێ شارەزایی ڕاستەوخۆ، واتە وا بکرێ تاک هەندێ شتی پەیوەست بە بابەتەکە پەیڕەو بکات.

٣- نموونەی مرۆیی بەسوود بخرێتە پێش چاوی تاک، بۆئەوەی خۆی لە کەسایەتییەکەیدا ببینێتەوەو بە لای ئاراستە ئەرێنییەکان و ڕەفتاری باشدا بچێت.

٤- فێرکردنی قوتابخانەیی دەکرێت بەشدار بێت لە هەموارکردنی ئاراستەکان بەرەو بابەتگەلی دیاریکراو.

٥- دەکرێ ئاراستەکان بگۆڕێن و هەموار بکرێن، لە ڕێگەی ڕزگارکردنی تاک لە هەندێ پشێوی دەروونی و کاردانەوەیی کە بەدەستییەوە دەناڵێنن.

بەڵام بابەتی گۆڕانکارییەکە بەو ئاسانییە نییە، چونکە زەحمەتە ئەو ئاراستانە بگۆڕدرێن کە تاک وەدەستی هێناوەو ساڵانێکی زۆر لەگەڵیدا دەژی، هەروەها ئەوەی پەیوەستە بە بیرو باوەڕو پێویستییەکانی و پاڵنەرە سەرەکییەکانی.

ئاراستەکان وەرگیراون نەک بۆماوەیی، کە خێزان ڕۆڵی لە وەرگرتنی ئەم ئاراستەیە هەیە، بەو پێیەی بە ئەزموونی جۆراوجۆردا تێپەڕیوەو دەیەوێ منداڵەکانی لەسەر هەمان ڕێبازی ئەو بڕۆن، هەر جیاوازییەک لەمبارەیەوە ڕووبەڕووی ڕەتکردنەوەیەکی توند دەبێتەوە.

## میدیا و ئاراستە سیاسییەکان:

ئامرازەکانی میدیا هەوڵی دروستکردن و گۆڕین و چەسپاندنی ئاراستە سیاسییەکان لای جەماوەر دەدەن، جا پاڵپشتیکار بێت یان بێ لایەن، بەتایبەت سەبارەت بە پرسە سیاسییە گرنگەکان کە لە ئەجێندای سیاسیدا لەپێشدان. بۆ پێکهێنانی ئاراستە سیاسییەکان سێ نموونە هەیە:

١- زانین بەرەو بابەتی ئەو ئاراستە سیاسییەی، دەبێتە هۆی بونیاتنانی پێکهاتەیەکی سۆزداری ئەرێنی، ئەمەش دەبێتە هۆی بونیاتنانی پێکهاتەیەکی ڕەفتاریی.

٢- ئەنجامدانی ڕەفتارێکی دیاریکراوو چوونە ریزی پارتێکی دیاریکراو، لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبوونی پێکهاتەی زانینی تاک لەبارەی ئەم پارتە، کە لە دروستکردنی پێکهاتەی سۆزداری یارمەتیدەرە.

٣- پێکهاتەی سۆزداری وەک گۆڕاوێکی سەربەخۆ، لەوانەیە هەستکردنی بایەخدان بەرامبەر کەسێک ببێتە هۆی دروستبوونی پێکهاتەی زانین لای تاک لەبارەی ئەو کەسە، ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی ڕەفتارێکی دیاریکراو بەرامبەری.

ئاراستە سیاسییەکان لای جەماوەری تەلەڤزیۆن لە کاتی ڕووبەڕووکردنەوەی پەیامی میدیا دروست دەبێت، کە پێویستە تایبەتمەندی دیاریکراوی تیادا بێت بۆئەوەی

هێزی کاریگەرییەکەی زیاتر بێت، وەک پشتبەستن بە پاساوو بەڵگەکان و بەکارهێنانی سەرنجڕاکێشی عەقڵی و سەرنجڕاکێشی سۆزداری، جگە لە خەسڵەتەکانی دیکە کە بە گەیاندنکارەوە پەیوەستە، وەک ئەوەی ئاگاداری بابەتی پەیامەکە بێت و لە جەماوەرەوە نزیک بێت.

پەیامی میدیا کە سەرنجڕاکێشی و رازیکردنی پێوە دیارە، وەک شێوازێک لە گۆڕینی ئاراستە سیاسییەکان لای کەسەکان بەکاردەهێنرێت، یان پێدانی ئاراستەی نوێی سیاسی بە کەسەکان، یاخود چەسپاندنی ئەوەی لەلایان هەیە، ئەمەش لە چوارچێوەی ئاراستە گشتییەکەیدا بەرجەستە دەبێت، کە بە (سیاسەتی میدیایی) تەلەڤزیۆن ناودەبرێت.

لێکۆڵینەوە نوێیەکان لەبارەی تەلەڤزیۆن بە لای قسەکردن لەبارەی شوناسی کەناڵەکە لاسەنگە وەک لە تایبەتمەندیەکەی، کە دەربڕی هەڵوێست و ئاراستە سیاسیەکانێتی لەبارەی سەرجەم ئەو پرسانەی لە بەرنامە هەواڵی و سیاسییەکانیدا باسی دەکات.

پرۆسەی گۆڕینی ئاراستە سیاسییەکان یان پێکهێنانی لای جەماوەری ئامرازەکانی میدیا لەرێگەی روبەڕووکردنەوە روودەدات، واتە وەرگرتنی پەیامەکان و کارلێککردن لەگەڵیدا، چونکە وەرگرتنی پەیامەکان بە تەنیا نابێتە هۆی پێکهێنانی ئاراستە سیاسییەکان یان گۆڕینی، کارلێکیش بەم مانایە بە تەواوکەری پرۆسەی وەرگرتن دادەنرێت، جگە لە چەند هۆکارێکیتر کە لە کاریگەری پەیامەکان و، کاراکردنی رۆڵەکەی لە پێکهێنانی ئاراستە سیاسییەکان لای جەماوەر زیاد دەکات.

روبەڕووکردنەوە مەرجێکی سەرەکییە لە پێکهێنانی ئاراستە سیاسییەکان یان گۆڕینی لای جەماوەرو، کاریگەری دووبارەکردنەوەی روبەڕووکردنەوە لە خێرایی پێکهێنانی ئاراستە سیاسییەکان زیاتر دەبێت، کاتێک پەیامەکە لە فۆرمێکی هەمەڕەنگدا پێشکەش دەکرێت، هەروەها کاریگەری دووبارە کردنەوەی روبەڕووکردنەوە لە کاتی پەیامە ئاڵۆزەکان وەک لە پەیامە سادەکان زیاتر دەبێ، چونکە دووبارەکردنەوە کاریگەری پەیامە ئاڵۆزەکان زیاتر دەکات وەک ئەوەی دەرەنجامی راستەوخۆو

راشکاو لەخۆ ناگرێت، بەڵام پشت بەو دەرەنجامە لە وەرگران دەبەستێ لەبارەی هەڵوێستی پەیامەکە ئەنجامی دەدەن.

زۆر لە توێژینەوەکان دووپاتیان کردۆتەوە، تاک لەرێگەی تەلەڤزیۆنەوە لە واقیعی سیاسی تێ دەگات، تەلەڤزیۆن وای لێ دەکات ئامادەباشتر بێت بۆ کارتێکردن بە رای سیاسەتمەدارەکان، توندی روبەڕووکردنەوەو دووبارەکردنەوەو لێکچوونی ئاراستەکان رۆڵێکی گەورە دەبینێت لە تێگەیشتنی تاک بۆ ئەم واقیعە و کارلێککردن لەگەڵیدا، جگە لەوەی پەیوەندیەکی پەیوەستداری لە نێوان ئینتیما حزبییەکان و بەکارهێنانی تاک بۆ ناوەڕۆکی ئامرازەکانی میدیا هەیە، چونکە بەکارهێنانەکە بە پێی ئەو ئینتیمایانە و ئاستی خزمەتکردنی بۆی دەبێت.

لەو گۆڕاوانەی لە رێگەیەوە کاریگەری ئامرازەکانی میدیا لە پێکهێنانی ئاراستە سیاسییەکان لای تاکەکان تێ دەگەین گۆڕاوی زیندەگییە Vividness، لەسەر ئەم بنەمایە، ئەو زانیارییە سیاسییانەی لە تەلەڤزیۆن پێشکەش دەکرێ پارێزگاری لە وریایی تاکەکان دەکات، بەوپێیەی زانیاری بەرجەستەن و خەیاڵ ورووژێنە و، لە رووی کات و شوێن و هەستەوە نزیکە.

### بەراوردی نێوان ئاراستە و را:

(را) زاراوەیەکە لە زاراوەی (ئاراستە)وە نزیکە، بەتایبەتی لە قسەکردنی ئاسایی مرۆڤ لە بۆنە رۆژانەییەکانی ژیاندا. زۆرجار پشت بە دۆزینەوەی ئاراستەیەک یان ئاراستەکانی کەسێک دەبەستێ، کە خراوەتە ژێر تێبینی یان لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەبارەی ئاراستەکان لای کۆمەڵە کەسێک.

جیاوازی نێوان راو ئاراستە دەکرێ لە چوار خاڵدا بخرێنەڕوو:

١- را حوکمێکی دیاریکراوە لەسەر رووداوێکی دیاریکراو لە بۆنەیەکدا دەدرێ، بەڵام ئاراستە ئامادەباشییەکە بۆ رەفتار بەرەو لایەک دەکرێ لەچوارچێوەی مەرجی جۆراوجۆرو لە بۆنەی جیاوازدا دەربکەوێ.

٢- شێوەی کاردانەوەیی کە لەگەڵ رەفتاری دەربڕاو لەبارەی ئاراستەوە هەیە،

دیارتـرو بەرچاوتـرە لـەوەی لە رادا هەیە، ئەمـە لەکاتێکدا هـۆکارە کاردانەوەییەکانی وەک هەسـتەکان و شـتی تـر، دەکـرێ بەشـدار بێت لـە پێکهێنانی رایـەک، وەک چۆن دەکرێ بەشدار بێت لە پێکهێنانی ئاراستەیەکدا.

٣- دەکرێ لە راستی یان هەڵەیی را دڵنیا بینەوە، واتە لە لێکچوونی نێوان بڕیاری خاوەن رایەکە و واقیعی حاڵ، یان ئەو شـتەی بڕیاری لەسـەر دەدرێ، بەڵام ئاراسـتە بواری لێکۆڵینەوە لە راستییەکەی تێدا نییە، دوای دڵنیابوون لە بوونی لای خاوەنەکەی.

٤- را رەفتارێکـی روونـە لـە شـوێنی تێبینی راسـتەوخۆ دادەنرێ، بەڵام ئاراسـتە ئامادەباشـییەکی زانـراوە، بـە راسـتەوخۆیی تێبینـی ناکرێـت بەڵکو هەندێ شـێوازی رەفتار لەنێویاندا رایەکان، ئاماژەی بۆ دەکەن.

**یانزەیەم: رای گشتی:**

رای گشـتی بریتییـە لـە کۆکبوونـی کەسـانێک لەسـەر مەسـەلەیەکی دیاریکـراو، دروسـتبوونی بۆچوونێکە لەسـەر کەس، یان پرس، یان دەسـەڵات یان بیرو بۆچوون و بیرو رایەکی باو کە جێی مشتومڕ بێت، ئەم رایە بە خۆڕسک یان بەهۆی بانگەواز بـۆ پشـتگیری لـەو بۆچوون و رایە دروسـت دەبێت، ئەو رایە لەوانەیـە بۆ لایەنگیری یان بەرهەڵستی بێت.

(ولیـەم ئەلبێـچ) وای دەبینێ: «رای گشـتی ئـەو رایەیە لە ئەنجامـی تێکەڵاوبوونی کەسەکانەوە دێتە بەرهەم ئیتر بە یەکێک لە شێوازەکانی کۆمەڵ یان بەهۆی بابەتێکی جامی دیارو ئاشکرا دەبێتە مایەی لێدوان و پیلە بازی لەناو کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا».

(هارۆڵـد شـێڵدز) دەڵـێ: «رای گشـتی تەنها کۆمەڵێکـە لە (را)یەکانی تـاک، متمانە دەکاتـە سـەر جەمـاوەری جـۆری دیـار لـە ئاڕاسـتەکانی لەبـارەی بابەتێـک کە جێی مشـتومڕی دیـار بێـت، یـان ئەنجامی کۆکـراوەی (ڕا)یەکانـی تاکـە». هەروەها زانای بەناوبانـگ (لیۆنـارد دۆدوب) لەبـارەی رای گشـتییەوە دەڵێـت: «رای گشـتی بریتییە لـە بیـرو بۆچوونـی زۆرینەی تاکەکانـی کۆمەڵگەیـەک لەبارەی بابـەت و ڕووداوێکی تایبەتەوە».

ئەو پێناسەیەی ئەنجوومەنی جیهانی بۆ لێکۆڵینەوەی رای گشتی، کە دەڵێ: «رای گشتی بیرو رای کۆمەڵە کەسانێکی کۆمەڵایەتییە سەبارەت بە بابەتێک، ئەو کەسانەی لەبارەی ئەو بابەتەوە پەیوەندی و بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە، کە پێکەوە گرێیان دەدات».

هاوکات ئینسکلۆپیدیای نێودەوڵەتی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان، رای گشتی وا دەناسێنێت «رای گشتی کۆمەڵێک لە بیرو رای خەڵکە لەبارەی بابەتێک کە جێگای بایەخدانی کۆمەڵە، یان کۆمەڵێک بیرو رایە لەبارەی بابەتێکی دیاریکراو کە کار دەکاتە سەر هەڵسوکەوتی لەسەر دروستکردنی سیاسەتی دا».

**جۆرەکانی رای گشتی:**

رای گشتی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، کلتووری و ژینگەییە و، بنەمایەکی بەهێزە بۆ بوونی کۆمەڵەی مەدەنی، چونکە لەم کۆمەڵانەی ئەم دیاردەیە بوونی هەیە، ئاماژەیەکی روونە بۆ بوونی رەوشی دیموکراتی و پراکتیزە بوونی ژیانی مەدەنی و دامودەزگا مەدەنییەکان، چونکە رای گشتی لە کەشێکی دیموکراتی دەتوانێت دروست بێت بەتایبەت لەم سەردەمەدا. رای گشتی، لە سەرچەندین بنەما پۆلێن کراوە، لەوانە:

- بنەمای جوگرافی: وەک رای گشتی ناوچەی، نەتەوەیی، ئیقلیمی، جیهانی.
- بنەمای کات: وەک رای گشتی کاتی، یان ماوەدرێژ.
- بنەمای لایەنگیری: وەک رای گشی کەمینەکان، زۆرینە، زۆرینەی زۆر، گشت.
- بنەمای جێگیربوون: وەک رای گشتی جێگیر، یان گۆڕاو.
- بنەمای چۆنێتی دروست بوونی را: وەک رای گشتی بە هۆی فشار، دەنگدان، رازیکردن یان بەهۆی کۆمەڵایەتی.

بنەمای چۆنێتی: وەک رای گشتی زاڵ، رای گشتی رەخنەگر.

بنەمای دەرکەوتن و ئاشکرایی: وەک رای گشتی ئاشکرا، رای گشتی شاراوە.

**پێکهێنەرەکانی رای گشتی بریتین لە:**

- کۆمەڵە خەڵک: کۆمەڵێک خەڵکی بەدەر نەبوو لە پێکهاتەی ئایینی و زمان و بەهاو باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری باو.

- پرس: بوونی پرسێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، یان ئابووری، کۆمەڵێک درکی پێدەکەن و کار بۆ گۆڕینی دەکەن و دەیانەوێ سیستمی سیاسی، یان پرسێکی تری گشتی بگۆڕن.

- گفتوگۆ: پێویستە گفتوگۆی لۆژیکی و زانستی تێروتەسەل لە کەشێکی ئازاددا لەسەر پرسەکە بکرێ، بۆ گەیشتن بە رایەکی گشتی و بە ئامانج و رەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگە، ئەو رایانە، ئەگەر کۆک یان ناکۆک بن، رایەکی گشتی لەسەر رۆشناییان دروست دەبێت.

- کات: کاتی دیاریکراو بۆ دەربڕینی را، هەندێ جار کات رۆڵی سەرەکی دەبینێ، چ کاتێک هەڵدەبژێرێ و گونجاوە.

**پێوانەکردنی رای گشتی:**

هەندێ لە سیستمە سیاسییەکان، بایەخ بە پێوانەکردنی رای گشتی دەدەن و خۆیان ئەم کارە دەکەن، تا بزانن کێشە و کەموکوڕییەکان چین و چۆن چارەسەری بکەن. پێوانەکردن بەرچاو رونییان دەداتێ بۆ بڕیاردان، ئەمە دەبێتە کەناڵێکی پەیوەندی لەنێوان دەسەڵات و گەلدا، یان هەندێ رێکخراوو لایەنیتر ئەم کارە دەکەن، ئەو دەسەڵاتانەی رای جەماوەر بە هەند وەردەگرن، کار لەسەر ئەنجامەکان دەکەن. رێگاکانیش بریتین لە:

- راپرسی: لە رێگەی دروست کردنی فۆرمی راپرسی و دابەشکردن و پڕکردنەوەی.

- روپێو: بەم رێگایە، تارادەیەک را شاراوەکانیش دەزانرێن، لە رێگەی سەرنجدان یان چاوپێکەوتنەوە.

- شیکردنەوەی ناوەڕۆک: ئەم رێگایە زیاتر بۆ را جیهانییەکانە، وەک شیکردنەوەی بابەتەکانی کەناڵەکانی میدیاو دۆخە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان.

**چەندین هۆکار، کاریگەری لەسەر رای گشتی دروست دەکەن، وەک:**

لە جیهانی ئەمڕۆدا بەتایبەت پاش شۆڕشی زانیاری، ناسینی رای گشتی بە پێویستییەکی سەرەکی دەوڵەتە جەماوەرییەکان دادەنرێ، رای گشتی لەم سەردەمەدا بۆتە جێی بایەخ و گرنگی وڵاتانی جیهان، رای گشتی جیا لەوەی پرۆسەیەکی هزری

و کۆمەڵایەتییە، داینەمۆیەکیشە هەردەم لە جموجۆڵ و گۆڕاندایە.

- بارو دۆخی سیاسی: راستەوخۆ کاریگەری بۆ سەر دروستبوونی رای گشتی هەیە، لە سیستمی دیموکراتی و بوونی ئازادی و مافی مرۆڤدا کەشێکی لەبار دروست دەبێ بۆ دروستبوونی را، بەتایبەت ئەو رایانەی پەیوەندییان بە بڕیاری سیاسی و سیستمی حوکمەوە هەیە.

- بارودۆخی کۆمەڵایەتی: وەک دابونەریت و ئایین.

- میدیاو ریکلام: هۆکارەکانی میدیاو ریکلامکردن بۆ رای گشتی، یارمەتیدەرن بۆ دروستبوونی رای گشتی، لە سایەی سیستمێکی سیاسیدا کە باوەڕی تەواوی بە ئازادی و ئازادی رادەربڕین هەبێ، میدیا دەتوانێ گفتوگۆو راکان بگوازێتەوە. لە سایەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو هۆکارەکانی پەیوەندیکردندا، کاریگەری میدیا زۆر زیاترو کاریگەرتر بووە.

- سەرکردەی را: ئەو کەسانەی رای گشتی دروست دەکەن، پێویستە خاوەن پێگەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری بن، جێگەی متمانەی جەماوەر بن و راستگۆیی و سەرنجڕاکێشیان هەبێ و بتوانن کاریگەری دروست بکەن.

- هۆکارە ئابوورییەکان: ئەو هۆکارە ئابوورییانەی تاک پشتیان پێ دەبەستێت، ئابووری و بوونی جیاوازی زۆر لەنێو چینەکاندا.

- هۆکارە کەسییەکان: ئەو تایبەتمەندییەی لە تاکەدا هەیە، وەک بارودۆخی فسیۆلۆجی یان دەروونی.

- رۆشنبیری و پەروەردەو فێرکردن: رۆشنبیری و هۆشیاری، بنەمان بۆ دروستبونی رای گشتی، هەروەها پەروەردەو فێرکردن گرنگترین رۆڵیان هەیە لە هۆشیارکردنەوەو پەروەردەی کۆمەڵگەدا، کە پەیوەندی بە جۆری سیستمی سیاسییەوە هەیە.

- رووداو و کێشەکان: دروست بوونی رووداو، یان کێشەو تەنگژەیەک کە کۆمەڵگە روبەڕووی دەبێتەوە، دەبێتە هۆی دروستبوونی ئاڕاستەی نوێ و رای گشتی دروست دەکات.

## ڕای گشتی شاراوه و ئاشکرا:

ڕای گشــتی شــاراوه (کپکراو) لای زۆر له جه‌ماوه‌ر دروســت ده‌بێ، به‌ڵام به‌هۆی بوونی چه‌ند هۆکارێکه‌وه، ناتوانرێ ده‌رببڕێ، وه‌ک: هۆکاری کۆمه‌لایه‌تی و دابونه‌ریت که ڕێگا به‌گۆڕینــی هه‌نــدێ دابونه‌ریتــی بــاو نــادرێ، له‌بــه‌ر کۆمه‌ڵگــه و بارودۆخی کۆمه‌لایه‌تــی ئــه‌م ڕایه ده‌رنابڕدرێ، به‌ڵام زۆری ڕا گشــتییه‌کان، به هۆکاری سیاســی ڕێگــری لــه ده‌رکه‌وتــن و ده‌ربڕینی ڕاکه ده‌کرێ، ڕای گشــتی که فشــار بۆ ده‌ســه‌ڵات ده‌هێنێت، یان کاریگه‌ری بۆ ســه‌ر بڕیاری سیاســی دروســت ده‌کات، جێی مه‌ترســی سیستمه زاڵ و نادیموکراته‌کانه.

ئه‌م مه‌ترسییه، له مانه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵات یان ده‌رخستنی که‌م و کورتی و چاوکردنه‌وه‌ی جه‌مــاوه‌ر بــۆ ئــازادی و، دیاریکردنــی بڕیــاری سیاســی و گفتوکردن له‌ســه‌ر پرســه سیاسییه‌کانه، وا له‌م جۆره ده‌سه‌ڵاتانه ده‌کات ده‌نگه‌کان کپ بکه‌ن و، ڕێگا به‌ده‌ربڕینی ڕاو بۆچوونه‌کانیان نه‌ده‌ن و به‌شێوازی جۆراوجۆر ڕوبه‌ڕووی ببنه‌وه، جه‌ماوه‌ریش بۆ پاراســتنی ژیان یان به‌رژه‌وه‌ندی یان هۆکاری تر که په‌یوه‌ندی به سیســتمه‌که‌وه هه‌یــه، ناتوانــن ڕاکــه ده‌رببڕن، به‌ڵام له پرۆســه‌یه‌کی به‌رده‌وامدا ئــه‌م ڕاو بۆچوونانه لــه هــزری به‌شــێکی زۆری خه‌ڵکدا نه‌شــونما ده‌کــه‌ن، به‌هــۆی فشــاری ده‌ســه‌ڵات و نه‌بوونی زه‌مینه‌یه‌کی ڕاســته‌قینه‌ی له‌باری دیموکراتی و ئازادیدا، به‌شــێوه‌ی شــاراوه ده‌مێنێته‌وه، ئه‌گه‌رچی ئه‌و ڕاو بۆچوونانه جێگه‌ی ڕه‌زامه‌ندی و په‌یوه‌ندی به‌تینیان به به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانی سه‌رجه‌م خه‌ڵکیشه‌وه هه‌یه.

بۆیه له‌و سیستمانه‌ی ده‌سه‌ڵات ده‌ستی به‌سه‌ر هه‌موو جومگه‌کانی ژیانی کۆمه‌ڵگه گرتبێت و بڕوای به مانا ڕاسته‌قینه‌که‌ی دیموکراتی و ئازادییه سیاسی و مه‌ده‌نییه‌کان نه‌بــێ، ڕای گشــتی ئــازاد بــه زه‌حمــه‌ت دروســت ده‌بێ، بــه‌ڵام ئه‌و ڕایانه‌ی ده‌ســه‌ڵات مه‌به‌ستیه‌تی و له به‌رژه‌وه‌ندییه‌تی، دروست ده‌بن که ده‌ربڕی خواستی جه‌ماوه‌ر نین، بۆیه ئه‌م سیستمانه زۆربه‌یان به شۆڕش و ده‌ستی جه‌ماوه‌رو له ڕێگه‌ی جه‌ماوه‌ره‌وه ده‌که‌ونه به‌ر شالاوی توڕه‌یی.

بــه پێچه‌وانــه‌ی وڵاته دیموکراتی و لیبراڵه‌کان، دروســتکردنی ڕای گشــتی له‌ســه‌ر

بابەتێکی دیاریکراو، کارێکی ئەوەندە قورس و گران نییە و رێگری و بەربەستی بۆ دروست ناکرێت. لەم سیستمەدا، هۆکارەکانی رادەربڕین فەراهەم دەبن و راکان بە ئاشکرا دەردەبڕدرێن، ئەمەش هاوکاری دەسەلاتی سیاسی دەکات بەردەوام بە خۆیدا بچێتەوە، ئەگەر بۆچوون یان دنیابینییەکی هەلە یان نەخوازراوی هەبێت، لە رێگەی جەماوەرەوە ئاگادار بکرێتەوەو بڕیاری سیاسی لە خزمەتی گشتیدا بێت، کە ئەم سیستمانە بە رێگای دیموکراتی ئالوگۆڕی دەسەلات دەکەن.

**میدیا و رای گشتی:**

رۆلی میدیا لە گواستنەوەی زانیارییەکان بۆ جەماوەر لەبارەی بابەتە سیاسییەکان دەست پێدەکات، دواتر لە شیکردنەوەی رووداوەکان و گەیاندنی لێدوانەکان، چونکە جەماوەر بایەخ بەو رووداوو لێدوانانە دەدات، بەلام ئەم رۆلە تایبەتمەندی خۆی هەیە لە هەر سیستەمێکی میدیا، بۆیە ئازادی میدیا بوارێکی پڕ لە پێشبڕکێیە لە نێوان میدیاکارو سیاسەتمەدار، میدیاکار هەوڵ دەدات لە چوارچێوەی ئەو بوارەدا راستییەکان بە جەماوەر بگەیەنێ، هەروەها رۆلی چاودێری لەسەر کارەکانی حکومەت ببینێ، لەلایەکی دیکە سیاسەتمەدار هەوڵ دەدات دەزگاکانی میدیا بۆ مەبەستی خۆی بەکار بێنێ، بەتایبەتی لە کاتی هەلبژاردندا.

بۆیە میدیاکار دەزگاکانی میدیا بەکار دەهێنێ بۆ دروستکردنی رای گشتی، لەگەڵ رەچاوکردنی تایبەتمەندی هەر دەزگایەک: رۆژنامەو گۆڤار دەخوێنرێنەوە، بۆیە بەکار دەهێنرێن بۆ دروستکردنی رای گشتی لە نێوان خوێنەران، هەروەها بۆ ئەو کەسانەی کاتێکی دیاریکراویان هەیە بۆ خوێندن و حەز دەکەن پەیامەکانی سەر لاپەڕەکان دوو سێ جار بخوێننەوە.

بەلام رادیۆ پێویستی بە گوێ راگرتنەو بۆ هەمووان بەکار دەهێنرێ، چونکە تەنانەت نەخوێندەوارەکانیش لە پەیامەکانی تێ دەگەن، هەروەها دەنگی مرۆیی، دەنگی شتەکان، میوزیک، بەکار دەهێنرێ کە ناوەڕۆکی پەیامەکان بەهێزتر دەکات. تەلەڤزیۆنیش پێویستی بە دوو هەستی مرۆییە: چاوو گوێ، بۆیە دەنگی مرۆیی،

دەنگی شتەکان، میوزیک، وێنە، میکیاژ، ئیکسسوارات، جلوبەرگ، دیکۆر زۆرترن، ئەمانەش وا دەکەن ناوەڕۆکی پەیامەکانی بەهێزتر بن.

بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە لە نێوان سیستەمە سیاسییەکانی جیهان جیاوازن، لە سیستەمە دیموکراتییەکاندا میدیا ئازادەو دەتوانێ رای گشتی دروست بکات، هەروەها هاوولاتیان هۆشیارن و هەست بە کێشەکانی نێو کۆمەڵگا دەکەن، بۆیە بەردەوام رای خۆیان دروست دەکەن. بەڵام لە سیستەمە دکتاتۆرییەکاندا رای گشتی بوونی نییە، چونکە میدیا رۆڵی خۆی نابینێ لە گەیاندن و لە شیکردنەوەی کێشەکاندا، چونکە دەزگاکانی میدیا سەر بە حکومەت و پارتە سیاسییەکانن، هەروەها لەبەر کەمبوونی رێژەی هاوولاتیانی رۆشنبیر لە نێو کۆمەڵگادا.

لە وڵاتە دیموکراتییەکان هاوولاتی پێویستی بە دەزگا دەرەکییەکان نییە بۆئەوەی زانیاری بەدەست بهێنێ، چونکە دەزگاکانی میدیای ناوخۆیی هەموو زانیارییەکانی بۆ دەگوازێتەوە، بۆیە پشت بە دەزگا ئاراستە کراوەکان نابەستێ بۆ زانینی زانیارییە ناوخۆییەکان. بەڵام لە وڵاتە دکتاتۆرییەکان هاوولاتیان پشت بە دەزگا ئاراستە کراوەکانی وڵاتانی دیکە دەبەستن، چونکە دەزگا ناوخۆییەکان ئەو جۆرە زانیارییە بڵاو ناکەنەوە.

**دروستبوونی رای گشتیش بە کۆمەڵێک هۆکار پەیوەستە:**

١. توانای دەزگاکانی میدیا لە بەدەستهێنانی زانیارییەکان بۆ مەبەستی بڵاو کردنەوەی لەو وڵاتەی دەزگاکەی لییە.

٢. راستگۆیی ئەم زانیاریانە کە دەزگاکان دەیگوازێتەوە، چونکە جەماوەر متمانەی دەبێ بەو دەزگایەی راستییەکان دەگوازێتەوە.

٣. ئاستی رۆشنبیری و هۆشیاری جەماوەر.

٤. بایەخدانی جەماوەر بەو بەو بابەتانەی دەزگاکانی میدیا بڵاوی دەکاتەوە.

٥. ئاستی ئازادی لە مەسەلەی وەرگرتنی زانیارییەکان لە رێگای دەزگاکانی میدیاوە.

تەنانەت لە قۆناغی مشتومڕی جەماوەریشدا، میدیا رۆڵێکی سەرەکی هەیە لە

نزیک کردنەوەی بۆچوونەکان لە نێوان تاکەکانی جەماوەر، لە دەزگاکانی میدیا ڕێژەی زۆرینـەو کەمینـە دەردەکـەوێ، لـە ڕێگەی ئـەو بابەتانە کـە بڵاو دەکرێتـەوە، بە پێی تیۆری (ڕێکخسـتنی ئەجیندا) جەخت لەسـەر ئەوە دەکرێ کە جەماوەر بۆچوونەکانی دەزگاکانـی میدیـا تەبەنـی دەکات، لە ئەنجامدا دەزگاکانی میدیـا بابەتە گرنگەکان لای جەماوەر ڕێک دەخەن.

## بەشی هەشتەم
## زمان و ئامرازەکانی میدیا

زمان بریتییە لە ئامرازی بەیەکگەیشتن و دواندنی نێوان خەڵک و ڕێگەی لێکگەیشتنی نێوانیانە، تاکەکان وەڵامی ئەو زمانە دەدەنەوە کە گوێبیستی دەبن، پێش ئەوەی توانای بەکارهێنانی زمانەکەیان هەبێت، شیرەخۆر ناتوانێ پەیامی خۆی بە کەسوکاری بگەیێنێ بە بەکارهێنانی زمان و وشەکانی، بەڵام بۆ دەرکردنی ئەو دەنگانەی بەستراون بە ئاوازگەلێکی تایبەت کە گوزارشت لە مەبەستی دەکات، گەرووی بەکار دێنێ.

گرنگی ئامرازەکانی میدیا لەوەدایە جەماوەر دەدوێنێ، بەو پێیەش ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی هەیە لە بەکارهێنانی زماندا کە چەندین سەدە کاریگەرانە بەکارهاتووە، مێژووی زمانە زیندووەکان کاریگەری دامەزراوە ئاینی و پەروەردەیی و حکومییەکان ئەوە دەسەلمێنێ، میدیا کاریگەری خۆی لە دانانی زاراوەگەلێکی جیاوازی هێناوەتە ئاراوەو پەرشوبڵاوی کردۆتەوە، کاری ڕۆژنامەوانیش بەدەر نییە لە کاری ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ڕووی زمانەوانییەوە، کە ڕۆڵیان هەبووە لە وەرگێڕان و دارشتنی هەواڵ و، زۆرجاریش پێویستی کردووە میدیاکارانیش وشەو زاروەگەلێکی تازە بنووسنەوە، ئەمەش گرنگی ڕۆشنبیری زمانەوانی دەردەخات، ئێستگەو تەلەڤزیۆنیش واقیعێکی نوێی هێنایە کایەوە لە ژیان بەهۆی ئەو سێ فاکتەرەوە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەوە بڵاوبوونەوە، کە بریتین لە:

١- شۆڕشی ترانستۆر لەساڵی ١٩٦٠ وای لە ئامێری رادیۆ کرد هەرزان و وردەکار بێت لەوەرگرتن و بڵاوکردنەوە لە سەرجەم وڵاتانی جیهان، لە شوێنی دوورو نزیک و لە شاخ و لە شارو لە لادێ و لە دورگەکان و هەموو قوژبنێک.

٢- دەرکەوتنی تەلەڤزیۆن لە زۆربەی وڵاتانی دونیا کە گۆڕانێکی باشی هێنایە ئاراوە.

٣- گواستنەوە لە ڕێگەی مانگە دەستکردەکانەوە وایکرد پێویستییەکانی زمان لە سنووری ناوخۆیی دەربازی ببێ. ئامرازەکانی میدیاو تەکنیکی نوێ و قوتابخانەو سینەما بەهۆی دیالۆگ و گفتوگۆی نێوان ئەکتەران و، گێرانەوەی لەنێو خەڵک هۆکارێکی نوێی نواند لەژیانی زمانەوانی و، بەپێچەوانەش ڕاستە. ئامرازەکانی میدیا یارمەتی بڵاوبوونەوەی زۆر لە بێژەو شێوە میللییەکانی داوە.

ئەوەی دەروونناسی جیا دەکاتەوە، هەمەچەشنی و زۆری لقەکانێتی بە تیۆری و کردارییەوە، لەوانەش دەروونناسی زمان کە گرنگی بە توێژینەوەی زمان و ڕەفتاری زمانەوانی دەدات لە دۆخی ئاسایی و نائاساییدا.

**دەروونناسیی زمانەوانی:**

زانستێکی نێوبەندییە (علم بيني)، تێیدا هەردوو بواری زمانناسی و دەروونناسی تەواوکار دەبن، تێگەیشتن لێی پێویستی بە شارەزابوونە لە بوارەکانی فەلسەفەو پەروەردەو خوێندن و ڕۆشنبیری، هەروەها بە میکانیزمی کۆئەندامی دەماریی و مێشک و زیرەکی دەستکرد. توێژینەوەیەکی ئەزموونکارییە بۆ پرۆسە دەروونییەکان، کە مرۆڤ لە میانەیدا سیستەمی زمانی سروشتی بەدەست دێنێ و جێبەجێی دەکات.

زمانناسی دەروونی بەوە جیا دەکرێتەوە کە لە ڕوانگەیەکی دەروونییەوە لە زمان دەکۆڵێتەوە، واتە وەک دیاردەیەکی دەروونی لای قسەکەرو گوێگر وەکو یەک گرنگی بە زمان دەدات، قسەکەر هزرەکانی لە دەستەواژەگەلێک کە بە ئاخاوتن گوزارشتی لێ دەکات دادەڕێژێ، بیسەریش درکی دەکات و تێی دەگات، هەروەها بەوەش جیا دەکرێتەوە کە چاودێری پرۆسە زەینییەکانی دەکات لە کاتی فێربوونی زمان و بەکارهێنانی و پەیوەندی ئەوە بە هزرو ڕۆشنبیرییەوە، بۆ نموونە گرنگی بە توێژینەوەی ئەو پرۆسانە دەدات، کە ئاوەزی مرۆیی لەمیانەیدا شێوازی (بیستراو یان نووسراو) بە واتاوە دەبەستێتەوە لەمیانەی نێوبەندێک، کە ئەویش سیستەمی زمانە. زمانناسی دەروونی گرنگی بە توێژینەوەی چۆنێتی تێگەیشتنی مرۆڤ بە زمان و بەرهەمهێنان و فێربوونی دەدات و تەرکیزکریش لەسەر پرۆسە زانینییەکان دەکات،

که لەناواخنی بەکارهێنانی زمان و میکانیزمی مێشک کە پەیوەندی پێوەیە هەیە.

دەروونناسـی لە ئەوروپا وا دیاری کرا کە بایۆلۆژی زەینییە، ئەو باوەڕەش بڵاو بووەوە، کە دەشـێ ڕووداوە زەینییەکان وەکو هەسـت و نەسـت و مۆرکە زەینییەکان بپشـکێنرێ، بـە بەکارهێنانـی پرۆگرامـی وۆرد وەکـو ئـەو پرۆگرامـەی لـە زانسـتی سروشتی بەکاردەهێنرێ، توێژینەوەی زمانیش بەشداری لە شۆڕبوونەوە بە سروشتی زەیندا دەکات، رسـتەش -نەک وشـە- یەکەی بنەڕەتی زمانە، بەرهەمهێنانی وشـەش وەرچەرخاندنـی پرۆسـەی هـزری تـەواوکارە بـۆ بەشـەکانی ئاخاوتن بەشـێوەیەکی ڕێکخـراوو یـەک لـەدوای یەک، لەهەمان کاتـدا توێژەران لە ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرهەڵستی ئەوەیان کرد، تەرکیز بکرێتە سەر توێژینەوەی پرۆسە زەینییەکان وەک ئامانجێک بۆ دەروونناسی، رەفتارخوازییەکان ڕوویانکردە توێژینەوەی رەفتاری بابەتی، کە درکی بە هەستەکان کردبێ، دووپاتیشیان لەسەر ڕۆڵی ئەزموون کردەوە لە پێکهێنانی رەفتار، دووپاتیان لەسـەر ڕۆڵی سـزاو پاداشـتیش کردەوەو دووپاتیان لەسەر بوونی شێوەگەلێک کردەوە کە ڕاستەوخۆ لە ژینگەدا هەن.

کاتێک رەفتارناسەکان زمانی مرۆڤیان تاوتوێ کردو گرنگییان بە رەفتاری بێژەیی دا، دووپاتیـان کـردەوە کـە وردی رەفتـاری ئاخاوتن، دەرەنجامی نەشـونمای تاکە لە ژینگەکەی کە شـێوەی زمانی وردو ڕاسـت لەخۆدەگرێ، هەروەها دەرەنجامی سوور بوونە لەسەر فێرکردنی منداڵ، کە بە ڕاستی دان بە وشەدا بنێ و هەڵەکانی ئاخاوتنیان ڕاست بکرێتەوە.

رەفتارناسـان تەرکیزیـان لەسـەر گرنگیپێدانی واتـا کردووە، کـە توێژینەوەکانیان دووپاتیـان لەسـەر ئەنجامـی واتا لە وشـەدا کردۆتـەوە، وەکـو پێوانەکردنی ئەنجامی ئەو واتایانەی تاک دەتوانێ لە ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا پێشکەشـی بکات و، لە لیسـتێکی وشـەی تـاک و تەرادا دایبنێ کە واتـای هەبێت، هەروەها وەکو سـەلماندنی ئەوەی وشە واتادارە ناسراوەکان وەک (چێشتلێنان) فێربوونی ئاسانترە لە فێربوونی ئەو وشانەی واتای ناسراو نییە، وەکو ئایکۆن- شریتە.

سـەرەڕای بەستنەوەی ئاڵوگۆڕی هزرەکان لەنێوان هەردوو بواردا، دەروونناسی

و زمانناسـی وەک دوو زانسـت بۆ چەندین دەیە مانەوە، تا قۆناغی کۆتایی زمانناسی دەروونـی هاتـە ئـاراوە، ئەنجوومەنی توێژینەوەی زانسـتی کۆمەلایەتی سـاڵی ١٩٥٠ کۆنگرەیەکیان بەسـت، کە زانایانی زمان و زانایانی دەروونییان بانگهێشـت کرد، تێیدا بەرنامەیەکی هاوبەشی تایبەت بە زمانناسی دەروونی ئامادە کرد، کە پێیانوابوو ئەو ئامرازانەی دەروونناسان لە ڕێبازو بیردۆزکانیان پشتی پێ دەبەستن لەوانەیە بتوانێ بونیادی زمان ئاشکراو شی بکاتەوە، کە زمانناسی چارەسەری نەکردووە.

**پەرەسەندنی زمان:**

**پەرەسەندنی زمان چەند ئاستێکی هەیە، ئەمانەن:**

ئاسـتی یەکـەم: پەرەپێدانـی زمـان لـە نـاوەوە: مەبەسـت لێـی هەنگاونانـە لەگـەڵ گەشــەی کۆمەڵ و شــان بەشانی پەرەسەندنەکانی لەمیانەی شیتەڵکردن و داتاشین و بەرهەمهێنان، ئەم جۆرە پەرەســەندنە هێواشــە لەوانەیە ئەهلی زمان بەسروشت لەناو نەوەیەک یان چەند نەوەیەک هەسـتی پێ نەکەن، چونکە تێیدا دەژین و لەگەڵی تێکەڵ دەبن، بەڵام ئەوەی هەستی پێ دەکات و لەمسی دەکات نەوەکانی دواترە.

ئاسـتی دووەم: پەرەپێدانـی زمـان لـە دەرەوە: مەبەسـت لێـی ئـەو کاریگەریانەیە کە فشــار دەخەنە ســەر زمان و بۆ دەســتکاریکردنی زمان لە ناوەوەو دەرەوە خۆی دەسەپێنێ، لەگەڵ لابردن و خستنەسەرو گەندەڵکردن و تێکدان و دەرچوون لە ڕێسا پەیرەوکـراوەکان و بناغـە پشـت پـێ بەسـتراوەکان، ئەم جـۆرە پەرەپێدانـە زۆرداررو سـتەمکارانەیە، چونکـە بـە زەبـری واقیع سـەپێنراوە، یـان لەژێر کاریگەری هێرشـی هـزری کـە هێرشـی زمانیشـی لەگەڵـدا دەبـێ. هەروەهـا ئەو گەشـەیەیە کـە لەوانەیە زمانێک لە زمانەکان وا پێناسەی بکات، ئەمیش گەشەیەکی دروست نییە بەشێوەیەکی یـەک لـەدوای یـەک نییـە، بەڵکـو بەشـێوەیەکی هەرەمەکیانەیـەو زمان تێـک دەدات و ئەرکانەکانی و کۆڵەکەکانی وێران دەکات.

**مەرجە گرنگەکانی بەدیهێنانی گەشەپێدانی زمانەوانیش بریتین لە:**

یەکـەم: کەمکردنـەوەی جیـاوازی نێـوان زمانـی نووسـین (پەتی) و زمانـی میللی

ئـەوەی بەگشـتی خەڵک قسـەی پـێ دەکات، چونکە بەو شـێوەیە نەوەیەکی دروسـت خـاوەن زمانێکـی دروسـت پـەروەدە دەبـێ، ئەمیش کاریگەری لەسـەر گەشـەکردنی زمانەکە دەبێت.

دووەم: زمـان پێویسـتییەکانی کۆمـەڵ بـەدی بێنێ، بـەرەو ئاسـتی بەرزیش پێش بکەوێ بۆ هەموو جۆرە شێوەیەکی گوزارشت، کە زمانێکی پێشکەوتوو شان بەشانی سەردەمەکەی بێ و لەگەڵ دەوروبەری گونجاو بێ، گوزارشت لە رۆشنبیری کۆمەڵ و راپەڕین و پەرەسـەندنی بکات، شـان بەشانی دۆخەکانی بێ و رەنگدانەوەی شەوق و هیوای بێ.

سێیەم: رووپێوێکی گونجاو لەنێوان وتاری رۆژانە لە رێگەی سەرجەم ئامرازەکانی میدیـا بپارێـزێ، هەروەهـا لە نێوان زمانی هزرو ئـەدەب و داهێنان لە بواری خۆیاندا، کە هەمیشە نموونەی باڵا لە بەکارهێنانی زماندا هەبێ، کە وتاربێژان و نووسەران بە جیاوازی چینایەتیانەوە چاوی تێ ببڕن و هەوڵی بەپێشەنگزانینی بدەن و تێ بکۆشن بـۆ بەرزکردنـەوەی، ئەگـەر ئەو نموونە باڵایـە نەبوو نموونەی کـەم بەها و نزمترین پلـە جێـی بگرێتـەوە، ئەوا توانای ئاوەزی پەروەردە نـاکات و بەهرەی زاخاو نادات و زمانەکەش ناپارێزێ، ئەگەر زیانی پێ نەگەیەنێ و گەندەڵی نەکات.

ئەم سێ مەرجە ئەمرۆ خۆی لە زمانی پەتی سەردەم دەنوێنێ کە لەسەر دارشتنی زمـان بەرێوەدەچـێ، رسـتەکانی و دارشـتنەکانی هەمووی لە پێشـکەوتن یاخی نابن، شـتی جێگیـرو ڕەگ داکوتراویـش نیـن وەکـو بـەردی بێ دەنـگ، بەڵکـو بوونەوەری زینـدوون وەکـو خاوەنەکانیـان، ئـەوان لـە پێشـکەوتن و گۆڕانـی بەردەوامـدان هەر لەرۆژی لانکیانەوە تا رۆژی ئارامییان لەناو گۆڕ، هەروەها رسـتەو دارشـتن لە زمان کە ئەمەندەی پێناچی جوڵە دەکات و پێش دەکەوێ و دەگۆڕێ، لایەنێکی زۆر فراوانە لە شێوازی ساکارکراوی نوێ بۆ زمانی پەتی هاوچەرخمان.

### ئەو کارەمەبیانەی یارمەتیدەرە بۆئەوەی زمان کاریگەر بێت:

خەڵک زۆربەی کاتەکانیان بە قسـەکردن بەسـەر دەبەن، بەڵام دەترسـن لەبەردەم

ژمارەیەکـی زۆری خەڵـک قسـە بکەن، ئەمیش هەسـتێکی ئاسـاییە بـۆ هەموو خەڵک، هەنـدێ ڕێنمایـی پێشـکەش دەکـرێ کە ئەو هەسـتە لا دەبـات، وا لە تـاک دەکات پتر متمانەی بە خۆی هەبێ و توانای قسەکردنی لەبەردەم خەڵکدا دەبێت:

١- خۆئامادەکردن بۆ قسـەکردن، بۆ ئەمە شـەش هەنگاو هەیە: زانینی خەسـڵەت یان جۆری جەماوەری گوێگر، هەڵبژاردنی بابەت، دیاریکردنی مەبەستی قسەکردنەکە، کۆکردنەوەی زانیاری، ڕێکخستنی ناوەڕۆکی قسەکردن، شێوازی پێشکەشکردنی.

٢- خەسڵەتی جەماوەری گوێگر: پێویستە بیرۆکەیەکی گشتی لەبارەی ئەدگارەکانی گوێگـرەکان هەبـێ: قەوارەی جەماوەر، تەمەن و ئاسـتی خوێندنیـان، بۆچوونەکانیان. توانـای خەڵـک بـۆ تێگەیشـتن جیـاوازە بەپێـی پاشـخانی زمانەوانیان لـە قۆناغەکانی تەمەنیان، هەروەها بەپێی ئاسـتی خوێندنیان، قسـەکردنی نێرەرێک لەبارەی ڕۆمەکان بۆ کۆمەڵێک منداڵی خوار هەشـت سـاڵ پێویستە جودا بێت لە قسەکردن سەبارەت بە هەمـان بابـەت بۆ قوتابیانی کۆتایـی قۆناغی دواناوەندی. جیاوازییەکەش هەمیشـە لە وشەو ڕستەو جۆرەکانی ئەو ڕووداوو زانیاریانەی کە پێشکەش دەکرێن.

٣- بۆچوونەکان: لە کاتی قسـەکردن لە بابەتێک کە مایەی مشـتومڕ بێ، پێویسـتە لەسەر نێرەر بۆچوونی جەماوەر بزانێ، بۆ نموونە ئایا زۆربەیان مەیلی بۆچوونەکانی ئەمیـان هەیـە یان گوێی نادەنێ؟ ئەگـەر بۆچوونەکانیان پێچەوانـەی بۆچوونی نێرەر بوو، یان ئەگەر گوێیان پێ نەدا، پێویسـتە نێرەر زۆر ڕاسـتی و زانیاری کۆ بکاتەوە بۆ قەناعەتپێکردنیان.

٤- قەبارە: قسـەکردن بۆ کۆمەڵێک، کە ژمارەیان زۆر بێ پێویسـتی بە کەشـێکی فەرمیتـر هەیـە لە کۆمەڵێکی ژمارە کەم، هەروەها قسـەکردن بـۆ کۆمەڵی ژمارە زۆر لەوانەیە لە سـەکۆیەکەوە بێت، بەڵام قسـەکردن بۆ گرووپی بچووک دەکرێ لە کاتی دانیشـتن بێت، ئەمە سـەرەڕای کاریگەری قەبارەی جەماوەر لەسـەر شـێوازی گشتی قسەکردنەکە.

٥- هەڵبژاردنی بابەت: پێویستە لە هەڵبژاردنی بابەت ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێ: یەکـەم: بابەتێـک هەڵبژێرە بەلاتەوە گرنگ بێت یان زۆر لەبارەیەوە بزانیت، چونکە

ئەمە یارمەتییەکە بۆت بەمەرجێک بەرسڤی جەماوەرەکەت باش بێ.

دووەم: ئـەوەی جەمـاوەر گرنگـی پێ دەدات بەهەندی وەربگـرە، لەبارەی ئەوەش قسە لەگەڵ خەڵک بکە، کە بەلایانەوە گرنگە و سەرقاڵی کردوون.

سـێیەم: بەرزو نزمی دەنگت گونجاو بێ لە ئاسـتی قسەکردندا، قسەکردن لەبارەی بابەتێـک لـە دامەزراوێـک کـە کاری تێـدا دەکەی جیـاوازە لە کردنی هەمـان بابەت لە یانەیەکی وەرزشی.

چـوارەم: بـە وردی بابەتەکە دیاری بکـە، زانیاری لەبارەیەوە کۆ بکەرەوە، ماوەی قسەکردنەکەش دیاری بکە، بۆئەوەی بتوانی باڵ بەسەر هەموو لایەنەکانیدا بکێشی.

٦- دیاریکردنـی مەبەسـت: زۆرجـار وتـار بـۆ بەدیهێنانـی یەکێـک یـان زیاتر لەم مەبەستانەی خوارەوە پێشکەش دەکرێت:

ا. هـەواڵ پێـدان: پێشکەشـکردنی راسـتی و زانیارییـەکان دەبـێ بەشـێوەیەکی راستەوخۆ بێت.

ب. قەناعەتپێکردن: لەکاتی هەوڵدانتە بۆ رازیکردنی جەماوەر لەبارەی کارێک، یان گەڵاڵەکردنی بیرۆکەیەکی دیاریکراو، کە شان بەشانی رووداوەکان پشت بە دوواندنی سۆزی جەماوەر دەبەستی.

ج. چێژوەرگرتن: بە پێشکەشـکردنی ئەزموونگەلێک کە وا لە جەماوەرەکەت بکەی هەست بە سەروەری و بەختەوەری بکەن، زۆرجاریش ئەمەیان فەرمیتی لە هەردوو جۆری پێشوو کەمترە.

٧- کۆکردنەوەی زانیاری: ئەگەر زانیاریت لەبارەی بابەتی قسـەکردنەکەوە نەبوو یان زانیاریەکانت کەم بوون، ئەوا پەیرەوی ئەمانە بکە:

ا. بابەتەکـە وەک خـۆی (بـە سروشـتی) ببینـە: ئەگـەر قسـەکردنەکەت لەبـارەی سـەرلەنوێ دروسـتکردنەوەی کاغـەزی رۆژنامـە بـوو، پێویسـتت بەوەیە سـەردانی کارگەیەک بکەی کە ئەو کارە دەکات.

ب. ئەوەی لەبارەی کتێبخانەوەیە بەکاری بێنە: چونکە کتێب، گۆڤار، رۆژنامە، فیلم، نەخشەو شتی دیکە، زانیاریەکی زۆر لەخۆدەگرن.

ج. بەکارهێنانی سەرچاوەکانی زانیاری ئەلیکترۆنی ناو کتێبخانەی دیجیتاڵی و ئەلیکترۆنییەکان یان بەکارهێنانی لاپتۆپ. لەو سەرچاوانەش: پەیوەندی راستەوخۆ، خەپڵە نەرمەکان (الاقراص المرنة)، لوولەکە لێکدراوەکان (الاسطوانات المدمجة)، خەپڵەی ریزکراوی لیزەر (cd-room)، ئینتەرنێت، هۆکارە جۆراوجۆرەکان، بڵاوکراوەی ئەلیکترۆنی، خەپڵەی ژمارەیی.

د. ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ خاوەن ئەزموون و شارەزاکان لەبارەی بابەتەکەت، ئەگەر وتارەکەت لەبارەی کاریگەری بڕی بودجەی خوێندن بوو لەسەر قوتابخانە، پێویستت بە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمارەیەک لە مامۆستایانی قوتابخانەی ناوچەکە یان گەڕەکەکەیە.

٨- رێکخستنی ناوەڕۆک: وتاری سەرکەوتوو پێویستی بە (پێشەکی، توندوتۆڵی و کۆتایی) هەیە. پێشەکی وتارەکەت با سەرنجڕاکێش بێ، ئاگای جەماوەر رابکێشێت، بابەتی وتارەکەتی بەشێوەیەک پێ رابگەیەنیت جەماوەر نزیک بکاتەوەو دوور نەکەوێتەوە، بەم شێوەیەش دەست پێنەکەیت: قسەکانم لەبارەی...، بەڵکو وتارەکەت بەدەگمەنییەکی کەسێتی یان بە دەستەواژەی کاریگەر دەست پێ بکە.

بەڵام توندوتۆڵی وتار کرۆکەکەیەتی، بۆیە خاڵی سەرەکی پێشکەش بکە، بەڵگەو دوورو درێژی پاڵپشتی وتارەکەت بێ، خاڵە سەرەکییەکانیش بە چەند شێوەیەک پێشکەش دەکرێت، لەوانەیە بەپێی گرنگی ریزبەند دەکرێ، گرنگترین پاشان دوای ئەو، لەوانەشە بەپێی زەمەنی رودانی ریزبەند بکرێ. ئەگەر خاڵێکت نمایش کردو گومانت کرد کە هەرسکردنی قورسە، هەوڵی ئاسانکردنی بدە بۆ رووداوی ئاسان و پلەبەندی، یان پەنا ببە بۆئەوەی جەماوەر لێی دەزانێ. کۆتایی قسەکانیشت پوختەکەیەتی، دوا دەرفەت بۆت ئەوەیە مۆرکێکی بەهێز لای گوێگر دروست بکەی، هەوڵبدە وتارەکەت بە شتگەلێک کۆتایی پێ بێنی گوێگر بخاتە بیرکردنەوە، لەوانەشە بۆ کۆتایی ئەوە بەسوود بێ کە ئاماژە بە سەرچاوەگەلێکی گرنگ، یان وتەی کەسایەتیگەلێکی گرنگ بدەی.

٩- شێوازی وتاردان: پێویستە بڕیار لەسەر رێگای وتاردانەکەت بدەی، بۆ ئەمە

چوار ڕێگا هەیە:

ا. خوێندنەوەی وتارەکە لەسەر کاغەز یان لاپتۆپ: ئەمەیان پرۆسەیەکی ئاسانە، لە جیاکەرەوەکانیشی دڵنیابوون لە بیرنەچوونەوەی هەندێ خاڵی دیاریکراوو گونجاندنی وتارەکە بۆ ئەو ماوەیەی بۆت رەخساوە، بەڵام لایەنی نەرێنیشی هەیە، لەوانەش: لەوانەیە لە خوێندنەوە نغرۆ ببی و روبەڕووی جەماوەر نەبیتەوە، لەوانەشە بەشێوەیەکی بێزارکەر بخوێنیتەوە کە گرنگییەکەی لەدەست بدات.

زەحمەتیشە ناوەڕۆکی ئەوەی دەیخوێنیتەوە راست بکەیتەوە، بۆئەوەی لەگەڵ کاردانەوەی جەماوەر بگونجێ. پێویستە لەسەرت ئەگەر خوێندنەوەی وتارەکەت هەڵبژارد بە وردی و گرنیپێدانەوە بینووسی، هەندێ لە وتاردەران وتارەکانیان لەسەر پیتاکی سەربەخۆ یان لاپەڕەی جۆراوجۆر بە کۆمپیوتەر دەنووسێت، کە ڕێگەیان دەدات لە کۆتایی هەر پیتاکێک یان هەر لاپەڕەیەک بە دوای کاردانەوەی جەماوەردا بڕۆن.

ب. ئەزبەرکردنی وتارەکە، مەبەست لێی هەڵگرتنی وتارەکەیە لە سینگ ئەمیش کردارێکی زەحمەتە، کە چەند کاژێرێک یان رۆژێک دەخایەنێت بەپێی درێژی وتارەکە، لە کەموکورتییەکانی لەوانەیە هەندێ خاڵی گرنگی وتارەکە لەبیر بکرێت، هەروەها رێگە بە راستکردنەوەی وتارەکە نادات، بۆئەوەی لەگەڵ جەماوەر بگونجێت، ئەگەر بڕیارتدا وتارەکە ئەزبەر بکەیت پێویستە لەکاتی پێشکەشکردنی هێمن و ئاسایی بیت.

ج. وتاری سەرپێیی: بەکارهێنانی لە وتارە فەرمییەکاندا دەگمەنەو لە کۆبوونەوەکانی لیژنە و یانە و تیمەکانی کارکردن بەکاردەهێنرێت، بەوە جیا دەکرێتەوە کە رەمەکی و زیندەییە، زۆرجاریش لەگەڵ میزاجی جەماوەر دەگونجێ، لە کەم و کورتییەکانی: ئەگەر پێش گوتنی رێک نەخرێ ئەوا دەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی هەندێ خاڵ، لەبەرئەوە باشتر وایە پێش هەنگاو نان هزرەکانت رێک بخەیت و، سەرەکییەکانیشی بە چەند وشەیەک لە کاغەزێکی بچووک تۆمار بکەیت.

د. سەرپێیی پاڵپشتکراو: وێنەی ناوەڕاستە لەنێوان خوێندنەوەی نووسراوو و بەسەر پێ رۆیشتن، کە هەمووی بە تەواوی نانووسرێت، بەڵکو خاڵە سەرەکییەکانی

دەنووسرێت، وشە و رستەکانی دەستپێکردن کە هەموو خاڵێک پێی دەست پێدەکات، لە جیاکەرەوەکانی نەرمی نواندنە، کە تۆ دەتوانی شتی بخەیتە سەر، یان لێی ببڕی بەپێی کاردانەوەکانی جەماوەر، هەروەها دەتوانی روبەڕووی جەماوەر ببیتەوەو تێڕوانینەکانیان یەک بە یەک بزانی، سەرپێی پاڵپشتیکراو پێویستی بە کۆکردنەوەی زانیاری زۆر هەیە، بەو رادەیە بەکاری دێنی کە لە بەرسڤی جەماوەر بۆ وتارەکەت سەرنجی دەدەی.

١٠- خۆڕاهێنان لەسەر وتاردان: راهێنان لەسەر وتاردان پێویستە بۆ هەموو شێوەکانی وتار: خوێندراو، سەرپێیی تەواو، سەرپێیی پاڵپشتیکراو، راهێنان ئامرازێکی کارایە بۆ زیادبوونی باوەڕ بەخۆبوون و سەرنجڕاکێشان، هەردووکیشیان دوو هۆکاری گرنگن بۆ کارتێکردنە سەر جەماوەر.

١١- چۆن خۆت رادەهێنی؟ بە پشتبەستن بە پلانی سەرەتایی وتارەکە دەست بە راهێنان بکە، ئەگەر توانیت ریکۆردەرێکی دەنگ بەکاربێنە، پاشان گوێ لە وتاردانەکەی خۆت بە رەخنەوە بگرە، دوای ئەوە دەتوانی لەبەردەم ئاوێنە وتارەکەت بخوێنیتەوە، لەوانەشە داوا لە یەکێک لە هاوڕێکانت بکەی گوێت لێ بگرێ، بەو شێوەیە دەزانی هەڵوێستەکەت چۆنە، ئایا ئەگەری ئەوەی هەیە بزاڤەکانت یارمەتیدەری کارتێکردن بێت لە جەماوەر یان ئاگای پەرش و بڵاو بکاتەوە، ئەمەو زۆر هۆکاری دیکە کار لە رادەی سەرکەوتنی وتاردانەکەت دەکات، کە پێویستە لەکاتی راهێنان ئاوڕی لێ بدەیتەوە، گرنگترینیان جۆشی دەنگ، خێرایی ئەدا، ئاوازی دەنگ، روونیی گوتن.

ا. جۆشی دەنگ: مەبەست لێی قەوارەی دەنگە، رێسای بنەڕەتیش ئەوەیە بە دەنگێک قسە بکەی جەماوەر بە روونی گوێی لێ بێ، بەمەرجێک رەچاوی قەوارەی ئەو شوێنە بکەی کە قسەی تێدا دەکەی، ئایا میکرۆفۆنی تێدا بەکاردێنی یان نا، ئایا ژاوەژاوی وای تێدایە بەسەر دەنگەکەدا زاڵ بێ، بە هەر شێوەیەک بێ پێویستە بەرزی و نزمی بە دەنگت بکەی، لەوانەیە دەنگت بەرز بکەیتەوە بۆئەوەی دووپاتکردنەوەی خاڵێکی گرنگ، هەندێجاریش بەمەبەستەوە دەنگ نزم دەکرێتەوە، بۆئەوەی ئاگای جەماوەر رابکێشی.

ب. خێرایی: هەوڵبدە خێرایی قسەکردنت کۆنترۆڵ بکەی بۆئەوەی لەگەڵ ئەو ماوەیەی بۆت رەخساوە بگونجێ، ناشبێ بەخێراییەک قسە بکەی وشەکان تێکەڵ بە یەک بن، چونکە جیاکردنەوەو تێگەیشتنی زەحمەت دەبێ، لەوانەشە گوتنی وشەیەک یان رستەیەکی دیاریکراو سست بکەیتەوە کە بزانی لە کارتێکردن لە جەماوەر گرنگی خۆی هەیە.

ج. ئاواز: مەبەست لێی دروستکردنی ئاوازە بۆ دەنگ، بۆئەوەی یارمەتی تێگەیشتنی واتا بدات، بۆ نموونە پرسیارکردن ئاوازی خۆی هەیە، نیشانەی پرسیارکردن ئاوازی خۆی هەیە، سەرسوڕمان ئاوازی خۆی هەیە، هەڵچوون ئاوازی خۆی هەیە، بەو شێوەیە. لەبەرئەوە پێویستە لە وتاردانندا بەرزی و نزمی بە دەنگت بکەیت، بۆ دوورکەوتنەوە لە بێزاربوون و هەوڵدان بۆ کارتێکردن لە جەماوەر.

د. روونی: وشەکان بەوپەڕی روونی دانیان پێدا بنێ، پیتەکان بە تەواوی دەربکە.

ه. رواڵەت و جوڵە: رواڵەت کار لە جەماوەر دەکات، جلوبەرگی گونجاو بەپێی هەڵوێستەکە لەبەر بکە، بێ زیادەڕۆیی یان بریقەداری کە ئاگای جەماوەر پەرش و بڵاو بکات. بەخاوو خلێچی لەسەر سەکۆکە پاڵی لێ مەدەوە، هەوڵبدە دڵخۆش دەربکەویت، چاوت بخەرە سەر جەماوەر نەک بۆ بنمیچەکە یان زەوییەکە یان پەنجەرەکان، ئەگەر وتارێکی نووسراوت پێشکەش کرد وا مەکە کاغەزەکان بەرچاوت بگرن، هێماو جموجوڵت یارمەتیدەرتە بۆ دووپاتکردنەوەی ئەوەی دەیڵێی، بەلام زیادەڕۆیی تێدا مەکەو بە بێزاری بەکاری نەهێنی، کە وا لەجەماوەر بکەی سەرنج بداتە جموجوڵەکانت زیاتر لە وتارەکەت.

و. ئامرازکانی بیستن و بینین: وەکو نەخشەو وێنەی رەنگاورەنگ و نیگارو شێوە روونکردنەوەییەکان و، نموونەو خەپڵەو کاسێتی تۆمارکراو، هەموویان پەیوەندیدارن وا لە وتارەکەت بکات زیندوو بێ و کار لە ئاگای جەماوەر بکات، یارمەتیش دەدات بۆ وەبیرهاتنەوە بەشێوەیەکی باشتر لەوەی ئەگەر وتارەکەت تەنها بە وشە بێ، پێویستیشە لەکاتی هەڵبژاردنی ئامرازەکان جەخت لەسەر ئەمانە بکەی:

- ئامرازەکە خزمەتی مەبەستێکی دیاریکراو بکات: نموونەیەک یان

بەرجەستەکراوێکی گوێ زیاتر بەسوودە لە تەنها وێنەیەکی گوێ لەکاتی شرۆڤەکردنی گوێ و ئەرکەکانی، گوێگرتن لە تۆمارکردنی شێوەزارە ناوخۆییەکان بەسوودە لەکاتی گفتوگۆکردنی ئەم شێوەزارانە.

- ئامرازەکان بەگوێرەی پێویستیت بێ زیادەڕۆیی بەکار بێنە، نەخشەی هەموو ئەفریقا مەخەرە روو، لەکاتێکدا تۆ باس لە جەنگەکانی شەڕی جیهانی دووەم دەکەی.

- ئەو ئامرازە بەکار بێنە کە قەوارەی بۆ سەیرکردنی جەماوەر گونجاو بێ، رەچاوی قەوارەی ژووڕەکەو ژمارەی گوێگران بکە.

خۆت لەسەر ئەو ئامرازانە رابهێنە کە بەکاریان دێنی، ئەمانەشت لەبیر بێ کە ئەو ئامرازانە بەکاردێنی:

ا. ئامرازەکە ئامادە بکە پێش ئەوەی وتارەکەت پێشکەش بکەی، وای لێ بکە لەبەرچاوی جەماوەر دوور بێ، تا بۆ بەکارهێنانی کاتی گونجاو رێک دەکەوێ، بەو شێوەیە لە پەرش و بڵاوی ئاگای جەماوەر دوور دەکەویتەوە.

ب. ئامرازەکان لەسەر ستاند قایم بکە، لەکاتی قسەکردن بەدەست مەیگرە.

ج. بەکارهێنانی هەر ئامرازێک نابێ پەیوەندی بینینت لەگەڵ جەماوەر بپسێنێ.

د. بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی، دەسپێگیر (مقابس)ی کارەباو دەزگاکان پێش قسەکردن بەکاربێنە.

ه. بەڕێکردنی ئامرازەکە لەسەر جەماوەر لەکاتی قسەکردن ئاگایان پەرش و بڵاو دەکاتەوە، دەکرێ ئەگەر پێویست بوو بەڕێکردنەکە پێش قسەکردن یان دوای قسەکردنەکە بێت.

و. لەبیرت بێ کە جەماوەر ئامانجە، قسەی بۆ ئەو بکە نەک بۆ ئامرازەکە.

**زمان وەک ئامرازێکی پەیوەندیکردن:**

ئامرازەکانی تەکنۆلۆژیا چۆن زمان بەکار دەهێنن؟ ئامانجی بنەڕەتی زمان پەیوەندیکردن و گواستنەوەی زانیارییەکان بە باشترین رێگای پەیڕەوکراو بە باشترین گوزارشتکردن و پەیوەندیکردن و کارتێکردن، زمانیش ئامرازی یەکەمی

بنەڕەتی پەیوەندیکردنە. زاراوەی پەیوەندیکردن، پەیوەندیکردنی پەیامی زارەکییە یان دەستنووسە، یان زانیاری یان هزرو بیروڕا لەڕێگەی ئاخاوتن یان نووسین یان هێماوە.

ئەم پرۆسەیە لە ڕێگەی ئامرازە ناسراوەکانی تەکنۆلۆژیا بەهۆی زنجیرەیەک کارلێککردنی ئاڵوگۆڕی پێکەوە بەستراو دەبێت: نێرەر- وەرگر- پەیام- ئامرازی پەیوەندیکردن. هەروەها پرۆسەیەکە بۆ ئاڵوگۆڕی چەمکەکان لەنێوان تاکەکان، بە بەکارهێنانی سیستمی سیمبولە ناسراوەکان، واتای جەماوەریی پەیوەندیکردنیش بریتییە لە دانی هەواڵ و زانیاری و بیروڕا بە جەماوەر بە ئامانجی کارتێکردنی بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ.

لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیکردن بەقەد کۆنی کۆمەڵگەی مرۆیی کۆنە، لەو رۆژەوە هەیە کە مرۆڤ هەستی بە بوونی راستەقینەی خۆی کردووە، لە هێماوە دەستی پێکردووەو بە دۆزینەوەی زمان کۆتایی پێ هاتووە، تا گەیشتە ئەوەی ئەمرۆ دەیبینین لە ئامرازە نوێیەکانی میدیا، کە ئێستا دەوترێ: هەر زمانی میدیایە کە شارستانیەت دادەڕێژێ.

ئامرازەکانی میدیایش ئەو رێگایەیە بەهۆیەوە دەکرێ بیرۆکەیەک یان رایەک بگەیەنێتە ژمارەیەک وەرگر، وەکو رۆژنامە، رادیۆ، تەلەڤزیۆن، سینەما، هەر ئامرازێکیش جۆرێکی تایبەت لە پەیام هەڵدەگرێ کە جیاوازە لەوانی دیکە، لەوانەشە ئامانجی خۆشگوزەری یان رۆشنبیرکردن یان میدیا بێت.

ئەو پرسیارەش کە خۆی نیشان دەدات ئەوەیە، چۆن زمان وەک ئامرازێکی پەیوەندیکردن دەردەکەوێ؟ پرۆسەی پەیوەندیکردن تەنها لەسەر نێرەرو وەرگر بەند نییە، سەرکەوتوش نابێ بە پەیام نەبێ، هەروەها ئامرازیش دەگەیەنێ یان بەشێوەیەکی باشتر زمانیشە، کەواتە زمان ئامرازی پەیوەندیکردنە کە پرۆسەی پەیوەندیکردنی جەماوەری لەسەر بەندە.

هەر وشەیەکیش سیمبولێکی هەیە، تەنها زاراوەی سیمبولیی رووتیش نییە، بەڵام لە چوارچێوەی پێکهاتەی زمانەوانی بەندە بە گواستنەوەی واتاوە، وشەی لە

چوارچێوەی ئاخاوتنـدا بەڵگەی سـیمبولیی لەهەر جارێک جیاوازە، دوو رەهەندیشـی هەیە: رەهەندی مادی و رەهەندی واتایی، میدیاکاری جەماوەری گرنگی بە رەهەندی واتایی وشـە دەدات، چونکە تاکە خەمی جەماوەری گشـتییە، کاتێک تاکێک پەیوەندی بە کەسێکی دیکەوە کرد، هەوڵدەدات بەشداری ئەوە بکات کە پەیوەندی پێوە دەکەین.

لێـرەوە گرنگی زمـان دەردەکەوێ بەوپێیەی گرنگترین ئامـرازی پەیوەندیکردنەو، ئـەو بناغەیەیـە کە سـەرجەم ئامرازەکانی دیکەی پەیوەندیکردن لەسـەری وەسـتاوە، کەواتە دەبێ زمانێکی نوێ و سادەو گونجاو لەگەل پێویستی هەر ئامرازێکی میدیایی بدۆزرێتەوە.

زمانـی کـوردی بـە مێـژووی دوورو درێژی خۆی ئـەوەی نەزانیـوە وەک ئەمڕۆ دەیزانـێ، لـە خێرایـی گەشـەکردن و تەکانـدان لە پێشـکەوتن و شـان بەشـان بوونی گۆڕانکارییەکان، بەپێی زۆر هۆکارو لە ئەنجامی هۆکاری زۆر لەوانەشە بەهێزترینیان ئـەو دەسـەڵاتە فراوانەیە کە کەناڵەکانی میدیا هەیانـەو پەیڕەوی دەکەن، کە ئەوپەڕی کاریگەریان لەسەر بەهاو پرەنسیب و سیستم و رەفتارەکانی کۆمەڵگە هەیە، هەروەها لە زمان و رۆشنبیری و بەو شێوەیەش کە هەندێ لە کۆمەڵگاکان ناسنامەی شارستانی خـۆی گـوم دەکات و دەسـتی دەگاتـە تایبەتمەنـدی رۆشـنبیری و، لەپێشـیانەوەش تایبەتمەندی زمانەوانی.

پەیوەنـدی نێـوان زمـان و میدیـا هەمیشـە لەسـەر یـەک هێڵگەلێکـی تەریـب نین، هەردوولا کاریگەری ناگۆڕنەوە بەهۆی نەبونی هاوهێزی نێوانیان، چونکە میدیا لایەنی بەهێـزە، لەبەرئەوە کاریگەری لەسـەر زمان گەیشـتۆتە ئەو پلەیەی کـە تایبەتمەندییە جیاکارەکانـی زمـان لاواز دەکات و زیانـی پـێ دەگەیەنێ، هەندیجـار دەگاتە تێکدان و وێرانکردنی جوانی.

ئەگەر هەموو زانست و هونەرێک و هەموو لقێکی چالاکی مرۆیی زمانێکی تایبەتی هەبێ، ئەوا زمان لە میدیادا لە زۆر رووەوە جیاوازە لە بوارە جیاوازەکانی پسپۆڕیتی، لە هەڵوێستی لاوازدایە بەرامبەر هێزی میدیاو بالادەستی، لەوانەیە زمان خۆی بەسەر میدیادا بسەپێنێ، بەلام ئەوە میدیایە باڵ بەسەر زماندا دەکێشێ.

**پەیوەندی ئامرازەکانی میدیا بە زمانەوە:**

سەرجەم زانایانی زمان و شارەزایانی لەسەر راستییەک کۆکن کە زمان لەڕووی ئـەوەی بوونەوەرێکـی زیندووە دەکەوێتە ژێر رکێفی یاسـای گەشـەو پەرەسـندنەوە، پەرەسەندن بنچینەیەکی رەسەنە لە ژیانی زمان بەوپێیەی بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، بناغـەی پەرەسـەندنیش یەکەمجـار بوونێکـی سـادەیە، دووەم جاریـش نەشـونمای پەرەسـەندنە، لەمیانەی ئەم گواسـتنەوەیەدا بوونەوەر پێشـکەوتوانە دروست دەبێ و قۆناغ بەقۆناغ دەگۆڕێت.

**پەیوەندی ئامرازەکانی میدیا بە زمانەوە لەم خالانەوە روون دەبێتەوە:**

١- ئامرازەکانـی میدیـا یارمەتـی بڵاوبوونـەوەی زۆری بێـژەو شـێوە میللیـەکان داوە، هەندێ لەوانەی سـەرقاڵی زمانی کوردین خۆیان لە کەسـانی دی لەو تێڕوانینە گاڵتەجاڕیانە دەشـارنەوە، چونکە هەندێ لە کەناڵەکانی میدیا زمانناسـی بەشێوەیەکی لەرزۆک نیشان داوە، کە جیهانی تایبەتی خۆی و میزاجێکی تاکیانەی هەیە. هەندێ لە ئامرازەکانـی میدیایـی کوردی ئاهەنگ بۆ ئەکتەران و وەرزشـوانان دەکەن، ناودارانی زمانیش دەخەنە پشت پەردەوە، چونکە ئەمان دەزانن میدیا کاریگەری مەودا دووری هەیـە، ئەگـەر خەڵـک بیانناسـیایە و ژیاننامەیـان بخوێندایەتـەوە ئـەوا سـوودیان لـە کاریگەیـان وەردەگـرت و، هەوڵیانـدەدا نەوازشـیان بـۆ بکەن و لەسـەر رێگای ئەوان بڕۆن، ئەمەش خزمەتکردنی زمانە، بەڵام دیارە میدیاکاران ئەوی دیکەیان دەوێ.

٢- ئامرازەکانـی میدیـای کـوردی بەدەگمـەن گرنگی بە چۆنێتـی تەلقینی زمان بۆ منداڵ دەدەن، چیرۆک، وتارو بەدواداچوونی رۆژنامەوانی لە دیارترین وێنەی ئەدەبی و رۆژنامەوانییە، سەلمێنراویشـە کە ئەو چیرۆکەی پێشـکەش منداڵ دەکرێ لە قاڵبی زمانێکـی خـۆش و شایسـتە و واتایەکـی خـاوەن ئامانجـی ماقـووڵ هەڵبگـرێ، بڕێک گەشەی ئاوەزی و زمانەوانی بەدی دێنێ. وتاریش پێویستە بیرۆکە یان را بە ئارامی و رەوانـی شـێواز بۆ منـداڵ بگوازێتـەوە، بـەڵام بەدواداچوونی رۆژنامەوانی دەشـێ وەڵام بـۆ پرسـیارەکانی منـداڵ، سـەبارەت بە زۆر لـە نهێنی و راسـتییەکان و وتارو چەمکەکان، بە شێوازی رەوان و زمانێکی خۆش پێشکەش بکات.

٣- رادیـۆش ئامرازێکی گرنگی پەیوەندیکردنە، لەوانەیە بەشـداری بڵاوکردنەوەی زمانی پەتی لەنێوان تاکەکان بکات، ئەویش لە ڕێگەی شێوازە ئەدەبییەکان کە هەلیان بـۆ دەرەخسـێت لە بەرنامەکانی ئێسـتگە بـڵاو بکرێنەوە، وەکو شـانۆ ئامانجدارەکان، چیرۆکـی نـاوەڕۆک بـاش و شـیعر. ئـەم ئامرازە پێویسـتی بـە دەنگـی رادیۆیی باش هەیە، کە گوێی بیسـەر بۆ لای خۆی راکێشـێت، لە کاتی نمایشـکردنی ئەم شـێوازانەو وەکو ئەمانە هەر دەبێ روونی گوزارشتکردن لەگەڵ کورتی یەک بگرنەوە، دووریش لەگەڵ رستە کردارییە درێژەکان کە تاک ناتوانێ هەرسی بکات. واش پێویست دەکات تەرویج بۆ زمانی میللی بکرێ لە ئامرازەکانی پەیوەندیکردن.

٤- دەزگاکانـی میدیـا لـە بـواری زمانەوانیـدا توانایان هەیە وێنەیەک لـە نایابترین وێنەی تەواوکاری بن، لەگەڵ هەوڵەکانی قوتابخانەو زانکۆ بۆ رابوونی زمانی کوردی، هەروەهـا شیاویشـە وێنەیـەک بێ لـە وێنەکانی شـەرمەزاری لەگەڵ ئـەم هەولانە، بە نیمچە کۆی دەنگیش گەیشتونەتە ئەوەی ئامرازەکانی میدیا بەشێوەیەکی بەسوود یان بەرهەمهێـن بەکارناهێنرێـن، بەڵکو بـۆ چێژوەرگرتنە زیاتر لەوەی بۆ سوودبەخشـین بێ، بۆ کات بەفیڕۆدان زیاتر لەسـوود وەرگرتن، هەروەها بۆ کاری سیاسـییە کەمتر لە کاری زانستی.

٥- بۆئـەوەی ئامرازەکانـی میدیـا بـرەو بە زمانـی کوردی بدەن، پێویسـتە گرنگی بە هەڵبژاردنی پێشکەشـکارانی هەواڵ و بەرنامەکان لە هەردوو ئێسـتگەی بیسـتراوو بینـراو بـدەن لەنێـو ئەوانـەی لەزمانـی کوردیـدا بەتوانـان، بۆئـەوەی ببنە پێشـەنگی بەکەڵکهاتـوو بۆ بیسـەران و بینەران، هەروەها کردنـەوەی خولی بەهێزکردنی زمانی کـوردی بـۆ کارمەندانی سـەرجەم کەناڵە جیاوازەکانی میدیا، بۆ بەدیهێنانی ئاسـتێکی بەرزی زمانەوانی کە چالاکییەکانیان پێویستی پێیەتی.

٦- لە زمانی میدیادا (دەستەواژەی تەماوی) بەر گوێ دەکەوێ، بەهۆیەوە هاوڵاتی ئاسایی ئەزیەت دەبینێ لە تێگەیشتنی ناوەڕۆک، ئەم تەماویبوونە پەیوەندی بە زمانەوە نییـە، بەڵکـو بە توانای میدیاکارەوەیە لە گوزارشـتکردنی روون و ئاشـکرا، روونی و ئاشـکرایی لـە واتـای خوێندنەوەی وتـار یان میللیدا نییـە، بەڵکو لە رەوانیی داڕشـتن

و ئاسـانی تێگەیشـتندایە. مەبەسـتیش لە زمانی میدیایی ئەوە نییە زمانی وێژەیی پێ وەسـف دەکـرێ لـە چێژوەرگرتنـی هونەریی جوانی، یـان ئەوەی زمانی زانسـتی پێ وەسـف دەکرێ لە تیۆری رووت، بەڵکو مەبەسـت لە زمانی میدیایی ئەو زمانەیە کە لەسـەر سسـتمێکی زانستی کۆمەڵایەتی ئاسـایی بونیات نرابێ، واتە هەر وشەیەک لە زمانی میدیایی پێویستە لای جەماوەری وەرگر روون بێت و لێی تێ بگەن، هەروەسا پێویسـتە بەشـێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئاسـانی خوێندنەوەو گوێ لێگرتنی بەدی بێنێ، بەڵام هونەری شاردنەوەو دوو واتایی، یان هەڵای هەڵچونیی سەبارەت بە بێژەکان و شتی دیکە لە هونەری وێژە، کە دەبێتە هۆی راکێشانی واتا هەمویان دوورن لەزمانی میدیا.

٧- زمانـی میدیایـی دەبـێ کورتکـراوە بێ، سـوربوون لەسـەر رسـتەی کورت لە جیاتـی رسـتەی درێژ، پاشـان وا بە بـاش دەزانرێ بگوترێ: -نمایش بـۆ توێژینەوە- لـە جیاتـی نمایش لەسـەر زەمینەی توێژینـەوە. -بکوژ- لە جیاتی -بەشـداری جەنگی کـرد- توێژینەوەیەکـی ئامـادە کـرد -لە جیاتی هەڵسـا بـە ئامادەکردنـی توێژینەوە- گفتوگۆکـە دوو کاژێـری خایانـد- لەجیاتـی گفتوگۆکـە مـاوەی نزیکـەی دوو کاژێری خایانـد. دووبارەکردنـەوەی بێـژەی کوردی لەمیانـەی کەناڵەکانی میدیا دەسـتەبەری باشترکردنی رەوشی زمانەکەیە.

**کاریگەربوون و کارتێکردنی نێوان زمان و ئامرازەکانی میدیا:**

ئـەم سـەردەمە پەرەسـەندنی گـەورەی لە بوارەکانـی ئامرازەکانـی میدیا بەخۆوە بینیوە، وەرچەرخانێکی گەورەی زمانیشی بەخۆوە بینیوە، بەتایبەتیش زمانی میدیایی، ئـەم زمانـەش کاری بـۆ سەرخسـتنی ئامرازەکانـی میدیا کردووە کە لەگـەڵ کاروانی سـەردەمدا هەنـگاوی نـاوە، بەڵگـەی توانـای ئەم زمانـەش بوونێتـی وەک ئامرازێکی جیـاکارە لـە ئامرازەکانـی پەیوەندیکـردن، هەروەهـا کاریگەری لە هەسـت و نەسـتی خەڵـک و لەرەفتـارو بیـرو باوەڕیـان، زمانیـش کەوتـە ژێـر کاریگـەری ئامرازەکانـی پەیوەندیکردنیـش تـا ئەوانـەی گرنگییان بە زمان داوە دەڵێن: ئەوەی پێیگەیشـتوین لە

شێوازی ئاسـان لـەم زمانەدا دەگەڕێتەوە بـۆ چاکەی ڕۆژنامەوانـی ئەمڕۆو، بۆ هیچ کەسێکی دیکە ناگەڕێتەوە.

زمـان کەوتـە بـەر کاریگـەری ڕۆژنامەوانییـەوە، ڕۆژنامەوانی زمانی خسـتە ژێر دەسـەڵاتی خۆیەوەو، وای لێ کرد نەرم بێ و بەگوێرەی پێداویسـتییەکانی سـەردەم بێ، هەروەها پێشکەوتنە مەزنەکانی شـان بەشانی ڕاپەڕینی لەخۆگرت، کە بڵابوونەی بێژەو زاراوەگەلێکی نوێ و فراوانبوونی ئاسۆی زمان و پەرەسەندنەکانی شێوازەکانی زمان، لە بواری زانست و هونەرو کۆمەڵناسی و سیاسەت بەدی دەکەین.

بـەڵام هێنـدەی کاریگـەری ئەرێیانـەی ڕۆژنامەوانـی لەسـەر زمـان، کاریگـەری نەرێیانەشی هەبووە، بەهۆی لاوازی کادیرو فراوانبوونی ئەم ئامرازەو غیابی ڕەگەزی پیشـەیی ڕۆشـنبیر تیایدا، لاوازی ئەدای زمان و میدیایی هاتە ئاراوەو لەسـەر خودی ڕۆژنامەوانـی ڕەنگـی دایـەوە، هەروەسـا لاوازی لـە دەروازەکانـی هێنایە ئـاراوە، بە سـەکۆیەکی میدیایـی جەمـاوەری و ڕۆشـنبیری و سیاسـی و دیموکراسـی دادەنرێ، بەڵام هەر کەسێک پێی دەنووسێت ئەو سەکۆیە لەبیر دەکات و ڕوو دەکاتە نووسین بەشـێوەی ئەدەبـی و خـودی، دوور لـە زمانێکـی پەتـی میدیایی جەماوەریی ئاسـان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ڕۆژنامە ئەو سەکۆیە لەدەست بدات.

نغرۆبوون لە بەکارهێنانی زمانی میللی و هەجینکردنی پەتی (تهجین الفصحی) وای لـێ کرد لە بەرجەسـتەکردنی پەتییەکـی هاوبەش لاواز بـێ، ئامادەکارانی بەرنامەکان باوەڕیـان وایـە، کاتێـک زمانـی پەتی ئاسـان بێ ئەوا دەبێتـە شـێوەزارێکی میللی باو بۆئەوەی جەماوەر تێی بگات، بەڵام عەبەسیانە هەوڵی خۆی دەدات بۆیە بۆ جەماوەر گران دەبێت.

میدیا هونەرێکی شارسـتانییە، زمانەکەشـی زمانێکی نوێیە، ئەمیش بە سیستمێکی میدیایـی ئەژمـار دەکـرێ، گرفتـی زمان لـە کارایی ئامـرازە میدیاییەکانـی جەماوەرە، بۆنموونـە: ئـەو وڵاتانـەی بـە زیاتـر لـە زمانێـک قسـە دەکـەن لایەنـە بەرپرسـەکان دووچاری ئاسـتەنگ دەبنەوە لە گشتاندنی میدیایەکی جەماوەری، بەڵام ئەو وڵاتانەی بە زمانی نەتەوەیی مامەڵە دەکەن گرفتەکە لەوانەیە تاڕادەیەک کەمتر بێ، لەمبارەیەوە

چەندین دەیەی پێش وتوویێتی میدیا زمانێکی نوێ و ڕەوانبێژێکی نوێ دێنێتە کایەوە، وتووشێتی سەردەم پێویستی بە زمانێکی میدیایی نوێیە.

هەندێ لە توێژەران پێیانوایە خەڵک بەپێی جیهانی زمان شارستانێتیەکەی بونیاد دەنێ، ئەوانە ملکەچی جیهانی زمان دەبن کە ئامرازێکە بۆ گوزارشتکردنیان، واقیعیش نەستیانە تەرکیز دەکاتە سەر دابە زمانەوانییەکانی کۆمەڵ و تەنهاش پشت نابەستێ بە چوارچێوەی مادی و ژیانی ئابووری.

ئامرازەکانی میدیایی جەماوەری بە زمانیشەوە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر ئاوەزی خەڵک و، ڕەفتارو گۆڕینی درککردنیان و هەڵوێستی تایبەتیان و پێکهێنانی بیروڕایان دروست کردووە، وای لێ کردوون مەیلی تازەبوونەوەو لەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریێتی و بەشداریکردن لە پرۆسەکانی گەشەپێدانی نەتەوەیی لەسەر هەموو ئاستەکان بکەن. بەڵام لەسەر ئاستی نیشتمانی زمانی میدیایی پەتی، هاوبەش، سادەو گوزارشتکار بریتییە لە زمانی ناوەند بۆ گشتاندنی میدیاو کاریگەری، بۆئەوەی ڕۆڵی خۆی لە پرۆسەی پەیوەندی و لە ڕەتکردنەوەی توخمی شوێن و، گەشەپێدانی هۆشیاری نەتەوەیی لەرووی چەندێتی و چۆنێتیەوە ببینێ.

**زمانی میتا و ڕۆڵی لە میدیادا:**

بریتییە لەکۆمەڵێ شێوازی زمانەوانی کە دەبێتە هۆی تەرکیزکردنی چەمک و روونکردنەوەی زیاتری واتا، خۆیشی زمان نییە، بەڵام کۆمەڵی شێوازی دیالۆگە کە دەکرێ بەکاربهێنرێ، ئەگەر بە کوردی یان فەرەنسی یان ئینگلیزی یان هەر زمانێکی دیکەی جیهان قسە بکەی. زمانی (میتا) بریتییە لە کۆمەڵێ پرسیاری جیاواز کە دەبێتە هۆی روونکردنەوەی پتری مەبەست، هەروەسا دەبێتە هۆی بەهێزکردنی باوەڕگەلێکی ئەرێنی و لەقبوونی بیروباوەڕی نەرێنی، ئەمیش هەندێ لە شێوازەکانیێتی:

- خوێندنەوەی هزر: لەوانەیە کەسێک وا بانگەشە بکات هەست و نەستی فلانە کەس دەخوێنێتەوەو، دەڵێ: تۆ هەست بە هەستی من ناکەی، یان تۆ نیازت فریودانە، پرسیاری زمانی بەرزی میتا بۆ ئەوە ئەمەیە: چۆن دەزانی؟

- هەڵسـەنگاندنی گشـتی: لەوانەیە وتەبێژێک هەڵسەنگاندنگەلێکی گشتی کە لەسەر بنەمـای راسـتی نین بڵێ، بۆ نموونە کەسـێک دەڵێ: دەروونناسـی تەنهـا جادوویەکە، پرسـیاری باڵای میتا بۆ ئەوە ئەمەیە: کێ وا دەڵێ؟ یان لەسـەر چ بنەمایەک وا دەڵێ؟ یان چۆن ئەوە دەزانی؟

یـان کەسـێک لەوانەیـە بڵـێ هێمای دەرەکـی کار لە دۆخی زەینـی دەکات و دەڵێ: دەنگی بێزارم دەکات. پرسیاری زمانی بەرزی میتا دەڵێ: چۆن ئەوەت زانی؟ یان ئەوە چۆن ئەم کارە دەکات؟ یان چۆن دەزانی تەنها دەنگی ئەوە دەبێتە هۆی بێزاربوونت.

- هاوهێـزی لێکـدراو: گشـتاندنی واتایە بە پشتبەسـتن بـە رووداو یان رەفتارێکی دەرەکـی، بـۆ نموونـە دەڵێ «کاتێک تۆ بەم شـێوازە قسـە دەکەی مانـای وایە تۆ رێز لـە مـن ناگـری». پرسـیاری بەرزی میتـا ئەمەیە: چۆن قسـەکانم هۆکارە بـۆ رێز لێ نەگرتنـت؟ یـان ئایا هیچ قسـەیەکم کـردووە، کە مانای رێز نەگرتنـت بووبێ؟ یان ئایا پێشتر ئەوە پێچەوانە رووی نەداوە؟

- ئامرازەکانی گشتاندن و گەمارۆدان: هەموو، هەرگیز، هەمیشە، گشت، بۆ نموونە کەسـێک دەڵێ: کەس نازانێ چی روودەدات. پرسـیاری باڵای میتا ئەمەیە: هیچ کاتێک نەبووە کەس نەزانێ چی رووی داوە؟ یان چۆن؟ هیچ کەس؟ یان ئایا هەمیشـە؟ یان ئایا گشت هەروەها.

- ئامرازەکانی پێویست و پابەندکردن: وا پێویستە، لەسەرمە، زەرورە نموونەیەکە کەسێک دەیڵێ: پێویستە ئەوە بکەم. پرسیاری زمانی باڵای میتا: چی روودەدات ئەگەر نەیکەیت؟

- ئەگـەری توانـا: دەتوانم و ناتوانم، نموونەی کەسـێک دەیڵـێ: ناتوانم ئەوە بکەم. پرسـیاری زمانی باڵای میتا ئەمەیە: چی دەبێ ئەگەر تۆ توانیت؟ چی رێت لێدەگرێ؟ ئایا هەمیشە تۆ ناتوانی؟

- لابردنـی سـاکار: وەک ئـەوەی کەسـێک بڵـێ: هەسـت بـە ماندوبـوون دەکـەم، پرسیاری زمانی باڵای میتا ئەمەیە: لەکوێ. کەی. لەگەڵ کێ؟

- لابـردن لـە باشـتر زانیـن: وەک ئەوەی کەسـێک بڵێت: ئەم فرۆشـیارە باشـترە،

پرسیاری باڵای میتا بەم جۆریە: لە کێ باشترە؟

- نادیارو کەســەکان: وەک ئەوەی کەسـێک بڵێ: پێم وترا. پرســیاری زمانی باڵای میتا بەم جۆرەیە: کێ ئەوەی وت؟

- وشـەی فشــەڵ: وەک ئەوەی کەسێک دەڵێ: فەرامۆشــم دەکات. ریسوام دەکات. پرسیاری باڵای میتا بۆ ئەمە: چۆن فەرامۆشت دەکات؟ یان چۆن ریسوات دەکات؟

ئەمە هەندێ شێوازی زمانەوانییە لە زمانی میتا، بۆ روونکردنەوەی ئەوەی زیاتر مەبەســتە بەکاردەهێنـرێ، یـان لەقکردنی بـاوەڕی نەرێنی. هەمدیس بـۆ بەهێزکردنی بیروبـاوەڕی ئەرێنیـش بەکاردەهێنـرێ بـۆ نموونــە: ئامانجم ئەوەیە ببمـە فڕۆکەوان، پرسیار دەکرێ (کەی؟ چۆن؟ لەکوێ؟ لەگەڵ کێ؟)، کاتێکیش وەڵام بۆ ئەم پرسیارانە دیاری دەکرێ ئامانجەکەی لەوەی پێشـتر روونترە، دەشـتوانێ بە ئاسـانییەکی زیاتر بەدی بێنێ، چونکە کتومت دەزانێ چۆن کار بکات و، چی بکات و کەی و لەکوێ بیکات و لەگەڵ کێ ئەوە بکات.

ئەم شێوازە زمانەوانیانە پێویستە لە کەشوهەوایەکی ئاشنای تەواو بەکار بهێنرێ، بۆئەوەی دیالۆگەکە بەئارامی بمێنێتەوەو دەروونەکانیش رازی بن.

## بەشی نۆیەم
## کارامەییەکان لە دەروونناسی میدیا

**کارامەیی میدیایی:**

کارامەیی، ئەو هەنگاو یان پرۆسە زانینە (هزرییە)یە یان (راپەڕاندنکاری)یە یاخود ویژدانی (بۆچوونکاریە)یە و، ئەو پەیوەندیە ئاشکرایەیە کە میدیاکار لە میانەی ئەنجامدانی یەکێک لە ئەرکەکانی کارەکەی ئەنجامی دەدات.

پلەبەندی هونەریی پەیکەرێکی گشتییە بۆ پۆلێن کردنی کارمەندان لە پیشەگەلی جیاواز بەپێی کارامەییەکانیان و، لە پێنج دەستە پێکدێ و هەریەکەیان خەسڵەت و تایبەتمەندی دیاریکراوی هەیە، ئەرکە پێ سپێردراوەکانی هەر دەستەیەک جیاوازە لە رووی ژمارەو جۆرو پلەی ئاڵۆزی و، لە رووی زانیاری و زانینە تیۆرییەکانی پەیوەست پێوەی، مەرج نییە لە هەر پیشەیەکدا دەستەگەلی پێنج ئاستەکە بوونی هەبێت.

**لێرەدا هەریەک لە دەستەکان لە کاری میدیادا دەناسێنین:**

**١- کارمەندی دیاریکەری کارامەیی:**

مەبەست لە دەستەی دیاریکەری کارامەیی ئەو کارمەندە میدیاییەیە کە کارێکی پیشەیی ئەنجام دەدات و، جێبەجێ کردنەکەی پێویستی بە بڕێکی دیاریکراو لە کارامەیی هەیە و، تاقیکردنەوەی بڕیار لەسەردراوی لەلایەن دەزگاکە بۆ ئاستی ئەم دەستەیە تێپەڕاند، هەروەها ئەو میدیاکارەی ئەم بڕە توانایەی بە مەشق یان پەیڕەوکردن وەدەست هێناوە، لەو نموونانەی دەکەونە چوارچێوەی ئەم دەستەیە لە بواری میدیا بریتین لە: ئەو تەکنیککارانەی لە چاککردنەوەی سادەی ئامێرەکانی میدیا کار دەکەن.

**٢- کارمەندی کارامە:**

دەستەی کارمەندی کارامە، ئەو کارمەندە میدیاکارە دەگەیەنێت کە هەندێ کار

دەکات، ئەنجامدانی پێویست بە هەندێ کارامەیی هەیە پەیوەستە بە بەشێکی تەواو لە پیشەکە و خاوەن ئاستێکی ئەدای باڵاو، تاقیکردنەوەی بڕیار لەسەردراو بۆ ئەم دەستەیە تێپەڕاندو، لەمیانەی پرۆگرامی فێرکردن و مەشقی جۆراوجۆری میدیایی کارمەندی کارامە ئامادە دەکرێت. لەو نموونانەی دەچنە چوارچێوەی ئەم دەستەیە لە بواری میدیایی، وێنەگری میدیاییە.

**٣- کارمەندی پیشەیی:**

دەستەی کارمەندی پیشەیی، مەبەست لەو کارمەندە میدیاکارەیە کە کاری ئەوتۆ دەکات، راپەڕاندنەکەی پێویست بە کارامەییگەلێک دەکات کە بەشێوەیەکی تەواو لە چوارچێوەی پیشەکە رووماڵ بکات و، لایەنی کرداری (ئاست) و زانیاری هونەری پەیوەنددارو ئەو بنەما زانستیانە لەخۆدەگرێت کە زانیارییە هونەرییەکانی لەسەر بونیات دەنرێت، ئەمەش سەرەڕای توانین بۆ دابەشکردنی کارەکان و بەرزکردنەوەی کارامەیی کارمەندان لە ئاستەکانی خوارەوەو، تاقیکردنەوەی بڕیار لەسەردراو بۆ ئەم دەستەیە تێپەڕاندو، کارمەندی پیشەیی لەمیانەی پرۆگرامی فێرکردن و مەشقی میدیایی یان راپەڕاندنەوە ئامادە دەکرێت. نموونە لەبارەی ئەو کارانەی دەکەونە چوارچێوەی ئەم دەستەیە لە بواری میدیایی، پەیامنێری میدیاییە.

**٤- کارمەندی تەکنیکی:**

دەستەی کارمەندی تەکنیکی، ئەو کارمەندە میدیاکارە دەگەیەنێت کە پیشەکەی خۆی رادەپەڕێنێت و، پێویستی بە شیانێکی زانستی و کارامەیی زانستی و سەرپەرشتیکردنی هەیە و بڕوانامەی مامناوەندی زانکۆ یان هاوشێوەی ئەوە، یاخود بڕوانامەیەکی پیشەیی نمرە یەکی بەدەستهێنابێت و، سەرکەوتووانە خولی مەشقی بڕواپێکراوی لە لایەنێکی فەرمی بەپێی یاسا کارپێکراوەکان بینیبێت. لە نموونەی ئەو کارانەی دەکەونە چوارچێوەی ئەم دەستەیە لە بواری میدیایی، رۆژنامەنووسی تایبەتمەندە.

**٥- پسپۆڕێتی:**

دەستەی پسپۆڕیی واتا ئەو کارمەندە پیشەییەیە، کە بەلای کەمەوە بڕوانامەی

یەکەمی زانکۆیی وەدەست هێنابێت و لە بواری پسپۆڕێتییەکەی کارەکەی راپەڕێنێت.
لە نموونە لەبارەی ئەو کارانەی دەکەونە چوارچێوەی ئەم دەستەیە لە بواری میدیایی، ئەندازیاری میدیایی و پێشکەشکاری هەواڵەکانە.

**یەکەم: کارامەیی شیکردنەوەی کاری میدیایی:**

وەسـفکردنێکی گشـتییە، هەموو ئەرک و رۆڵ و بەرپرسیارێتییە پەیوەستدارەکان بـە میدیـا دەگرێتەوە، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکـی وردو رێکخراوە بۆ دیاردەکانی کارو مـەرج و تایبەتمەندییەکانێتـی و بـە شـێوازێکی زانسـتی و بـە هەنگاوی دروسـت، بۆ دیاریکردنی پێداویسـتی و زانیارییە پێویسـتەکان بۆ تەواوکردنی کارو ئەنجامدانی بە سـەرکەوتوویی. لە دیاریکردنی پێداویسـتییەکانی کاردا، کارامەیی جەسـتەیی و بزاڤ و ئـاوەزی و، زانینـی سروشـتی بارودۆخەکەی و هۆکارەکانی سـەرکەوتن و متمانە تیایدا، پارمەتیدەر دەبێت.

**بنەماکانی شیکردنەوەی کاری میدیا:**

شـیکردنەوەی کار، ئەو شـێوازەیە پارمەتیمان دەدات بۆ دەسکەوتنی داتاو راستی و زانیـاری تایبـەت بـە سروشـتی کاری میدیـا، لەرێگـەی تێبینیکـردن و لێکۆڵینەوەو بەکارهێنانی ئامرازە زانستییەکان، لەم روانگەیەوە دەکرێ شیکردنەوە بۆ سێ بەشی سەرەکی دابەش بکەین:

- ناسینی وردی کاری میدیا.
- وەسفکردنی وردی گشتگیری ئەو ئەرکانەی کە کاری میدیای لێ پێک دەهێنرێت.
- دیاریکردنی ئەو پێداویستیانەی کارکردن کە لە کارمەندە دەخوازرێ، بۆئەوەی کاری میدیایی سەرکەوتووانە رابپەڕێنێت.

هەروەها مەبەسـت لە شـیکردنەوەی کار، ئەو لێکۆڵینەوە زانسـتییە وردەکارییەیە کـە لەسـەر کار ئەنجـام دەدرێـت، بەئامانجـی دیاریکـردن و وەسـفکردنی ئـەرک و بەرپرسـیارێتییەکان و بارودۆخـی ئاسـتەکەی و، مەترسـییەکانی و پەیوەندییەکانـی بـە کارەکانـی ترەوەو، پێداویسـتییەکانی لـە تایبەتمەندییەکان لە کەسـەکە تاکو تیایدا

سەرکەوتوو بێت...هتد. بێگومان هەر کارێک بە رادەیەک لەویتر جیاوازە، لە هەموو ئەو لایەنانەی کە شیکردنەوە بایەخی پێ دەدات. هەر کارێک پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت هەیە بۆ شیکردنەوەی، چونکە کاری میدیایی پێویستی بە زیرەکی زیاترو، تێکەڵاوی و کارلێکە، لەگەڵ ئەوانی دیکەو، توانای گفتوگۆو گوێ رادێران و پەیوەندی و قەناعەتپێکردنی ئەوانی دیکەی هەیە.

**سەرچاوەکانی کۆکردنەوەی داتاکان لە شیکردنەوەی کاری میدیایی:**

کاتێک کاری میدیا شی دەکەینەوە، پەنا دەبەینە بەر چەندین سەرچاوە بۆئەوەی لە رێگەیەوە ئەو داتایانە کۆ بکەینەوە، کە لە پرۆسەی شیکردنەوە پشتی پێ دەبەستین، لە گرنگترین ئەم سەرچاوانەش:

**١- لێکۆڵینەوەکانی پێشتر لەبارەی کاری میدیا:**

بۆ شیکردنەوەی کاری میدیا، زۆر لێکۆڵینەوە هەن تیشکی خستۆتە سەر ئەم کارە لە رووی شیاندنی پێویست، شارەزایی داواکراو، ئەو لایەنانەی کەموکوڕی کە تاک لە ئەنجامدانی ئەو کارە پەک دەخات، رێوشوێن و رێنمایی کاری میدیایی جێی باوەڕ.. هتد.

**٢- سەرنجدان:**

لە گرنگترین ئەو ئامرازانەیە لە شیکردنەوەی کاردا سوودی لێ وەردەگیرێت، دەکرێ تێبینی بکەین تاکەکە لە کارەکەدا چی دەکات و، بۆچی؟ چۆن؟ ئەو ئامرازو ئامێرانە چین کە بەکاریان دەهێنێت؟. تێبینی ئاشکرا بۆ کارمەندی میدیاکار کە کارەکەی رادەپەڕێنێت، کارێکە ناکرێ دەستبەرداری بین، نموونە لەمبارەیەوە وەسفکردنی تۆیە بۆ هەر کەسێک، هەرچەندە زۆر ورد بێت، ناکرێ وێنەیەک پیشان بدرێت کە هێندەی ئەو وێنەیە ورد بێت، کە سەرنجی ئاشکرا (واتە بینین) دەیبەخشێت.

**٣- چاوپێکەوتن:**

دەکرێ پرۆسەی چاوپێکەوتن وەک یەکێک لە سەرچاوەکانی کۆکردنەوەی داتا لە شیکردنەوەی کاری میدیایی بەکاربهێنرێت، لەم بارەدا ئەنجامدەری شیکردنەوەی

کارەکـە چاوپێکەوتنێـک لەگـەڵ ئەو میدیـاکارە ئەنجام دەدات کە ئـەو کارە دەکات کە شیکردنەوەکەی دەیەوێ، زۆر لە میدیاکاران ئەم کارە دەکەن، لەم بارەدا ئەنجامدەری شـیکردنەوەی کارەکە چاوی بە سـمپڵێک لەو فەرمانبەرانە دەکەوێ، باش وایە لەپاڵ ئـەو چاوپێکەوتنانـەی لەگـەڵ کەسـەکان لـەو کارەدا ئەنجـام دەدرێ، چاوپێکەوتنیش لەگـەڵ بەرپرسـەکانیان ئەنجام بدرێت، لە هەموو ئەو چاوپێکەوتنانە پرسـیارو وەڵام و گفتوگـۆو لێکدانـەوە لەبـارەی سروشـتی کارەکە و بارودۆخەکـەی و ئەرکەکانی و پێویسـتییەکانی و، مەترسـییەکانی و پەیوەندییەکانـی لەگـەڵ کارەکانی تـردا ئاڵوگۆڕ دەکرێـت و، هەمـوو ئـەو خاڵانەی ئەنجامدەری شـیکردنەوەی کاری میدیایی دەیەوێ زانیاری لەبارەیەوە کۆ بکاتەوە.

**٤- فۆرمی راپرسی:**

زۆرجار ئەنجامدەری کارەکە پشـت بە ئامرازی فۆرمی راپرسـی دەبەسـتێ، تاکو هەندێ زانیاری کۆ بکاتەوە، کە لە شیکردنەوەی کاری میدیاییدا پێویستی پێیەتی، بۆیە فۆرمی راپرسی بەشێوەیەک دروست دەکات، کە هەندێ پرسیارو لێکدانەوەی تایبەت بە کارەکەی لەخۆگرتبێت و شـیاوی شـیکردنەوە بن. بە سروشـتەکەی و بارودۆخی ئاسـتەکەی و، ئـەرک و بەرپرسـیارێتییەکانی و، مەترسـی و پێداویسـتییەکانی...هتد، بەجۆرێک وەڵامەکان لەبارەی ئەم پرسیارو لێکدانەوانە بابەتێکی دەوڵەمەند دەبێت بە داتای پێویست بۆ شیکردنەوەی ئەم کارە. فۆرمی راپرسی دەنێردرێت یان بە کارمەند یـان سەرپەرشـتیار کارەکـە، یاخـود سـمپڵێکی دەدرێت بۆئـەوەی وەڵامی پرسـیارو لێکدانەوەکانی بداتەوە کە شوێنی بەتاڵی فۆرمەکە بۆ وەڵامدانەوە تەرخان کراوە.

**٥- ئامرازەکانی کارکردن و ئامێرو کەرەستەکانی:**

تێگەیشـتن لـە خەسـڵەت و تایبەتمەنـدی و پێکهاتـە و کارو سروشـتی ئەو ئامێرو کەرەسـتە و خامانەی کە کارمەندەکە لە پرۆسـەکانی بەرهەمهێنان بەکاری دەهێنێت، لـە سـەرچاوە گرنگەکان دادەنرێ بۆ کۆکردنەوەی داتای پێویسـت بۆ شـیکردنەوەی کاری میدیایی، چونکە تیشـکی زۆری دەکەوێتە سـەر لەبارەی چۆنێتی ئاسـتی کارە میدیاییەکـە و بـارودۆخ و مەترسـییەکانی و، ئـەوەی پێویسـتییەتی لـە کارامەیـی و

ئەزمـوون و ئامادەباشـی، بۆیـە بـە هەنگاوێـک دادەنرێـت پێش ئەوەی شـیکەرەوەی کاری میدیایی دەسـتبەرداری بێت، ئەو زانیاریانە زۆر دەوڵەمەند دەکات کە پێویسـتە لەبـارەی کارەکـە کۆ بکرێتەوە، ئەمە سـەرەڕای ئەوەی ئامـاژەدان بە ئامرازو ئامێرو کەرەسـتە بەکارهاتووەکان لە کارەکەدا، بە بەشـێکی سەرەکی لە شیکردنەوەی کاری میدیاییدا دادەنرێت.

**٦- راپەڕاندنی کردەیی کارەکە:**

هەندێ کار پێویستی بە ئەزموونێکی زۆر یان کارامەییەکی زیاد، یاخود شیاندنێکی بەرز نییە و هەڵسووڕێنەرەکەی ناخاتە مەترسییەوە، ئەنجامدەری شیکردنەوەی کارە میدیاییەکە دەتوانێت بە راستی پیادەی بکات پێش ئەوەی شی بکاتەوە، بەڵکو هەندێ لە شـیکەرەوەکان پێیان باشـە هەموو ئەو کارانە پیادە بکەن کە شـی دەکەنەوە، تەنها ئەو کارانە نەبێت کە پێویستی بە شیان یان مەشقێکی زۆر هەیە، چونکە تەواوبوونی کردەیـی کارەکـە وا دەکات شـیکەرەوەکەی هـەواڵ بەخـۆی بـدات لەبـارەی مەودای ئـەو هەوڵـەی دەیـدات و، چۆنێتی راپەڕاندنـی ئەرکەکانی و بارودۆخی ئاسـتەکەی و مەترسییەکانی و، ئامادەباشی جەستەیی و ئاوەزی و دەروونی پێویست بۆ راپەڕاندنی ئەو کارە میدیاییە، هەروەها وای لێ دەکات خۆی هەواڵی پێ بدات لە بارەی سەرجەم ئـەو هەسـتانەی کە کارمەندەکە هەسـتی پێ دەکات لە میانـەی ئەنجامدانی کارەکەی، بۆیـە راپەڕاندنـی کردەییانەی کارەکە بە ئامرازێکی نایـاب دادەنرێت بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەیەوە، ئەگەر شیکەرەوەی کارەکە توانی پەیڕەوی بکات.

**فۆرمی شیکردنەوە:**

دوای تەواوبوونـی کۆکردنـەوەی داتـاو زانیـاری پێویسـت بـۆ شـیکردنەوەکە، لە رێگەی بەکارهێنانی ئەو سەرچاوانەی پێشتر ئاماژەی پێ کرا، شیکەرەوە پێویستە ئەم داتاو زانیارییانە لە راپۆرتێکی رێکخراو بەشێوەیەکی دیاریکراو بخاتەڕوو، بەجۆرێک لـە هـەر مەسـەلەیەک کە بـە کاری بابەتی شـیکردنەوەکە پەیوەسـت بێت، بەئاسـانی سـوودی لێ ببینرێت. فۆرمی کارکردن شـێوەیەکی نموونەیی تایبەتی وەردەگرێت کە چەند بەندێک لەخۆ دەگرێت، پێویسـتە شـیکەرەوەکە پڕی بکاتەوە سـەبارەت بە هەر

کارێـک کـە ئەنجامی دەدات، شـێوەی ئەم نموونەیە لە دەزگایەکـی میدیا هەر چۆنێک بێت، پێویستە لە چوارچێوەی بەندەکانیدا ئەمانە لەخۆ بگرێت:

١- ناسـاندنی ورد بۆ ئەو کارەی لەژێر شـیکردنەوەدایە، چونکە کاری پەیامنێر لە ڕۆژنامەیەک لەگەڵ کاری پەیامنێرێک لە تەلەڤزیۆندا جیاوازە.

٢- دەورەدانێکـی گشـتگیر بـۆ ئـەو ئەرکانـەی کـە هـەر کارێکی میدیایـی لەخۆی دەگرێت.

٣- خسـتنەڕووی کارامەیـی و شـارەزایی و شـیاندن و ئامادەباشـی و، ئـەو تایبەتمەندیانەی پێویستە لە کەسەکەدا هەبێت بۆ سەرکەوتنی لەو کارە میدیاییەدا.

٤- ئەو بارودۆخەی ئەم کارە تیایدا ئەنجام دەدرێت و، مەترسییەکانی.

٥- پەیوەندی ئەم کارە بە کارەکانی دیکە لەناو دەزگاکە.

**هەندێ زاراوەی بەکارهێنراو لە شیکردنەوەی کاردا:**

* ئەرک: هەڵوێستێکە کۆششێکی تیا دەکرێت، جا ئەو کۆششە هزری یان جەستەیی بێت، وەک پرۆسـەیەکی بیرکاری یان سـەرکەوتن بە سـەر قادرمەدا، هەریەکەیان بە ئەرکێک دادەنرێت.

* فەرمان: بریتییە لە کۆمەڵێک ئەرک کە کەسـێک بە ڕاپەڕاندنی ڕادەسـپێردرێت، لـەم ڕووەوە هـەر دامەزراوەیەکـی کار هێندەی ژمارەی کارمەنـدان تیایدا ژمارەیەک فەرمان لەخۆ دەگرێت، کە هەریەک بە کۆمەڵێک ئەرک ڕادەسپێردرێن.

* کار: بریتییـە لـە یـەک فەرمـان یان کۆمەڵێک فەرمانی هاوشـێوە لـە ئەرکدا، بۆ نموونـە ئەگـەر یەکێک لـە دامەزراوەکانی کاردا یەک کەس لەسـەر ئامێری چاپ بێت، دەکـرێ بڵێیـن ئـەم دەزگایـە یەک فەرمانی بـۆ ئامێری چاپ هەیە، هەروەها دروسـتە بڵێیـن ئـەم دەزگایـە کارێکـی میکانیکی تێدایە، بـەڵام ئەگەر لەم دەزگایە بیسـت کەس هەبن هەریەکەیان لەسەر ئامێری چاپ بن، ئەوا دەڵێین لەم دەزگایەدا بیست فەرمانی ئامێری چاپ و یەک کاری ئامێری چاپ هەیە، چونکە ئەو ئەرکانەی یەکێک لەو بیست فەرمانبەرە پێی ڕادەسـپێردرێت، هاوشێوەی ئەوەیە بە هاوپیشەکەی ڕادەسپێردرێت، بەجۆرێک دەکرێ ئەم بیست فەرمانبەرە لە یەک کاردا کۆ بکەینەوە.

* پیشــە: واتا کۆمەڵێک کاری تاڕادەیەک هاوبەشــە لە ئەرکدا، بۆیە هەردوو کاری نووسەری ئامێری چاپی کوردی و نووسەری ئامێری چاپی ئینگلیزی، پیشەی (نووسین لەسەر ئامێری چاپ) کۆیان دەکاتەوە، بەهەمان شێوە کاری مامۆستای زمانی عەرەبی لە قوتابخانەی بنەڕەتی و کاری مامۆستای زمانی کوردی لە قوتابخانەی دواناوەندی، پیشەی وانەوتنەوە بە زمانی کوردی کۆیان دەکاتەوە.

**دووەم: کارامەیی چاوپێکەوتنی میدیایی:**

چاوپێکەوتنی میدیایی بە گرنگترین هەنگاو بۆ میدیاکار دادەنرێت، کە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتـی پیشــەیی بینـراوی ڕوبەڕووە لە نێـوان میدیاکارو تاکەکانـی کۆمەڵگە، لە کەشـێکی ئارامـی دەروونیـدا کـە متمانەی ئاڵوگـۆڕ لەنێوان هەردوولا باڵی بەســەردا دەکێشـێت، بە ئامانجی کۆکردنەوەی زانیاری لەپێناو تیشـک خسـتنە سـەر کێشە یان ڕووداوەکـە، واتـە پەیوەندییەکـی هونـەری هەسـتیارە تیایـدا کارلێکێکـی کۆمەڵایەتی یـان ئاڵوگـۆڕی زانیاری و شـارەزایی و هەسـت و ئاراسـتەکان ئاڵوگـۆڕ دەکرێت، لە ڕێگەیـەوە پرسـیار لـە هەمـوو شـتێک دەکرێت کـە چالاکییەکـی پیشـەیی ئامانجدارە نەک گفتوگۆیەکی سـادە، لە میانەیدا جەخت لەسـەر یارمەتی کەسـەکان دەکرێتەوە لە خستنەڕووی خۆیان و تێڕوانینەکانیان.

**جۆرەکانی چاوپێکەوتنی میدیایی:**

**١- چاوپێکەوتنی تەنیا کەسیی میدیایی:**

چاوپێکەوتن لەنێوان میدیاکارو تەنیا یەک کەسدا دەبێت، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو ڕوبـەڕوو، ئامانـج لـەم شـێوازە لـە نزیکـەوە ناسـینی بیرۆکـە و تێڕوانینەکانـە لای بەرامبەر، بۆئەوەی تاک لەم چاوپێکەوتنە سەرکەوتوو بێت، پێویستە بە باشی گوێ لە بەرامبەر بگرێت و، کار بۆ دۆزینەوەی هۆگری و دۆستایەتییەک لە نێوان دیدارکەرو دیدارکراودا بکات.

## ٢- چاوپێکەوتنی میدیایی بە کۆمەڵ:

چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کەسـەکان دەکرێت و، بابەتێکی دیاریکراو دەخرێتـەڕوو، بۆئـەوەی لـە میانـەی چاوپێکەوتنەکە گفتوگۆی لەسـەر بکرێت، ئامانج لەم چاوپێکەوتنە زانینی ئاسـتی توانای کەسـەکانە بۆ بەدەنگەوەهاتنی ئەوانی دیکە و، کارلێک کردن لەگەڵ ژینگەی دەوروبەرو زانینی تێڕوانینیان بۆ بابەتێکی دیاریکراو.

نموونـە لەبـارەی زۆر خاڵـی گرنـگ یارمەتـی میدیـاکار دەدات، لـە چاوپێکەوتنی میدیاییدا سەرکەوتوو بێت:

١- ئـەو خاڵانـە دیـاری بکە کە دەتـەوێ لەبارەی کەسـەکە روونـی بکەیتەوەو لە یاداشتانەمەیکدا بینووسە، پێش چاوپێکەوتنەکە پیایدا بچۆرەوە پاشان بەدواداچوونی بۆ بکە.

٢- سـووربە لەسـەر ئـەوەی تێڕوانینێکـی باش لای بەرامبەر جـێ بهێڵیت، چونکە تێڕوانینەکانی سەرەتا زۆرجار بەردەوام دەبن.

٣- زاراوەو وشـەکان بەشـێوەیەکی ورد هەڵبژێرە، بەتایبەتی ئەگەر پێویسـتت بە زاراوەیەکی بیانی هەبوو.

٤- لە جوڵە ناشـیرینەکانی جەسـتە دوور بکەوە، وەک راوەشـاندنی هەردوو قاچ یان نووشتانەوەی هەردوو قۆڵ و دانانی لەسەر یەک.

٥- سووربە لەسەر ئەوەی کاغەزو قەڵەمت پێ بێت، بۆ نووسینی هەر زانیارییەکی گرنگ.

٦- پێویستە جلی گونجاو بپۆشیت و باشتروایە قات لەبەر بکەیت.

٧- رەچاوی ئەوە بکە زۆر رێکپۆش بیت و لەوپەڕی قۆزیدا بیت.

٨- سـوور بە لەسـەر ئەوەی ماوەیەکی باش پێش کاتی دیاریکراو، بگەیتە شوێنی چاوپێکەوتنەکە.

٩- پێش چوونە ژوورەوە بە نەرمی لە دەرگا بدە.

١٠- بێ زیادەڕۆیی سڵاو لەو کەسە بکە کە دەتەوێ دیداری لەگەڵ بکەیت، پاشان

دانیشە.

١١- لە کاتی دیدارەکەدا با بزەیەکی نەرم بە سیماتەوە دیار بێت.

١٢- هەوڵبدە گوێ لە هەموو وشەیەکی بچوک یان گەورە بگریت کە کەسەکە دەیڵێت، بە تەماشاکردنی کەلوپەلی ژوورەکە بە نموونە یان شتی دیکە سەرقاڵ مەبە.

١٣- کار بۆ دووپاتکردنەوەی متمانە بەخۆبوونت بکە، لە لەخۆبایی بوون و خۆنواندن خۆت دوور بگرە.

١٤- ریتمێکی هاوسەنگی دەنگ بەکاربێنە، بەجۆرێک بەرز یان نزم نەبێت و لە قسەکردندا دوودڵی نەبێ.

١٥- کاتێک دەتەوێ برۆیت، لە پیاکێشان بە کورسی و مێز یان هەر شتێکی تر کە لە نووسینگەکەدا هەیە خۆت بپارێزە، چونکە ئەمە تێروانینێکی خراپ جێ دەهێڵێت.

**سازدانی میدیاکاران بۆ چاوپێکەوتن:**

**قۆناغی یەکەم/ پێشخستنی پێشبینی واقیعی:**

کەسەکە ئاگادار دەکرێتەوە لەبارەی شێوەو ناوەڕۆک و درێژی ماوەی چاوپێکەوتنەکە و، رۆڵەکانی هەریەک لە جێبەجێکەری چاوپێکەوتنەکە و کەسەکە و، ئەگەرەکانی گەیشتن بە بڕیاری ئەرێنی و چۆن ئەم چاوپێکەوتنە لە پرۆسەی بڕیارداندا بەکار دەهێنیت.

**قۆناغی دووەم/ پێشخستنی تواناکانی چاوپێکەوتن:**

جەخت لەسەر شێوازەکانی دەرخستنی خود بەشێوەیەکی کارا دەکرێت، وەک: شێوازی لەبەرکردنی پۆشاک، جۆری زمان، پەرەپێدانی کارامەییە گونجاوەکانی پەیوەندیکردن و دەربڕینی ئاراستە و تایبەتمەندییەکان.

**قۆناغی سێیەم/ بەکارهێنانی رێوشوێنەکانی مەشقی کارا:**

سەرکردە باشترین رێگە و شێوازە فەراهەمبووەکان هەڵدەبژێرێ، بۆ زیادبوونی توانای وەدیهێنانی ئەنجامی ویستراوو، بەشێوەیەکی گشتی داوا دەکات شێوازی جۆراوجۆر لە جیاتی یەک شێواز بەکار بهێنرێ وەک (بەنموونەیی کردنی رۆڵ

بینینی فیدباک لە ڕێگەی فیلمگرتنێکی ڤیدیۆ، گفتوگۆی بابەتە نووسـراوەکان، مەشـقی ڕەفتاری)، دەکرێ پێنج یان شـەش کاژێری مەشـقکردن بە کەمترین ڕادەی پێویسـت دابنرێت.

**قۆناغی چوارەم/ ئامادەکاری بۆ شۆکی ڕەتکردنەوە:**

پێویست دەکات مامەڵە لەگەڵ ئەگەری ڕەتکردنەوەی کەسەکە بکرێت، چونکە ئەو چاوپێکەوتنی میدیاییت لەگەڵ دەکات.

**ئەو پرسیارە باوانەی لەوانەیە میدیاکار لە زۆربەی چاوپێکەوتنەکاندا بیکات:**

هەندێ پرسیاری باو هەیە کە زۆرجار لە چاوپێکەوتندا دەخرێنەڕوو:

١- باسی خۆت و بەهرەو ئارەزووەکانت بکە؟

٢- پێش ئێستا لە کوێ کارت کردووە؟

٣- ئایا لە کاتی خوێندندا کارت کردووە؟ بۆچی؟

٤- ئامانجـە دوورو نزیـک مەوداکانـت چین؟ کەی و بۆچی ئـەم ئامانجانەت دانا؟ چۆن خۆت بۆ وەدیهێنانیان ئامادە دەکەیت؟

٥- خۆت چۆن دەبینیت کە پێنج ساڵە کار دەکەیت؟

٦- حەز دەکەیت لەژیاندا چ کارێک بکەیت؟

٧- چۆن وەسفی خۆت دەکەیت؟

٨- چی هانت دەدات یان پاڵت پێوە دەنێت بۆئەوەی ئەوپەڕی تواناکانت پێشکەش بکەیت؟

٩- چۆن سەرکەوتن دەستنیشان دەکەیت و هەڵیدەسەنگێنیت؟

١٠- ئەو دەسکەوتانە چین وەدەستت هێناون و، هەستی ڕەزامەندی لات دروست کردووە؟

١١- ئەو گۆرانکاریانە چین کە حەز دەکەیت بیکەیت؟

١٢- چۆن لە ژێر فشاردا کار دەکەیت؟

١٣- چی لە هەڵەکانتەوە فێر بوویت؟

١٤- خاڵە بەهێزو لاوازەکانت چین؟
١٥- دوایین کتێب خوێندبێتتەوە چییە؟ ئەی دوایین فیلم کە تەماشات کردبێ؟
١٦- ئایا تۆ سەرکردەیەکی باشیت؟ نموونەیەک بهێنەوە
١٧- کەسایەتیت چۆن پۆلێن دەکەیت؟

**سێیەم: کارامەیی چارەسەرکردنی کێشەکان و بڕیاردان:**

مەبەست لە چەمکی چارەسەرکردنی کێشەکان، ئەو کۆمەڵە کردارەیە تاک ئەنجامی دەدات بە بەکارهێنانی ئەو زانیاری و زانینەی پێشتر فێری بووەو، ئەو کارامەییەی فێری بووە بۆ زاڵبوون بەسەر هەڵوێستەکە بەشێوەیەکی باش، هاوکات پێیشی ئاشنا نییە کە بەسەریدا زاڵ بێت و چارەسەری بکات.

زۆر پێناسە بۆ چەمکی ( کێشە) هەن، کێشە هەروەک (سمیت Smith) پێناسەی دەکات: «هەڵوێستێکە تاک هەوڵ دەدات بەدوای ئامرازی کارادا بگەڕێت، بۆ زاڵبوون بەسەر هەر ئاستەنگێک کە ڕێگر بێت لە گەیشتن بە ئامانجێکی بەهادار». کێشەش «هەڵوێستێکە ناتوانین بەدەنگەوەهاتنی گونجاومان بۆی هەبێت، یان ئاستەنگێک لە نێوان ئێمە و جێبەجێکردنی ئامانجەکەدایە». بەڵام (چارەسەر) بریتییە لە «ڕزگاربوون لەم ئاستەنگە یان شێوازی بیرکردنەوە، بۆ دەربازبوون لە واقیعێک کە نامانەوێ».

**گرنگی فێربوونی توانای چارەسەرکردنی کێشەکان لە کاری میدیاییدا:**

- هەندێجار کێشەکان لە ژیانی مرۆڤدا زیاد دەبێت و کەسێک نابینێتەوە هاوکاری بکات.
- هەندێجار کەسەکە پێویستی بە بڕیاردانی خێرا هەیە.
- هەندێجار کەسەکە ملکەچی بڕیاری یەکلاکەرەوەو چارەنووسساز دەبێتەوەو ناتوانێت بڕیاری لەسەر بدات، جگە لە خۆی.

بۆئەوەی بزانیت کارامەیی چارەسەرکردنی کێشەکانت هەیە، ئەم ڕستانەی خوارەوە بخوێنەرەوەو، بە ڕازی بوون یان نا ڕازی بوون بڕیاریان لەسەر بدە:

١- متمانەت بە تواناكەت هەیە بۆ چارەسەركردنی كێشە سەخت و تازەكان.

٢- كاتی پێویستت هەیە و لەو بڕوایەدای دەتوانیت زۆربەی ئەو كێشانەتی پێ چارەسەر بكەی كە ڕوبەڕووت دەبنەوە.

٣- زۆربەی ئەو كێشانەی ڕوبەڕووت دەبنەوە، زۆر بە ئاڵۆز دادەنرێت بۆ چارەسەركردنی.

٤- بە شێوەیەكی درەنگوەخت كار بە بڕیارەكانت دەكەیت.

٥- كاتێک ڕوبەڕووی كێشەیەک دەبیتەوە متمانەت نییە ئایا دەتوانیت مامەڵە لەگەڵ هەڵوێستەكە بكەیت یان نا.

٦- توانات بۆ چارەسەركردنی زۆربەی كێشەكانت هەیە، تەنانەت ئەگەر لەئێستادا ئەگەری چارەسەر نەكردنیان لەئارادا بێت.

ڕەزامەندی لەسەر ڕستەكانی ١، ٢، ٤، ٦، واتە تۆ متمانەیەكی زۆرت بەتواناكانت هەیە، بۆ چارەسەركردنی كێشەكان.

**فێربوونی كارامەیی چارەسەركردنی كێشە:**

كارامەیی چارەسەركردنی كێشە وا لە میدیاكار دەكات ڕۆڵێكی تازە ببینێت، كە بكەرو ڕێكخەری شارەزاییەكانی بێت و بابەتگەلێک كە دەیزانێت، بۆیە دەكرێت ئاماژە بە ژمارەیەک لەو بەڵگانە بكرێت، كە پاساو بۆ گرنگی مەشق لەسەر كارامەیی چارەسەركردنی كێشە دێنێتەوە، وەک شێوازێک بۆ فێربوون، ئەویش ئەوەیە:

١- زانین جۆراوجۆرە، بۆیە پێویستە میدیاكاران لەسەر شێوازی جۆراوجۆر مەشقیان پێ بكرێ، بۆ چارەسەركردنی بوارو جۆرە جیاوازەكانی ماریفەت

٢- كارامەیی چارەسەركردنی كێشەكان لە كارامەییە پێویستییەكانە بۆ زۆر بواری جیاواز، جا بواری ژیانیی یان بوارەكانی خۆگونجاندنی پیشەیی بێت.

٣- كارامەیی چارەسەركردنی زانیاری یارمەتی میدیاكاران دەدات خۆیان زانیاری بەدەست بهێنن و، میكانیزمەكانی سەربەخۆییان بۆ زیاد بكەن.

٤- كارامەیی چارەسەركردنی كێشە یارمەتی میدیاكاران دەدات بڕیاری گرنگ لە

ژیانی خۆیان بدەن و، وایان لێ بکات بەسەر ئەو بارودۆخ و هەڵوێستانەدا زاڵ بن، کە پیایدا تێپەڕ دەبن.

٥- شێوازی چارەسەرکردنی کێشە شێوازێکە تاکی میدیایی دەخاتە هەڵوێستێکی راستەقینەوە، بۆ گەیشتن بە بارێکی هاوسەنگی زانین.

**جۆرەکانی کێشە:**

(ریتمان) کێشەکانی لە پێنج جۆردا کۆ کردۆتەوە، بە پشتبەستن بە پلەی روونی زانیاری و ئامانجەکان:

- ئەو کێشانەی زانیاری و ئامانجەکان زۆر بە روونی دیاری دەکرێن.
- ئەو کێشانەی زانیاری و ئامانجەکان بە روونی دیاری ناکرێن.
- ئەو کێشانەی ئامانجەکانی دیاریکراوو روونە، بەڵام زانیارییەکانی روون نییە.
- ئەو کێشانەی ئامانج و زانیارییەکانی روون نین.
- ئەو کێشانەی وەڵامی دروستیان هەیە، بەڵام رێوشوێنەکانی پێویست بۆ گواستنەوە لەباری ئێستا بۆ باری کۆتایی روونە نییە و، بە کێشەکانی چاوکراوەیی ناسراوە.

**هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی کێشە:**

چالاکی چارەسەرکردنی کێشەکان چالاکییەکی هزری زانینەو بە هەنگاوگەلێکی زانینی هزری ریزبەندکراوو رێکخراودا لە هزردا دەڕوات، کە دەشێ رەگەزو هەنگاوەکانی بەم چەشنە دیاری بکرێن:

١- هەستکردن بە کێشەکە: ئەم هەنگاوە خۆی لە درککردنی ئاستەنگ یان لەمپەرێکدا دەبینێتەوە، کە لەبەردەم گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو رێگرە.

٢- دیاریکردنی کێشەکە: سەرکردەی میدیاکار یارمەتی فەرمانبەرەکە دەدات، لە داڕشتنەوەی کێشەکە بەشێوەیەکی وردو دیاریکراو، بە بەکارهێنانی وشەی وردو ئاسان و ئەو رەگەزانە لەخۆدەگرێت کە لە هەڵوێستە پێکهێنراوەکەدا هەیە. واتە

وەسفکردنی بە وردی، ئەمەش دەرفەتی دەدات وێنەی سنوورەکەی بکێشێت و ئەوەی لەویتر جیای دەکاتەوە.

کێشـەش لـە ڕێگەی سـێ هۆکارەوە دیـاری دەکرێت، کە یارمەتی تـاک دەدات بۆ گەیشتن بە دیاریکردنێکی ورد، ئەوانیش:

- ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە خودی تاکەوە هەیە لەڕووی تێگەیشتنی تاک بۆ خودی خۆی، بیرۆکەکانی، هەست و بەهاکانی.

- ئەو هۆکارانەی پەیوەسـتن بەو ژینگەیەی کێشـەکەی تیا ڕوودەدات و، ئاسـتی چارەسەربوونی کێشەکە و، پەیوەستبوونی لەگەڵ تاکەکانی دیکە و، ئاستی کاریگەری ئەوانی دیکە، هەروەها کاریگەربوونی ئەوان پێی.

- ئـەو هۆکارانـەی بـە خودی کێشـەکە پەیوەسـتن، لە ڕووی سروشـتی کێشـەو قەبارەکەی.

هەروەها لە دیاریکردنی کێشەدا، پێویستە فەرمانبەر هەندێ پرسیار لە خۆی بکات، چی وام لێ دەکات لەو بڕوایەدابم ئەمە کێشـەیە؟ چۆن کارم لێ دەکات؟ ئەو شـتانە چییە کە پێشـبینی ڕوودانی دەکەم ئەگەر کێشـەکە بەردەوام بێت؟ هەسـتم بەرامبەر کێشەکە چییە؟ پاڵنەرەکانم بۆ گۆڕانکاری چییە؟ چی وام لێ دەکات لە گۆڕان بترسم؟ ئاسـتی متمانـەم بە تواناکانم لەسـەر گۆڕان چەندە؟ بیرۆکەکانـم لەبارەی گۆڕانکاری چییە؟

٣- شـیکردنەوەی کێشـە: خـۆی لـە ناسـینی ڕەگـەزە سـەرەکییەکانی کێشـەیەک لەلایـەن میدیـاکار دەبینێتـەوە، هەروەهـا دوورخسـتنەوەی ئەو ڕەگەزانەی کێشـە لە خۆی ناگرێت.

٤- کۆکردنـەوەی داتـای پەیوەسـت بـە کێشـەکە: خـۆی لـە مـەودای دیاریکردنی میدیـاکار دەبینێتـەوە، بـۆ باشـترین سـەرچاوە فەراهەمبـووەکان بـۆ کۆکردنـەوەی زانیاری و داتاکان لە گۆڕەپانی پەیوەست بە کێشەکە، لەوانەیە میدیاکار زانیارییەکان لـە ڕێگـەی کتێب یان ئەندامانـی خێزانەوە کۆ بکاتەوە. بەهۆیەوە تاک دەتوانێت بیر لە زۆرترین چارەسەرو ئەڵتەرناتیڤ بکاتەوە.

٥- پێشـنیاری چارەسـەری و ئەلتەرناتیڤـەکان: مەبەسـت لـە ئەلتەرناتیڤ و چارەسەرییەکان وێنەی چارەسەری گریمانەییە، کە هەمیشە پشت بە چەند بەڵگەیەکی لۆژیکی ئاشکرا یان لەناو کێشەکە دەبەستێ، بەهای ئەو چارەسەریانەی تاکەکان پێی دەگەن پەیوەستە بە بەهای ئەو زانیاری و شارەزاییانەی هەیانە، هەروەها پەیوەستە بـە روونـی گەنجینـەی زانیـن کـە وەرگرتـن و بەکارهێنانـی ئاسـانە و، تەوزیفکردنی بۆئەوەی بە چارەسەر بگات.

٦- لێکۆڵینـەوەی چارەسـەرە پێشـنیارکراوەکان بەشـێوەیەک جێبەجـێ بکـرێ و هەڵبژاردنێکی باشتریش بێ: لەم قۆناغە ئەو ئەلتەرناتیڤە دەخرێنە ژێر تاقیکردنەوەوە کە حیسابی بۆ کراوە، بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی، بەجۆرێک ئەلتەرناتیڤەکە بەشێوەیەکی زەمانەوانی ورد دادەڕێژرێتەوەو، بەشـێوەیەکی شیاو بۆ چارەسەرو هەنگاوی واقیعی بۆ جێبەجێکردنی هەبێت. ڕۆڵی سـەرکردەی میدیاکار خۆی لە یارمەتیدانی فەرمانبەر دەبینێتەوە، لە دیاریکردنی مەوعیدو کات و چۆنێتی لێکۆڵینەوە لە ئەنجامەکان.

٧- گشـتاندنی ئەنجامـەکان: ناوەڕۆکـی ئـەم قۆناغە خـۆی لـەوەدا دەبینێتەوە، کە فەرمانبـەر پێـی گەیشـتووە لـە ئەنجامـە بەدەسـتهاتووەکان لە ڕێگـەی تاقیکردنەوەو ئەزموون، یان لێکۆڵینەوە، ئەم ئەنجامە بەسـەر ئەو بارانە دەگشـتێنرێت کە هاوشـێوە یان نزیکن لە گۆڕاوەکانی ئەلتەرناتیڤەکە، یان هاوشـێوەن لە پەیوەندییە باوەکان یان ئەوانەی لە چوارچێوەی ئەلتەرناتیڤ یان گۆڕاودا لەخۆی دەگرێت.

## ئەو هۆکارانەی بۆ شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکان ئاستەنگن:

چەندیـن هـۆکار هەیـە ئاسـتەنگن لەبەردەم گەیشـتن بـە چارەسـەری گونجاو بۆ کێشەکە و، دەبێتە هۆی بەدەنگەوە هاتنی نەگونجاو، گرنگترین ئەو هۆکارانەش بریتین لە:

١- ئامادەباشـی عەقڵی: ئەو ئامادەباشـییە وا دەکات تاک بەشێوازێکی دیاریکراو وەڵام بداتەوەو، ئاستێک بۆ گریمانە پێشنیارکراوەکان دابنێ و، ببێتە هۆی پەیوەستبوون بە چارەسەری نەگونجاو سەرەڕای بێ کەڵکبوونی.

٢- جێگیربوونـی وەزیفـی: ئامـاژە بـە سـووربوونی تـاک دەکات بـە چارەسـەرە باوەکان.

٣- راپەڕانـدن: ئـەوەش بە جێبەجێکردنی ئەو چارەسـەریانەی کە دڵنیا دەبنەوە لە راستییەکەی.

٤- پەیڕەو نەکردنی رێبازکاری لە دیاریکردن و چارەسەرکردنی کێشەکان.

٥- دانانی کێشە لە دەرەوەی چوارچێوە راستەقینەکەی.

٦- کەمبوونەوەی زانیاری یان خراپ شیکارکردنی کێشەکە.

٧- راگرتنی جێبەجێکردن یان پشتگوێ خستنی بەدواداچوون و هەڵسەنگاندن.

٨- نەبوون یان سنووردارکردنی بەشداری لایەنە پەیوەندیدارەکان.

٩- ترس لە شکست و لە نوێبوونەوەو ئاڵوگۆڕی هزرەکان.

**چوارەم: کارامەیی بەڕێوەبردنی کات بۆ میدیاکار:**

بەڕێوەبردنی کات «بریتییە لە باشـترین بەکارهێنانی کات بەمەبەستی وەدیهێنانی ئامانجی دیاریکراو، ئەمەش بە پلاندانان و رێکخستن و ئاراستەکردن و بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی کارایانەی چالاکی و ئەرکەکان لە ماوەیەکی دیاریکراودا».

میدیاکار بە دەسـت فشـارێکی زۆری جێبەجێکردنی ئەرکەکانی دەناڵێنێت، ئەمە وا دەکات کارامەیـی بەڕێوەبردنـی کاتەکـەی هۆکارێکی گرنگ بێت بۆ سـەرکەوتن، بۆیە دەبێت باس لەم کارامەییە بنەڕەتییە بکەین.

بەڕێوەبردنـی کات، ئـەو رێگـە و شـێوازانەیە یارمەتـی تـاک دەدات بـۆ ئەوپەڕی سـوود بینیـن لـە جێبەجێکردنـی ئامانجەکانی و، خولقاندنی هاوسـەنگی لـە ژیانیدا لە نێوان ئەرکەکانی و ئارەزوو و ئامانجەکانیدا.

**لە نووسینگەکەت ناوچەی کار بۆ سێ بەش دابەش بکە:**

بەشی یەک: گرنگترین بەشە و ئەو شتانەی تیا دادەنێی کە بەهایەکی بەرزی هەیە، وەک دەفتـەری تێبینییەکانـت و زبڵدان و ئـەو شـتانەی بەردەوام پێویسـتت پێیانە و پێویسـت ناکات لەسـەر کورسییەکەت هەستیەوە تاکو دەستت بکەوێ، واتە بە دەست

درێژکردن دەتوانیت بەدەستی بێنیت.

بەشی دوو: ئەو شتانەی تیا دادەنرێت کە کەمتر پێویستت پێیانە و ماوەیەک جارێک پێویستت پێیانە، وەک تەلەفۆن و ئەو شتانەی پێویستە بوەستی یان لەشت درێژ بکەیت تاکو بکەوێتە دەستت.

بەشی سێ: ئەو شتانەی تیا دادەنرێت کە زۆر بە کاری ناهێنی و پێویستە بۆی بچیت تاکو دەستت بکەوێت، وەک کتێب و هاوشێوەکانی.

هەوڵبدە هەر جارێک دەستنیشانی بکەی، ئەو شتانە چییە کە دەبێ لە هەر بەشێکی دابنێی، بۆ نموونە دەمبووس، ئەگەر لەوانە بێت کە زۆر بەکاری دەهێنن، ئەوا لە ناوچەی (١)ی دابنێ.

رۆژ= ٨٦٤٠٠ چرکە، لەبەرچی ئەم کاتە بۆ هەندێ خەڵک بۆ بەڕێوەبەردنی دەزگای گەورە گونجاوە، کەچی هەندێکی دیکە ناتوانن هەندێ کاری سادە لەو کاتە ئەنجام بدەن؟ جیاوازییەکە خۆی لە کارایی قۆستنەوەی کاتدا دەبینێتەوە.

## گرنگی ڕێکخستنی کات:

ڕێکخستنی کات پرۆسەی سوودبینینە لە کاتی فەراهەمبوو و، بەهرە کەسییە دەستەبەربووەکان لەلامان، بۆ وەدیهێنانی ئامانجە گرنگەکان کە لە ژیانماندا هەوڵی بۆ دەدەین، لەگەڵ پارێزگاریکردن لە وەدەستهێنانیدا. ئەو ڕێگە و ئامرازو تەکنیکانەیە کە وادەکات مرۆڤ سوودی تەواو لە کاتەکەی وەربگرێت، لە وەدیهێنانی ئامانجەکانی و دروستکردنی هاوسەنگی لەژیانیدا لەنێوان ئەرک و ئارەزوو و ئامانجەکاندا. گرنگی ڕێکخستنی کاتیش لەم خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- زیاتر دابەشکردنی کارەکان و ڕوونتر کردنی کە کاریگەری زیاتری دەبێت.

٢- قووڵ کردنەوەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی.

٣- بوونی هەماهەنگییەکی پێشوەخت لەکارەکانیاندا.

٤- هاوکاریمان دەکات کە سیناریۆی ئامانجەکانمان لە داهاتوودا بە ئاشکرایی دیار بکەین.

٥- دەبێتە هۆکارێک کە رێکخستنێکی باش و نەرم و نیان لە دەزگایەکە دروست بێت، تیایدا گۆڕانکاری و نوێکاری رووددەدات.

٦- کارمەندەکان کارەکانیان بە باشترین شێواز ئەنجام دەدەن.

٧- نزیکبوونەوەو بەدواداچوون.

٨- رێنمایی پۆزەتیڤانە دروست بکرێ و ئەنجام هەبێ بە ماندوبوونێکی کەمیش.

٩- دەبێتە هۆکارێک بۆ دەستپێشخەری تاکەکان بۆ هێنانەکایەی شتی نوێ.

**ئەو کارانەی لە رێکخستنی کاتدا یارمەتی میدیاکار دەدات:**

١- رۆژانە پلان و ئامانجەکانت بخوێنەوە.

٢- تەکنیکە نوێیەکان بۆ رێکخستنی کاتەکەت بەکار بهێنە.

٣- هزرت چڕ بکەوەو پەرتەوازەی مەکە.

٤- نووسینگە و ژوورو ئوتۆمبێلەکەت رێک بخە.

٥- سەرکەوتن بە بڕی ئەو کارانە نییە کە ئەنجامی دەدەیت، بەڵکو بە مەودای کاریگەری ئەو کارانەیە بەشێوەیەکی ئەرێنی لەسەر دەوروبەرتدا.

٦- نەرم و نیانی لە جێبەجێکردنی پلانەکەت.

٧- بیرۆکە و پلان و ئامانجەکانت تۆمار بکە.

٨- نائومێد مەبە. نائومێد مەبە. چونکە نائومێدی نزیکترین رێگەیە بۆ شکست. گوتوویانە: لە هەڵەکانم ئەوەندە فێر دەبم، زیاترە لەوەی لە سەرکەوتنەکانم فێری دەبم.

٩- پێشینکاری (اولویات) لەنێوان کارەکانتدا بکە، واتە ئەوە هەڵبژێرە کە دەزانیت لە داهاتووتدا بەسوودە بۆت و بۆ خەڵکی زیانبەخش نییە.

١٠- رۆژانە پلان و ئامانجەکانت بخوێنەوە.

**جۆرەکانی کات:**

**- کاتی داهێنانانە:**

ئەو کاتەیە تایبەتە بە پرۆسەکانی بیرکردنەوەو شیکردنەوەو پلاندانانی داهاتوو و، رێکخستنی کارو هەڵسەنگاندنی دەسکەوتەکان و، لە چالاکییە کارگێڕییەکان پەیڕەو

دەكرێت.

**- كاتی ئامادەباشیی:**

ئـەو كاتـە دەگەیەنێت كە پێش دەسـتپێكردنی كار یان چالاكییەكە، ئەگەر بە وردی و زیرەكی بقۆزرێتەوە ئەوا بەرهەم زیاد دەكات.

**- كاتی بەرهەمهێنراو:**

ئەو كاتەیە لە جێبەجێكردنی ئەو كارو چالاكیانە دەخایەنرێت، كە لە كاتی داهێنانە پلانی بۆ دانراوەو، لە كاتی ئامادەباشیدا ئامادەكاری بۆ كراوەو، بۆ زیادبوونی كارایی قۆسـتنەوەی كات، پێویسـتە كەسـی كارگێـڕی پرۆسـەی هاوسـەنگیی لەنێـوان كاتی خایاندراو لە جێبەجێكردنی كارەكە و، بەرهەمهێنانەكەی و لەنێوان كاتی خایاندراو لە داهێنان و ئامادەباشی بكات.

**- كاتی گشتی یان ناڕاستەوخۆ:**

ئەو كاتەیە بۆ ئەنجامدانی چالاكی گشـتی لاوەكی پێویسـتە، كە كاریگەری لەسـەر دواڕۆژی دەزگاكـە و پەیوەندییەكـەی بـە هـی تـرەوە هەیـە، وەک پەیوەسـتبوون بە دەستەو دامەزراوەو ئامادەیی كارگێڕی سەركردە بۆ كۆڕەكان، یان دەستەبەركردنی بانگهێشتی تایبەت بە چالاكی دیاریكراو یان كردنەوەی دامەزراوگەلی دیاریكراو.

**بەفیڕۆدەرەكانی كات:**

(ماكانزی و ریچارد) بەفیڕۆدەرەكانی كات وا پێناسـە دەكەن، هەموو ئەوانەیە كە رێگریـت لـێ دەكات لـە وەدیهێنانی ئامانجەكانت بەشـێوەیەكی كاراو بەهۆی ئەمانەی خوارەوە دروست دەبن:

١- لـە پلاندانانـدا: نەبوونی ئامانج، پێشـینكاری، پلاندانـان، هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی زۆر كار لە یەک كاتدا، هەڵسانگاندنی نا واقیعی بۆ كات.

٢- لـە رێكخسـتندا: نەبوونـی رێكخسـتنی كەسـیی، دووفاقەیـی كۆشـش، كارە كاغەزییـەكان، رۆتیـن، خوێندنـەوە- كەرەسـتەی نەگونجـاو، ئاسـانكارییە ماددییـە نەگونجاوەكان، تێكەڵكردنی بەرپرسـیارێتی و دەسـەڵات، فرە سەركردە، سیستەمێكی خراپ بۆ دۆسیەكان.

٣- لـه وەزیفـەدا: زیـادە یان کەمیی لە ژمـارەی فەرمانبەران، ئـەو فەرمانبەرانەی پشـت بـە کەسـێکیتر دەبەسـتن- فەرمانبـەرە رانەهێنـراوەکان، بـێ توانـا- غایبوون، دواکەوتن، دەست لەکارکێشانەوە.

٤- لە ئاراستەکردندا: کەمیی پاڵنەر، رێپێدانی نا کارا، بەشداریکردن لە وردەکارییە رۆتینییەکان- کەموکوڕی لە هەماهەنگی.

٥- لە دروستکردنی بڕیاردا: داواکردنی دەسکەوتنی هەموو زانیارییەک- دواخستن، دوودڵی، بڕیاری خێرا.

٦- لە پەیوەندییەکاندا: کۆبوونەوەکان، گەرمیی یاداشـتە ناوخۆییەکان، پەیوەندییە زۆرە زیـادەکان، ناڕوونـی یـان لەدەسـتدانی پەیوەنـدی و رێنماییـەکان- نەبوونـی پەیوەندی.

٧- لە چاودێریدا: پچڕانی پەیوەندی تەلەفۆنی، نەتوانینی وتنی نا، کەمیی رێککاری خودیـی، جێهێشـتنی کار بەبـێ تەواوکردنـی، کاریگەرییـە بینینیـە خەریککـەرەکان، دەنگەدەنـگ، نەزانینـی ئـەوەی لـە دەوروبـەرت روودەدات، سـەردانکەرە لەپـڕەکان، زانیاری ناتەواو، زانیاری دواکەوتوو، کەمیی رێککاری خودیی، لەدەستدانی پێوەرەکان، سانسۆر، راپۆرتە بەدواداچووەکان- سانسۆری زیاد.

٨- ئاسـتەنگی دیکـە: تەمەڵی و دواخسـتن، لەبیرکردن، ئەمـەش روودەدات چونکە کەسـەکە ئـەوە تۆمـار ناکات کە دەیـەوێ ئەنجامی بدات، بەمـەش زۆر لە ئەرکەکانی بەفیـڕۆ دەچێـت، پەیوەندی بڕینی ئەوانی دیکەو، سـەرقاڵییەکانیان، کە لەوانەیە گرنگ یـان پێداگیـر نەبـێ، تەواو نەکردنـی کارەکان، یـان بەردەوامی نەبوون لە رێکخسـتن بەهۆی تەمەڵی یان بیرکردنەوەی خراپ بەرامبەر رێکخستن، خراپ تێگەیشتنی ئەوانی دیکە دەبێتە هۆی کێشەگەلێک کە کاتەکەت هەڵدەلووشێت.

### پێنجەم: کارامەیی مامەڵەکردن لەگەڵ ململانێ لە کاری میدیاییدا:

هەموو پەیوەندییەک لە کرۆکی خۆیدا ململانێ یان رێکنەکەوتن یاخود بەرژەوەندی ناکـۆک لەخـۆ دەگرێـت، ململانێ کاتێک لـە پەیوەندییەکانـدا پەیدا دەبێت، کـە رێگە لە

کاری کەسێک دەگیرێت یان لەگەڵ کاری کەسێکی دیکە تێک ئاڵاو دەبێت یاخود پێک دادەدەن، لەوانەیە ململانێیەکە لەنێوان ئارەزووی کەسەکان یان ڕێگەکانیان لە گەیشتن بۆ ئامانجەکانیان بێت، یان پێویستە کەسییەکانیان یاخود ئەو پێشبینیانەی هەندێکیان ئەوی دیکەیان بە هۆکار لە دروستبوونی ململانێیەکەی پێ تاوانبار دەکەن.

ململانێکانیش لە هەموو پەیوەندییەکاندا هەیە (هاوڕێیان، هاوپیشەکان، پەیوەندییە گەرم و گورەکان، هاوڕێیانی کار، دراوسێ...) لەوانەیە ماوەیەک جارێک لەگەڵ هەمان کەس پەیدا بێت، سەرەڕای پێویستی ململانێیەکان بەڵام هەستێک لای زۆربەی کۆمەڵگەکان هەیە، بەوەی ململانێی نێوان کەسەکان کاری خراپە و پێویستە لێی دوور بکەوینەوەو، زۆربەی خەڵک لەو بڕوایەدان پەیوەندی باش ئەو پەیوەندیەیە کە ململانێی تێدا نییە، هەندێکی دیکە وای دەبینن نەبوونی ململانێ لە پەیوەندییەکاندا واتە تێکەڵ نەکردن لە ژیانداو ساردی سۆزداری و نەخۆشی لە پەیوەندیدا.

**ململانێ لەوانەیە هەندێ سوودی هەبێ، لەوانە:**

١- زیادبوونی ململانێیەکان لە هۆشیاریمانەوەیە کە کێشەکانمان پێویستی بە چارەسەرە، چونکە لە سروشتی ئەو کێشانەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە وریامان دەکاتەوە، لایەنەکانی ململانێیەکە کێن و، چۆن دەکرێ لەگەڵیدا مامەڵە بکەین.

٢- ململانێ هانی گۆڕانکاری دەدات، هەندێ کات هەیە پێویستمان بە گۆڕان هەیە، بۆیە پێویستمان بە کارامەیی تازەو چاککردنەوەی داب و نەریتەکانی پێشترمان هەیە.

٣- ململانێ هێزو پاڵنەرمان زیاد دەکات، لە مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکاندا.

٤- وا دەکات ململانێیەکانی ژیان بەتام و چێژتر بێت، چونکە ململانێ حەزی بەدواداچوونمان زیاد دەکات و دەبێتە مایەی وروژاندنمان، لەبەرئەوەی مشتومڕو گفتوگۆ کارلێککردنی نێوانمان بەچێژ دەکات و، دەرفەتی بێزاری لە قسەکردن و کرداردا کەم دەکاتەوە.

٥- بڕیارە باشەکان زۆرجار لە ئاکامی ناکۆکی و فرەیی لە ڕای نێوان کەسانی بەرپرس لە بڕیارەکاندا دروست دەبێت، چونکە ناکۆکی لە بیروڕا بڕیارێک بەرهەم

دەهێنێت کە بە باشی بیری لێ کراوەتەوە.

٦- ململانێی یارمەتیدەرە لە تێگەیشتنی ئەوەی تۆ لە چ جۆرە کەسانێکی، چییە وات لێ دەکات تووڕە بیت و چییە دەتترسێنێت و، ئەو شتە گرنگانە سەبارەت بە تۆ چیین، بەهۆی بەئاگابوونت لە رایەکانت کە لەوانی دیکە جیاوازەو، بەهۆی ئارەزووت بۆ بەرگری کردنت لێی و، نەرمونیانیت لە هەموارکردنەوەت دەتوانیت بەشێوەیەکی باشتر لە خۆت تێ بگەیت.

٧- ململانێیەکان دەکرێ لەژێر کاریگەری فشاری رۆژانە پەیوەندی قووڵ و بەهێز بکات، چونکە بەهۆیەوە دەکرێ تێگەیشتن و بەهاکانی کەسێک بۆ کەسێکیتر بگەیەنرێت و، مەودای پابەندی هەریەکەیان بە پەیوەندییەکە.

**لەم بارانەشدا ململانێ ئەرێنی دەبێت:**

١- ئەگەر پەیوەندی نێوانتان بەهێزەو، هەریەکەتان لەگەڵ ئەویتر مامەڵە بکات یان کاری لەگەڵ بکات.

٢- ئەگەر هەردووکتان متمانەتان بە یەکدی هەیە و یەکدیتان خۆشدەوێت.

٣- ئەگەر تۆو لایەنی بەرامبەر لەسەر ئەنجامەکانی ململانێ رازی بن.

٤- ئەگەر تواناو کارامەییەکانی تۆو لایەنی بەرامبەر باش بێ، دەتوانن چارەسەری ململانێکانی داهاتوو بکەن.

بۆیە کاتێک لەگەڵ لایەنێکیتر بە ململانێیەکدا تێپەڕ دەبێت، پێویستە کار لەسەر رەچاوکردنی ئەمانەی خوارەوە بکەیت:

- وەدیهێنانی ئامانجە کەسییەکانت، ئامانجە کەسییەکەت لەوانەیە زۆر گرنگ یان گرنگییەکی کەمی هەبێ.

- پارێزگاری لە ئاستی پەیوەندییەکی باش لەگەڵ کەسێکی دیکەدا، لەوانەیە پێویستت بەوە بێت لەئێستا یان لە داهاتوودا لەگەڵ کەسێکی دیکەدا مامەڵە بکەیت.

لەو ستراتیژیەتانەی دەکرێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ململانێ بەکاربهێنرێت، بەم شێوەیە:

### ١- کشانەوە (شێوازی کیسەڵ):

لەم ستراتیژیەدا کەسەکە بۆ شوێنەکانی پێشووی دەکشێتەوە، کە بەتەواوی خۆی لە ململانێیەکە دوور دەگرێت، وەک چۆن کیسـەڵ خۆی بۆ هێلانەکەی دەکشێنێتەوە، لـەو کاتـەدا روبەڕووی ئاسـتەنگێک دەبێتەوە کەسـەکە دەکشـێتەوەو دەسـتبەرداری ئامانـج و پەیوەندییەکانـی دەبێـت، بـە واتایەکیتـر لـەو پـرس و پێویسـتیانە دوور دەکەوێتـەوە کـە بەهۆیـەوە ململانێکـە روودەدات و، لەبارەی ئـەو خەڵکانەی دەکرێ ململانێ بکەن یان لەگەڵیان ناکۆک یان کۆک بن، ئەم کەسـە لەو بڕوایەدایە ئومێدێک لـە هەوڵـدان بۆ چارەسـەرکردنی ململانێیەکە نییە، چونکە ئەو هەسـت بە کەموکوڕی دەکات هەروەک لەو بڕوایەدایە ئاسـانترە کە لە رووی جەسـتەیی و دەروونییەوە لە ململانێیەکە بکشێتەوە، لەجیاتی ئەوەی روبەڕووی بێتەوە.

### ٢- ستراتیژیەتی ناچارکردن (شێوازی ماسی قرش):

لێرەدا کەسەکە هەوڵ دەدات بەسەر کەسێکی دیکەدا زاڵ بێت لە رێگەی ناچارکردنی تاکو چارەسـەرییەکانی ئەم بۆ ململانێیەکە پەسـند بکات، لێرەدا وەدیهێنانی ئامانجەکە بـۆ کەسـەکە پێشـینەیەکی رەهایـە، بـەڵام پەیوەندییەکـەی بـە کەسـەکەی تـر گرنگی نییـە، چونکە کەسـەکە هـەوڵ دەدات ئامانجەکە وەدی بهێنێت، جـا ئامانج یان رێگەکە هەرچییـەک بێـت و، ئـەو بـە پێویسـتییەکانی ئەوانی دیکـەوە پەیوەنددار نییـە و، پێی گرنگ نییە ئایا خەڵک شـێوازەکەیان پێ خۆشـە یان نا، چونکە ماسـی قرش لەرێگەی رەفتارەکانییەوە پێیوایە ململانێیەکان کەسێکی براوەو یەکێکی دۆڕاویش هەیە، پاڵەوان و قوربانـی بوونـی هەیـە، چونکـە بردنـەوە هەسـتێک بە دەسـکەوت و شـانازی بەو کەسانە دەبەخشێت و، ئەوان بە ئامرازەکانی هێرشکردن هەوڵی قازانج و وەدیهێنانی ئامانجەکانیان دەدەن.

### ٣- ستراتیژیەتی خۆشکردنی کەشەکە (ورچی میهرەبان):

لێـرەدا پەیوەندییەکـە زۆر گرنگـە لەکاتێکـدا وەدیهێنانی ئامانجە کەسـییەکان کەم بەهاتـر دەبێـت یـان هـەر بەهای نییە، کەسـەکە هەمـوو هەوڵێـک دەدات تاکو لەلایەن خەڵکانـی تـرەوە پەسـندکراوو خۆشەویسـت بێت، کەسـەکە لەو بڕوایەدایە پێویسـتە

لــە ململانــێ خــۆ دوور بگرێــت، تاكــو خــۆی بگونجێنێت و بۆئــەوەی لــەلای ئەوانەوە پەسندكراو بێت، چونكە گفتوگۆكردن لەبارەی ململانێوە پەیوەندییەكە وێران دەكات و، لەبەر بەرژەوەندی پەیوەندییەكە و دروشمەكەی كەسەكە دەستبەرداری ئامانجەكانی دەبێت، بەم شــێوەیە: ئامانج و پێویســتییەكانم لەبیر دەكەم، ئەوەی دەتەوێ وەدەستی بێنە بۆئەوەی منت خۆش بوێ.

## ٤- ستراتیژیەتی سازشكردن (ڕێوی):

لێرەدا كەســەكە بەشــێوەیەكی هاوسەنگتر بایەخ بە ئامانجەكانی و پەیوەندییەكانی لەگــەڵ ئەوانــی دیكــە دەدات، ئــەو وەک ڕێوییــە بایــەخ بە ســازش دەدات و هەوڵی بۆ دەدات و، دەســتبەرداری بەشــێک لە ئامانجەكانی دەبێت و شێوازگەلی قەناعەتپێكردن بەكاردەهێنێــت، بۆئــەوەی ئەوانی دیكە دەســتبەرداری بەشــێک لــە ئامانجەكانیان بن، ئــەو هەوڵ دەدات لەگەڵ كەســەكەی تر چارەســەرێک بۆ ململانــێ بدۆزنەوە، كە هەر كەســێک شــتێک وەدەســت دێنێ (زەمینەی هاوبەش لەنێوان دوو تێڕوانینی توندڕەوو لێک دوور)، لێرەدا كەســەكە ئامادەیــی تیایــە قوربانی بە بەشــێک لــە ئامانجەكانی و چەند بەشێک لە پەیوەندییەكەی بدات، بۆ دۆزینەوەی ڕەزامەندییەک بۆ بەرژەوەندی هاوبەش كە بە كەسەكەی تر پەیوەستت دەكات.

## ٥- ستراتیژیەتی هاریكاری (سەگی ماڵی):

بەلاتــەوە گرنگــە كاتێــک لــە ململانێــی ئامانجەكانتــدا بیــت و پەیوەندییەكــەت زۆر گرنگە، چونكە ئامانجەكان و پەیوەندی هەمان بەهایان هەیە كە بەهایەكی بەرزە، ئەو كەسانەی هاریكاری بەكاردەهێنن، وا تەماشای ململانێیەكە دەكەن وەک كێشەیەک كە دەبێت چارەسەر بكرێت، بۆیە هەوڵدەدەن و شێوازی جۆراوجۆر بەكار دەهێنن، تاكو بگەنە چارەسەرێک كە ئامانجەكانیان و ئامانجی كەسانی دیكە وەدی بهێنن، هەروەک لەو بڕوایەدان دەكرێ ململانێ لە ڕێگەی ســووككردنی گرژیی نێوانیان پەیوەندییەكە بــاش بــكات و، ئــەوان گفتوگــۆی ئامانجــدار بــۆ دیاریكردنی كێشــەكە بــەكار دەهێنن، پاشان دەست بە دروستكردنی ئەڵتەرنتیڤ دەكەنەوەو، ئەڵتەرناتیڤێک جێبەجێ دەكەن كە لەســەری ڕێک دەكەون، بۆیە دەبینیت لەم شــێوازەدا چارەســەرییەكان لایەنەكانی

ململانێیەکـە رازی دەکات و پەیوەندییەکـەش بە بەهێزی دەهێڵێتەوە، چونکە ئەوان بە کەمتر لە دۆزینەوەی چارەسەرێک رازی نابن، کە ئامانجەکانیان و ئامانجی خەڵکانی دیکە وەدی بهێنێت، هەروەها تەنانەت رازی نابن چارەسەر بدۆزنەوە کە گرژیی کەم بکاتەوەو هەسـتی نەرێنی نەهێڵێت، سـتراتیژیەتی پێنجەم هەندێ جار بە ستراتیژیەتی بونیات یان ئەرێنی ناودەبرێت.

## بەشی دەیەم
## سەرکردایەتی و کارگێڕیی لە دەروونناسی میدیادا

**سەرکردایەتی:**

دەکرێ سەرکردایەتی وا بناسێنین «ڕەفتارێکە تاک ئەنجامی دەدات، کاتێک چالاکی کۆمەڵەیەک بەرەو ئامانجێکی دیاریکراوی هاوبەش ئاراستە دەکات». هەروەها «پرۆسەی بزواندنی کۆمەڵێک خەڵکە بە ئاراستەیەکی دیاریکراوو پلان بۆ دانراو، بە هاندانیان بۆئەوەی بە ویستی خۆیان کار بکەن».

(هیس) و هاوڕێیانی پێیانوایە سەرکردایەتی «چالاکی و کاراییەکە، کاریگەری لە ڕەفتاری ئەوانی دیکە وەک تاک و گرووپەکان دەکات، بەرەو وەدیهێنانی دەسکەوت و ئامانجە ویستراوەکان». کەواتە سەرکردایەتی دەسکەوت و کاریگەرییە لە سەرکردایەتیکراوان یان ئەوانەی ڕووبەڕووی ئامرازە جیاوازەکانی میدیا دەبنەوە، بۆئەوەی ئامانجە ویستراوو داواکراوەکان وەدی بهێنرێت.

سەرکردایەتی تەنیا گرتنی شوێنێک یان پۆستێک نییە، یا ئەوە نییە تەنیا ئەرکێک بێت، یاخود فەرمانکردن بەسەر یەکێک، بەڵکو ئەوەیە چۆن لەدڵی خەڵک جێ بکەیتەوە، ئەوەش لەڕێگەی قەناعەتکردن و کاریگەریکردن لەسەریان و ئەوانیش متمانەی پێ بکەن. کرۆکی سەرکردایەتی کاریگەرییە، لە دەسەڵاتی ڕەسمی حوکم دەکەیت، بەڵام لە سەرکردایەتی کاریگەریت لەسەر عەقڵ و هەست و سۆز هەیە، باشتروایە هەردروک تێکەڵ بکرێت. سەرکردایەتیکردن لەسەر تۆقاندن و ترساندن دروست نەبووە، بەڵکو کاریگەری سەرکردە پەیوەستە بە ئامانجەکان. کاریگەری سەرکردایەتی دوو سەرەیە، شت دەدەیت و شتیان لێوەردەگریت.

سەرکردایەتی سەرکەوتووش خەڵک بەو ئاراستەیە دەبزوێنێت کە بەرژەوەندییەکانیان لە مەودایەکی دووردا وەدی بێنێ، سەرکردایەتی ڕۆڵ و پرۆسەیەکی هەیە ئامانجی کارتێکردنە لەوانی دیکە و، کەسی سەرکردەش ئەوەیە

پێگەیەکی دیاریکراو لە گرووپەکە دەبێت، چاوەڕوانی لێ دەکرێت کارەکەی بە ڕێکوپێکی رابپەڕێنێت.

**سەرکردە:**

وشەی سەرکردە (Leader) مەبەست لەو کەسەیە خەڵکی ئاراستە و ڕێنوێنی دەکات، واتە پەیوەندییەک هەیە لەنێوان کەسێک کە ئاراستە دەکات و کەسانێکی دیکە کە ئەم ئاراستەیە پەسند دەکەن، ئەم چەمکەش پرۆسەیەکی پێگەیشتووە، هەردوو لایەنی کەسێکە ئاراستە دەکات و ڕێنوێنی دەکات و ئەوانی دیکە ئەو میدیایە وەردەگرن کە ئامانجی وەدیهێنانی مەبەستگەلی دیاریکراوە.

سەرکردە کۆمەڵێک خاسیەت و کردارە، کاروباری خەڵک بەڕێوە دەبات و بەشێوەیەکی باش و سەرکەوتوو سەرپەرشتی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی ئەرکێکی زۆر گرنگ و کاریگەرە لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەزگاکان بەتایبەتی دەزگا ڕاگەیاندنەکان، کە بەردەوام دەبێت ئەرکیان داهێنان و نوێکاری لەخۆ بگرێ، بۆئەوەی لەکارەکانیاندا سەرکەوتوو بن، لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری و خزمەتکردنی هاوولاتیان، پێش خەڵک و دەزگای دیکە بکەون.

سەرکردە دەتوانێت بە باشترین شێواز بۆ ئامانجەکە ئاراستەی خەڵک بکات. کە شتێک ڕوودەدات سەرکردە دێتە ناو وردەکارییەکان و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان دەدات. دەستڕۆیشتنی کەسایەتی مانای ئەوە نییە دەسەلاتی رەسمی نییە، بەلام هەوڵدەدات دەسەلاتە رەسمییەکە لەگەڵ شارەزایی خۆی تێکەڵ بکات.

سەرکردەش ئەو کەسەیە کە لێی چاوەڕوان دەکرێت ڕۆڵێکی کاریگەر ببینێت، لە دیاریکردن و وەدیهێنانی ئامانجەکانی گرووپەکە. سەرکردەی سەرکەوتووش ئەوەیە کە گرووپەکە بەرەو لایەکی دروست بە تەواوی ئاراستە دەکات، نەک ئەو کەسە بێت خۆی دەربخات بۆئەوەی سەرکردەی خەڵک بێت.

لە خەسڵەتەکانی سەرکردایەتی کارگێڕی: خواست و گوڕو تین، میتۆدێتی بیرکردنەوە، مێشک کراوەیی، متمانەت بە خەڵک هەبێت، شەفافیەت، دەستپێشخەری،

هاوسـەنگی دەروونـی، متمانـە بەخۆبـوون، توندوتوڵـی و جدی بـوون، گوێرایەڵی و خۆشەویستی، راستڕەوی، سەرڕاستی.

**هەندێ تەکتیک هەن بۆ کاریگەری لەسەر خەڵک، لەوانە:**

- هەڵسوکەوتت نموونەیی بێت.
- روون و راستەوخۆ بە.
- واقیعی و خۆشەویست بە بە.
- ببەخشە و وەربگرە.
- نابێت هەموو گاڵتەیەک بکەیت.
- رێگە بە کارمەندان بدە کار بکەن واتە با هەست بە خۆیان بکەن.

**پرەنسیپەکانی سەرکردایەتیی کارا لە میدیادا:**

ئەو پرەنسیپانەی سەرکردایەتی لەلایەن سەرکردەی میدیاکارەوە رەچاو دەکرێت لە سەرکردایەتیکردنی دەزگا میدیاییەکەی، بۆئەوەی سەرکردایەتییەکەی کارا بێت:

**١- پرەنسیپی تێگەیشتنی خود:**

واتـە میدیـاکار لـە خـۆی تـێ بـگات و لایەنەکانـی کـەم و کورتـی و هێـزی خۆی دەستنیشان بکات، بتوانێت کۆنترۆڵی بکات و، کۆنترۆڵی هەر رەنگدانەوەیەکی نەرێنی بکات کە لەسەر پەیوەندییەکەی لەگەڵ کۆمەڵەی کاردا دروست دەبێت.

**٢- پرەنسیپی بەشداریکردن:**

واتـە سـەرکردەی میدیـاکار سـوور بێت لەسـەر ئـەوەی گرووپەکە لـە پلاندانان، جێبەجێکردن، هەڵسـەنگاندن و بەدواداچوون هۆشیارانە بەشداری بکات، چونکە ئەمە بەشـدار دەبێـت لـە پاڵپشـتیکردنی پەیوەندییە مرۆییەکانی نێوان خـۆی و ئەوان و، لە بەرزکردنـەوەی گیانـی ورە لـە گرووپەکـە و، پەیوەنـدی هاوبەشـی گرووپەکە بەهێز دەکات و ئینتیمای ئەندامان بەرزتر دەکاتەوە.

**٣- پرەنسیپی درککردنی رۆڵ:**

واتە سەرکردەی میدیاکار درک بە رۆڵ و ئەرکەکانی و ئەو بەرپرسیارێتیانە بکات

لـه ئەسـتۆیەتی، بـەو پێیەی سـەرکردەیەکی میدیاکارەو بەسـتنەوەی ئەمە بە ئامانجە پەروەردەییـەکان، بەشـێوەیەک لـە پاڵپشـتیکردنی تواناکـەی لـە پلاندانانـی ئامانجدار بەشدار بێت.

**٤- پرەنسیپی هۆکارە دیاریکراوەکان و هۆکارە ئاستەنگەکان:**

واتە سەرکردەی میدیاکار ئاگاداری هۆکارە دیاریکراوەکان بێت بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەی میدیایی، هەروەها ئەو هۆکارانەی ئاستەنگیشن بۆی، بۆئەوەی سەرکەوتنی بەرنامەکە ئاسان بکات.

**٥- پرەنسیپی گیانی وره:**

واتـە سـەرکردەی میدیاکار هەوڵ بدات گیانی ورە بەرزیـی لای هەموو ئەندامانی گرووپەکە بدۆزێتەوە، بۆئەوەی هەریەکەیان هەست بە بەرپرسیارێتی لە سەرکەوتنیدا بکەن.

**٦- پرەنسیپی ئاگاداربوون لە ژینگە:**

واتـە پێویسـتە سـەرکردەی میدیاکار بە تـەواوی ئاگادارو شـارەزای ئەو ژینگەیە بێـت کـە لەچوارچێوەیـدا کار دەکات، بـە شـێوەیەکی بابەتـی تەواو ئـاگای لە پێوەرو ڕێنمایەکانی بێت.

**٧- پرەنسیپی پێشەنگ و ڕێبازی شاراوە:**

واتە سەرکردەی میدیاکار نموونەی پابەندی بێت و، ئینتیماو پابەندبوون بە یاساو سیسـتەم و ڕێنماییەکان و، بە ئامانجە میدیاییەکان و پەیوەندییە مرۆییەکان ڕێنوێنی بکات لە کارلێک کردن لەگەڵ ئەوانی دیکە.

**٨- پرەنسیپی دەسـەڵاتی سەرکردەیی بەرامبەر دەسەڵاتی سەرکردە:**

واتـە پشتبەسـتنی سـەرکردەی میدیاکار بەو دەسـەڵاتەی لە ئەزمـوون و زانین و پەیوەندییە مرۆییەکان سـەرچاوەی گرتووە، نەک لە یاسـاو سەنتەرەوە، بۆیە وای لێ دەکات توانامەندتـر بێـت لـە کاریگەری لـە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیـەی کارلێکی لەگەڵ دەکات.

**جیاوازی نێوان سەرکردایەتی و کارگێڕی:**

دەکرێ جیاوازی نێوانیان بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

١- سەرکردایەتی بایەخ بە داهاتوو دەدات، بەڵام کارگێڕیی جەخت لەسەر دەسکەوت و ئاست لەئێستادا دەکات.

٢- سەرکردایەتی بایەخ بە ئاراستە ستراتیژییەکان دەدات، بەڵام کارگێڕیی زۆرجار جەخت لەسەر پێوەرە چەندییەکان دەکاتەوە.

٣- سەرکردایەتی شێوازی پێشەنگ پەیڕەو دەکات، بەڵام کارگێڕیی بایەخ بە چارەسەرکردنی کێشەکانی کارکردن دەدات.

٤- سەرکردایەتی گرنگی بە مەشق دەدات، بەڵام کارگێڕیی جەخت لەسەر ئاست دەکاتەوە.

٥- سەرکردایەتی کارکردن لەگەڵ کارمەندان بە رۆحییەتی تیم، بەڵام کارگێڕیی بایەخ بە یاساو سیستەمەکان دەدات.

٦- سەرکردایەتی جەخت لەسەر پەیوەندییە مرۆییەکان دەکاتەوە، بەڵام کارگێڕیی بەکارهێنانی دەسەڵات.

٧- سەرکردایەتی رەچاوکردنی کارمەندان و پێداویستیەکانیان و بارودۆخی تایبەتییان، بەڵام کارگێڕیی لاوازی بایەخدان بە کارمەندان.

بۆیە میدیاکار کاتێک لەگەڵ فەرمانبەرەکانیدا مامەڵە دەکات، دەبێت سەرکردە بێت نەک بەڕێوەبەر.

**جۆرەکانی سەرکردایەتی میدیا:**

دابەشکاری جۆراوجۆر بۆ جۆرەکانی سەرکردایەتی هەیە، دابەشکردنێکی باو هەیە کە سەرکردایەتی بۆ سێ جۆری سەرەکی پۆلێن دەکات، (کیرت لیڤین) چەشنەکانی سەرکردایەتی میدیایی بەم جۆرە دیاری کردووە:

١- سەرکردایەتی دەسەڵاتخوازی: سەرکردەی میدیاکار بە تەنیا بریار دەدات.

٢- سەرکردایەتی دیموکراتی یان بەشدار: سەرکردەی میدیاکار بە ئارەزوومەندی

و بڕوا پێ هێنان کار دەکات و، هانی ئەندامان دەدات بڕیارەکە بدەن.

٣- سەرکردایەتی ئاراستە نەکراو یان ئاژاوەگێڕی: سەرکردەی میدیاکار دەستبەرداری دەسەڵاتی بڕیاردان دەبێت و دەچێتە ئاستی راوێژکاری گرووپەکە، ئیتر بە شێوەیەکی راستەوخۆ کۆنترۆڵی ئەندامان ناکات و، هەوڵ نادات بە ناڕاستەوخۆ کار بکاتە سەریان، ئەمەش شێوازێکی کردەیی بۆ سەرکردایەتی نییە، چونکە هانی هەڵاتن لە بەرپرسیارێتی دەدات.

لێرەدا روونکردنەوەیەک بۆ شێوازەکانی پێشووی سەرکردایەتی میدیایی دەخەینەڕوو:

هۆکاری بەراورد سەرکردایەتی دیموکراتی (قەناعەتپێکەر)ی میدیایی سەرکردایەتی دکتاتۆری (سەرکوتکار یان دەسەڵاتخوازی یان ئوتۆکراتی) میدیایی سەرکردایەتی سەربەستی (ئاژاوەیی یان گێرەشێوێنی)

کەشی کۆمەڵایەتی - پێویستییەکانی سەرکردەو ئەندامان تێر دەکات.

- لە نێو تاکەکاندا ڕێزگرتنی هاوبەش هەیە.

- سیاسەتەکان لە ئەنجامی گفتوگۆی بەکۆمەڵ دیاری دەکرێن. - دکتاتوری، دەسەڵاتسەپێنی.

- ئیستیبدادی ئوتۆکراتی

- پەیوەندی نێوان سەرکردەو ئەندامانی بە زۆر دروست دەکرێت. - پشێوییە، ئەندامانی گرووپەکە و سەرکردە ئازادییەکی رەها یان بە بێ رێککاری هەیە.

سەرکردە - لە گفتوگۆ بەکۆمەڵەکاندا بەشدارەو هانی ئەندامان دەدات گفتوگۆو هاوکاری بکەن.

- ئازادی دابەشکردنی کار لەنێوان تاکەکاندا بۆ گرووپەکە بەجێ دێڵێت.

- هانی رەخنەگرتنی خودی دەدات. - خۆی بەتەواوی شتەکان دیاری دەکات و هەنگاوەکانی کارکردن و چالاکییەکان دەستنیشان دەکات.

- جۆری کار بۆ هەر کەسێک دیاری دەکات.

- فرمانی زۆر دەردەکات کە پێچەوانەی ویستی گرووپەکەیە.

- هەمیشە بەجێی سەرنجی گرووپەکە دەمێنێتەوە. - بێلایەنە، مەگەر بە جدی نەبێت دەنا بچوکترین بەشداریشی نابێت.

- پەتەکە بە بەرەلایی بۆ تاک و گرووپەکە بەجێ دەهێڵێت.

- هەوڵ نادات بۆ باشکردنی کار.

- پیاهەڵدان و سەرکۆنە ناکات.

تاکەکان - هەریەکەیان هەست بە گرنگی بەشدارییە ئەرێنییەکەی لە کارلێکی کۆمەلایەتی دەکات.

- ئازادی هەڵبژاردنیان بۆ دەڕەخسێنێ.

- ئەمانە زیاتر حەزیان لە کارکردنە.

- هەریەکەیان بەپێی تواناکانیان سوودیان لێ دەبینرێت.

- گرووپەکە پێکەوە بەستووترن. - کارەکەی هەنگاو بە هەنگاو جێبەجێ دەکات، بەشێوەیەک نازانن هەنگاوی دواتر یان پلانەکە بەتەواوی چییە.

- ئازادی هەڵبژاردنیان بۆ هاوڕێیانی کار نییە، بەڵکو سەرکردە کارو هاوڕێیانی کار دەستنیشان دەکات. - هاوڕێیان و هاوپیشەکانی بە ئازادییەکی تەواو کار هەڵدەبژێرن.

جێهێشتنی سەرکردە بۆ شوێنەکەی یان ئەگەر لابرا - بەرهەم و کار بە ئامادەنەبوونی وەک ئەوە دەبێت کە ئامادە بووبێت. قەیرانێکی توند روودەدات کە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی گرووپەکە یان دابەزینی گیانی ورە. بەرهەم بەبێ ئامادەبوونی مادی دەبێ یان زۆر کەمترە لەوەی خۆی لەوێ بووبێت، بەپێی بارودۆخی کارلێکی کۆمەلایەتی.

رەفتاری کۆمەلایەتی - بەوە جیا دەکرێتەوە کە هەست بە متمانەیەکی ئاڵوگۆڕو خۆشەویستی لەنێوان ئەندامانددا هەیە لەگەڵ سەرکردەدا.

- هەست بە سەقامگیری و لێپرسینەوەو ئارامی دەروونی تێدایە. - بەوە جیا دەکرێتەوە کە گیانی شەڕانگێزی و رەفتاری تێکدەرانە و، زۆری گفتوگۆ یان

ملکەچکردن و نەرێنی و کەموکوڕی پێوە دیارە.

- تاکەکان هەست بە کەموکوڕی دەکەن و زیاتر پشت بە سەرکردە دەبەستن و، ریایی و مەرایی بۆ سەرکردە زیاتر دەبێ. - متمانەی ئاڵوگۆڕو خۆشەویستی لەنێوان تاکەکاندا لەگەڵ سەرکردە نامێنێت.

- بێزاریی و دڵەڕاوکێ بە ئاستێکی نامێنێت.

**ئەو هۆکارانەی شێوازی سەرکردەی میدیاکار دەستنیشان دەکات:**

ئەو هۆکارەی لەسەر ئەو بنەمایە شێوازی سەرکردایەتی بونیات دەنرێت، کەسایەتی سەرکردەو ئەوەی حەزی لێیەتی لە دەسەڵاتخوازی یان ئازادیخوازی، هەروەها هەندێ هۆکاری دیکە کە شێوازی سەرکردایەتی دیاری دەکات:

١- هۆکاری تەمەن: لەوانەیە باشتر بێت شێوازی سەربەستی بگیرێتەبەر، کە لەسەر بنەمای ئازادی کارکردنە لەگەڵ بەساڵاچووواندا، لەکاتێکدا شێوازی ئوتوکراتی بۆ تەمەن بچوکەکان گونجاوترە.

٢- هۆکاری رەگەز: لەوانەیە باشتر بێت شێوازی ئوتوکراتی لەگەڵ نێرەکان و، شێوازی دیموکراتی یان سەربەستی لەگەڵ مێیەکاندا بەکاربێت.

٣- هۆکاری ئەزموون: دەکرێ شێوازی دیموکراتی یان سەربەستی لەگەڵ ئەندامانـدا بەکاربێت، ئەوانەی ئەزموونێکی زۆریان هەیە، لەکاتێکدا لەوانەیە باشتر بێت شێوازی ئوتوکراتی لەگەڵ ئەوانە بەکار بێت کە تازە دەستیان بە کار کردووە.

٤- هۆکاری کەسێتی: شێوازی دیموکراتی لەگەڵ کەسێک بەکەڵکە کە هاریکار بێت و بیرکردنەوەی بەکۆمەڵیانەی هەبێت، بەڵام شێوازی ئوتوکراتی لەگەڵ کەسێکی شەڕانگێز بەکەڵک دێت و، شێوازی سەربەستی لەگەڵ ئەو کەسایەتیانە باشە کە رەچەیەکی تاکرەوییان تێدایە، وەک گۆشەگیرەکان کە حەز دەکەن بەتەنیا کار بکەن و رکیان لە پەیوەندیکردنە بە کەسی دیکەوە.

٥- را نەهاتن لەسەر شێوازی دیموکراتی: نەتوانینی ئەندامان بۆ کارکردن لە کەشێکی دیموکراتی، لەوانەیە پێویست بە بەکارهێنانی شێوازی ئوتوکراتی بکات.

**خەسڵەتە کەسییەکانی سەرکردەی میدیاکار:**

پێشینەکان لیستێکیان داناوە کە ژمارەیەک خەسڵەتی سەرەکی کەسیی سەرکردەی کۆمەڵەی لەخۆگرتووە، بریتین لەوەی: هاوسـەنگ بێت، توانای جیاکردنەوەی هەبێت، خـاوەن منـی بەهێـز بێت، لـە دڵەڕاوکێـی زیـاددا یاخی بێـت، خەیاڵی هەبێـت، توانای پێشـبینی هەبێـت، هاوسـۆز بێت، حەزی لـە یارمەتیدانی خەڵک بێـت هەروەها توانای بەرگەگرتنی شکستی هەبێت.

دەکرێ هەندێ کەس مشـتومڕ بکەن بەوەی خەسـڵەتەکان بۆ هەر سەرکردەیەکی میدیـاکار پێویسـتن. ئەمـە راسـتە، بـەڵام سـەبارەت بـە سـەرکردەی میدیـاکار، ئەوا ئـەم خەسـڵەتە کەسـییانە لـە دەزگا گـەورە میدیاییـەکان گەورەترو گرنگتـرە، چونکە سـەرکردەی میدیاکار پێویسـتی بەوەیە لەو کاتە بۆ یەک کەس دەربکەوێت، لەکاتێکدا پرۆسەی مامەڵەکردن لەگەڵ ژمارەیەک لەو کەسانەی لەهەمان کاتدا هەن، سەرکردەی میدیـاکار دەکـرێ بـە بەرەنگاری و دژایەتییەکی کراوەو، گۆڕین و، پشـت پێ بەسـتن روبەڕووی بێتەوە.

هەمـوو ئەمانـە لـە تەنهـا یەک کەسـەوە نییـە بەڵکو لـە چەند کەسێک و لەهەمان کاتدایە. دواجار سـەرکردەی میدیاکار پێویسـتی بەوەیە بتوانێ گرنگی بە هەر تاکێک لـەو دەزگا گـەورە میدیاییانـە بـدات، دەبێت خۆی بۆ قووڵترین ئاسـت تـێ بگەیەنێت، لەوانەیە لە سەرکردەی میدیاکار لە دەزگا بچووکە میدیاییەکانیش زیاتر بێت.

لێـرەدا هەنـدێ خەسـڵەتی گرنـگ روون دەکەینـەوە کە بـە سـەرکردایەتی کارای میدیاوە پەیوەسـتە، کە بوونی یان نەبوونی، ئاسـانکاری یان ئاستـەنگ بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی دامەزراوەی میدیایی دروست دەکات، ئەمەش ئەو خەسڵەتانەیە:

**١- ئامادەبوون:**

سـەرکردەی میدیـاکار لـەڕووی هەڵچوونـەوە ئامادە بێت، واتە خۆشـی و ئازاری ئەوانـی دیکـە کاری لێ بـکات. ئەگەر سـەرکردەکان لەگەڵ کاردانـەوەی ئەوانی دیکە هاوهەسـت بـن، ئـەوا لـەڕووی هەڵچوونەوە زیاتـر لەگەڵیان تێکەڵ دەبـن، ئەمەش وا

لــە ســەرکردەی میدیاکار دەکات توانــای نزیکبوونەوەی لــەم ئەزموونانەی هەبێت و، بەئاسانی لەگەڵ ئەندامانی گرووپەکە هاوسۆز بێت و بەزەیی پێیان بێتەوە.

**٢- هێزی کەسایەتی:**

هێزی کەسێتی بریتییە لە متمانە بەخۆبوون و، ئاگابوون لە ئاستی کاریگەری تاک لەســەر ئەوانــی دیکــە، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ســەرکردەی میدیاکار ئەوانی دیکە بۆ خۆی دەقۆزێتەوەو بەسەریاندا زاڵ بێت، چونکە ئەگەر هێزی بەکارهێنا ئەوا زیانی پێ دەگەیەنێت. سەرکردە میدیاکارە بەهێزە دڵسۆزەکان ئەو کاریگەرییە بەکاردەهێنن کــە لەســەر بەشــدارانی گرووپەکــە هەیانــە، بۆئــەوەی هانیــان بدەن تاکــو لەگەڵ وزە بەکارنەهێنراوەکانیان پەیوەندی ببەستن، نەک بۆ پاڵپشتی پشت بە خۆبەستن، چونکە هێـزی کەسـایەتی هەمیشــە متمانــە بەخۆبوون و هۆشــیاری و درککردنــی لەگەڵدایە، بەوەی تاک پێویســتی بەوە نییە ئەوانی دیکە لە ئاســتێکی نزمدا بن، تاکو پارێزگاری لە هێزەکەی بکات.

**٣- ئازایەتی:**

ســەرکردەی کارای میدیـاکار بەئاگایە لەوەی پێویســتی بەوەیــە ئازایەتی بنوێنێت، لــە کارلێکــی لەگــەڵ ئەندامانــی گرووپەکــە لــەو دەزگا میدیــاەی کاری تیــا دەکات و، ناتوانێت لە پشــت رۆڵی تایبەت بە ســەرکردەی بە تەنیا خۆی بشــارێتەوەو، لەمیانەی رەچاوکردنی مەترسییەکان لە گرووپەکە و داننان بە هەڵەکاندا دەربکەوێت و، لەمیانەی روبەڕوبوونەوەی ئەوانی دیکەدا لەگەڵ بایەخ و ئاماژەدان بە کاردانەوەکانی بەرامبەر ئــەوەی روبــەڕووی دەبێتەوە، لەرێگەی بەشــداریکردن لەگەڵ گرووپەکە بە بیرۆکە و هەستەکانی لەبارەی پرۆسەی گرووپەکە.

**٤- ئیرادە بۆ روبەڕوبوونەوەی خۆی:**

ئازایەتی تەنیا بەو رێگایانە جێبەجێ نابێت کە سەرکردە لەگەڵ ئەندامانی گرووپەکە مامەڵەی پێ دەکات، بەڵکو بەو رێگایانەش کە لەگەڵ خۆی مامەڵەی پێ دەکات، چونکە یەکێــک لــە ئەرکە ســەرەکییەکانی ســەرکردە ئەوەیــە لای ئەندامانــی گرووپەکە خۆی ئامادەباش دەکات، لەبەرئەوەی ســەرکردەی میدیاکار چاوەڕوان ناکات بەشداربووان

شتگەلێک ئەنجام بدەن کە خۆی ئامادەیی بۆی نییە، بۆیە دەبێت ئیرادەی لێپرسینەوە لە خۆی نیشان بدات، روبەڕوبوونەوەی خودیش ئەم جۆرە پرسیارانە و وەڵامدانەوەیان لەخۆدەگرێت:

١- لەبەرچی من سەرکردایەتی کۆمەڵەکان بکەم و لەم چالاکییە چیم دەست دەکەوێت؟

٢- لەبەرچی بەم شێوازە لە چەند کۆمەڵگەیەکدا مامەڵە دەکەم؟ ئەی کاریگەری ئاراستەکەم، بەهاکەم، جیاکارییەکەم، هەستەکەم و رەفتارەکەم لەسەر ئەندامانی گرووپەکە چییە؟

٣- ئەو پێویستییانەم چییە کە تێر دەبن ئەگەر سەرکردەی گرووپەکە بم؟ تا چ ئاستێکیش؟

٤- ئایا ئەو کۆمەڵانەی کە سەرکردایەتییان دەکەم، بۆ تێرکردنی پێویستییە تایبەتییەکانم لەسەر حیسابی پێویستی ئەندامان بەکارم هێناون؟

وەڵامی سادە بۆ ئەو پرسیارانەی پێشوو نییە، مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە سەرکردە ئامادە بێت بەردەوام پرسیارگەلێک بورووژێنێت، بۆ دیاریکردنی راستگۆییەکەی لەگەڵ خۆی کە ئاستی پاڵنەرییەکەی چەندە بەو پێیەی سەرکردەی دامەزراوەیەکی میدیایە، دواجار روبەڕوبوونەوەی خود پرۆسەیەکی بەردەوامە.

**٥- هۆشیاربوون بەرامبەر بە خود:**

هاوتای خەسڵەتی ئامادەباشییە بۆ روبەڕوبوونەوەی خود، ئەم خەسڵەتە بۆ سەرکردەی کارا سەرەکییە، کە پێویستە سەرکردە درک بە پێویستییەکانی، ململانێ کەسییەکان، کێشەکان، ناوەندەکانی هێز، لاوازی و کاریگەری چاوەڕوانکراو بۆ هەموو ئەو کێشانە بکات لەسەر پرۆسەی گرووپەکە. سەرکردە بایەخمەندەکان لە بەکارهێنانی ئەندامانی گرووپەکە دوور دەکەونەوە، بۆئەوەی پێویستییە تایبەتییەکانیان دەستەبەر بکەن و، پاڵپشتی منی تایبەت بە خۆیان بکەن.

**٦- دڵسۆزی:**

یەکێک لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی سەرکردە، بایەخدانی راستگۆیانەیە بە

بەرژەوەندی ئەوانی دیکە، دڵسۆزی سەرکردە دەبێت ڕاستەوخۆ بێت و، بە ئەندامانی گرووپەکە بڵێ ئەو شتە چییە کە حەز ناکەن بیبیستن. سەبارەت بە سەرکردەی میدیاکار، بایەخدان واتە داواکردن لە ئەندامان تەماشایەکی چەند بەشێکی ژیانیان بکەن، کە لەوانەیە بیانەوێ ڕەتی بکەنەوەو، هان نەدانی هیچ شێوە ڕەفتارێکی ناڕاستگۆیانە لای ئەندامانی دامەزراوە میدیاییەکەی.

### ٧- ڕەسەنایەتی:

ئەم خەسڵەتە بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزییەوە پەیوەستە، چونکە کارایی پێویست دەکات سەرکردە کەسێکی ڕەسەن و واقیعی و گونجاو ڕاستگۆ بێت، بە سیماکان نەژیت و لە پشت دەمامکەکان خۆی نەشارێتەوەو، میکانیزمی دەروونی بەکار نەهێنێت یان پەنا بۆ درۆ نەبات، کە میکانیزمێکە (کۆمەڵی فروفێڵی دەروونی مرۆڤە بۆ ڕزگاربوون لە هەڵویستە تایبەتییەکانی بەشێوەیەکی نەستیانە پەنای بۆ دەبات وەکو شەڕانگێزی، گەڕانەوە بۆ قۆناغی منداڵی.. هتد). ڕەسەنایەتی پێویستی بە ئیرادەیە تاکو تاک بەشێوەیەکی گونجاو خۆی ئاشکرا بکات و، لەو هەست و کاردانەوانە بەشدار بێت کە بەسەر گرووپەکەدا دێ.

### ٨- هەستکردن بە شوناس:

ئەگەر سەرکردە دەیەوێ یارمەتی ئەوانی دیکە بدات بۆئەوەی خۆیان ئاشکرا بکەن، ئەوا پێویستی بەوەیە هەستێکی ڕوونی لەبارەی شوناسەکەیەوە هەبێت، ئەمەش واتا زانینی بەهاکانی کەسەکە و ژیان بە یارمەتی پێوەرگەلێکە لەڕووی خودییەوە لە هەمان کەس سەرچاوەی گرتووە، نەک بەهۆی ئەوەی ئەوانی دیکە لێی چاوەڕوان دەکەن. هەروەها واتای ئەوەیە هۆشیار بێت لەو شتانەی هەیەتی وەک هۆکارەکان، پێویستی، مەترسی، پاڵنەرو ئامانجەکان. دواجار واتە زانینی ئەوەی کەسێک دەتوانێت بیزانێت و، ئەوەی کەسەکە لە ژیانیدا دەیەوێ و، چۆن ئەو شتەی دەست دەکەوێ کە دەیەوێ.

### ٩- متمانەکردن بە کاری بە کۆمەڵ:

باوەڕی زۆری سەرکردە بەو بەهایانەی بە کاری گرووپی تایبەتن، بۆ سەرکەوتنی

گرووپەکە زۆر پێویستە. هەروەها ئەندامانی گرووپەکە دەبێت باوەڕیان بە گرنگی و بەهای کاری میدیا هەبێت.

**١٠- گوڕو تین:**

سەرکردە پێویستی بەوەیە وای دەربخات لە کارەکەیدا لەگەڵ ئەندامەکان لە دەزگای میدیادا ئاسوودەیە و، پێی خۆشە بەردەوام لەگەڵیاندا بێت. واتە دەبێت گوڕو تینی کارکردن نیشان بدات، چونکە سەرکردە بەبێ گوڕو تین دەبێتە کەسێکی رۆتینی، دواجار نەمانی گوڕو تین لای سەرکردە بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئەندامەکان رەنگ دەداتەوە، بەمەش دانیشتن بۆ کۆبوونەوەکانی گرووپەکە سەرنجڕاکێش نابێت و، لە توانایان بۆ ئەنجامدانی کارە گرنگەکان رەنگ دەداتەوە.

**١١- توانای داهێنانکاری و ئەفراندن:**

سەرکردە داهێنەرەکان دەتوانن لەگەڵ خۆیان و ئەوانی دیکە لە گرووپەکەدا کراوە بن، هەروەک بۆ ئەزموونە تازەکان و، شێوازگەلی ژیان و بەهاگەلێکی جیاوازە لەوەی هەیانە کراوەن، دواجار پێویستە بیرۆکەی تازەو پێگەیشتوو بە گرووپەکە بدەن، دەبێت لە کەوتنە داوی شێوازە نەریتییەکانەوە دوور بکەونەوە.

**١٢- توانای بەرگەگرتن:**

بەو پێیەی سەرکردەی میدیاکار لەوانەیە لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە شەکەت بێت، بۆیە پێویستە شێوازگەلێک بدۆزێتەوە، تاکو لە بەرنامەکانی تایبەت بە دەزگا میدیایەکە زیندوو دیار بێت، دواجار ئەوان پێویستیان بەوەیە ئاگایان لە ئاستی وزەکانیان بێت و، سەرچاوەگەلێکیان بۆ خۆراکی دەروونی (واتە پێویستییەکانی پیشەکەیان) هەبێت، هەروەها ناچاریان دەکات بە باشی بایەخ بە خۆیان بدەن.

١٣- درککردنی سەرکردە بە لایەنی رۆشنبیری خۆی:

سەرکردەی میدیاکار نابێت لایەنی رۆشنبیری تایبەت بە خۆی فەرامۆش بکات، چونکە ئەو وەک هەر مرۆڤێکی دیکە تاکایەتی و جیاکاری خۆی هەیە، سەرەڕای بەشداریکردنی لەگەڵ تاکەکانی دیکە لە هەندێ خەسڵەتی گشتی، کە لەڕێگەیەوە دەتوانێ لەوانیتر نزیک بێتەوەو، لەگەڵیاندا تێکەڵ بێت و بگونجێت، ئەمەش وەک

سۆزو نیانی و ڕێزگرتنی ئەوانی دیکەو، درککردنی هەستە هاوبەشەکان، کە یارمەتی دەدەن لە ئەندامانی کۆمەڵە میدیاییەکەی تێ بگات.

### ١٤- توانای زاڵبوون بەسەر هێرشی ئەوانی دیکە:

جاری وا هەیە ڕوودەدات سەرکردەی میدیاکار لە ڕەوشێکدا بێت، نەتوانێت ڕۆڵەکەی بە باشترین شێوە ئەنجام بدات، بە هۆی هەندێ هەڵوێست کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، یان بەهۆی هەندێ لایەنی کەسیی کە وەریگرتووە، وەک ئاسانی هەڕەشەکردن لە سەرکردە لەلایەن ئەوانی دیکە و، ئاسانی کاریگەربوون بەوەو، هەست نەکردن بە ئاسایشی دەروونی لە کاردا، هەستیاری زیادی سەرکردە بەرامبەر ئەو ڕەخنە و بەدواداچوونانەی لەلایەن ئەوانی دیکەوە ڕووبەڕوو دەکرێتەوەو، ڕووبەڕووبوونەوەی توندی ئەندامانی گرووپەکە یان هەندێکیان لە هەندێ جاردا بەرامبەر سەرکردەی گرووپەکە، لەبەرئەوەی گوایە لە دانیشتنەکاندا سەرکردەکە بەشێوەیەکی تەواو بایەخ بە خۆیان و کێشەکانیان نادات.

### ١٥- هەستکردن بە کەیفخۆشی و کرانەوە:

کاری میدیا کارکردنێکی جدییە، بەڵام ئەمە لە نەبوونی کەیفخۆشی و کرانەوە ڕێگر نییە و، قۆستنەوەی ئەم لایەنە بەمەبەستی ئاسوودەبەخشین و دوورخستنەوەی هۆکاری ساردیی لە کاری میدیا، ئەم کارە هەستکردن بە گرژیی و وەڕسیی لای ئەندامەکان کەم دەکاتەوە. سەرکردەی گرووپەکە پێویستی بەوەیە کراوەو نەرم و نیان بێت، متمانەی بەخۆی هەبێت و، متمانەیەکی زۆری بە تاکەکان و بە پرۆسەی گرووپەکە هەبێت.

#### کارامەییەکانی سەرکردەی میدیاکار:

سەرکردەی میدیاکار کە کاری کارگێڕیی دەکات و سەرپەرشتی دەزگایەکی میدیا دەکات، پێویستە چەندین کارامەیی هەبێت، کە هەندێکیان پەیوەندی بە مامەڵەکردنییەوە لەگەڵ میدیاکاران هەیە و، هەندێکیان پەیوەندی هەیە بەو بەرنامەیەی دەزگا میدیاییەکە پێشکەشی دەکات کە کاری پێ دەکات، سەبارەت بە گرنگی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی

دیکەو کارامەییەکانی پەیوەندیکردنیش، هەندێ کەس زیادەڕۆیی دەکات لەوەی دەڵێت، گرنگترین ئەرک بۆ سەرکردەی میدیاکار توانایەتی لە پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەوانی دیکە. ئەم رایە پشت دەبەستێ بە ئەنجامی ئەو توێژینەوانەی دووپاتیان کردۆتەوە، سەرکردەی میدیاکار ٨٠٪ی کاتەکەی لە کاری میدیا بە پەیوەندیکردنەوە بەسەر دەبات، چونکە ئەو گوێ دەگرێت و قسە دەکات و دەخوێنێت و یاداشت و راپۆرت دەنووسێت. پەیوەندیکردنیش چەندین سوودی هەیە لەوانە:

١- ئاراستەی رەفتاری ئەندامەکان بەرەو ئامانجە ویستراوەکان.

٢- دەستەبەرکردنی زانیاری و گواستنەوەی بۆ ئەندامەکان لە گرووپەکە.

٣- نزیکبوونەوە لە نێوان بیرۆکەو چەمکی ئەندامانی و گەشەسەندنی کەشی کارلێککردن لە نێوانیاندا.

٤- تێرکردنی پێویستییەکانی مرۆڤ و گەشەپێدانی توانا جۆراوجۆرەکان و زیادبوونی رۆشنبیری.

٥- زیادبوونی ئاستی دەستەواژە پیشەییەکان لای میدیاکاران.

## لەوانەیە پەیوەندیکردن لەڕووی فۆرمەوە جەستەیی بێت یان زارەکی یاخود نووسرا بێت:

پەیوەندیکردنی جەستەیی پەیوەندیکردنی بێژەیی پەیوەندیکردنی نووسینکاری کاردانەوە پێچەوانەکان روون دەکاتەوە. گیانی هاریکاری و هاوڕێیەتی بەهێز دەکات. گەڕانەوە بۆی ئاسان دەکات تاکو بەرپرسیارێتی دیاری بکرێت.

کار لە گیانی ورەی ئەندامەکان دەکات، چونکە کردەکان بە دەنگێکی بەرزتر لە وشەکان دەدوێن. گرژیی و فشارەکان ناهێڵێت لە ئەنجامی دەرکردنی ئەوەی لە دڵاندا هەیە. زانیارییەکان دیکۆمێنت دەکات بۆ سوودبینین لێی لە داهاتوودا.

کاریگەرییەکی زۆری هەیە لای ئەندامەکان لە میانەی: ئاماژەکردنەکان، جووڵەکانی سیما، بێدەنگی- تووڕەیی و هەڵچوون، سڵاوکردن بە دەست، بزە. هانی ئاڵوگۆڕکردنی پرسیار دەدات بۆیە لە نزیککردنەوەی چەمکەکاندا کاریگەرە. گواستنەوەی زانیاری و

وەڵام بۆ ژمارەیەکی زۆر لە میدیاکاران دەستەبەر دەکات، لەوانە: راپۆرت، یاداشت، بڵاوکراوە، ئامرازە روونکەرەوەو وێنە روونکارییەکان.

**لە بنەماکانی پەیوەندیکردنیش کە پێویستە رەچاو بکرێن، ئەمانەن:**

١- تەماشاکردنی ئەو کەسەی قسەت بۆ دەکات، هاندانی پرسیارکردن، نەپچڕاندنی قسەکەر، ئەگەر ناچار بوویت قسەکانی ببڕی ئەوا بابەتەکە نەگۆڕیت، گوێگرێکی باش بە، توانای بەڕێوەبردنی کاتت هەبێت.

٢- گوێگرتن بە وردی و تێگەیشتن لەو پەیامەی کە ئەوانی دیکە بۆتی دەگوازنەوە.

٣- روونی و دەستنیشانکردن: بە دەوری بابەتەکە مەسووڕێوەو بە تەمومژاوی مەدوێ، ئەگەر باست لە شتێکی گشتی کرد با شتێکی دیاریکراوت هەبێت کە مەبەستەکەت روون بکاتەوە.

٤- لە بیرت بێت کە وشەکان بریتین لە هێماگەلێک، هەرچەندە زانین و زانیاریمان لەبارەی ئەو پرسانە زیاتر بێت کە قسەی لەبارەوە دەکەیت، توانای کاریگەری و قەناعەتکردنمان زیاتر دەبێت.

٥- هەڵبژاردنی وشەو چەمک و بیرۆکەکان کە وا دەکەن کارلێکت لەگەڵدا بکەن لەسەر بنەمای ئەو باکگراوەند و زانینەی هەیانە.

٦- پرسیارکردن پاشان بوار بە فەرمانبەرەکان بدرێت، ئەوەی لە واقیعدا تێی گەیشتوون راستە دووپاتی بکەنەوە. (ئایا تۆ مەبەستت ئەوە بوو..)، (ببوورە. تۆ بایەخ بە....دەدەیت).

٧- نەترسان لە وتنی (من نازانم): زۆربەمان شتێکی کەم لەبارەی ئەم جیهانە دەزانین کە تیایدا دەژین و، خۆنیشاندان بە وەڵامدانەوە یان هەڵبەستنی، ئەوا متمانە لەدەستدانی ئەوانی دیکە بە ئێمە و بە خۆیان زیاتر دەبێت.

٨- دوورکەوتنەوە لە وەستان لە داوی دەستەواژەی (یان/ یاخود)، چونکە زۆر لە شتەکان لە ژیاندا، بە سادەیی ناچنە پۆلێنی رەش و سپییەوە.

٩- هەوڵدان بۆ دەربڕینی بیرۆکەکان لە شوێن و کاتی پێویست.

**ئەو کارامەییانەی دەکرێ سەرکردەی میدیاکار بەکاریان بهێنێت:**

**١- توانای پلاندانان:**

هەر خولەکێک لە کاتەکەمان بۆ پلاندانان بەسەری دەبەین، لە جێبەجێکردندا چوار کاژێرمان لێ دەبات، پلاندانان یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی سەرکردەی میدیاکار، لەم ڕێگەیەوە سەرکردەی میدیاکار هەندێ پێشبینی لەبارەی ڕەوشەکە لە داهاتوودا دەکات، پاشان دانانی پلانەکە ئامانجە ویستراوەکان بۆ وەدیهاتنی لە ماوەیەکی دیاریکراودا ڕوون دەکاتەوە، لەگەڵ هەڵسەنگاندنی پێویستییە داواکراوەکان بۆئەوەی ئەم ئامانجانە بە کارایی وەدی بهێنرێن. سوودەکانی پلاندانانیش بریتین لە:

- ئامادەباشی بۆ قەیرانەکان.
- بەرزکردنەوەی توانای ئەندامانی گرووپەکە، بە دیاریکردنی ئەرک و بەرپرسیارێتی داواکراو لێیان.
- هەستکردن بە گیانی تیم و بەشداریکردن لە نێوان ئەندامەکاندا.
- یارمەتیدان بۆ گەشە و پێشخستنی ئەندامەکان.

**٢- گوێگرتنی کارا:**

وریابوون لە سیما زارەکی و نازارەکییەکانی پەیوەندیکردن بەبێ دەرکردنی بڕیار یان هەڵسەنگاندن.

بەکاردەهێنرێت بۆ هاندانی متمانە و، ئاشکراکردنی خودو دۆزینەوەی خود لەلایەن ئەندامانەوە.

**چەند بنەمایەک هەیە بۆ گوێگرتن:**

- سەرکردەی میدیاکار لە مانا شاراوەکانی دەستەواژەکانی میدیاکار تێ بگات.
- گوێ ڕادێران لە خاڵە دووبارەکان لە باسی گوێگرتن.
- گوێ ڕادێران بە ئەرێنی (زارەکی و نازارەکی).
- ڕێزگرتنی زمانی ئەندامەکان.

**٣- لێدوان، دووبارە دارشتن:**

وتنی هەندێ وشەی جیاواز لەوەی فەرمانبەرەکە وتوویەتی بۆئەوەی ماناکە ڕوون

بکاتەوە. بۆ دیاریکردنی ئەوەی ئایا سەرکردەکە بە وردی لە رستەکانی فەرمانبەرەکە تێگەیشتووەو، بۆ زیادبوونی مانای مەبەستدار لە دەستەواژەکەیدا.

**٤- روونکردنەوە:**

درککردنـی گەوهــەری پەیامەکە لەســەر ئاســتە هەسـتی و بیرکردنــەوەکان، واتە سادەکردنەوەی رستەکانی فەرمانبەرەکە لەمیانەی جەخت کردنەوە لەسەر گەوهەری پەیامەکـە. یارمەتیدانــی ئەندامــەکان لە هەڵاوێرکردنی هەسـت و بیرۆکـە ململانێکارو شڵەژاوەکان، بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی مانادار لەبارەی ئەوەی گەیەنراوە.

**٥- پوختکراوە:**

هاریکاری لە دیاریکردنی هۆکارە گرنگەکان لە کارلێک کردن لەگەڵ فەرمانبەرەکان و، بەکاردەهێنرێت بۆ دوورکەوتنەوە لە بەشـکاری و پێدانی ئاراسـتەیەک بە گفتوگۆ، بۆئەوەی بەردەوامیتی و مانا دەستەبەر بکات.

پوختکردنەوەی ئامانجی ئەوەیە:

- دەستپێکردنی کارلێک لەگەڵ فەرمانبەرەکان و کۆتایی پێهێنانی.
- کاتێک سـەرکردەی میدیاکار بیەوێ هەڵچوونەکانی کارمەندان ئارام بکاتەوە.
- کاتێک سـەرکردەی میدیاکار بیەوێ لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە بچێت.
- پێداچوونەوەی بابەتێکی دیاریکراو لەگەڵ ئەندامان لە دەزگا میدیاییەکە.

**٦- پرسیارکردن:**

خسـتنەڕووی پرسـیاری کـراوە کە دەبێتە هـۆی دۆزینەوەی خـود لەبارەی (چی و چـۆن) روویـدا، یـان زانیارییـەکان گواسـترایەوە، یـان سروشـتی کارلێکـی نێـوان فەرمانبـەرەکان. بـۆ گەیشـتن بـە گفتوگۆیەکـی زیاتـر و، دەسـکەوتنی زانیـاری بـۆ وروژاندنـی بیرکردنــەوەو، بـۆ زیادبوونـی روونــی و جەخـت کردنــەوە، کە خودی میدیایی لای فەرمانبەرەکان زیاتر دەدۆزێتەوە.

**٧- روبەڕوبوونەوە:**

هاندانـی بەشـداربوان بـۆ تەماشـاکردنی لێـک نەچـوون لـە نێـوان قسـە و هەڵسـوکەوتەکانیان، یـان لـە نێـوان پەیامــە جەسـتەییەکان و پەیوەندیکردنی زارەکی

و، ئاماژەدان بە زانیاری یان پەیامە ململانێکەرەکان کە بۆ کۆمەڵگە و جەماوەر دەیگوازنەوە. بۆ هاندانی گەڕانی خودیی راستگۆو، بەکارهێنانی هەموو ئەگەرەکان و، بۆ زیادبوونی هۆشیاری تاک بە لێکنەچوونە خودییەکان تاکو لێی دوور بکەوێتەوە.

**٨- پێچەوانەی هەستەکان:**

پەیوەندیکردنی تێگەیشتن بۆ ناوەڕۆکی هەستەکان لای فەرمانبەران، لە بواری میدیادا. تاکو ئەندامەکان بزانن گوێیان لێ گیراوەو تا ئەودیوی چوارچێوەی ئاستی قسەکردن، تێیان گەیشتراوە پاشان بۆ ئەنجامدانی ئەرکە میدیاییەکانیان بەگوڕو تین دەبن.

**٩- پاڵپشتی:**

دەستەبەرکردنی هاندان و پاڵپشتی فەرمانبەران لەسەر هەر بیرۆکەیەکی نوێی کارا کە پێشنیاری دەکەن. خولقاندنی کەشێک ئەندامان هان بدات بۆ بەدواداچوونی رەفتارە ویستراوەکان بۆئەوەی یارمەتی دەستەبەر بکەن، کاتێک ئەندامەکان بۆ خولقاندنی متمانە روبەڕووی سەختی دەبنەوە.

**١٠- هاوسۆزی:**

سەرکردەی میدیاکار لە ئەندامەکان بچێت، لەمیانەی وەرگرتن یان دزینی چوارچێوەی سەرچاوەیی تایبەت بە فەرمانبەران. بۆ زیادبوونی متمانە لە دەزگای میدیا لە نێوان فەرمانبەران و، بۆ تێگەیاندن و، هاندانی ئاستە قووڵترەکان لە دۆزینەوەی خود.

**١١- ئاسانکاری:**

کردنەوەی پەیوەندیکردنێکی روون و راستەوخۆ لەرێگەی گرووپەکە و یارمەتیدانی فەرمانبەرەکان لە گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتی زیاتر لەبارەی ئەرکە میدیاییەکەیان. لە وەدیهێنانی پەیوەندیکردنێکی کارا لە نێوان فەرمانبەرەکان و، بۆ یارمەتیدانیان بۆ گەیشتن بە ئامانجە تایبەتییەکانیان لە دەزگا میدیاییەکەدا بەکاردەهێنرێت. لەمیانەیدا:

- هاندانی ئەندامەکان بۆ دەربڕینی هەستیان و، فێرکردنیان چۆن پشت بە خۆیان و هەستەکانیان ببەستن و، چۆن راستەوخۆو بە روونی قسە بکەن و، دروستکردنی

کەشێکی ئارام و ئاسوودە.

- کارلێک لەنێوان فەرمانبەر دروست بێت نەک تەنیا لەگەڵ سەرکردەو، یارمەتیدانیان لە سەرکەوتن بەسەر ئاستەنگەکانی پەیوەندیکردن و، بەکارهێنانی ئەوەی دەیزانن و گواستنەوەی بۆ ژیان و، یارمەتیدان بۆ تەواوکردنی کارە تەواو نەکراوەکان، لە میانەی مەشق و راهێنان و ئەرکەکان.

**١٢- دەستپێکردن:**

ئەنجامدانی هەندێ هەڵسوکەوت بۆ دەسکەوتنی بەشداری، گرووپەکە و، پێشکەشکردنی ئاراستە و بیرۆکەی نوێ لە دەزگا میدیاکە. بەکاردەهێنرێت بۆ دوورگرتن لە سەر لێ تێکچوونی ناپێویستی گرووپەکە و، زیادبوونی خێرایی پرۆسەی کارلێک لە نێوان ئەندامەکاندا. توانای سەرکردەی میدیاکار لە پێکهێنانی کۆمەڵە و، ناساندنی گرنگی رۆڵەکەی وەک سەرکردە بۆ فەرمانبەران و، توانای سوودوەرگرتن لە شارەزاییەکان و کارلێککردن لەگەڵیدا. توانای سەرکردەی میدیاکار لە ئامادەکردنی باشی فەرمانبەران و، دابەشکردن و روونکردنەوەی ئەرکەکان بۆ هەر فەرمانبەرێک و، دەستپێکردن بە دانیشتن دوای ئامادەکاری و، دانانی هێڵە پانەکان و کۆکردنەوەی زانیاری لە ئەندامەکان، بۆئەوەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەک باش بکەن.

**١٣- دانانی ئامانجەکان:**

پلاندانان بۆ ئامانجی دیاریکراو بۆ دەزگا میدیاییەکە و، یارمەتیدانی بەشداربووان لە دیاریکردنی ئەو ئامانجانەی مانایان هەیە بۆیان، دەکرێ لە رێگەیەوە کارەکەیان بە باشترین شێوە ئەنجام بدەن. بۆ پێدانی رێنمایی بۆ کارەکانی فەرمانبەران و یارمەتیدانیان لە هەڵبژاردن و روونکردنەوەی ئامانجەکانیان و، لە دەزگای میدیایی ئامانجەکان هەمیشە لە میانەی راگۆڕینەوە لەنێوان ئەندامانی دەزگاکە دەبێت.

**١٤- هەڵسەنگاندن:**

نرخاندنی ئەو کارانەی فەرمانبەرەکان ئەنجامیان داوەو، هەڵسەنگاندنی ئاستی پێشکەوتنەکەیان لە جێبەجێکردنی ئامانجەکان. بۆ هۆشیاربوونێکی قووڵتر بە خودو، تێگەیشتنێکی باشتر بۆ جووڵە و ئاراستەی فەرمانبەرەکان.

**١٥- پێدانی فیدباک:**

دەربڕینی کاردانەوەو ڕووداوە ڕاستگۆکان جەخت لەسەر تێبینیکردنی ڕەفتاری فەرمانبەر دەکاتەوە، لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر فیدباکی ئەرێنی بۆئەوەی بەردەوام پاڵپشتی و هانی فەرمانبەرەکان بدەن. بۆ پێشکەشکردنی تێڕوانینێکی دەرەکی لەبارەی ئەوەی چۆن کەسەکە بۆ ئەوانی دیکە دەردەکەوێت و، بۆ زیادبوونی ئاگایی فەرمانبەر بە خۆی.

**١٦- پێشنیار:**

پێشکەشکردنی ئامۆژگاری و زانیاری و ڕێنمایی و بیرۆکەی نوێ بە فەرمانبەرەکان و، گوێگرتن لە پێشنیارەکان و ڕەچاوکردنیان. بۆ یارمەتیدانی فەرمانبەرەکان لە گەشەپێدانی ڕێگە جۆراوجۆرەکان، بۆ بیرکردنەوەو مامەڵەکردنی داهێنەرانە و ئاکاریانە.

**١٧- پاراستن:**

پاراستنی فەرمانبەرەکان لە مەترسی دەروونی ناپێویست لە ئەنجامی کارە میدیاییەکەیان، کە لەوانەیە تووشی بێت. بۆ هۆشداریکردنی ئەندامەکان لە مەترسی چاوەڕوانکراو لە ئەنجامی بەشداریکردن لە کاری میدیایی و، بۆ کەمکردنەوەی ئەم مەترسییانە بەتایبەتی لە کاتی ڕووماڵە میدیاییەکەیان بۆ ناوچە گەرمەکان.

**١٨- ئاشکراکردنی خود بۆ سەرکردەی میدیاکار:**

سەرکردە ئاماژە دەدات بە کاردانەوەکەی لە بارەی ئەو ڕووداوانەی سەرکردەی میدیاکار لەئێستادا پێیدا تێپەڕیوە، تاکو فەرمانبەرەکان هان بدات هەستی خۆیان و نارەحەتییەکانیان دەرببڕن. بۆ ئاسانکردنی ئاستگەلی قووڵتر لە کارلێکی نێوان فەرمانبەران و بۆ دروستکردنی متمانە و، بە نموونەکردنی ڕێگەگەلێک کە سەرکردەی میدیاکار ناسراو بکات وەک لەوانیترو، بۆیان بێتە پێشەنگ.

**١٩- نموونەییکردن:**

ڕوونکردنەوەی ڕەفتارێکی ویستراو لەڕێگەی کارکردن یان هەڵسوکەوت، کە لەوانەیە یەکێک لە فەرمانبەران ئەنجامیان دابێت. بۆ دەستەبەرکردنی نموونەگەلێک

بۆ رەفتاری ویستراوو، هاندانی فەرمانبەران بۆئەوەی بەشێوەیەکی تەواو پەرە بە تواناکانیان بدەن.

**٢٠- مامەڵەکردن لەگەڵ بێدەنگی لای هەندێ لە فەرمانبەران:**

کەمکردنەوەی پەیوەندیکردنی زارەکی و نازارەکییە لای هەندێ لە فەرمانبەران، کە بوار بە فەرمانبەران دەدرێ تا ماوەیەک بێ دەنگ بن، بۆ تێگەیشتن لەو رووداوانەی رووماڵیان کردووە. ئەو هۆکارانەی بێدەنگی کە ئاستەنگ بۆ کاری میدیایی دروست دەکات بریتین لە:

- ئارەزوو نەبوون لەلایەن میدیاکار لە بەردەوامی کارکردن، لەگەڵ باوەڕبوونی بە بێ کەڵکییەکەی.

- سەرسوڕمان و نەتوانین لە دەربڕینی دیمەنە میدیاییە زۆر کاریگەرەکان، کە کارمەند ناتوانێ بەرگەی بگرێت.

**٢١- کات:**

کات هۆکارێکی زۆر گرنگە لە سەرخستنی کاری میدیایی، بۆیە سەرکردەی میدیاکار پێویستە بارودۆخی هەر تاکێک لەناو دەزگا میدیاییەکە بزانێت و، کارێکی پێ نەسپێردرێ کە لەگەڵ رەوشی ئێستای نەگونجێت. کات رێگەمان پێ دەدات لە قۆناغێکەوە بچینە قۆناغێکی دیکە، بەجۆرێک لەگەڵ فەرمانبەرەکان و ئەو پێشکەوتنە بگونجێت کە بەدەست هاتووە.

**٢٢- مامەڵەکردنی بەرەنگاربوونەوە:**

لەوانەیە هەندێ فەرمانبەر لە رێگەی کشانەوە یان گۆڕینی بابەتەکە یاخود شێواندن، بەرەنگاری سەرکردەی میدیاکار ببێتەوە، یان دژایەتی بەرامبەری بکات. پێویستە سەرکردە درک بە پرسەکە بکات و تێبینی بکات، ئەگەر بەرەنگاربوونەوەکە لەلایەن زیاتر لە فەرمانبەرێکەوە بوو، ئەوا دەبێ بۆ فەرمانبەرەکانی روون بکاتەوە تاکو کەمی بکاتەوە.

## بەشی پانزەیەم
## دوارۆژی ئامرازەکانی میدیا

**جیهانگیری میدیایی:**

جیهانگیریی زاراوەیەکی نوێیە، لە زمانی ئینگلیزی لە وشەی (Global) وەرگیراوە واتـە جیهانـی یـان نێودەوڵەتی. زۆرجار لەگەڵ وشـەی (گونـد)دا کۆدەکرێتەوە، بۆیە دەبێتـە (Global Village) واتـە گوندێکـی جیهانـی. دەستنیشـانکردنی پێناسـەیەکی گشـتگیر بـۆ جیهانگیریـی، نەک تەنیـا کارێکی زەحمەتە، بەڵکو کارێکە ڕیشـی تێناچێ. هەر قوتابخانەیەکی فکری و فەلسـەفی و تەنانەت بیریارو ڕۆشـنبیرەکان لە ڕوانگەی خۆیانەوە ئەم چەمکە دەناسێنن.

لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە زاراوەی جیهانگیریی زۆر بڵاو بووەوە بەتایبەتی بەهۆی ئەو پێشکەوتنەی لە تەکنەلۆژیای پەیوەندی و تۆڕە نێودەوڵەتییەکانی پەیوەندی هاتنە ئاراوە. هەندێ شارەزای دیکەی جیهانگیریی کە باس لە سەرەتاکانی سـەرهەڵدانی دیاردەکـە دەکـەن، باس لە سـاڵانی نـەوەدەکان دەکـەن. هەندێ توێژەر دەڵێن جیهانگیریی پرۆسەیەکی کەڵەکەبوونە، واتە پێشتر جیهانگیریی بچوکتر هەبووە کە ڕێگەی بۆ جیهانگیریی سـەردەمی ئەمڕۆ خۆشـکردووە، بەڵام ئەوەی کە نوێیە لە دیاردەکـە ئەوەیـە کـە زۆر خێراترە لە جاران بەهۆی ئەو شۆڕشـە گەورەو خێرایەی لەبـواری زانسـتدا هاتە ئـاراوە، بەتایبەتی سـەرهەڵدانی ئینتەرنێت و پێشـکەوتنەکانی کەناڵەکانی میدیاو پەیوەندییەکان.

**کاریگەرییە خراپەکانی:**

- نەمانی ناسـنامە و کەسـایەتی نیشـتمانی لۆکاڵی و، سـەرلەنوێ تواندنەوەی و پێکهێنانەوەی لە چوارچێوەی ناسـنامە و کەسـایەتییەکی جیهانی، واتە گواسـتنەوە لە تایبەتمەنـدی تایبەتییەوە بۆ گشـتێتی (العمومیە) گشـتی، بەجۆرێک تاک مەرجەعیەتی

خۆی لەدەست دەدات و دەستبەرداری ئینتمایەکەی دەبێ. پێشتر هەمان شت بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووە لە قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنیدا، ئەویش لە خێزانەوە بۆ خێڵ و لەوێشەوە بۆ هۆزو گەل، دواتر بۆ هەرێم و شانشین و ئیمپراتۆریەت ئینجا بۆ وڵات و ئێستا بۆ کۆمەڵگەیەکی جیهانی کراوە.

- لەناوچوونی کلتوورو شارستانی لۆکاڵی نیشتمانی و دۆزینەوەی حاڵەتێکی نامۆ لەنێوان مرۆڤ و تاک و مێژووە نیشتمانییەکەی و، بۆماوە کلتووری و شارستانییەکەی کە شارستانی باوباپیران بەرهەمی هێناوە، واتە جیاکردنەوەی قەد لە رەگ و ریشە درێژبووەکەی و جیاکردنەوەی رووکار لە قوڵایی و، دۆزینەوەی شێوەیەکی نوێ لە شێوەکانی کلتووری جیهانی کە هەموو مرۆڤەکان دروستیان کردووە کە تایبەت نییە بە خودی کەسەکان یان ناوچە جوگرافیەکان.

- ئەوەی ئێستا ئامرازە میدیاییە جیاوازەکان دروستی دەکەن و هەڵی دەسەنگێنن، بە بەکارهێنانی پەخشی راستەوخۆ بۆ هەموو جیهان لەرێگەی مانگە دەستکردەکانەوە، کە دووبارە یادەوەری و ئاگایی تایبەت بەهەموو مرۆڤایەتی پێکدەهێنێتەوە.

- رەچاو نەکردنی بەرژەوەندییە نیشتمانییە تایبەتیەکان، ئەوکاتەی لەگەڵ بەرژەوەندی جیهانگیریی یان باهۆزە هەڵقوڵاوەکان لەهەموو بوارەکاندا دژ دەوەستێ.

- زاڵبوون بەسەر بازاڕە لۆکاڵییەکان لەمیانەی هێزە باڵادەستەکان کە هێرش و کاریگەری هەژموونی بەهێزی خۆی بەسەر کیانە لۆکاڵییە لاوازەکان پیادە دەکات و، لەنێوی دەبات و دەیگۆڕێ بۆ دامەزراوگەلی تایبەت بە خۆی.

**کاریگەرییە باشەکانی:**

ئەو رۆشنبیرانەی گەشبینن بەرابەر بەم پرۆسەیە، تێروانینێکی پۆزێتیڤی لەبارەی دەخەنەڕوو، پەیوەستی دەکەنەوە بە بەها باڵاکانی وەکو: دیموکراسی، مافی مرۆڤ، ئازادی و.. هتد. بێگومان زۆربەی ئەو رۆشنبیرانە، لەپشتی ئەم پرۆژەیەن و خۆبەخشانە کاری بۆ دەکەن، ئەوانەن کە لە رێگەی دەزگاکانی میدیاوە بە شان و باڵی جیهانگیریدا هەڵدەدەن و هەر خۆیان خاوەنی ئەو دەزگایانەن و بەهەموو

شێوەیەک پشتگیری هەر سیستەم و دەسەڵاتێک دەکەن، کە لەگەڵ پڕۆژەکەدا بێ و پێشوازی لێ بکات. بەبارێکی تردا، میدیا بە تەواوی لە پشتی ئەم پڕۆژەیەیە. لەو بیریارانەی کە گەشبینن بەرابەر جیهانگیریی (فرانسیس فۆکۆیاما)یە، ئەو پێیوایە سەردەمی جیهانگیریی سەردەمێکی بێ وێنەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیداو هەموو بەهاکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و یەکسانی و...، تێیدا هاتۆتەدی و پیادە دەکرێ. هەروەها زانست و تەکنەلۆژیا گەیشتوونەتە دوا پلەی گەشەسەندن و، خۆشگوزەرانی خەڵکی بەگشتی فەراهەم دەبێ. ئەو پێیوایە دەبێ هەموو لایەکمان پێشوازی لەم پرۆسەیە بکەین و کاری بۆ بکەین، تەنانەت فۆکۆیاما بانگی (کۆتایی مێژوو) دەدات و بەدوا قۆناغی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی لە قەڵەمی دەدات.

**گرنگترین لایەنە باشەکانی جیهانگیریی بریتیە لە:**

- کار بۆ خێراکردنی جێبەجێکردنەکانی تەکنەلۆژیای نوێ دەکات. بە پێشکەوتنە خێراو یەک لەدوای یەکەکانی، جیهانگیریی دوپاتی دەکاتەوە کە لەهەر ساتێکدا جیهان و تاکێک لەم جیهانەدا دەدۆزێتەوە، بەڵکو هەر ساتێک شتێکی نوێ لەدایک دەبێ و، جیهانگیریی هەلێکی گەورەیە بۆ سوود بینین لەم شتە نوێیانە و بە کاراییەکی تەواو.

- پیشەسازی و کشتوکاڵ و خزمەتگوزارییە بەرهەمهێنەکان لەسەر ئاستی هەموو ناوچەکانی جیهان پێش دەخات، وەک نەهێلانی جیاوازییەکان و یەکخستن و جێبەجێکردنی سیستەمەکانی بەرهەمهێنان و، بازاڕکاری و پارەدان و کادیرە مرۆییەکان کە بە کردەیی سەرکەوتنەکەی پەخش دەکات.

- یەکگرتنی بازاڕەکانی دراوی جیهانی و یەکگرتنی پێوانی نەغدینەیی و، یەکگرتنی جیهان و سیاسەتە دارایی ـ نەغدینەییە جێبەجێکراوەکان لەسەرانسەری جیهاندا، بەجۆرێک جیهان دەبێتە تەنها یەکەیەک.

ئەو بارودۆخەی کە ئێستا جیهان پێیدا تێپەڕ دەبێ، وای لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردوە ئامادەو بە پیت بێ، بە ڕوودانی زۆرترین گۆڕانکاری کە شوێنکاری خۆی لەسەر هەموو لایەنەکانی ژیان بەشێوەیەکی گشتگیر بەجێدێڵێ. گۆڕانکاریەکان بە یەک شێوازو ئاراستە لەرووی خێرایی و فراوانییەوە روونادەن، بەڵکو لە کۆمەڵگەیەکەوە

بۆ یەکێکیترو لە شارستانییەتێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ. پێویستە تێڕوانینمان بۆ قەبارەی گۆڕانکارییەکان و جۆری و هەمەلایەنییەکەی هەڵقوڵاوی واقیع و ئاستی گۆڕانە ناوخۆییەکان بێ، هەستکردنمان بەم گۆڕانکارییانە روو لە زیادبوون دەکات، لەگەڵ فراوانبوون و پێشکەوتنی ئەو هۆیانەی کە کەنارەکانی جیهان بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

ئەمەش ئەو هۆکارانەن کە دەروازەی بەسەر جیهاندا بۆ خستووینەتە سەر پشت، کە لەرێگەیەوە پێشوازیمان لە کاریگەرییەکانی کردووە، جیهانیش سوودی لە کارتێکردن لێمان بینیوە، ئەوانەش کە بەشێوەیەکی پێشکەوتووتر پێمان دەگەن بەتایبەتی لەم بوارەدا، بواری پەیوەندی تەکنەلۆژیا کە ئێستا بە گرنگییەکی زۆرەوە چۆتە نێو ئابووری بازاڕی جیهانی. ئێستا کێبرکێیەکی فراوانی لەسەر دەکرێ لەلایەن ژمارەیەک لە کۆمپانیا گەورەکان کە هەریەکەیان لە هەوڵی بەرەوپێشچووندان، بەم هۆکارانە ئاسۆکانمان بەسەر ئەو گۆڕانە جوانەو پێشکەوتنانەی کە لە جیهاندا روویداوە فراوان بوون.

زۆر وڵات بە دەرهاویشتە و ئاکامەکانی جیهانگیری سەرقاڵ بوون و، بە روونی دڵەڕاوکێ لە مەترسییەکانی پەیدابوو، دوای ئەوەی کەناڵە جیهانییەکانی پەخشی ئاسمانی دەستیان بە بازارکاری و پتەوکردنی بەهاو ئامانجەکانیان کردو، لەگەڵ بڵاوبوونەوەکەیدا، رکابەرییەکی میدیا پەیدابوو بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن و زانیاری لەسەر ئاستی پرۆسەکانی پەخش و کارپێکردن و وەرگرتن و بەرهەمهێنان لە رووی شێوەو ناوەڕۆکەوە، مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ئامرازە جیاوازانە بەشێکی سەرەکی لە ژیانی رۆژانەی تاک پێکدەهێنێت. ئەو ئامرازانەش بووە پێویستییەک لە پێویستییەکانی ژیانی هاوچەرخ بۆ تێرکردنی ئارەزووە ماریفی و تەرفیهییەکانی تاک.

لە سایەی جیهانگیری میدیادا ئێستا میدیا لە هەندێ وڵاتدا لەبەردەم روبەڕوبوونەوەیەکی گەورەدایە بەتایبەتی دوای ئەوەی هاووڵاتی لە ماڵەکەی خۆیەوە دەتوانێت کەناڵە بیانییەکان تەماشا بکات، کە هەندێکی بە زمانی ئەو وڵاتە خۆیەتی،

لەوانەیە لە ڕێگەی بەرنامەکانیەوە تووشی کاریگەری نەرێنی بێت، چونکە ئەگەر بینەر بابەتێکی میدیای ڕۆشنبیری داهێنانکەری پێشکەوتوو نەبینێ کە ئارەزووەکەی تێر بکات، لەوەی کەناڵی ئاسمانی وڵاتەکەی پێشکەشی دەکات، لەوانەیە بەرنامەی بیانی کاریگەری لەسەر بکات، ئەمەش کار دەکاتە سەر دارشتنەوەی بیرکردنەوەو ویژدانی پاشان ناسنامەکەشی.

لە کاتێکدا پێویستە کەناڵە ناوخۆییە ئاسمانییەکان پرسە گرنگەکان و کێشەکانی کۆمەڵگە بە جەماوەر بگەیەنن، بۆئەوەی رایەکی گشتیی هاوسۆزی لەگەڵدا دروست بکەن، تاکو کار بکاتە سەر ئاراستەکانی سیاسەتی ئەو دەوڵەتەی تیایدا دەژی. ئەم رای گشتییە بە ئاراستەی ئەرێنی خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی خەڵک و پرسە چارەنووسسازەکانیان دەکات. هەروەها پێویستە ئەو کەناڵە ناوخۆییە ئاسمانیانە بە زمانێک گفتوگۆ لەگەڵ ئەوی دیکەدا بکەن کە تێی بگەن و قەناعەتی پێ بهێنن، بەتایبەتی کە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی وای کردووە بەئاسانی دەوڵەتان بە پەیامە راستەوخۆکەیان و ناوەڕۆکە باشترینەکەیان، سەروەرێتی پەیوەندیکردن و میدیای وڵاتانی جیهان ببەزێنن.

ئینتەرنێت ئەمڕۆ لە هەموو شتێکیتر زیاتر لە جیهانگیریی نزیکمان دەکاتەوە، دونیای هێماو کەلوپەلەکان شوێنی دونیای زمانی گرتۆتەوە، زەوییەکەشمان بۆتە بازنەیەکی گریمانیانەی وەها چەقەکەی هەموو شوێنێک و هیچ شوێنێک بێت، راستە زۆرینەی گەل بەتایبەتی لە وڵاتانی باشوور ناتوانن سوود لە ئینتەرنێت و کلتوورەکەی وەربگرن و هێشتا بە کلتووری ناوخۆو تایفی و هۆزایەتیان پەیوەستن، بەڵام ئەم کلتوورانە هێشتا زیندوون و جەماوەریش دەورووژێنن و وایان لێ دەکەن هەست بە ناسنامەی خۆیان بکەن، کەواتە پێویست ناکات بە بیانووی جیهانگیریی و نوێخوازی خۆیان لێ بشارنەوە.

جیهانگیری میدیا دەسەڵاتی تەکنەلۆژیایەکی سیستەم ئاڵۆزە کە بە سنووری نیشتمانی وڵاتان پابەند نییە، بەڵکو سنووری ئاسمانیی نەبینراو دەخاتەڕوو کە تۆڕەکانی پەیوەندیکردنی زانیاری وێنە دەکێشن، لەسەر بنەمای سیاسی و ئابووری

و فیکری، بۆئەوەی جیهانێک بەبێ دەوڵەت یان نەتەوە یاخود نیشتمان هەڵبسەنگێنن.

مانگە دەستکردەکان بە درێژایی رۆژو شەو بە ئاسمانەکانی جیهاندا دێن و دەچن، هەموو هۆکارەکانی پەیوەندیکردن و چاودێریکردنی نوێ و سنووربڕیان بۆ دەسازێنێ، لە سەروو هەموویانەوە تۆڕی ئینتەرنێت دەسازێنێ کە مەترسیدارترین و ئاسانترین میکانیزمی زانیارییە، چونکە ئەم تۆڕە بەشەکانی گیتی پێکەوە گرێ دەدات، لەسەر شێوەی سیستمێکی جاڵجاڵۆکەیی زۆر وردو دزەکار، سەرباری ئەو پەخشەی سەتەلایت کە بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە زۆر ئاسان بووە.

جیهانگیری میدیا خەسڵەتێکی سەرەکی سەردەمی جیهانگیرییە و، درێژکردنەوەی یان فراوانکردنە لە ناوچەی جیاجیای جوگرافی لەگەڵ پێشکەش کردنی ناوەڕۆکێکی هاوشێوە، ئەوەش وەک جۆرێک لە فراوانبوونی رۆشنبیری لە ئەنجامی ئەو پێشکەوتنە لە ئامرازەکانی میدیاو پەیوەندیکردندا، کە وایکرد بشێت شوێن لە شوناس جیا بکرێتەوەو بەسەر سنووری رۆشنبیری و سیاسییەکاندا باز بدرێ و، لە هەستی ئینتیما بۆ شوێنێکی دیاریکراو کەم بکرێتەوە.

**گوندی جیهانی و دوا رۆژ:**

ئەو بازدانە گەورەیەی بەهۆی شۆڕشی میدیاو بڵاوبوونەوی زانیاری و، سەربەخۆ بوونی هەواڵ و وێنە و هێماکان و، نەمانی سنوور لە بڵاوبوونەوەیان، سەری هەڵدا، هەندێ لەو رۆڵانەی بێ هێز کرد کە دەوڵەت و خێزان پێی هەڵدەستان لە پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی و، کورتکردنەوەی رووبەری کات و شوێن هەروەک چۆن (مارشال ماکلوهان) بە گوندی جیهانی (The global village) ناوی برد، کە بووە راستییەکی حاشا هەڵنەگر. بۆیە تاکەکان گۆشەگیرتر دەبن لە ناو ئەو چوارچێوەی کە خۆیان لە ناوی دەنێن، دواتر لە ناو ژووره داخراوەکانیان دەکەونە ژێر کاریگەری گەورەی زانیاری هەڵەو ناڕاست، لە رێگای کۆمەڵێک لەو ئامرازانەی کە ئەم پەیامە دروستکراوانە لە کەسێکەوە بۆ ئەویتر بە کەم و کوڕی و بێ شارەزایی دەگوازنەوە.

میدیای بینراو کلتووری تازە پێک دەهێنێت، کە مرۆڤایەتی لە کلتووری زارەکی بۆ کلتووری نووسین و لەوانەش کلتووری وێنە گۆڕاوە، بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای زانیـاری لـە شـێوەی بازدانی بێ وێنـە، تەلەڤزیۆن بۆتە پرۆگرامکـراوی ژیانی خەڵک و شـتە سـەرەکییەکانی ژیان، بە هەمان شـێوە بۆ ئینتەرنێت و مۆبایل، ئێسـتا جیهان بریتییە لە گوندێکی بچووک، تەنانەت دەوترێ بۆتە گوندێکی تەلەڤزیۆنیی بینراو.

چاوەڕوان دەکرێ پەیوەندی خەڵک لەگەڵ یەکتر زیاتر بە ئامرازە جیاوازەکانی میدیا پشتبەسـتوو بێت، کە دەکرێ سـەردانە کۆمەڵایەتییەکان کەم بێتەوەو، پەیوەندییەکانی خزمایەتـی لەگـەڵ یەک کـەم ببنەوە، لەجیاتی ئەوە لە بەرامبەر ئینتەرنێت دادەنیشـین بـۆ پەیوەندیکـردن و ئەنجامدانـی بۆنـە جیـاوازەکان، جیهان وەک ئـەوەی چاوەڕوان دەکـرێ بـەم نزیکانـە لە تەنهـا مۆبایلێکدا کـورت دەکرێتـەوە، چونکـە بەهۆیەوە تاک دەتوانـێ تەماشـای تەلەڤزیـۆن و هەواڵە جیاوازەکان بـکات و، دەکرێ لەگەڵ خزمانی و هاوڕێیانـی قسـە بـکات، لەوانەیە پێویسـت نەکات بچێت بۆ قوتابخانـە و بەرامبەر مامۆسـتا دابنیشـێت، چونکە دەکرێ مامۆسـتا لە رێگەی مۆبایلەوە قوتابییەکە ببینێت، پێویستیشـی بە هەڵگرتنی کتێبی جۆراوجۆر نەبێت، چونکە لەوانەیە کتێبخانە گەورەو پڕ لـە کتێبـەکان نەمێنـن و، تاک بـە مۆبایلەکـەی قەرەبـووی بکاتەوە، کـە کتێبەکانی خوێندن و کتێبی دیکەی لەسەر هەڵبگرێت و لەگەڵ ئەوانی دیکەدا پەیوەندی هەبێت.

لـە کۆمەڵگـە کۆنەکاندا تاک کەوتبـووە ژێر باڵی دیاردە قیزەونـە کۆمەڵایەتیەکان، ناچار دەبوو لە ناسـنامەی تاکی ئایینی و ئابووری و سیاسـی و هۆزایەتیدا بتوێتەوە، بـەڵام لەنـاو کۆمەڵگـە نوێیەکانـدا ئـازادە لـەوەی لـە یـەک کاتـدا ئینتیمـای بـۆ چەند ناسنامەیەک هەبێ.

کەواتـە مرۆڤـی نـوێ ئینتیمـای بۆ گونـدە بچوکەکـەی و سـەرتاسـەری جیهانیش هەیە، لەیەک کاتدا خێڵەکییەکی کۆچەرو نیشتەجێشـە، بەو واتایە جیهانگیریی شـتێکی نوێی بۆ مرۆڤ زیاد کردووە، پێویست ناکات لێی بترسین. لێرەدا پێویستە هەڵوەستە لەسەر بەکارهێنانی زمانی دوو لایەنە یان دووڕوویی بکەین و دانی پێدا بنێین، چونکە جیهانگیریی لـە زۆربـەی کاتـدا ئەمەریکییـە، ویلایەتـە یەکگرتووەکانیـش جۆرێک لە

ئیمپریالی یاخود دەست بەسەر جیهاندا گرتن پەیڕەو دەکەن، ئەمە هێزێکە هاوشێوەی لەمێژوودا نییە، لە واقیعیشدا ئەمەریکا سەرکردایەتی سەربازگەی رۆژئاوایی «ئەوروپا، کەنەدا، ئوسترالیا» دەکات، ئەمەش جیهانی سەرەکی جیهانگیرییە، جیهانێک کە شارستانییەتەکەی لەڕووی فەلسەفەی و رۆشنبیریەوە لەسەر مافەکانی مرۆڤ و لەرووی سیاسەت و ئابووریشەوە لەسەر رژێمی سەرمایەداری دیموکراتی دایڕشتووە.

جیاوازی لەنێوان وڵاتانی ئەو جیهانە سەربەستەدا هەیە، بەڵام جیاوازییەکان تەنیا لە ناوەوەیەو بەدیار ناکەون، واتا چاوی دەرەوە نایانبینێ، وڵاتی چین وەها لەدونیای رۆژئاوا دەڕوانێ وەکئەوەی یەک دەستە بێ و جیاوازی زۆریش لەنێوان ئەمریکاو ئەوروپادا نەبێ. هیندی و عەرەب و موسڵمان و ئەفریکایی تەنانەت رووسەکانیش بەهەمان شێوە.

لە سەردەمی تازەدا بەهۆی پێشکەوتنی ئامرازەکانی میدیا، توانای گەڕان بەدوای پیشەی گونجاوو لێکۆڵینەوەی گونجاوو هاوسەر، لە ڕیگەی بەکارهێنانی ئامرازی پێشکەوتووی تەکنەلۆژییەوە دەستی پێ کردووە، لەوانەیە ئەم مۆبایلە بۆ کەسەکە گرنگترین هاوڕێ بێت، لە ژوانەکانی ئاگاداری دەکاتەوەو لەبارەی کێشەکانی قسەی بۆ دەکات، تەنانەت لەوانەیە لە چارەسەرکردنی هەندێ لە کێشە جەستەییەکانی یارمەتی بدات، بە هۆی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان و دیاریکردنی دەرمانی گونجاو بۆی، هەروەها لەوانەیە چارەسەرکەرێک بێت بۆ کێشە دەروونییەکانی تاک، کە تاک دڵخۆش دەکات و گرژیی و بێزاری و دڵتەنگییەکەی کەم دەکاتەوە، ئەمەش وا دەکات ئامرازەکانی میدیا لە ژیانی کەسەکەدا گرنگترین هاوڕێ بن.

کاریگەری دەروونی ئەمانە، هۆکارەکەی بۆ دوو شتی سەرەکی دەگەڕێتەوە:

- زیادبوونی هەستکردن بە ئاسوودەیی و خێرایی لە تەواوکردنی کارە جیاوازەکان: بەشێوەیەکی ئەرێنی لەسەر دەروون دروستی کاریگەر دەبێت، وا دەکات کەسەکان لەگەڵ واقیعەکەیان زیاتر توانای گونجانیان هەبێت.

- گرژیی و زیادبوونی ڤاڵایی: لەوانەیە هەندێ کەس هەست بە نامۆیی بکەن، وەک

ئەوەی زۆر لە خودی خۆیان دوور بن.

هـۆکاری بەهێزتـر لـەو دوو هۆکارە کـە کۆنترۆڵی تـاک دەکات، بریتییە لە توانای کەسـەکە بـۆ گونجان و لەباربـوون و خۆگونجاندن لەگەڵ ئامـرازە جۆراوجۆرەکانی میدیـاو، توانـای لـە بەکارهێنانی ئـەم ئامرازانە، چونکە ژیانی مرۆیـی ئەگەر بۆ ژیانی تەکنەلۆژیـا بـە تەنهـا گۆڕا، ئـەوا مۆرکە مرۆییەکـەی لێ دادەماڵرێت و لـە ژیانی نزم (ئاژەڵیی) نزیکتر دەبێتەوە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری ئەوە بێت کە مرۆڤە و، پێویستی بەوانیترەو پەیوەندی بینراوو جەسـتەیی و دەروونی لەگەڵیاندا هەیە و، بەبێ ئەوەو سەرەڕای هەموو پێشکەوتنە میدیاییەکان تاک بێ بەها دەبێت، سەرەڕای ئەو پارەو شکۆو دەسەڵاتەشی هەیەتی.

**ئینتەرنێت و مەوداکانی پەیوەندیکردن:**

داهێنانـی تەکنەلـۆژی نـوێ لەبـواری پەیوەندییـە مرۆییەکانـدا گۆڕانـکاری زۆر گەورەی پێکهێناوە، بە جۆرێک ئاڵوگۆڕو گەشەی تەکنەلۆژی لە پەیوەندییەکاندا زیاتر لـە بوارەکانـی دیکەی زانیاری مرۆڤایەتی، گەشـەی بەخۆوە بینیوەو نوێترین داهێنانە لەبواری گۆڕینەوەی زانیاریدا.

تـۆڕی ئینتەرنێـت بـە لوتکـەی تەکنەلۆژیـای پەیوەندیکـردن دادەنـرێ و زاراوەی ئینتەرنێـت ئاماژەیـە بـە کۆمەڵێـک لـە ئامێـری کۆمپیوتـەری پێکـەوە پەیوەندیـدارو، زانیارییـەکان لەنێـوان خۆیانـدا ئاڵوگـۆڕ دەکـەن و دەیانگوازنـەوە، لەبـەر سروشـتە دینامیکییـە کارلێکییەکـەی بەشـێوەیەکی سـەرنجڕاکێش لـەم سـاڵانەی دواییـدا بـڵاو بۆتەوە.

ئینتەرنێـت تۆڕێکـی زۆر گەورەیە کۆبوونەوەیەکی گەورە لە دە هەزار لەو تۆڕانە پێکدەهێنێت کە دەتوانرێت لە ڕێگای هەزاران کەناڵی فەزاییەوە پەیوەندیان پێوە بکرێ. ئینتەرنێت رایەڵەیەکی بەربڵاوی چەندین کۆمپیوتەری پێکەوە بەسـتراوە، لەو ڕێیەوە بەخێرایی لە بوارەکانی زانسـت و نۆژداری و ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و میدیادا زانیاری ئاڵوگۆڕی پێ دەکرێت، رایەڵەی ئینتەرنێت هۆکارێکی بەسـتنەوەی

گشت لایەکی جیهانە و بە جۆرێک دنیای بچوک کردۆتەوەو کردوویەتییە گوندێکی بچووک و، بەهۆیەوە شارەزای شارستانیەت و داب و نەریت و زانستی دنیا بووینە.

ئینتەرنێت لە سەرانسەری جیهاندا بە گەورەترین تۆڕی زانیارییەکان دادەنرێت، ڕێگە بە بەشداربووانی دەدات بە چەندین شێواز پەیوەندی پێکەوە بکەن و سوود لە یەکتر وەربگرن، وەک گۆڕینەوەی پۆستی ئەلیکترۆنی و گواستنەوەی فایل و پەیوەندیکردنی هەواڵەکان و، کەڵک وەرگرتن لە هەزاران بنکەی زانیاری و ئەنجامدانی دایەلۆگ و ڕاپرسی لەگەڵ یەکترو، گەشت کردن بەناو کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکانی تۆڕی ئینتەرنێت زیاتر دەبێت و، ژمارەی لاپەڕەو دۆکۆمێنتەکانی لەگەڵ ژمارەی بەشداربووانی زیاتر دەبێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سوودو کارئاسانییەی ئەم تۆڕە پێشکەشی دەکات.

کۆششی مرۆڤ لە ساڵانی کۆتایی سەدەی بیستەمدا بۆ گەیشتن بە زانیاری بەشێوەیەکی ئاسان و خێراو کەمخەرج و توانای لێکدانەوەو تاوتوێکردن و بە زانستکردنی ئەو زانیارییانە گەیشتە ئاکام، مرۆڤی هۆشیار بە کەڵک وەرگرتنی لە هارد دیسک و ئۆفسێت و بە یارمەتی کۆمپیوتەر، دەتوانێ لەماوەیەکی زۆر کەمدا دەستی بە کۆمەڵێکی زۆر لە هەواڵ و زانیاری بگات.

ئینتەرنێت بۆتە ئامرازێک بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروبۆچوونەکان، جگە لەوەی گرنگترین ئامرازی ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانییە لەنێوان وڵاتاندا، بڕی ئەم ئاڵوگۆڕە لەساڵی ٢٠٠٠دا گەیشتە نزیکەی دوو سەد ملیار دۆلار. بۆ بەجیهانیکردنی میدیاو پەیوەندیکردن، ویلایەتە یەکگرتووەکان هەوڵی داوە بۆ بەکارهێنانی ئەم تۆڕە بۆ پەیوەندیکردنی مەبەستەکانی، ئەویش بە بازاڕ پەیداکردن بۆ هەموو جۆرە بەرهەم و شمەکەکانی و بڵاوکردنەوەی کلتوورەکەی بە جیهاندا، هەروەها ناردنی بیروبۆچوون و داب و نەریتی ڕۆژئاوایی بەگوێرەی شێوازی ژیانی ئەمەریکایی، لەڕێگەی پۆستی ئەلیکترۆنییەوە. ناردنی زانیارییەکی زۆر بەشێوەیەک لە بەرژەوەندی مەبەستەکانیدا بێ، لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانێ چاودێری وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان بکات و ئاگای لە جموجۆڵیان بێ. هەروەها هەوڵدان بۆ باڵادەستکردنی دەسەڵات و تاکڕەوی

خۆی بەهۆی هەبوونی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە، سـەرەڕای بالادەسـتی بانک و پێگە زانیارییەکانی لەسـەر ئەم تۆڕەدا، کە بێگومان دەربڕی تێگەیشـتنی خۆیەتی لەبارەی هەموو دۆزێک لە جیهاندا.

سـوود وەرگرتـن لـە نەخوێنـدەواری تەکنەلـۆژی لە جیهانـی سـێیەمدا، هەروەها بەربەست دانان لەبەردەم ئەو وڵاتانەدا لە برەودان بە پێشکەوتنیان، سەرەڕای ئەوەی هەنـدێ لـەم وڵاتانـە ئـازادی تەواویان نییـە یان بـواری تەواویان بۆ نەڕەخسـاوە لە سـوود وەرگرتن و هەڵبژاردنی ئەم لێشـاوە زانیارییە، بۆئەوەی هەندێ لەو زانیارییە هەڵەو چەواشـەکراوانە راسـت بکاتەوە کە پەیوەندیدارن پێیەوە، هۆکارێکی تری ئەم بالادەستیەیە.

مامەڵـەکاری لەسـەر ئینتەرنێـت وای لـە بازرگانی کرد پێشـکەوتنی خێرا بەخۆوە ببینێت، کە هاوشێوەی پێشکەوتنی دامەزراندنی کۆگا گەورەکانە لە ساڵانی شەستەکاندا، ئەمـە رەفتـاری بەکاربـەران و بازرگانانـی گـۆڕی، چـاوەڕوان دەکرێت لـە دواڕۆژدا قەبـارەی ئاڵوگـۆڕی بازرگانی کلاسـیکی کەم بێتەوەو، بەتەواوی دەسـتبەرداری بێت و بازرگانـی ئەلیکترۆنـی جێگـەی بگرێتەوە، چونکە بـازاڕەکان لەبـەردەم بەکاربەردا بازاڕی کلاسـیکی نییە کە بتوانین بە جەسـتەیی پێی بگەین، بەڵکو هەموو بازاڕەکانی جیهان موڵکێتی و دەتوانی تیایدا بازاڕ بکات.

**رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی:**

دۆزینـەوەی ئینتەرنێـت و بڵاوبوونەوەی بەشـێوەیەکی خێـراو فراوان لە زۆربەی وڵاتانـی جیهانـدا، چەندیـن گۆڕانکاری بنەڕەتـی لە رۆژنامەو پیشـەی رۆژنامەگەریدا بەرپـا کـردو، بـووە مایـەی دەرکەوتنـی جۆرێکی نوێ لـە رۆژنامە کە بـە رۆژنامەی ئینتەرنێتی یان رۆژنامەی ناکاغەزیی ناسراوەو، بە وێنەی رۆژنامەی چاپکراو لە شێوە کلاسـیکییەکەی ئێستادا کەوتە خۆسـەپاندن لە قۆناغی بەکارهێنانیدا یان مامەڵەکردن لەگەڵیدا لەلایەن جەماوەرەوە، پاشـان وەک جێگرەوەیەک بۆ ئەو جۆرەی رۆژنامە لە کاتی گەیشتنی بە قۆناغی پشت پێ بەستنی لەلایەن خوێنەرانەوە.

ڕۆژنامەگـەری ئەلیکترۆنـی ئـەو ڕۆژنامانەیـە کـە لەسـەر تـۆڕی ئینتەرنێت بڵاو دەبنـەوە، وەک ڕۆژنامەیەکـی چاپکراو لەسـەر شاشـەی کۆمپیوتەر کـە دەق و دەنگ و ڕەنـگ و وێنـەی جـوڵاو لەخـۆ دەگرێـت، هەروەهـا فۆرمێـک یـان زیاتـری هەیە لە هەمان ڕۆژنامەی کاغەزی یان کورتەیەک لە تەواوی ناوەڕۆکی ئەو ڕۆژنامەیە، واتە مینبـەرو ڕووبەرێکـی فـراوان بۆ ئازادی ڕادەربڕیـن و خزمەتگـوزاری بەکۆگەیاندن. دەرکەوتنـی شـوێنی ئەلیکترۆنـی لەسـەر تـۆڕی ئینتەرنێـت جۆرە شۆڕشـێک بوو لە تەکنۆی ڕۆژنامەوانی.

ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکانی سەر تۆری ئینتەرنێت دەکرێنە سێ پۆلێن:

١-ماڵپەری ڕۆژنامە کاغەزییەکان، لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، یان هەندێ لە کەناڵە ئاسمانییەکان، کە بە نوسخەی ئەلیکترۆنی تەواوکەریان دەژمێردرێ و زۆر بابەت و بڵاوکراوەو بەرهەمی ڕۆژنامەنووسی لەخۆ دەگرێت.

٢- ماڵپەری هەواڵگری و میدیایی تایبەت بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەو بەدواداچوونی هەواڵ و ڕووداوەکان و، ئامادەکردنیان بۆ بڵاوکردنەوە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

٣- ئـەو ڕۆژنامـە ئەلیکترۆنییانـەی نوسـخەی کاغەزیـان نییـە و لەشـەقامدا بڵاو ناکرێنـەوە، زۆربـەی کات بەرهەمـی تاکە کەسـین و هەموو جـۆرە هەواڵێکیش لەخۆ دەگـرن و، سـوود لـە پێشـکەوتوترین تەکنەلۆژیای میدیـاو زانیارییـەکان وەردەگرن تاکو بە جوانترین شێوەکاری خزمەتگوزاری ئەندام بدەن، ئەم ڕۆژنامانە ڕۆژانە بڵاو دەبنەوەو بەردەوام گۆڕانکاری بەسەر ناوەڕۆکەکەیاندا دێ.

باشـبوونی بـەردەوام بـۆ خزمەتکردنـی ئینتەرنێـت، پاڵـی بـە پیشـەگەرانی ڕۆژنامەوانییـەوە تاکـو چەمکـی ڕۆژنامەوانیـی ئەلیکترۆنی وەبەر بهێنـن، چونکە ئەم ئامـرازە تازەیـەی بڵاوکردنـەوە چەندین خەسـڵەت وەدەسـت دێنێ، لەوانـە: ژمارەی فەرمانبـەران دیـاری کـراوەو، دوو هێنـدە بوونـی بڵاوکردنـەوەو، بـازاڕکاری و، دەسـتپاکی خوێنەران و، قەبارەی نەرم و نیانتر، چونکە بڵاوکراوە لەسـەر ئینتەرنێت ئێستا تەواوکەری ڕۆژنامەی کاغەزییە، لە دواڕۆژیشدا دەبێتە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی، جێـی ڕۆژنامـەی کاغەز دەگرێتەوە، چاوەڕوان دەکرێ ڕۆژنامەی کاغەزی نەمێنێت و

بــە رۆژنامــەی ئەلیکترۆنــی قەرەبوو بکرێتەوە، کە دەکـرێ ملیۆنەها کەس و بە هەوڵ و تێچوونێکـی کەمتـر پێی بگەن، ئەمەش لەسـەر ژمـارەی خوێنەران بە ئەرێنی رەنگ دەداتــەوە، هەروەها لەســەر ژمارەی لاپەڕەکان کە دەکرێ تـاک رۆژانە بیخوێنێتەوە، چونکـە بـەو رۆژنامەگەرییـە ئـەو کۆت نەکـراوە کە لــە وڵاتەکەی یان لــە ناوچەکەی دەردەچێـت، بەڵکـو دەکـرێ هەر رۆژنامەیەک لە هەر شـوێنێک لە جیهانـدا لە ماوەی قۆناغگەلی کاتی پێوانەییدا بیخوێنێتەوە.

**توندوتیژی لە میدیای نوێدا:**

بایەخـدان بــە توندوتیژی بە ســەرجەم شـێوە بڵاوکراوەکانی هەواڵـی دیاردەیەکە تەنیا لە کەناڵی (CNN)دا نییە، بەڵکو لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو بەهۆی هۆکاری جۆراوجۆرەوە کەناڵی هەواڵی تایبەتمەند وەک تەقینەوەیەک سـەریان هەڵدا، لە ســاڵانی هەشـتاکاندا جیهان ئەم ئاراسـتەیەی بەخـۆوە بینی، واتــە زیاترین کەناڵی تەلەڤزیۆنی تایبەتی سەر بە گەورە کۆمپانیاکان و کۆمەڵگە میدیاییەکانە پەیدا بوون.

تێڕامــان لــە نەخشــەی نێودەوڵەتی ململانێـکان و لە ســەرچاوەکانی گرژی، وامان لـێ دەکات لـەو بڕوایەدابیـن ململانێیـەکان لەجیهانـدا لەبارەی چەکـی ئەتۆمی و ئاوو وزە، لەگـەڵ کێشـەکانی سـنوورو ململانێ ئیتنـی و مەزهەبییـەکان لەداهاتوودا زیاتر دەبن، لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکانی دوارۆژ دووپاتی دەکەنەوە کە ناوچەکانی هەژاریی و برسـێتی فراوانتـر دەبن، ئەمــە جگە لە کاریگەری نەرێنـی جیهانگیری و کۆمەڵگەی ۲۰٪ هــەروەک (هانـس پیتــەر مارتن) و (هارۆلد شـومان) هەردوو نووسـەری کتێبی (دوای جیهانگیری) بۆی دەچن، لەگەڵ پاشەکشــەی زیاتر لە سـەروەریتی دەوڵەت و، خاوەنانـی بڕیار لــە بەرژەوەندی ئەو کۆمپانیایانە کە لەگەڵ هەواڵەکان وەک کالایەک مامەڵـە دەکـەن، زۆرجـار بەرژەوەنـدی کۆمپانیاکانـی رێـکلام رەچـاو دەکات و کار تێکـردن لە زۆرترین بینەر بە شـێوازی جۆراوجـۆر، لە میانەی نمایش و بەکارهێنانی چڕ بۆ وێنە و نمایشی درامیانەی هەواڵەکان.

خانمــە نووســەر (نۆرینـا هێرتـز Noreena Hertz) لــە کتێبەکـەی بەنـاوی

(هەژموونی بێ دەنگThe Silent Takeover)، وێنەی سیناریۆی ئەم دوارۆژە دەکێشێت: «جیهانێک کە سەرۆکێکی ئەمریکایی تیا بێت کە یاسا لە دوای یاسا لە بەرژەوەندی کۆمپانیا گەورەکان دەربکات و، رۆبرت میردۆخ دەسەڵاتێکی بەهێزتری لە دەسەلاتی (تۆنی بلێر) هەبێت و، کۆمپانیا گەورەکان ئەجێندا سیاسییەکانیان دابنێن، بەڵکو جیهانێکی ترسناکە و دیموکراتی نییە، لەوانەیە بیرۆکەی رۆڵبینینی کۆمپانیا گەورەکان لە جێی حکومەت لە هەندێ رووەوە پەسندکراو بێت، بەڵام سەرکێشییەکان بەشێوەیەکی زیادو بەبێ فریاخەر بەجێمان دەهێڵن». بەردەوامی باری ئامرازەکانی میدیا، لە پێشەوەیان کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکان وەک گوێزەرەوەی توندوتیژی، هەر دەمێننەوەو زیاتر پێش دەکەون، بەپێی ئەو زانیاری و ئاماژانەی پێشتر ئاماژەمان پێ کرد.

ئاراستەی گشتی بۆ پێشکەوتنی ئامرازەکانی میدیا لەرووی ناوەرۆک و شێوە خاوەندارییەکانی، بە پاشەکشەی توندوتیژی لە رووماڵکردنی میدیا مژدەبەخش نییە و، ئەگەر دەنگەکان لە ولاتانی پێشکەوتوو وردە وردە بەرز دەبنەوە، بۆ گەمارۆدان یان روبەڕوبوونەوەی هەژموونی بێدەنگ و میکانیزمەکانی، مەسەلەکە لە ولاتانی تازە گەشەسەندوو زیاتر لە پێویست دیارە، کە هێشتا نوێکردنەوە تیایدا بە قۆناغی لاسایی کردنەوەی نموونەکانی رۆژئاوا، لە نێوانیاندا نموونە میدیاییەکان تێپەڕ دەبێت، بیرکردنەوە لە کەناڵی هەواڵی تایبەتمەندی زیاتر لە شێوەی CNN تەنیا ئامرازی گوێزەرەوە بۆ توندوتیژی دەبێت و، بەشێوەیەکی سەرەکی خۆراکپێدەری دەبێت.

**کارکردن لە دوورەوە:**

شۆڕش لە ئامرازەکانی میدیادا بووە هۆی پەیدابوونی چەمکێکی نوێ ئەویش کارکردن لە دوورەوە بوو، کە پێویست ناکات تاک بۆ کۆمپانیا یان دەزگاکەی بچێت، بەڵکو دەتوانێت کارەکانی راستەوخۆ ئەنجام بدات و، بە بەرپرسانی بگەیەنێت. چاوەڕوان دەکرێ لەداهاتوودا دیاردەی قەرەباڵغی ڕێگاوبانەکان نەمێنێت، توێژەران کارەکەیان کەم دەبێتەوەو دۆزینەوەی کار دەبێتە پرسێکی ڕێتێچوو، کە تاک دەتوانێت

توانایەکی تەکنەلۆژی جۆراوجۆری هەبێت، چونکە کارو پیشـەکان لەوانەیە لەرێگەی ئینتەرنێـت و راوێژکارییـە جیـاوازەکان لـە رێگـەی پەیوەندیکردنـی میدیایـی بینراوو بیسـتراو ئەنجـام بدرێت، دواجار لەو پیشـە دەسـتیانە کورت دەکرێتـەوە کە ئاوەزی ئەلیکترۆنی ناتوانێت جێبەجێی بکات و زۆر کەمیشە، جەخت لەسەر مانەوەی لە ماڵان دەکرێتـەوە بۆئـەوەی کارە جیـاوازەکان ئەنجـام بـدات، بۆ نموونە لەوانەیە مامۆسـتا ناچار نەبێت بچێت بۆ زانکۆ یان قوتابخانە، دەکرێ پەیوەندی لەگەڵ قوتابیاندا هەبێت لەکاتێکـدا لـە ماڵی خۆیدایە، هەروەها لەوانەیە بەڕێوەبەری دەزگا یان کارگەکە ناچار نەبێ بـۆ چاودێـری کردنـی فەرمانبەرەکانی و دڵنیابـوون لـە بەڕێوەچوونی کارەکە، بەردەوام کارمەندان بەسـەر بکاتەوە، لە جێگەی ئەوە کامێرا لە گۆشـەکانی کارگەکە دادەنێ و بەشێوەیەکی ئەلیکترۆنی چاودێری کارەکە دەکات، بۆئەوەی بزانێت قەبارەو جـۆری کارکردنەکـە چۆنـە و فەرمانبەرەکان چۆن کارەکانیـان دەکەن و کەی دێن و دەڕۆنەوە.

پرسـی لـەم شـێوەیە ئەگەر روودەدات، ئـەوا کەلێنێکی گـەورە لە نێـوان تاکەکاندا دروسـت دەکات، کە تاکەکان دوور لە ویسـتی خۆیان بە هێزی دەرەکی کۆت دەبن، و وایـان لـێ دێـت وەک ئەوەی بەڕێوەبراو بـن، ناتوانن پەیوەندیـان هەبێت بۆئەوەی تێڕوانینیان بەشێوەیەکی دروست، ئەم پرسەش لەوپەڕی مەترسیدا دەبێت کە لەوانەیە رێککاری ناوخۆیی لەدەست بدەن، کە لە ئەنجامدانی ئەو کارە بە گرنگ دەزانرێت کە کەسـەکان لە پێناویدا بەبێ سانسـۆر ئەنجامی دەدەن، ئەم رێککارییە ناوخۆییە دەبێتە ئاستەنگێک لە رێگەی کارەکەدا. کاری خۆبەخشیش کەم دەبێ و، نەخۆشی دەروونی وەک دوو روویی لەپێناو چەسپاندنی خود دەردەکەوێ، یان نواندنی لە کارکردندا بە بێ ئەوەی بەشێوەیەکی کرداری ئەنجام بدرێت.

**داکشانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی:**

بەهـۆی زیادبوونـی بەکارهێنانـی ئامرازەکانی میدیـا لەلایەن تاکەکانیـدا کۆمەڵگە بـە گشـتی، تێبینـی کەمیی لـە پەیوەندی نێوان تاکەکانیدا کـراوە، ئەمەش بە روونی لە

خێزانـدا دەركـەوت، هەندێ لێكۆڵینـەوە بینییان قەبارەی ئەو كاتـەی ئەندامانی خێزان كـە لـە قسـەكردن لەگـەڵ یـەك بەسـەری دەبەن، كەمـی كـردووە. هەرچەنـدە لەگەڵ یەكیشدا دادەنیشن، هەروەها لێكۆڵینەوەكان نیشانیاندا كە سەردانە كۆمەڵایەتییەكان و سەردانی خزمان بە بەراورد لەگەڵ پێشتر كەمی كردووە، ئەمەش بۆ چەندین هۆكار دەگەڕێتـەوە، لەوانە سـەرقاڵبوون بە ئامرازەكانـی میدیا كە چارەكی ژیانی مرۆڤی بۆ خۆی بردووە.

چاوەڕوان دەكرێ پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان و خزمان كەم بێتەوە، ئەگەر ئامرازەكانـی میدیـا لـە پێشـكەوتن بەردەوام بن، ئیتـر هەندێ بۆنـەی كۆمەڵایەتی جا سەرەخۆشـی یان پیرۆزبایی لەرێگەی ئامرازەكانی میدیاوە بێت، بێ ئەوەی پێویسـت بكات دەبێت سەردانی جیاجیای كۆمەڵایەتی بكرێت.

یارییەكانـی ڤیدیـۆ رووی درەوشـاوەی جیهانی فرە پەیوەنـدی دەنوێنێت و، یاری سـێ رەهەنـدی پەیـدا بووە، وای لێ هاتووە لە نێـوان گەنجاندا جەنگ لەئارادا بێت، لە كاتێكـدا لـە ماڵەكانی خۆیان دانیشـتوونە و، بڕی ئـەو كاتە جیاواز بووە كە منداڵان لە یاریكردن لەم یاریانەدا بەسەری دەبەن، تەنانەت هەندێ ئامێر جگە لەم جۆرە یاریانە هیچیتر بەكارناهێنن، هەروەها سەرشـێتی منداڵان بە پەیوەسـتبوونی زیاد بەم جۆرە یاریانـە بەبـێ راوەسـتان و بـۆ چەنـد رۆژێـك زیاد بـووە، دواجار منـداڵان وایان لێ هاتووە بەشێوەیەكی زیاد بە واقیعی خەیاڵی دوور لە ژیانی راستەقینە پەیوەست بن.

ئەگەر وریای ئەم جۆرە یاریانە نەبین چاوەڕوان دەكرێ لە دواڕۆژدا ئارەزوویەكی سەركێش لای هەندێ لە منداڵان دروست بكات، بە جۆرێك لە دانیشتن و ئەنجامدانی ئەم یاریانە زیاتر بەردەوام بن و، ئەم یاریانە پێش دەكەون و ئیتر یاریكردن پێی تەنیا بۆ تام و چێژ نییە، بەڵكو بۆ وەدیهێنانی دەسكەوتی ماددی جۆراوجۆرە.

**زانین و ئامرازەكانی میدیا:**

دەكرێ لەرێگەی هەسـتەكانی مرۆڤەوە درك بە (زانین) بكرێ، ئەمەش بریتییە لە "كەڵەكەبوونی شارەزاییەكانی مرۆڤ لەبارەی پەیوەندییەكانی نێوان شتوومەك و ئەو

شتانەی لە ژیانی مرۆڤدا هەن، ئەمانەش بە بەکارهێنانی ڕێبازی توێژینەوەی زانستی دەبن بە ڕاستی».

زانین هێزە، چونکە هێزی دەوڵەتان ئێستا بە بڕی بەرهەمهێنانی بۆ زانیاری و، دروستکردنی و ئاڵوگۆڕو بازاڕکارییەکەی دەپێورێت، هەموو سەرچاوەکانی هێزی هەنووکەیی ئایندەیی، جا دارایی، سەربازی، پیشەسازی یان کلتووری بێت، پشت بەو بنەمایە دەبەستی کە لە زانیارییەوە پێشکەش کراوە.

زانین مەسەلەی سەرەکی ستراتیژییە کە بەدڵنیاییەوە لە سەرەتای هەزارەی سێیەمدا بەرەو دواڕۆژمان دەبات، زانین و جێبەجێکردنە تەکنیکییەکانی و دابەشکردنەکەی وای لێ هاتووە، جڵەوی چالاکی مرۆیی لەسەر هەموو ئاستەکاندا سەرکردایەتی دەکات، هەروەها جۆری ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە و چارەنووسەکەی لەهەمان کاتدا دیاری دەکات، هەروەها لەئێستاو دواڕۆژدا پێگەی نەتەوەکان لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی دیاری دەکات، بەم شێوەیە دەکرێ زانین پێناسە بکەین کە «هێز یان دەسەڵات یاخود پارەیە و، ناونیشانی پێگە و کەرامەتی نیشتمانە».

بەهۆی پێشکەوتنی ئامرازەکانی میدیا، ئێستا هەندێ کەس لە کۆمەڵگەکان تەنیا لەرێگەی ئامرازە جیاوازەکانی میدیاوە زانیاری وەردەگرن، بە بێ پێویست بە کتێب یان گەڕان بە دوای زانیاری لە سەرچاوە سەرەکییەکان، پێشتر ئەگەر پرسەکە بۆ کەسەکە سەخت بکرایە، ئەوا لە شامەوە بۆ بەغدا دەهات، بۆئەوەی کەسێک بدۆزێتەوە وەڵامی بداتەوەو زانیارییەکی گونجاوی پێشکەش بکات، هەروەک زانست بۆ ئەو دەهات نەک بۆ کەسی دیکە، بەڵام ئەمڕۆ مامۆستایان خۆیان دەچن بۆ ماڵی قوتابییەکان بۆئەوەی وانەی تایبەتیان پێ بڵێنەوە، لەهەمان کاتدا قوتابی هەوڵێکی زۆر نادات بۆئەوەی بە زانین بگات، چونکە هەر کتێبێکی قوتابخانە ڕێبەرێکی لەگەڵدایە قوتابی دەتوانێت لە کتێبخانەکانی دەرەوە بیکڕێت و، پارەتی دەدات بۆ وەڵامدانەوەی ئەرکەکانی و ئەو ئەرکانەی کە دەخرێتە ئەستۆی بداتەوە، چیتر پێویستی بە هەڵگرتنی هیچ کتێبێکی دەرەکی یان ڕۆشنبیری نەماوە، لەبەرئەوەی ئینتەرنێت ملیۆنەها کتێبی ئەلیکترۆنی تێدایە، تەنانەت ئەگەر تاک ناچار بوو کتێبێک هەڵبگرێت، ئەوا کاتی

پێویستی نییە بیخوێنێتەوە، ئێستا تاکەکان بۆ خوێندن پشت بە کتێبی مەنهەجی دەبەستن و، لە کۆمەڵگەدا بە ڕەواجترو بەربڵاوتر بووە، ئەمە جگە لەوەی کتێب بۆ خۆی لە تێڕوانینی هەمواندا قورس دێتە بەرچاو، تا ئاستێک هەندێ پێیان سەیرە کەسێک کتێبێکیان بۆ بکات بە دیاری، یاخود ببینن کتێبێکی بەدەستەوەیە.

بەڵام چاوەڕوان دەکرێ لە ئایندەدا، پێشوازیکردن لە ئامرازە کلاسیکییەکانی زانین کەم بێتەوەو، تەنها پشت بە ئامرازەکانی زانین لە ڕێگەی ئینتەرنێت و کەناڵە ئاسمانییەکانەوە ببەسترێ، لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەمانە بەس نییە بۆ پێویستی تاک لە رووی زانیاری و زانینەوە، هەروەک هەندێک لەو بڕوایەدان.

**بەهاو ئامرازەکانی میدیا:**

لێکۆڵینەوە تازەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە شەڕی بەهاکان لە دواڕۆژدا زیاتر دەبێت و، ئامرازەکانی میدیا وا دەکەن لەم شەڕەو ئامادەباشی بۆی زیاتر پێداگیر بێت، لەبەر چەند هۆکارێک، پێشکەوتنی ئامرازەکانی میدیا بۆ بەهاکان لایەنی خراپی زۆرە، وای لێ هاتووە ئامرازەکانی میدیا بەهاکان هەڵدەسووڕێنن، وەک زانراوە بەهاکان تاڕادەیەک جێگیرن، بەڵام بەهۆی قەڕەباڵغی ئامرازە جۆراوجۆرەکانی میدیاوە دەستی بە شلبوون و کشانەوە کردووە، هەروەها چیتر وەک پێشوو ژیانی تاکەکانی کۆنترۆڵ نەکردووە، بەداخەوە ئەمەش بەهۆی ئامرازەکانی میدیاوە بوو، چونکە بە رووخسار بۆتە نموونەیی بەڵام واقیعێکی تاڵی هەیە، بۆ نموونە کوڕ لەبەردەم باوکیدا تەماشای بەرنامە و زنجیرە دراماو فیلم دەکات، کە لەئاست بەهاکانی باوکی و بەهاکانی ئەو کۆمەڵگەیەیە کە تیایدا دەژیت، بەڵام کە باوکی دەچێتە دەرەوەو بەتەنیا دەمێنێتەوە، ئەوا هەموو بەهاکانی پێشوو دەڕووخێن و بەداخەوە لای هەندێ لە کوڕان بەتایبەتی گەورەکان دەست بە تەماشاکردنی ئەو فیلمانە دەکرێ، کە لەگەڵ بەهاکانی ئەو کۆمەڵگەیە ناگونجێت.

لە خراپییەکانی ئینتەرنێت و میدیای ئاسمانی ئەوەیە، وای کردووە بەهاکان بەهیچ جۆرێک چەسپاو نەبێت، بەمەش ئێستا زۆر پێویستە ئەوانەی تازە پێ دەگەن بە

سیستەمێک لە بەهاکان بارگاوی بکرێن، کە لە کاریگەرییەکانی حەزبزواندنی کەسیی بیانپارێزێت، چونکە سانسۆر لە دوورەوە چیتر بێ کەڵکە، ئەگەر لە بنەڕەتدا لە رووی تەکنیکەوە پاساویشی نەبێت.

بەڵام لە دوارۆژدا ئەگەر چارەسەرێک بۆ ئەم کێشە گەورەیە نەدۆزێتەوە، چاوەڕوان دەکرێ نەوەیەک بکەوێتەوە بەر بەزەیی یاری پێکردنی میدیایی و پیشەسازی خەونەکان و بێ هۆشکردنی مێشکەکان و، رووکەشکردنی ئاگاو راکردنی هەناسەسوارانە بە دوای چێژی هەنووکەیی، کە هەندێ ئامرازی میدیا رێکلامی بۆ دەکەن، پێویستە دەزگا نیشتمانییەکان کار بکەن بۆئەوەی تاک بە بەهاگەلی بەهێز بارگاوی بکەن، کە وای لێ بکات ژیانێک بونیات بنێ کە شیاوی گەشەکردنی بەردەوام بێت، وەک بەهاکانی کۆشش و پابەندبوون و بەرپرسیارێتی لەبارەی چارەنووس و بەشداری و هاریکاری.

## بەشی دوانزەیەم
## فشار و سووتانی دەروونی لە میدیادا

بابەتی فشاری دەروونی و دەرەنجامەکەی لەسەر کەسەکان، لە بابەتە گرنگەکانە کـە ئـاوەزی زانـاو توێژەرانـی لـە بوارەکانی تەندروسـتی گشـتی و دەروونناسـی و سـەرجەم زانسـتە مرۆییەکاندا سـەرقاڵ کردووە، لەبەر ئەو کاریگەری و دەرەنجامە مەترسیدارو وێرانکەرەی لەسەر ژیانی خەڵک بە تاک و کۆمەڵ جێ دەهێڵێت، پسپۆرانی ئـەم بـوارە وای دەبینن فشـاری دەروونی یەکێکە لە کێشـەکانی ئەم سـەردەمە و، بە روونی دیارە کۆمەڵگەکانی لە لایەنەکانی سیاسی، ئابووری، یان کۆمەڵایەتی نیگەران کردووە و، کارلێکە بەردەوامەکانی و دەرهاوێشـتەکەی و، ئەوەی لێی دەکەوێتەوە لە زۆر نەخۆشی لەش وەک نەخۆشییەکانی دڵ و بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و برین.

هەر لە کۆنەوەو بەتایبەتی لە سەرەتای چاخی ئیسلامەوە، پەیڕەوکردنی پزیشکی لای پزیشـکان و زانایانـی موسڵمان، لەبـارەی گەڕانـی چالاک لەبارەی ئـەو هۆکارە دەروونییانـەی یارمەتـی چاکبوونەوە دەدەن یان دوای دەخەن و، بایەخی شـێخ ئیبن سیناو رازی و ئەوانی دیکە بە هۆکارە خێراکەرەکانی چارەسەربوون و تەندروستی و بە نەریتە تایبەتییە پزیشکییەکانیش و، هاوسەنگی لە خواردن و خواردنەوەو، باوەڕو ئاشـتی دەروونـی و خـەوی باش، بەڵگەی بەهێزن کە ئەوان درکیان بە دەسـتوەردان و کارلێکی زیندەگی لەنێوان دەروون دروسـتی و نەخۆشـی جەسـتەیی کردووە، واتە لەنێوان ئەوەی دەروونییە و ئەوەی جەستەییە.

بایەخـدان بـە لایەنـە دەروونییـەکان گەلێـک ئەنجامـی ئەرێنی لێکەوتـەوە، ئەوەی پەیوەسـتە بە پێشـکەوتنی لێکۆڵینەوەی نەخۆشـییەکان لەڕووی دەستنیشـان کردن و چارەسـەرکردنیەوەو، لەپاشـان راسـتی هاوچەرخی پزیشـکی چیتر چارەسـەری ئەم کۆمەڵـە نەخۆشـییانەی بـەدڵ نەبـوو، بەوپێیـەی بە تەواوی نەخۆشـی جەسـتەیین و پێویستە چارەسەرییەکەی تەنیا چارەسەری لایەنە جەستەییەکان بگرێتەوە، هەروەها

چیتر پەسند نەدەکرا کە پەیڕەوکاری پزیشکی خۆی لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم نەخۆشییانە دوور بگرێت، کاتێک وا تەماشای دەکات بەوەی نەخۆشی راستەقینە نین و، بەتەواوی بۆ بنەمای دەروونی نەزانراو دەگەڕێنرێتەوە.

ئامارە جیهانییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ٨٠٪ی نەخۆشییە تازەکان هۆکارەکەی فشارە دەروونییەکانە و، ٥٠٪ی کێشەی ئەو نەخۆشانەی سەردانی پزیشک و نەخۆشخانەکان دەکەن هۆکارەکەی فشاری دەروونییە و، ٢٥٪ی لە تاکەکانی کۆمەڵگە بەجۆرێک لە جۆرەکان کێشەی فشاری دەروونییان هەیە. ئامارەکان لە ئەمەریکا ئاماژە بەوە دەکەن کە ٥٠٪ یان زیاتری تاکەکانی ئەو وڵاتە بەلای کەمەوە بە دەست نیشانەیەکی شڵەژانی دەروونی لەش دەناڵێنن و، ٧٥٪یان ئەو نەخۆشییانەیان هەیە کە بەهۆی فشاری دەروونییەوە دروست بووە، وەک برین و ناڕێکی گەدە، خێرایی ترپەکانی دڵ، سەرئێشەی توند، ژانی نیوە سەر، بەرزبوونەوەی فشاری خوێن هەروەها ئازارەکانی پشت.

**پێناسەی فشاری دەروونی:**

چەمکی فشاری دەروونی هێشتا لە تەمومژترین چەمکەکانە و، سەختییەک لە دەستنیشانکردنی پێناسەکەی و لێکۆڵینەوەی بەشێوەیەکی ورد هەیە، ئەمەش لەبەر پەیوەست بوونی بە چەند چەمکێکی نزیک لێی لەڕووی مانـاوە، هەروەها پەیوەستبوونی بە ئاراستەی جیاوازی تیۆری، زانایان و توێژەران نەگەیشتوونەتە رێککەوتنێکی دیاریکراو لەبارەی مانای «فشاری دەروونی»، هێشتا ئەم زاراوەیە ناڕوونە و پێویستی بە توێژینەوەو وردیی و دەستنیشانکراوی زیاتر هەیە.

هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە بەبێ جیاوازی رۆژانە تووشی سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی فشاری دەرەکی دەبنەوە، لەوانەش فشارەکانی کارکردن، خوێندن، فشاری خێزانی، فشاری پەروەردەی منداڵ، چارەسەرکردنی کێشەکانی تەندروستی، کاروباری دارایی، زیادبوونی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان یان گواستنەوەی بۆ ژینگەیەکی تازە، دەستەوەستان لە رێکخستنی کات، یان گەشت و ململانێ خێزانییەکان، زیادبوونی

ئـەو کارانەی پێویسـتە ئەنجـام بدرێن هەروەها قەیرانە جیاوازەکان کە بەشـێوەیەکی چاوەڕوانکراو یان نەکراو روبەڕووی دەبینەوە.

کەسـەکان رۆژانە تووشـی ئەو فشـارانە دەبنەوە کە سـەرچاوەکانیان ناوخۆییە، وەک فشـاری خواردنـی داوو دەرمـان و خراپـی ئەنجامەکـەی. بەواتایەکیتر، لیسـتی فشـاری دەروونـی فـراوان و درێـژە، سـەبارەت بـە مرۆڤـی ئاسـایی، شـارەزایی و هەڵوێسـتی جۆراوجـۆر دەگرێتـەوە کە لە کاتی زیادبـوون و کەڵەکەبوونی و لە کاتی نەتوانین لە مامەڵەکردن لەگەڵ هەندێ لە دەرەنجامە خراپەکانی تایبەت بە نەخۆشەکە و پشێوییەکە بەدەنگییەوە دەچین، جا دەروونی یان ئەندامی بێت.

ئـەم چەمکـەی لە دەروونناسـی و پزیشـکی دەروونـی بەکارهێنانی بـڵاو بۆتەوە، لـە لێکۆڵینـەوە ئەندازەیـی و فیزیکییـەکان وەرگیـراوە، کاتێـک ئامـاژەی دەکـرد بـە (کۆششکردن Strain و، فشار Press و، ئەرک Load).

(هانز سـیلی Hans Selye) پزیشـکی کەنەدی بە یەکێک لە یەکەمین پزیشکەکان دادەنـرێ کە باسـیان لەم بابەتە کـردووەو، لە دەوروبەری سـاڵی ١٩٥٦ زەمینەیەکی زانسـتی تەواویان پێ داوە، ئەو هەر زوو تێبینی ئەوەی کرد کە وێڕای جۆراوجۆری سـەرچاوەکانی نەخۆشـی و سـکالای نەخۆشـەکان، ئەوا لە تایبەتمەندی هاوشـێوەو نیشـانەی چوونیەکـی نەخۆشـی هاوبەشـن، سـەرەڕای ئـەو نیشـانە جۆرییانـەی کە چارەسـەری دەکات و بـە نەخۆشـی تایبـەت بـە هەریـەک لەوانـە پەیوەسـتە، چونکە هەموو نەخۆشـەکان بەدەسـت خراپی حەزکردن لە خواردن و لاوازی ماسـوولکەیی، هەروەها بایەخ نەدان بە ژینگە دەناڵێنن، لەپاشان (سیلی) وای لێکدایەوە کە نەخۆشییە جیاوازەکان لە دروسـتکردنی پاشکۆ لە نیشانەکان کە ناوی پاشکۆی فشاری گشتی، سەرەڕای نیشانە جۆرییەکانی تایبەت بە هەر نەخۆشییەک هاوبەش دەبن.

توانـای لـەش بـۆ خۆگونجاندنی مەبدەئی و گونجان بۆ فشـارەکان، (سـیلی) ناوی لـێ نـا وزەی خۆگونجانـدن، دووپاتیشـی کـردەوە کـە بـەردەوام بەرەنگاربوونەوەی فشـارەکان وردە وردە دەبێتە هۆی لەدەسـتدانی ئەو وزەیە و هەرەسهێنانی، لەپاشان توانای لەش -لەبارە مرۆییەکاندا- لە بەرگەگرتن لاواز دەبێ، بەمەش نەخۆشی و زوو

مردن روودەدات. ئەندامە لاوازەکانی لەش سەرەتا بەپیر فشارەکانەوە دەچن، چونکە ئەوان لە ئەندامەکانیتر زووتر نەخۆش دەکەون لە نەخۆشییەکانیتر راڤە دەکات، بۆ نموونە لە کاتی شکستهێنانی کۆئەندامی بەرگری لە نەخۆشی، برینی شێرپەنجەیی دروست دەبێت و، کاتێک سووڕی خوێن و دەمارەکان شکست دەهێنن لە ئەنجامدانی ئەرکەکەی وەستانی دڵی لێ دەکەوێتەوەو، کاتێک دەزگای کۆئەندامی هەرس لە راپەڕاندنی ئەرکەکانی شکست دەهێنێت، بەهۆی کەمی بڕی خوێن کە پێی دەگات لەئەنجامی ئەو پەشۆکاوییەی کە ئەم فشارانە دەیورووژێنێت، ئەوا نەخۆشیگەلی گەدە دێتە ئاراوە.

فشاری دەروونی وەک (سیلی) پێناسەی دەکات بریتییە لە «بەدەنگەوەهاتنی دیارینەکراوی لەشە بەرامبەر هەر ئەرکێک کە دەبێ ئەنجامی بدات، ئەگەر هۆکارێک بێت یان ئەنجامی بارودۆخێکی بە ئازار یان ناخۆش بێت».

**(سیلی) سێ قۆناغی بۆ روبەڕوبوونەوەی فشاری دەروونی دەستنیشان کرد:**

**١- وریابوون (Alarm):**

تەنها بە درککردنی بوونەوەری زیندوو بە بوونی سەرچاوەیەکی فشار دەست پێ دەکات، جا ئەو فشارە دەروونی یان کۆمەڵایەتی بێت، لێرەدا لەش چەندین گۆڕانکاری و بەدەنگەوەهاتنی دەبێت، لە ئەنجامی ئەوەشدا بەرەنگاری لەش کەم دەبێتەوە، لە کاتی فشاری توندیشدا ئەم بەرەنگارییە بەتەواوی نامێنێت.

**٢- بەرەنگاری (Resistance):**

لەش هۆرمۆنگەلێک دەردەدات یارمەتی بەرەنگاربوونەوەی دەدات و، ئەو بەدەنگەوەهاتنانەی لە قۆناغی یەکەمدا روویاندا نامێنن و، گۆڕانکاری و بەدەنگەوەهاتنگەلێک دەردەکەون کە نیشانەی خۆگونجاندنن.

**٣- لەناوچوون (Exhaustion):**

دوای توشبوون بە هەمان فشار بۆ ماوەیەکی زۆر کە لەش هەوڵی خۆگونجاندنی لەگەڵ دەدا، وزەی پێویست بۆ خۆگونجاندن لەوانەیە لەناوبچێت و هەرەسهێنانی کۆتایی روودەدات و بوونەوەرەکە دەمرێت.

فشـار چەمکێکـە ئاماژەیـە بۆ ئاسـتی بەدەنگەوەهاتنـی تاک بـۆ ڕووداوەکان، یان گۆڕانکارییـە ژینگەییـەکان لـە ژیانـی ڕۆژانـەدا، ئەم گۆڕاوانـە لەوانەیـە ئازارهێن بن و هەنـدێ شـوێنەواری فسـیۆلۆژی دروسـت بکەن. لەگـەڵ ئەوەی ئـەو کاریگەرییانە لە کەسـێکەوە بۆ کەسـێکی دیکە دەگۆڕێت، بەپێی پێکهاتەی کەسـێتی و تایبەتمەندی دەروونی کە لەوانی دیکە جیای دەکاتەوە، کە جیاکارییەکی ئاساییە لەنێوان کەسەکانداو (ماکنـک) وای ناسـاندووە، «ئەو سـەختیانەیە کە مرۆڤ بەهۆی شـارەزایی تووشـی دەبێت، کە لە ئاکامی درککردنێتی بەو هەڕەشانەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە».

(لازاروس) بوونـی تێکەڵبوونـی هـەردوو چەمکـی فشـاری دەروونـی و نیگەرانی دووپـات دەکاتـەوە، کـە ئەمەی دواییان بە دەرەنجامی فشـاری دەروونی دادەنرێت، کە پەیوەندییەکی دوو لایەنە لەنێوان تاک و ژینگەدا هەیەو، ئەم پەیوەندییە لە هەردوو بـاردا ئاڵوگـۆڕە، دووپاتیشـی دەکاتـەوە کە فشـاری دەروونی دەرەنجامی پرۆسـەی هەڵسەنگاندنی هەڵوێستە هەڕەشە لێکراوەکانە، کە تاکێک لە یەکێکیتر جیا دەکرێتەوە.

(لازاروس ١٩٨٤-١٩٦٦) وا پێناسـەی دەکات بـەوەی «دەرەنجامـی پرۆسـەیەکی هەڵسـەنگاندنە کـە تـاک سـەرچاوە خودییەکانی هەڵدەسـەنگێنێت، بۆئـەوەی مەودای توانابیەکـەی لـە دەسـتەبەرکردنی پێویسـتییەکانی ژینگە بۆ دەربکەوێت، واتە ئاسـتی گونجاوی نێوان پێویستییە ناوەکییەکانی تاک و ژینگەی دەرەوە».

زاراوەی فشـاری دەروونـی لای زۆر لـە زانایـان وەکـو هاوواتـای نیگەرانـی، تێکشـکان، ململانـێ، بەرگری، هەنـدێ هەڵچوونی تووڕەیی و ترس بـەکار دەهێنرێت، بەڵام ئەم زاراوەیە بۆتە شـتێکی باوو بەشـێک لە زاراوەکانی ئەم سـەردەمە و مانای تایبـەت بـە خـۆی هەیە، فشـارە دەروونییـەکان بـە دیاردەیەکی مرۆیـی دادەنرێن کە شـارەزاییەکی زۆر ئازاربەخشی لێ بەرهەم دێ، کاریگەرییەکەی بەشێوەیەک لەسەر ڕەفتار هەروەها لەسەر خۆگونجاندن دەردەکەوێ.

کەواتـە فشـار «بریتییـە لـە گرژیـی، یـان سـەختییەکی جەسـتەیی، عەقڵـی یـان هەڵچوونی، بەهۆی داواکاری یان فشـاری ژینگەیی، یان هەڵوێسـتەیی یاخود کەسـیی ڕوودەدات»، وەک ئـەوەی ئافـرەت بشـڵەژێت کاتێک بەهـۆی قەرەباڵغی ڕێگەوبان لە

کارەکـەی دوا دەکەوێـت و، ئـەو نیگەرانە لەبەرئەوەی لـە کۆبوونەوەیەکی گرنگ دوا کەوتووە، فشارگەلێکیش هەن ماوەیەکی زیاتر دەمێننەوەو تەنگ و چەڵەمەی گەورەتر لەخۆدەگرێـت، وەک: یەکێـک لـە ئەندامانی خێزان تووشـی نەخۆشـییەکی درێژخایەن بێت، یان سـەرباز بۆ ماوەیەکی زۆر لە بەرەکانی جەنگدا شـەڕ بکات. بە گشتی فشار زیاتر دەبێت کاتێک ڕووداوەکان لەپڕ ڕوو دەدەن، وەک مردنی لەناکاو.

فشاری دەروونی دەکرێ بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەش بکرێن: (فشاری ئەرێنی) کە هاندەرە بۆ تاک و، (فشاری نەرێنی) کە دەبێتە هۆی پەژارەو وەڕسیی بێ کەسەکە. فشـار دیاردەیەکـی تاکـە کەسـییە، کاتێـک هەندێ خەڵک بە فشـارێک کاریگـەر دەبن، ئەوا هەندێکیتر پێی کاریگەر نابن، ئەمەش پشـت دەبەسـتێ بەوەی درکی پێ دەکەین، لەوانەیە درک بە هاندەرەکان وەک ڕووداوگەلی فشارهێن بکەین یان نەیکەین، بڕێکی دیاریکـراو لـە فشـار یارمەتیمـان دەدات کارەکان بە کارایی ئەنجـام بدەین و، وێنەی دادێ ئەو کارە ڕوون دەکاتەوە کە پێویسـتمان پێیەتی، چونکە زیادو کەمییەکەی کار دەکاتە سەر ئاستی ئەرکەکە و تەوەری ئاسۆیی هاندەرەکان و، هەر لە ئاستی نزمەوە بۆ ئاسـتی بەرز پێویسـتییەکان دەردەکەوێ، بەڵام تەوەری شـاوولی ئاسـتی کارەکە دەردەخات، ئاستی زۆر نزم ئەرکێکی نا کارا بەرهەم دەهێنێت، واتە کاتێک مەسەلەکە بەرەنـگاری تواناکانمـان نابێتـەوە، ئـەوا لـە دەرخسـتنی تواناماندا شکسـت دەخۆین، کەواتە بڕێک هاندەر دەسکەوتەکانمان زیاتر دەکات، بۆ نموونە وانە هاوسەنگەکان لە وەرزشـدا کارایی بەرهەم دەهێنێت، یارمەتی کەسـەکە دەدات بەرەنگاری یاریزانانی تر بێتەوەو بگاتە لوتکەی کارایی.

**تیۆرەکانی فشاری دەروونی:**

زۆر لە تیۆرەکان لە بواری دەروونناسی ئاماژەیان بە سروشتی فشاری دەروونی و چۆنێتی لێکدانەوەی کاردانەوەکانی پەیوەست پێوەی کردووە، ئەو کاریگەرییەی لە هەموو لایەنەکانی کەسیی کەسەکە لێی دەکەوێتەوە. بە دیاردەیەکی ئاڵۆزی دەروونی دانرا، بۆیە توێژەران لەم بابەتەدا توێژینەوەیان کرد، دواجار تیۆرگەلێکیان پێشکەش

کرد کە ئەم دیاردەیە لێک بداتەوە، لەوانە:

### ▪ تیۆری کۆششی هانز سیلی:

(سیلی) یەکەم کەس بووە لە فشارە دەروونییەکانی کۆڵیوەتەوە، بەوپێیەی لە هۆرمۆنەکان و لێکۆڵینەوەی فسیۆلۆژی و دەماردا پزیشکی پسپۆر بووە، ئەو وای دەبینێت هەموو کەسێک لە ژیانیدا کۆمەڵێک فشاری دەروونی هەیە و، بڕێکی گونجاو لە فشارە دەروونییەکان یارمەتی تاک دەدات بۆئەوەی کارەکەی باشتر رابپەڕێنێت، بەڵام فشارە توندەکان هاوسەنگی لەش تێک دەدەن.

### ▪ تیۆری بەرەنگاری یان راکردن:

تیۆری زانای فسیۆلۆژی (ویلتەر کانون Welter Cannon)ە، بە یەکەمین ئەو تیۆرانە دادەنرێت، کە پشتی بە لایەنە بایۆلۆژییەکان لە راڤەکردن و لێکۆڵینەوەی فشارە دەروونییەکان بەست، ئەم تیۆرە دووپاتی دەکاتەوە کە ژیانی مرۆڤ زۆر رووداوی فشارهێنی ویستراوو نەویستراو لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت کە لەوانەیە هەڕەشە لە ژیان بکات، کەسەکان ناچار دەکات کۆشش و خەبات بکەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم رووداوانە یان لێی را بکەن و زۆر لێی دوور بکەونەوە. ئەم تیۆرە وای دەبینێت کەسەکان کاتێک روبەڕووی هەڵوێستی فشارهێن دەبنەوە، چەندین گۆڕانکارییان لێ دەردەکەوێت، وەک: بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، زیادبوونی خێرایی هەناسەدان، هەروەها توندبوونی ماسولکەکان، ئەم گۆڕانکاریانەش لەش ئامادە دەکات تاکو بەرەنگاری مەترسییەکە ببنەوە یان لێی را بکەن.

### ▪ تیۆری چارەسەری ماریفی Aaron. T. Beck:

ئەم تیۆرە دووپاتی دەکاتەوە ئەوانەی خەمۆکن و فشاری دەروونییان هەیە، ئەو کەسانەن تێڕوانینی شڵەژاوو هەڵەیان لە بیرۆکە و رایەکانیان هەیە، کە دەربڕی ئاراستە و بیرو باوەڕەکانیانە بەرامبەر خۆیان و رووداوە فشارهێنەکان، کە لەراستیدا لەوە مەترسی کەمترە کە کەسەکان درکی پێ دەکەن.

ئـەم تیـۆرە وای دەبینێـت ناکـرێ فشـاری دەروونـی دابـڕێنرێـت لـەوەی تاک لە ژینگەکـە یـان بواری دەوروبـەری فێری دەبێت و، فشـارە دەروونییەکان تێکچوونێک لە ڕێکخسـتنی ئاوەزیی و ئەرکە مێشـکییەکان دروسـت دەکات و هەندێ لە شـێواندن دروست دەکات، لەوانە:

- هەموو شـتێک یان هیچ شـتێک: ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە شـێواندنێکی زانینییە، چونکـە لەسـەر بنەمـای بوونـی دوو حاڵەتـی تونـدڕەو بـۆ هـەر تایبەتمەندیـەک و، فەرامۆشکردنی ژمارەیەک ئەگەر دەوەستێ.

- گشتاندن: ئارەزووکردنە بۆ بڕیارە ڕەهاکان و گشتاندنە توندڕەوەکان.

- کەمکردنــەوە لـە گرنگی ڕووداوە ئەرێنییـەکان: ئارەزووکردن بۆ کەمکردنەوەی گرنگـی ڕووداوە ئەرێنییـەکان کـە تـاک پیایدا تێپـەڕ دەبێت، یان گۆڕانـی بۆ ڕووداوە نەرێنییەکان.

- تایبەتمەندێتـی: کەسـەکە خۆی بە هۆکارێـک دەزانێت بۆ ڕووداوە دەرەکییەکان، بێ ئەوەی شتێک هەبێت بۆ ئەمە پاساو بێت.

**جۆرەکانی فشاری دەروونی:**

هەنـگاوی یەکـەم بـۆ کەمکردنەوەی ئاسـتی فشـار بە گشـتی بە کارکـردن بەپێی لیسـتی شـێوازەکان و بڕی فشـارەکان لە ژیاندا دەبێت، ئەمەش لە ڕێگەی نووسـینی یاداشـتنامەوە دەبێت، کە یارمەتیدەرە لە تێگەیشـتن لەو فشـارانەی تاک بەدەستییەوە دەناڵێنێـت و، توندیـی ئـەو فشـارانە و چـۆن بەدەنگییـەوە دەچێت، ئەگـەر بڕیارت دا فشـاریِ زۆرت لەسـەرە، ئەوا پێویسـتت بەوەیە هەندێ کار ئەنجام بدەیت، تاکو لەو فشـارانە ڕزگارت بێـت، بۆ نموونە پێویسـتت بە پەیڕەوکردنـی پلانێک هەیە بۆئەوەی بەسـەر ئەو فشـارانە زاڵ بیت، بەڵام لە بێ بەختی ئەو توانایەت نییە بەسـەریاندا زاڵ بیت، چونکە هەندێ شت کە فشارمان لەسەر دروست دەکەن بەبێ ئاگایی پەیدا دەبن، لەم ڕووەوە هەندێ لەو فشارانەی بەدەستییەوە دەناڵێنن بۆ سێ بەش پۆلێن کراون:

- ئەو فشـارانەی دەکرێ لە داهاتوودا پێشـبینی بکرێن و دەکرێ بەسـەریاندا زاڵ

بین.

- ئەو فشارانەی دەکرێ لە داهاتوودا پێشبینی بکرێ و ناکرێ بەسەریاندا زاڵ بین.

- ئەو فشارانەی ناکرێ پێشبینی بکرێت و ناکرێ بەسەریاندا زاڵ بین.

ئەمەش واتای ئەوەیە هەندێ فشار هەیە بەبێ پێشبینی ئێمە روو دەدەن و، دەشێ لەگەڵ پۆلێنی یەکەم و دووەم کار بکەین، کە دەکرێ یاداشتنامەیەک بۆ چەند هەفتەیەک ئامادە بکەین، بۆئەوەی هۆکارەکانی فشارەکە لە خەڵک و هەڵوێست و رووداوە جیاجیاکان بە نموونە بناسین، دواتر دەکرێ ئەوە هەڵبسەنگێنین ئایا ئەم فشارانە پێویست بە ئامادەکردنی پلانێک هەیە، تاکو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

فشاری دەروونی بەپێی جیاوازیی قوتابخانەکانی دەروونناسی جۆراوجۆرە، زانایانی دەروونناسی ئاماژە بە چەند جۆرێک لەمە دەکەن:

١- فشاری سووک: بەدەنگەوەهاتنی کەم لەگەڵ کۆمەڵە نیشانەیەکی فشارو ئاکامەکانی لێ بەرهەم دێ، کە بەئاسانی تێبینی دەکرێت.

٢- فشاری توند: بەدەنگەوەهاتنی زۆرو بەهێزی لێ بەرهەم دێ، بەجۆرێک لە توانای تاک بۆ بەرەنگاربوونەوەی زیاترەو، ئەم بەدەنگەوە هاتنی ئاساییە ئاماژەیە بەوەی پێویستە دەستێوەردان بکرێت.

٣- فشاری درەنگوەخت: هەمیشە لە کاتی رووداوەکەدا دیار نییە، بەڵکو پاش ماوەیەک دەردەکەوێت.

٤- فشاری دوای شۆک: لە ئەنجامی رووداوی توندوتیژو بەرز سەرهەڵدەدات، شوێنەوارەکەی بەشێوەیەکی درێژخایەن لەسەر بوونەوەری زیندوو جێ دەهێڵێت.

گرنگە بزانرێت فشارە دەروونییەکان بۆتە بەشێک لە ژیانی رۆژانە، ناچارمان دەکات هۆکارەکانی بزانین بۆئەوەی کاریگەرییەکەی کەم بکەینەوە.

**«سیلی» ئاماژەی بە دوو جۆر لە فشاری دەروونی کرد:**

- فشاری دەروونی خراپ: لە قەبارەی پێویستییەکانی سەر تاک زیاد دەکات، هەروەها بەئازاریش ناودەبرێت وەک لەدەستدانی کار یان لەدەستدانی ئازیزێک.

- فشاری دەروونی باش: دەبێتە هۆی دووبارە خۆگونجاندن لەگەڵ خود یان

ژینگـەی دەوروبـەر، وەک لەدایکبوونـی منداڵێکـی تـازە یان گەشـتکردن بـۆ کار یان خوێندن.

**(سیلی) باسی دوو جۆر فشاری دەروونی دەکات کە بریتین لە:**

☒ فشـاری زۆری دەروونـی: کەڵەکەبوونـی ڕووداوە نەرێنییەکانی فشـاری نزمی دەروونـی لـێ دەکەوێتـەوە، بەجۆرێـک سـەرچاوەکانی تـاک و تواناکانی لـە گونجان لەگەڵیدا تێدەپەڕێنێت.

☒ فشـاری نزمـی دەروونـی: ئـەو کاتـە ڕوودەدات کـە تاک هەسـت بـە بێزاری و نەبوونی ململانێ و وورووژاندن دەکات.

(سـیلی) دووپاتـی دەکاتـەوە کە مرۆڤ لە ژیانیدا هەمیشـە بەدەسـت جۆرێک یان چەند جۆرێک دەناڵێنێت، لەو چوار فشارەی ئاماژەمان پێ کرد.

**(لازاروس و کۆهـن) Lazarus & Cohen جیاوازییـان لەنێـوان ئەم دوو جۆرە فشارەدا کردووە:**

**یەکەم: فشارە دەرەکییەکان:**

مەبەسـت لێی ڕووداوە دەرەکییەکان و هەڵویسـتەکانی دەوروبەری کەسەکەیە و، لە ڕووداوە سادەکانەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ڕووداوە توندەکان.

**دووەم: فشارە ناوخۆییەکان (کەسیی):**

مەبەسـت لێـی ئـەو ڕووداوانەیە لە ئەنجامی ئاراسـتەی درککردن بـەرەو جیهانی دەرەکی پێکدێ، لە هزرو خودی کەسەکە سەرچاوەی گرتووە.

فشـاری دەروونـی دوو شـێوەی سـەرەکی لەخـۆ دەگرێـت، دوو زانـا ئاماژەیـان پـێ داوە، (بروهـان Bruhan) ئامـاژەی بـە فشـارە ئەرێنییـەکان دارە، کاتێـک لەگەڵ بەرزکردنەوەی پلەی وەزیفی ئەرکەکانیش زیاتر دەبن، هەروەها فشـارە نەرێنییەکان کە (سیلی) ئاماژەی پێدا، ئەمەش لە شکستهێنان لە وەزیفە یان کارکردندا ڕوودەدات.

هەروەها دەکرێت فشـارەکان بەشـێوەیەکی دیکە پۆلێن بکەین، فشـارەکان دەکرێ جۆراوجـۆر بـن، بەجۆرێـک هەمـوو لایەنەکانی ئـەو ژیانە بگرێتەوە کە مـرۆڤ تیایدا دەژی، دەشێ لەم جۆرانەی خوارەوەدا ریز بکرێن:

**▫ فشاری کار:**

لـە ئەنجامـی ماندوبـوون لـە کارو سەرئێشـەکانی دروسـت دەبێـت، لـە بـواری پیشەسـازی و میدیاو کارگێڕیدا، ئەنجامی سـەرەتاییشـی ئەو لایەنە دەروونیانەیە کە خـۆی لـە حاڵەتەکانـی ماندوبـوون و بێـزاری دەبینێتـەوە، بەپێی توندی یـان لاوازی فشـاری سـەر تاک دەبنە هۆی دڵەڕاوکێی دەروونی و، کاریگەرییەکانی ئەو ئەنجامانە لەسـەر خۆگونجانـدن لـە کارو بەرهەمهێناندا رەنگ دەداتەوە، ئەگەر ئەم هەسـتە لای کرێـکار لـە کارەکەیدا بۆ دروسـت بوو، ئەوا ئەنجامەکاز بریتـی دەبێت لە: کاریگەری لـە بـڕی بەرهەمهێنـان، یـان جۆرەکـەی، یـان کاژێرەکانـی کار، کـە دەبێتـە هـۆی تێکچوونی تەندروسـتی جەسـتەیی و دەروونی کرێکارەکـە، زۆرجاریش دەبێتە هۆی خراپـی گونجانـی پیشـەیی. لە یەکەمین ئەو نیشـانانە، زیادبوونی توشـبوونە لە کارو ڕووداوەکانـدا، لەوانەیە ترسـناکیش بێت، ئەمە جگـە لە زیادبوونی ئامادە نەبوون یان دواکەوتن لە کارداو، لەوانەیە بگاتە رادەی دابڕان لێی و بە تەواوی بەجێی بێڵێت.

**▫ فشاری ئابووری:**

رۆڵـی گـەورەی لـە پەرتەوازەکردنـی کۆششـی مـرۆڤ و لاوازکردنـی توانای لە تەرکیزکردن و بیرکردنەوە هەیە، بەتایبەتی کاتێک تووشی قەیرانی دارایی یان دۆڕان یاخـود لەدەسـتدانی کار بەتـەواوی بێت، ئەگەر سـەرچاوەی بژێوییەکـەی بێت، ئەمە لەسەر بارە دەروونییەکەی رەنگ دەداتەوە، بەهۆیەوە ناتوانێت لەگەڵ پێداویستییەکانی ژیاندا جووڵە بکات.

**▫ فشاری کۆمەڵایەتی:**

پێوەرەکانی کۆمەڵگە تاک ناچار دەکات بە تەواوی پێوەی پابەند بێت و، دەرچوون لێی واتە دەرچوون لە دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان، دواجار کێشە بۆ ئەو سەرپێچییانە دروست دەبێت، کە دەبێتە هێزی فشارهێن لەسەر تاک و تەنگژەو گرفتی بۆ دروست دەکات کە کاریگەری لە مامەڵە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دەکات.

**▫ فشاری خێزانی:**

بـە هـۆکارە پەروەردەییەکانی، فشـارێکی توند لەسـەر سـەرۆک خێزان دروسـت

دەکات و، کاریگەرییەک لەسەر پەروەردەی خێزانی جێ دەهێڵێت، زۆربەی ئەو خێزانانەی کە رەفتاریان پەروەردەییە، پابەند دەبن، ئەگەرنا پێکهاتەی خێزان تێک دەچێت و پێوەرەکانی رێککاری هەڵدەوەشێنەوە، دواجار ئەگەر رەفتاری باوک یان دایک نارێک بێت خێزان هەڵدەوەشێتەوە.

**فشاری خوێندن:**

لە سەرجەم قۆناغەکانی خوێندن فشارێکی توند دەکەوێتە سەر قوتابی، ئەگەر پەیڕەوی رێنماییەکانی قوتابخانە یان پەیمانگە یاخود کۆلێژ نەکات. پێویستە لە خوێندندا سەرکەوتوو بێت، بۆئەوەی بە پلەی یەکەم خواستە تایبەتییەکانی رازی بکات و، خێزانەکەی بە باشی پاداشت بداتەوە، کە لە داهاتی مادی خۆی ئەرکی خوێندنەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو.

**فشاری سۆزداری:**

بە هەموو لایەنەکانی، دەروونی، هەڵچوونی، بە یەکێک لە پێداویستییەکانی بوونی مرۆیی مرۆڤ دادەنرێت.

**سەرچاوەکانی فشاری دەروونی:**

فشاری دەروونی لەئەنجامی کارلێکی نێوان تاک و کۆمەڵە هۆکارێکی دەرەکی یان ناوخۆیی، ژینگەیی یان کەسیی بێت دروست دەبێت، کە خۆی لە هۆکارە جەستەیی و عەقڵی و کاردانەوەییەکان دەبینێتەوە، (دانزی Danzi) دووپاتی دەکاتەوە، کە فشاری دەروونی لە هۆکارە جەستەییەکانی وەک خراپبوونی یەکێک لە ئەندامانی لەش و، هۆکارگەلی عەقڵی و کاردانەوەیی وەک دڵەڕاوکێ و ترس دروست دەبێت، فشاری دەروونی پەیوەستە بە کردەو کاردانەوە نەرێنی و ئەرێنییەکان، بۆ نموونە لەوانەیە بردنەوەی خەڵاتێک فشارێک بێت بۆ ئەگەری وەدەستهێنانی خەڵاتەکە یان لەدەستدانی.

لەوانەشە فشارەکان لەناو خودی کەسەکە خۆی دروست بێت بەهۆی ئەو قەیرانانەی تیایدا دەژی و، بە فشاری ناوخۆیی ناودەبرێت، یان لەوانەیە لەچوارچێوەی

دەرەکـی بێـت، وەک کارکردن، پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێیـان و هاوڕا نەبوون لەگەڵیان، شـڵەژانی خێزانـی، کێشــەی خێزانـی، ناکۆکـی لەگەڵ هاوبەشـی ژیانـدا، جیابوونەوە، مردنـی کەسـێکی ئازیـز، زیانێکـی دارایـی بازرگانی، یان توشـبوون بە هەڵوێسـتێکی لەناکاو، ئەمانە بە فشاری دەرەکی ناودەبرێن.

فشارەکان جا ناوخۆیی بن لە ئاکامی هەڵچوونەکان، یان باری دەروونی و نەتوانینی تاک بە ئاشـکراکردنی و شـاردنەوەی، یان فشـاری دەرەکی بێت وەک ڕووداوەکانی ژیان، ئەوا بە گشتی بە بەدەنگەوەهاتن بۆ گۆڕانکاری ژینگەیی دادەنرێت. ڕووداوەکانی ژیانی ڕۆژانە فشـاری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، مرۆڤ کاتێک هەسـتی پێ دەکات کە بەردەوام لەگەڵ هەڵوێستە جیاجیاکاندا مامەڵە دەکات جا لە کارکردندا بێت یان لەگەڵ خەڵک یاخود ئەو کێشانەی چارەسەری گونجاویان بۆی نادۆزرێتەوە، یان پێشبڕکێی ڕووداوەکانی ژیان و پێویستییەکانی دەکات، کە پێویستی بە بەرگەگرتنی زیاتر هەیە بۆئەوەی گونجانی دەروونی دروست بێت، لەوانەیە ئەم هاوسەنگییە سەختە شکست بێنێـت، چونکـە تەنانەت بەختەوەرترین کەســەکان ڕوبەڕووی ڕەشـبینی و ململانێ و تێکشکان و فشاری جیاوازی ڕۆژانە دەبنەوە، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان بەشێوەیەکی ڕێژەیی، ڕوبەڕووی بارودۆخی سەخت دەبنەوە.

دەکـرێ هۆکارەکانـی فشــار پۆلێـن بکرێـن بـۆ (هـۆکاری ناوخۆیـی) وەک ئەرکی ئەندامەکان و، سروشـتی کەسـایەتی وەک مێشـک و ئەو بیرۆکانەی هەڵی گرتووەو، (هـۆکاری دەرەکـی) وەک کاروبـاری تایبەتـی و بژێـوی و بارودۆخـی ژینگەیـی. هۆکارەکانی گرژیی پشـت دەبەسـتن بە: ئەزموونەکانی پێشـترو، شێوازی کەسایەتی، پرۆگرامی پێشووی ئاگایی. هۆکارەکانی فشار دەکرێت بەم شێوەیە دابەش بکەین:

**یەکەم/ ڕووداوو کێشە دەروونییە ناوخۆییەکان:**

هەڵچـوون تا ئاسـتێکی گونجاو مرۆڤ لە مەترسـی دەپارێزێـت و، بۆ کارکردن و چالاکی پڕ وزەی دەکات و، پاڵی پێوە دەنێت تاکو بەرەنگاری مەترسییەکان و دوژمنان بێتــەوە بـۆ ڕوبەڕوبوونەوەی داهاتوو، ئــەوە ئەرکێکی خراپ نییە لە ئەرکە گونجاو و تەندروستییەکانی هەڵچوونە، ترس لای نەخۆشی توشبوو بە بەرزبوونەوەی فشاری

خوێن لەوانەیە هێزێکی پاڵنەر بێت بۆی، بۆئەوەی ئاستێک بۆ سۆدیۆم لە خۆراکەکەیدا دابنێت تاکو کاتی خواردنی دەرمانەکەی بە ڕێکوپێکی بیر بکەوێتەوەو، ترس لای توشبوو بە نەخۆشی شەکر وای لێ دەکات ڕۆژانە بایەخ بە کێشی بدات و، بە باشی چاودێری خۆراکەکەی بکات و بڕی ئەنسۆلینی پێویست بە ڕێکوپێکی وەربگرێت.

ترسی میدیاکار لە نەخۆشییەکە لەو کاتەی دیمانەیەکی تەلەڤزیۆنی ئەنجام دەدات، وای لێ دەکات دژە ڤایرۆس وەربگرێت، چونکە گومان دەکات تووشی نەخۆشییەکە دەبێت. یان ترسی میدیاکار لە نەگەیشتن بەو ڕاستییەی بەدوایدا دەگەڕێت، وای لێ دەکات بیر لە پیشەی تر بکاتەوە، کە بتوانێ زیاتر لە خۆی ڕازی بێت. بەڵام لە زۆر باردا لەوانەیە هەڵچوونەکان بگۆڕێن بۆ سەرچاوەیەک لە سەرچاوەکانی شڵەژان لە ژیانی دەروونی و کۆمەڵایەتی کەسەکە بە ئەرکە جەستەییەکانیشی و ئەوەی لە تەندروستی و نەخۆشی پێوە پەیوەستە، هەروەک دڵەڕاوکێ و خەمۆکی دەروونی و توشبوون بە نەخۆشییە دەروونییە جیاوازەکان.

**دووەم/ بارودۆخ و کێشە تەندروستییەکان:**

ڕژێنەکان چالاک دەبن و بەشێوەیەکی تایبەت ڕژێنی ئەدرینالین گەورە دەبێت، کاتێک تووشی فشار یان کێشەی تەندروستی دەبینەوە، (ئەدرینالین) زیاتر دەردەدرێن. لەبەر ئەم چالاکییە نائاساییەی دەرهاویشتنی ئەدرینالین، شانەکان بۆ گلۆکۆز دەگۆڕێن، کە وزە بە لەش دەدات بۆئەوەی لە بارێکی ئامادەباشی بەردەوامدا بێت. ئەمەش شتێکە لە هەڵوێستە هەڵچوونەکاندا بەسەر هەمووماندا دێ و، (سیلی) دووپاتی کردۆتەوە کە توشبوونی بەردەوامی ئاژەڵەکان بۆ فشاری تەندروستی (توشبوونی بە سەرما یان گەرمییەکی زۆر یاخود کوتانی بە ڤایرۆس)، توانای بەرەنگاری بۆ ماوەیەکی درێژ لەدەست دەدات. بەلای ئەوەوە نەخۆشی سەرەتا زەحمەتییەکە پێویستی بە وزەیەکی زیاتر هەیە، دواتر ماوەی گونجان و ڕاهاتنی بەسەردا دێ، وەک هەوڵێک بۆ گونجان لەگەڵ سەرچاوەکانی فشارو بەرەنگاربوونەوەی، بەڵام ئەمە لەوانەیە بۆ ماوەیەک بەردەوام بێت، دواتر ئاژەڵەکان هەست بە ماندوبوون دەکەن لەپاشان مردار دەبنەوە.

هەروەها دەرکەوت کە پەیدابوونی نەخۆشییە دەروونییەکان پەیوەستە بە

شـێوازەکانی ئـەو فشـارە دەروونیانەی کـە تاک بەدەسـتییەوە دەناڵێنێت، سـەرەتای پەیدابـوون و پەرەسـەندنی نەخۆشـییە دەروونییـەکان لـە کاتـی توشـبوون بـە گۆڕانکارییەکانـی ژیـان دەردەکەوێـت، وەک شکسـت لـە خوێنـدن، مردنـی یەکێک لە خزمان یاخود پێشبینی جیابوونەوە لە خێزان یان گۆڕینی لەناکاوی داهات لەئەنجامی دەرکردن لەسـەر کار، ئەمە لەسـەر نەخۆشییە سووکە دەروونییەکان وەک دڵەڕاوکێ و خەمۆکی دەروونی و، نەخۆشییە توندە عەقڵییەکانی وەک خۆکوشتن و شیزۆفرینیا جێبەجێ دەبێت.

بەمەش لە بەڵگەکانی پێشوو بۆمان روون دەبێتەوە کە نەخۆشی بە سەرچاوەیەکی سـەرەکی بۆ فشـاری دەروونی دادەنرێت، هەروەها بە ئەنجامێکی لۆژیکی دادەنرێت بۆئەوەی هەست بە زیادبوونی فشارەکان بکرێت، کە زیادبوونی رێژەی توشبوونمان بـە نەخۆشـییە سـووکەکان یـان توندەکان لێـک دەداتـەوە، لە کاتـی تەنگـژەکان یان تاقیکردنـەوەکان یاخـود گەشـتکردن، یـان زیادبوونـی ئـەو ئەرکانـەی پێویسـتی بـە کارکردنی زیاتر یان تەرکیزکردنی ورد هەیە.

**سێیەم/ بارودۆخ و کێشە کۆمەڵایەتییەکان و رووداوەکانی رۆژانە:**

ژیان لەگەڵ کۆمەڵ و ئینتیمابوون بۆ کۆمەڵێک لە هاوڕێ یان تۆڕێک لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـە رێکخـراوەکان، لـە سـەرچاوە سـەرەکییەکان دادەنرێـت کـە وا دەکات ژیان مانایەکی هەبێت، لەپاشـان بە گشـتی بۆ تەندروسـتی و خەباتکردن و رازیبوون ئاراستەمان دەکات. بەم دواییە لێکۆڵینەوەکانی (هارڤارد) کە (مکلاند McClelland) و هاوڕێیانـی ئەنجامیانـدا، روونیان کردەوە کە شـڵەژانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەوانەیە رۆڵێکی وێرانکەر بۆ تەندروستی ببینێت.

بـۆ لێکۆڵینـەوە لـەو بیرۆکەیـە، (مکلانـد) و هاوڕێیانی لـە رۆڵێکیـان کۆڵییەوە کە بـە پاڵنـەری ئینتیمـا ناونـرا، واتـە ئارەزووکـردن بـۆ پێکهێنانـی خێـزان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بوون لەگەڵ هاوڕێیانداو، دیداری ئەوانی دیکە و سەردانی کردنی یەکتر بە شێوەیەکی رێکوپێک، بە گشتی ئەنجامەکانیان ئاماژە بەوە دەکات، کە پاڵنەری بەهێـز بـۆ ئینتیمای کۆمەڵایەتی و پەسـندکردنی فێڵ لەگەڵ کۆمەڵێک و پەسـندکردنی

ئەوانـی دیکـە بـۆ ئێمـە، زیاتر پەیوەندی بە تەندروسـتی لـە لایەنـە دەروونییەکەی و ئەندامییەکەی پێکەوە هەیە.

میدیاکار بۆ مانەوە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا روبەڕووی ململانێیەک دەبێتەوە، کاتێک بەدواداچوونێکـی رۆژنامەنووسـی دەکات و پەیوەنـدی بەوانیتـر دەکات یـان بە تەنیا دەمێنێتەوەو، بە دوای پێشدەستی رۆژنامەنووسیدا دەگەڕێت کە لەوانەیە لەوانی جیا بکاتەوە، ئەمەش فشاری لەسەر دروست دەکات.

**چوارەم/ بارودۆخ و فشارەکانی کارکردن و دەسکەوت:**

فشـارەکان لـە لایەنە دەسـکەوتییەکەیەوە فێربوونی باش پـەک دەخات و، دەکرێ ببێتـە هـۆی شکسـت و دەستەوەسـتان لـە دەسـکەوت و رکلێبوونەوە لـە کار، لەگەڵ تێکشکانی دەروونی و شڵەژانی هەڵچوونی و ئاوەزی کە سەرچاوەکانی جۆراوجۆرن.

چونکـە میدیـاکار ئارەزووی دەسـکەوت دەکات، ئەگەرنا ئـەو دەزگایەی کاری بۆ دەکات لێـی رازی نابێـت، ئەگـەر بیرۆکـەی تـازەی پـێ نەبێـت یان تێڕوانینـی جیاواز پێشـکەش نەکات و دەسـکەوتێکی ناوازەی نەبێت، ئەوا لە کاردا بە دەسـت فشـارەوە دەناڵێنێت، چونکە بەرپرسانی کارەکەی لە ئاستەکەی رازی نابن.

**پێنجەم/ پێشکەوتنە تەکنەلۆژی و میدیاو پێویستییەکانی جیهانگیری:**

ئامرازەکانی میدیاو ئەوەی لە بابەتی هەستی و بیستن و بینین لەخۆی دەگرێت و، ئەو پێداویسـتییە تەکنەلۆژییە نوێیانەی بە ئامێرو کەرەسـتەکانیەوە دەستەبەر دەبێت، وەک کۆمپیوتـەرو ڤیدیـۆو تەلەڤزیۆنـی پرۆگرامکـراو و تـۆڕی زانیـاری ئینتەرنێت و هەڵقوولانـی کـراوەی کلتـووری، هەمـوو بوونەتە سـەرچاوەی فشـاری دەروونی بۆ کەسـەکە، جـا ئەوەی بـەکاری دەهێنێت یان ئەوەی نازانێت بـەکاری بهێنێت. میدیاکار پێویسـتە بـەردەوام ئـاگاداری و زانیاری لەبارەی هەموو پێشـکەوتنەکانی تەکنەلۆژیا لە بواری میدیادا هەبێت، ئەگەر لەگەڵ پێشـکەوتنەکەدا نەڕوات ئەوا فشـاری لەسـەر دروسـت دەبێـت و، وێسـتگە رێکلامییەکـەی نابێتـە جێـی تایبەتمەندیـی و پەسـندی جەماوەر.

(میلەر Miller) دوو سەرچاوەی فشاری روونکردەوە کە بریتین لە:

- **فشاری ناوخۆیی:**

لـە بیـرو بـاوەڕو بیرۆکـە هەڵەکانـەوە سـەرچاوە دەگرێـت، وەک پێشـبینییەکانی رۆژنامەنووس بەوەی پێویسـتە هەموو کاتێک هەموو رووداوو نموونەکانی رەفتاری نموونەیـی بزانێـت، ئـەم شـیمانەیە ناواقیعییـە و پێویسـتە رۆژنامەنـووس بزانێت کە ئـەو مرۆڤێکـی تـەواو نییـە، چونکـە ئـەو هەسـت دەکات و هـەڵ دەچێت و پێویسـتی جۆراوجۆری هەیە، هەروەها رۆژانە بەدەسـت زۆر کێشـەوە دەناڵێنێت و، هەوڵی بۆ ژیان لەسەرووی ئاستی تواناکانییەوە، بێگومان دەیخاتە ژێر فشارەوە.

- **فشاری دەرەکی:**

ئـەو هەڵوێسـتانەی دەبنـە هۆی فشـار وەک فشـارەکانی بەهـا، بیرو بـاوەڕەکان، پرەنسیپەکان و، ململانێ لەنێوان دابونەریتەکان کە تاک پێوەی پابەندەو لەنێوان واقیع کـە دەبێتـە هۆی فشـاری زۆرو، فشـاریش بەو هەڵوێسـتە دیاری دەکرێـت کە دەبێتە هۆی ململانێ لەنێوان بەهاکان و واقیعدا.

پەیامنێـر ناچـارە لە کاتی جەنگەکاندا بێ لایەن بێت، بۆیە لە هەموو لایەنەکانییەوە هەواڵەکـە رووماڵ دەکات و لـە لاگیـری دوور دەبێـت، ئەمـە ناچـاری دەکات لەگەڵ دوژمنی نیشـتمانەکەی مامەڵە بکات، بۆئەوەی لەبارەی هەندێ پرسـی پەیوەسـت بە رووداوە هەنووکەییەکانـەوە لیـی بپرسـێت، لەوانەیـە لـە مامەڵەکردنی بـێ لایەنانەی فشارێکی لەسەر دروست بکات کە لەگەڵ دابونەریت و بیروباوەڕو بەهاکەی ناکۆکە.

**فشاری کاری میدیایی:**

رووداوەکانـی کار یەکەمیـن لێکۆڵینـەوە بـوون کـە بایەخیان بە کارمەنـدو زانینی هۆکارەکانی فشارەکە دا، لێکۆڵینەوەکان دەریانخست ئەو فشارە دەروونیانەی بەهۆی فشـاری کاری میدیاوە دروسـت دەبن، زۆرجار لەو بوارەدا رووداوی لێ کەوتۆتەوە، جگـە لـە بارودۆخـی فیزیکـی (رووناکـی، کەمی هەواگۆڕکـێ، زیادبوونـی ژاوەژاو لە شوێنی کار...هتد)، رێژەی فشارەکانی لەسەر میدیاکار زیاد کردووە.

بارودۆخـی ناوخۆیـی لای میدیاکار هۆکاری کاریگەرە بۆئەوەی تووشـی رووداو بێـت، سـەرەڕای بارودۆخی دەرەکـی لە کاردا وەک (پەیوەندییەکانـی کار، کرێیەکانی کار، ئامرازەکانـی گواسـتنەوەی کرێکار...هتـد) و، بارودۆخـی فیزیکـی وەک (گەرمی، هەواگۆڕکێ، رووناکی، ژاوەژاو)، هەموو ئەم هۆکارانە پێکەوە فشاری گەورە دروست دەکـەن، کـە کارمەند لـە بەرهەم دەخات و، لە بـواری کاری میدیادا هەندێ رووداوی بەسـەردا دێ، لەوانەیـە هەندێکیـان نەخۆشـی و پێکانـی جەسـتەیی و دەروونـی لـێ بکەوێتەوە.

هەنـدێ لێکۆڵینـەوەی زانسـتی دووپاتـی کردۆتـەوە، کـە دانانـی ئامێرەکانـی هەواگۆڕکێ لە نووسـینگەی فەرمانبەران و هۆڵەکانی کارکردندا، رێژەی تووشـبوونی لای میدیاکاران کەم کردۆتەوە. هەروەها دووپاتیان کردۆتەوە کە زیادبوونی ژاوەژاو بە پشووی کەسەکان دەگەیەنێت و، پاڵیان پێوە دەنێت بێزارو تووڕە بن و تەرکیزیان نەمێنێـت، گرژیـی و ماندوبـوون بوونەتـە هاوتای میدیاکاران و، نیشـانەی نەخۆشـی جۆراوجۆری وا دەرکەوتوون کە تایبەتە بەوان، کە بە نەخۆشی پیشەیی ناونراون.

دواکەوتـن لـە کار، خەمۆکـی، ئامادەنەبـوون، هـاوکاری نەکردنـی ئەوانـی دیکـە، پشتگوێخسـتن، بەرەنگاربوونـەوەی گـۆڕان، هەڵەکـردن لە کاردا، پاسـاو هێنانەوە بۆ هەڵەکان، بڕیاردانی نادروست.

**کاریگەرییەکانـی فشـاری دەروونی کە دەشـێ میدیـاکار روبـەڕووی بێتەوە، بەم جۆرە کورتی دەکەینەوە:**

١- کاریگەرییـە فسـیۆلۆژییەکان: ئـارەزووو نەکردنـی خـواردن، بەرزبوونـەوەی فشـاری خوێـن، هەوکردنـی کۆئەندامـی هـەرس. تێکچوونی پرۆسـەی هەرسـکردن، شەکەتبوونی جەستەیی، هەناسەتەنگی، سەرئێشە و هەستیاری پێست دەگرێتەوە.

٢- کاریگەرییـە دەروونییـەکان: ماندوبـوون، بێزاریـی، کەمبوونـەوەی ئارەزووی کارکردن، خەمۆکی، خەوزڕان و دڵەڕاوکێ دەگرێتەوە.

٣- کاریگەرییـە کۆمەڵایەتییـەکان: کۆتایـی هێنانـی پەیوەندییـەکان، کشـانەوە، گۆشەگیری، نەمانی توانا بۆ پەسندکردن و بەرگەگرتنی بەرپرسیارێتی.

٤- کاریگەرییە رەفتارییەکان: هەروەک «لازاروس» ئاماژەی پێدا، ئەمانە دەگرێتەوە: زیادبوونی گرژبوونی ماسولکەیی، تەتەڵەکردن لە قسەکردن، گۆڕانکاری لە دەربڕینی رووخسار، دەستپێشخەری، بچووککردنەوە، شڵەژاوی لە خەوتن هەروەها کەمکردنەوەی ئارەزوو و گوڕو تینەکان.

٥- کاریگەرییە زانینییەکان: بریتییە لە شڵەژان و تێکچوون لە ئاگابوون و تەرکیزکردن و یادەوەری و، خراپی رێکخستن و پلاندانان.

**مەشقکردن لەسەر روبەڕوبوونەوەی فشارەکان پێنج هەنگاو لەخۆ دەگرێ، وەک (مایکنباوم) ئاماژەی بۆ دەکات:**

**١- توانای خاوبوونەوە:**

راهێنانەکان لەسەر خاوبوونەوە وەک هەناسەدان لە ناوپەنچک، خاوبوونەوەی رێکخراوو خاوبوونەوەی رێکخراو بەبێ گرژیی، هەروەها خاوبوونەوە لەژێر فشاری ئاماژەدانەکان بۆ وەدەستهێنانی تواناکانی روبەڕوبوونەوەی فشارە دەروونییە چاوەڕوانکراوەکان.

**٢- ریزبەندکردنی ئەو رووداوانەی بە فشارە دەروونییەکان بارگاوی کراون:**

بۆ جێبەجێکردنی تواناکانی روبەڕوبوونەوە لە هەڵوێستەکانی ژیانداو، بونیاتنانی ریزبەند یان لیستێکی کەسیی بۆ ئەو هەڵوێستانەی بە فشارە دەروونییەکان بارگاوی کراون، لە کەمترین هۆکار بۆ توشبوون بە وەڕسی دەست پێ دەکات تا زیاترین هۆکار.

**٣- مەترسییەکانی روبەڕوبوونەوە:**

باش وایە کەسەکە لیستێکی تایبەت بە خۆی لە مەترسییەکان دابنێ، کە یارمەتی دەدات روبەڕووی فشارە دەروونییەکان بێتەوە. ئەم مەترسیانەش یارمەتی کەسەکە دەدات بۆ تێپەڕینی ئەو کاتانەی تیایدا هەست بە فشاری دەروونی دەکات.

**٤- توانای روبەڕوبوونەوەی خەیاڵی:**

بە بەکارهێنانی خەیاڵ، دەکرێ هەر هەڵوێستێکی بارگاوی بە فشارە دەروونییەکان

لەو ریزبەندە هەڵبژێردرێ، کە ئەزموونی هەستکردن بە گرژیی و ئەو سۆزە پەیوەستدارانەی کە هۆکارن بۆ وەڕسییەکە و، دواتر ئەو گرژییە دوور دەخرێتەوەو بەرەنگاری ئەو مەترسیانە دەبێتەوە کە بۆتە هۆی فشارە دەروونییەکان، لەرێگەی بەرەنگاربوونەوەی مەترسییەکانی دیکە.

**٥- توانای روبەڕوبوونەوەی کردەیی:**

دوای جێبەجێبوونی چوار هەنگاوەکەی پێشوو، تاک دەست بە جێبەجێکردنی هەڵوێستە بەرەنگارییەکان لە ژیانی رۆژانەدا دەکات. دواجار مەشقەکانی خاوبوونەوەی خودی و مەترسی دژی فشارە دەروونییەکان دەبنە میکانیکی و، لە هەر هەڵوێستێکی بارگاوی بە فشارە دەروونییەکان بەکار دەهێنرێت.

**سووتانی دەروونی:**

هەندێجار دوای چەندین ساڵ لە کاری میدیا، میدیاکار هەست دەکات کە چیتر ناتوانێ وەک پێشوو کار بکات و، هەست بە سووتانی دەروونی دەکات، سووتانی دەروونی «هەستکردنی میدیاکارە بە ماندوبوون و بەکاربردن، نەبوونی پاڵنەر، لەگەڵ هەستکردن بەوەی پێشکەشی دەکات نەخوازراوەو بایەخدار نییە».

فشارەکانی کارکردن لای میدیاکاران، بەدەنگەوە هاتنێکی هەڵچوونی و جەستەیی بۆ دیاردەیەکی دەروونی پیشەیی هەستیار دروست دەکات، کە باس لە لایەنەکانی کەسایەتییەکانی دەکات و سووتانێکی دەروونییان لا دروست دەکات، ئەو لە بارێکی هیلاکبوونی دەروونی و جەستەییدایە لە ئەنجامی فشاری کارکردن دەردەکەوێت کە تووشی دەبێت و، بە خراپی کار لەسەر ئاراستەکانیان بەرەو ئەو پیشەیە دەکات کە کاری تیا دەکەن.

**پرۆسەی سووتانی دەروونی لای میدیاکاران لە سێ قۆناغ پێکدێ:**

١- فشاری کارکردن بەهۆی ناهاوسەنگی لەنێوان پێویستییەکانی کارکردن و، پێویستییەکانی کارمەندان لە چوارچێوەی پیشەییدا.

٢- کاردانەوەی هەڵچوونی بۆ باری ناهاوسەنگی کە فشاری کارکردن

هۆکارەکەیەتی.

٣- ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەر کەسەکە دروست دەبێ و، لە لایەنە نەرێنییەکەی کاریگەری لەسەر ئاراستەکانی دەکات، جا بە کەمبوونەوەی گوڕو تینەکەی بۆ کاری میدیا، یان شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەوانی دیکە، یاخود رەفتارە پیشەییەکەی بێت.

**نیشانەکانی سووتانی دەروونی لای میدیاکاران:**

- سووربوونی میدیاکاران لەسەر مۆڵەت و پشووەکانی هەفتانە و جەژنەکان و، خۆشحاڵبوون پێیان.

- ئارەزوو نیشاندان بۆ خانەنشینی و دووبارەکردنەوەی قسەکردن لەبارەیەوەو لەبارەی تایبەتمەندییەکەی لە رزگاربوون لە ئەرکەکانی کارکردن.

- دڵەڕاوکێی رۆژانە و ماندوبوونی جەستەیی.

- ئاگا نەبوون و تەرکیز نەکردن لە کارکردن.

- ئارەزوو نەبوون بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی دیکە و، توندی هەڵسوکەوت و داخران بەڕوویاندا.

- بێزاریی دووبارە لە کارکردن و ئارەزوو نەکردن لە ئەنجامدانی.

**هۆکارەکانی سووتانی دەروونی لای میدیاکاران:**

- ئەنجامدانی هەمان کارو بۆ ماوەیەکی زۆر.

- کارکردنی زیاتر لەگەڵ هەستکردن بە دەسکەوتێکی کەم.

- کەمیی هەستکردن بە دەسکەوت، میدیاکار هەست دەکات چیتر هەست بە دەسکەوتەکەی ناکات و کارەکانی ئەنجامێکی نییە.

- بەوپێیەی لەژێر فشارێکی گەورەدا دەناڵێنێت بۆئەوەی یارمەتی پێشکەش بکات و، لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی و سەرپەرشتیاران و کۆمەڵگە بە ئامانجەکان بگات.

- کارکردن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک، ئەو کەسانە بە رەفتارو بیرکردنەوە جیاوازەکان کار لەسەر میدیاکارەکە دەکەن.

- ململانێ لەگەڵ هاوپیشە و سەرپەرشتیارو کارگێڕان لەئەنجامی ئەوەی هەندێجار

تەمومژی لە رۆڵەکەدا دەبێت.

- دەست نەکەوتنی دەرفەتی تاقیکردنەوەی تایبەتی و داهێنان.
- نەتوانینی چارەسەرکردنی کێشە تایبەتییەکان وەک کێشەی دارایی.
- کەمیی متمانە لەنێوان بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانبەری میدیا.
- زۆریی گواستنەوە لەنێوان چەند ئامرازێکی میدیاو وێستگەی ئێستگەیی یان رۆژنامەییەکاندا.

**روبەڕووبوونەوەی سووتانی دەروونی:**

بۆ رێگرتن و چارەسەرکردنی سووتانی دەروونی پێویستە ئەم کارە بکرێت:

١. فێربوونی رێگە تایبەتییەکان بە بایەخدان بە خود، وەک خوێندن و نووسین.

٢. هەڵسەنگاندنی ئامانجە تایبەتییەکانی میدیاکارو ئەولەوییەت و پێشبینییەکان و، هەوڵدان بۆ دەستنیشانکردنی ئەوەی میدیاکار لە کارەکەی دەیەوێ و، چۆن دەکرێت پێش بخرێت.

٣. دۆزینەوەی بایەخدانە جۆراوجۆرە دوورەکان لە کار، وەک ئەنجامدانی ئارەزوو و چالاکی جۆراوجۆرو فێربوونی بەهرەی بەردەوام لە ژیاندا.

٤. بایەخدان بە تەندروستی لەرێگەی وەرزش و خەوی تەواوەوە.

٥. دەستپێشخەری بۆ دەستپێکردن بە پرۆژەی نوێ و، رانەوەستان لە پرۆژەی کارو هاوسەرگیری و منداڵبوون، تەنانەت بەردەوامی لە پێشخستنی خود بە پرۆژە پلان بۆ دانراوەکانی، بە جۆرێک گەشبینی و چالاکی لە کارەکەیدا بۆ دەگەڕێنێتەوە.

٦. پەرەپێدانی هاوڕێیەتی نوێ.

٧. فێربوونی شێوازی نوێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ فشارەکان، جا لە کار یان لە ماڵدا بێت.

٨. گەڕان بەدوای پاداشتی خودی نەک دەرەکی، چونکە زۆر لە میدیاکاران لە دەرەوە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی بەرپرسەوە پاداشت وەرناگرن وەک چاوەڕوانی دەکەن، بۆیە پێویستیان بەوەیە لە خودەوە پەرەی پێ بدەن.

٩. دۆزینەوەی مانای نوێ لەرێگەی گەشت و شارەزاییە نوێیەکان و سەرکێشییە

جۆراوجۆرەکانەوە.

١٠. ئامادەبـوون لـە کۆنگـرەو خولـەکان و وۆرکشـۆپە جیاوازەکانی مەشـقکاری ئاراستەکراو، بۆ پەرەپێدانی کاری میدیا.

* * *

## سەرچاوەکان


١- د. سامي محسن ختاتنة، د. احمد عبداللطيف ابو سعد، علم النفس الاعلامي، دار المسيرة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٠.

٢- فوزية العطية، المدخل الى دراسة علم النفس الاجتماعي، دار الحكمة للطباعة، بغداد، ٢٠٠٣.

٣- عبدالله زلطة، الإعلام الدولي، دار الفكر العربية، القاهرة، ٢٠٠١.

٤- احمد عزت صالح، اصول علم النفس، المكتب المصري الحديث، القاهرة، ٢٠٠٢.

٥- الاعلام والعلم النفس، د. خلدون عبدالله، دار اسامة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٠.

٦- كامل محمد محمد عويضة، رحلة في علم النفس، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٦.

٧- د.شيماء ذو الفقار زغيب، نظريات في تشكيل اتجاهات الرأي العام، الدار المصرية اللبنانية، القاهرة، ٢٠٠٤.

٨- سمير محمد حسين، الاعلام والاتصال بالجماهير، عالم الكتب، القاهرة، ٢٠٠٤.

٩- د. هاني الرضا، د. رامز عمار، الرأي العام و الاعلام والدعاية، بيروت، ١٩٩٨.

١٠- جبارة عطية جبارة، علم الاجتماع الاعلام، عالم الكتب، الرياض، ٢٠٠٥.

١١- بيل جيتس، المعلوماتية بعد الأنترنت، ت: عبدالسلام رضوان، سلسلة عالم المعرفة، الكويت، ١٩٩٨.

١٢- د. مؤيد عبدالجبار الحديثي، العولمة الاعلامية والأمن القومي العربي، الدار الأهلية للنشرو التوزيع، عمان، ٢٠٠٤.

١٣- د. نبيهة صالح السامرائي، علم النفس الاعلامي، دار المناهج للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٦.

١٤- سوزان القليني، تكنولوجيا الأتصالات و نظم المعلومات، دار النهظة العربية، القاهرة، ١٩٩٩.

١٥- د. محي محمد سعيد، ظاهرة العولمة الأوهام والحقائق، دار المطبوعات الجامعية، الأسكندرية، ٢٠٠٤.

١٦- محسن فتحي عبدالصبور، اسرار الترويج في عصر العولمة، مجموعة النيل العربية، القاهرة، ٢٠٠١.

١٧- د.صالح خليل أبو أصبح، أدارة المؤسسات الأعلامية في الوطن العربي، دار أرام للدراسات، عمان، ١٩٩٧.

١٨- عاطف عدلي العبد وعلي رضا، المؤسسات الأعلامية.. الأسس النضرية والنماذج التطبيقية، دار الفكر العربي، القاهرة، ٢٠٠٨.

١٩- د.محمد بن عبدالرحمن الحضيف، كيف يؤثر وسائل الاعلام؟، مكتبة العبيكان، الرياض، ١٩٩٨.

٢٠- محمد الدقس، التغير الاجتماعي بين النظرية والتطبيق، عمان، دار مجدلاوي، ١٩٩٧.

٢١- محمد عبدالحميد، دراسة الجمهور فى بحوث الاعلام، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٩٧.

٢٢- أ.د.حميدة سميسم، نظريات الاتصال، دار النشر مكتبة نانسي، دمياط، ٢٠٠٥.

٢٣- د.عبدالرحيم درويش، مقدمة الي علم الاتصال، دار النشر مكتبة نانسي، دمياط، ٢٠٠٥.

٢٤- صالح محمد ابو جادو، علم النفس التربوي، دار المسيرة للنشر والتوزيع، عمان، ١٩٩٨.

٢٥- صالح محمد ابو جادو، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، دار المسيرة للنشر والتوزيع، عمان، ١٩٩٨.

٢٦- د. محمـود حسـن اسـماعيل، مبـادىء علم الاتصال ونظريـات التاثير، دار العالمية للنشـر والتوزيع، القاهرة، ٢٠٠٣.

٢٧- د. محمود علم الدين، تكنلوجيا المعلومات وصناعة الاتصال الجماهيري، مكتبة العربي للنشروالتوزيع، القاهرة، ١٩٩٠.

٢٨- د.اديب خضور، مدخل الى الصحافة: نظرية و ممارسة، دار الفكر للنشر والتوزيع، دمشق، ٢٠٠٠.

## ناوەڕۆک

## بەشی چوارەم

## جەنگی دەروونی و ئامرازەکانی میدیا



## بەشی پێنجەم

## دەروونناسیی جەماوەرو ئامرازەکانی میدیا

## بەشی شەشەم

## پەیوەندیگیری لە دەروونناسیی میدیایی



## بەشی حەوتەم

## چەمکەکان لە دەروونناسیی میدیا

## بەشی هەشتەم

## زمان و ئامرازەکانی میدیایی



## بەشی نۆیەم

## کارامەییەکان لە دەروونناسی میدیا



## بەشی دەیەم

## سەرکردایەتی و کارگێڕیی لە دەروونناسی میدیادا

بەشی یانزەیەم

دواڕۆژی ئامرازەکانی میدیا



بەشی دوانزەیەم

فشار و سووتانی دەروونی لە میدیادا

سەردەمی ئێستا پێویستمان بە شۆڕشی میدیایە کە چێکردنی میدیاکارو بڵاوکردنەوەی هۆشیاری میدیاییە، ئەمە بۆ گەلێکی سڤیل کاریگەرترین خەباتی سەردەمەو جێگرەوەی دیکەی نییەو، بەوپێیەی میدیا مانی شارستانییەتە، پێویستە بۆ ئێمەش زمانێکی کارا بێت لە بۆنەگەلی نێودەوڵەتیداو، کاریگەری سایکۆلۆژیانەی وای هەبێت راستەوخۆ وێنەکانی بێ دەوڵەتی و سەربەخۆیی بەرجەستە بکات و دەوروبەر لێمان تێ بگات.

کارابوونی رۆڵی میدیای کوردی لە هۆشیاری میدیایی تاکەکانیدایە بۆ ئاخاوتن لەگەڵ دەوروبەرو، بڵاوکردنەوەی هۆشیاری میدیایی. ئەم هەوڵە ئەرکێکی مەدەنیانەیە بۆ بڵاوکردنەوەو پێشخستنی رەوتی میدیای زانستی و پێگەیاندنی میدیاکاران، ئەم کتێبە بۆئەوەیە هزری میدیای دەروونی بکاتە لقێك بۆ هەموو میدیاکاران و ئەو قوتابیانەی لەبارەی پسپۆرێتی دەروونناسی یان پسپۆرێتی میدیاییەوە دەخوێنن.

چاپی یەکەم ٢٠١٣




خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING AND PUBLISHING
www.mukiryani.com

چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر